**باس و توێژینەوە بڵاوکــراوەکان لە گۆڤاری ئەکادیمیای کــوردی دەربــڕی بیــر و بۆچوونــی توێژەرانــن نەک دەستەی نووســەرانی گۆڤار**


- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی.
- بەرگ و سەرپەرشتی هونەری: عوسمان پیرداود کواز
- نەخشەسازی: عیسام موحسین.
- هەڵەچن: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل.
شیلان جەلال.
- چاپ: چاپخانەی حاجی هاشم- هەولێر.
- تیراژ: ٧٥٠ دانە.

# لەم ژمارەیەدا

## بەشی کوردی



## بەشی عەرەبی - القسم العربی



## English Part

# ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە
# لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

١- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، گۆڤارێکی زانستی وەرزییە، باس و توێژینەوەی زانستی لە بارەی کورد و کوردستان، بڵاودەکاتەوە، بە مەرجێ لە هیچ شوێنێکی دیکە بڵاو نەکرابێتەوە یان بۆ بڵاوکردنەوە وەرنەگیرابێت.

٢- زمانی کوردی زمانی سەرەکی بڵاوکردنەوەیە لە گۆڤارەکە، بەڵام لێکۆڵینەوەی زانستی بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزیش بڵاودەکاتەوە.

٣- هەر بابەتێک کە بۆ گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی دەنێردرێت، دەبێت ناونیشانی باسەکە، ناوی نووسەر، شوێنی کارەکەی، پلە و پایەی زانستی، ئیمێل و ژمارەی تەلەفۆنەکەی لە سەر لاپەڕەی یەکەمی لێکۆڵینەوەکە نووسرابێت.

٤- نووسەر دەبێت پوختەی باسەکەی بە هەردوو زمانەکەی دیکە، جگە لە زمانی نووسینی دەقەکە لە کۆتایی توێژینەوەکە بنووسێت، کە نابێت لە یەک پەڕەی (A4) زیاتر بێت. لەو پوختەیەدا پێویستە گرنگی و ئەنجامە سەرەکییەکانی توێژینەوەکە بخرێنەڕوو.

٥- لە دوای پەسەندکردنی باسەکە لە لایەن هەڵسەنگێنەرانی زانستیەوە، دەستەی نووسەران ڕەزامەندی بڵاوکردنەوەی بە توێژەر دەدات.

٦- بۆ ئەوەی بابەتەکە لەگەڵ ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوەی گۆڤارەکەدا بگونجێت، دەستەی نووسەران مافی سەرلەنوێ داڕشتنەوە و لابردنی هەندێ دەستەواژەی هەیە، بە مەرجێک بیرۆکەی سەرەکی توێژینەوەکە نەگۆڕێت.

٧- ئەگەر باسەکە لە بارەی ساخکردنەوە (پەیدۆزیی، تحقیق) ی دەستنووسەوە بێت، دەبێت پەیدۆزییەکە بە پێی بنەما زانستییەکان بێت و چەند لاپەڕەی کۆپیکراوی دەستنووسەکە و شوێنی وەرگرتنی، کۆد و جۆری دەستنووسەکە (دەستنووس، چاپ، مایکرۆفیلم... هتد) لەگەڵ دابێت.

٨- ئەگەر ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی لە هەڵبژاردنی ناونیشانی باسەکە،

توێژینـەوەی بابـەت، شـێوازی بەکارهێنانـی سـەرچاوە و ڕێکخسـتنی پەراوێزەکان ڕەچاو نەکرابێتن، ئەوا باسەکە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بڵاوناکرێتەوە. هەروەها ئەو لێکۆڵینەوانەش کە بە زمانێکی پاراوی زانستی نەنووسرا بێتن فەرامۆش دەکرێن.

٩- دەبێـت باسـەکە دانەیەکـی لەسـەر (CD) لەگـەڵ (٣) دانـەی چاپکـراوی سـەر کاغـەز (A4) بـە فۆنتـی (١٥) ی یۆنیکورد بێت، بـە مەرجێک ژمارەی لاپەڕەکانـی بـە لیسـتی پەراوێـز و سـەرچاوەکانەوە لـە (٢٥) لاپـەڕە زیاتر نەبێت و پەراوێزەکانیشی لە کۆتایی باسەکە دابندرێت.

١٠- ئەگـەر بابەتەکـە وەرگێـڕدراو بوو، دەبێت لە زمانی یەکەمەوە بێت و دەقە ئەسڵییەکەشی لەگەڵدا هاوپێچ کرا بێت.

١١- گۆڤـاری ئەکادیمیای کوردی ناسـاندن و هەڵسـەنگاندنی ئـەو کتێبانەی لە بارەی کورد و کوردستانەوە نووسراون بڵاودەکاتەوە، بە مەرجێک نووسەر ڕەچاوی پێوەرە زانستییەکانی ئەم بوارەی کردبێت.

١٢- بابەتی نێردراو بۆ گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی نادرێتەوە بە خاوەنەکەی.

# گۆڕانی مێژوویی
# کۆنسنانتی زمانی کوردی

پ.د. یوسف شەریف سەعید    د. مزگین عەبدولڕەحمان ئەحمەد

**سەرەتا:**

ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵێکە بۆ ڕوونکردنەوەی بەشێکی گرنگ لە فۆنۆلۆجیی زمانی کوردی و دەرخستنی هەندێ لایەنی شاراوە لە دەنگسازیی کوردی، کە بە درێژایی مێژووی زمانی کوردی ڕوون نەکراوەتەوە. ئەم لێکۆڵینەوە دوو تەوەر لە خۆی دەگرێت و لە تەوەری یەکەمدا، باس لە گۆڕانی کۆنسنانتی زمانی ئێرانی دێرین بۆ ناوەڕاست و دواتر لە زمانەکانی ئێرانی دێرین بۆ زمانی کوردی دەکەین. لە تەوەری دووەمدا، گشت ئەو کونسنانتانەی کە تووشی گۆڕان بوونە بە نموونەوە ڕوونیان دەکەینەوە. لە کۆتاییشدا بە بەرچاو خستنی چەند ئەنجامێك، کۆتایی بە لێکۆڵینەوەکە دێت. لە ناوەرۆکی ئەم بابەتە هەندێ وشەی کورتکراوە هەن کە لێرەدا دیاری دەکرێن:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئێرانی دێرین | ← ئیَ.د | هندی دێرین | ← هـ.د |
| هیندۆ ئەورووپی | ← هـ.ئە | پەهلەوی ئەشکانی | ← ئەش |
| کوردی | ← ك | پەهلەوی | ← پەه |
| ئاڤێستایی | ← ئاڤ | نەزانراوە | ←......... |

**١. گۆڕانی مێژوویی کونسنانتەکان لە ئێرانی دێرین بۆ ناوەڕاست:**

ئەگەر لە سەردەمی دێرین توانرابا قسە و دوان وەکو ئێستا تۆمارکرابا و لەگەڵ دوانی ئێستا بەراورد کرابا، جیاوازییە دەنگییەکان زۆر بە زەقی هەستی پێدەکرا و راڤە و لێکدانەوەیەکی تەواویش بۆ جیاوازییە دەنگییەکان دەکرا. خودی گۆڕانەکەش لێك دەدرایەوە. هەرچەندە کە، بەراورد بۆ زمانانی سەردەمی دێرین بە هۆی پاشماوەی نووسراوی ئەو زمانانە دەکرێت، بەلام بە وردی

جیاوازییەکان دەرناکەوێت. چونکە خودی نووسین لەم سەردەمانەدا سەخت و گران بووە و شێوەی نووسینیش، لە کەم و کورتی دوور نەبووە و شێوە راستەقینەکەی دوانی زمانەکەی پیشان نەداوە. گۆڕانی دەنگ هەموو زمانەکان دەگرێتەوە، بە تایبەتی کاتێ کە دەنگ، دەچێتە چوارچێوەی قسەکردن و دوانی راستەوخۆ. چونکە جیاکردنەوەی دەنگ لە وێنەکەی (واتە نووسین) ئەم راستییەمان بۆ دەردەخات، کە هەمیشە دەنگ گۆڕانی زیاتر بە سەردا دێت بێ ئەوەی گۆڕان لە شێوەی نووسراوی زمانەکە روو بدات. باشترین بەڵگە بۆ ئەمە، ئەو جیاوازییانەیە کە شێوەی نووسینی هەندێ زمان، جیاوازە لە درکاندنی دەنگەکانی. واتە گۆڕان هەمیشە بەردەوامە لە دواندا، بەڵام شێوەی نووسین وەك خۆی ماوەتەوە (تالب حسین، ١٩٨٩:٤٤). جگە لەمەش هەندێ کۆنسنانت لە زمانی پەهـ دا هەبوون کە ئێستا لە زمانی کوردیدا نین. هەرچەندە کە لە شێوەزارەکاندا دەکرێ بڵێین ماون. لەوانەش فۆنیمی (ث،θ)ی هەبووە. هەروەها کۆنسنانتەکانی (d،g،b) ناوەڕاست لە رووکەشدا بە (γ، δ، v) گۆ دەکران (محسن ابوالقاسمی، ١٣٨٥:١٢٩). گۆڕانی کونسنانتەکان لە سەردەمی دێرین بۆ ناوەڕاست خۆی بەم شێوەیە بەرجەستە کردووە:

| ئێرانی ناوەڕاست | ئێرانی دێرین |
|---|---|
| d | T |
| Ž | Č |
| G | K |
| W | B |
| δ و h | D |
| Γ | G |

فۆنیمی پەهلەوی پارتی (ž) دەگەڕێتەوە بۆ، c،Ĉ,Ĵ/ی هـ.ئە دێرین و نەبۆتە /Z/ . لە دوای دەنگی / N/ گۆڕاوە بۆ /Ĵ/. /Ĵ / بە جۆرێك بە فۆنیمی / ž/ هەژمار دەکرێت.

کۆنسنانتی /K / ی ئیَ.د و هاوسێیەتی نێوان ڤاولەکان و دوای ڤاولـەکان لـە پـارتی تۆرفـانی، بـووە بـە /g / بـەڵام /g /ی ئـیَ.د بـۆ / y/ گـۆڕاوە. هێشـووە کونسنانتی /xw/ لە پارتیدا بە شێوەی /wx/ دەردەکەوێت. بۆ ئەم دیاردەیـە وەك تێکـەڵاوی دوو زار یـا کاریگـەری پـەهـ، مـەکنزی پێیوایـە ( Mackenzie)،1967:26 /xw/ و /wx/لە پارتیدا پێکەوە نیشاندەری کۆنسنانتی ڤاول ڕۆیشتووی w بێت.

## ١-٢. گۆڕانی دەنگەکان لە زمانی کوردیدا:

دەنگـەکان لـە هـەموو زمانەکانـدا پشـکێکی زۆرتـر لـە چـاو ئاسـتەکانی تـر دەکەونە بەر لافاوی گۆڕان و گەشەکردن. زۆرتـر و زووتـریش هەسـتی پێـدەکرێت. جیاوازیی فۆنۆلۆجیش ئەم لایەنانـە دەگرێتـەوە: ژمـارەی فۆنیمـەکان و چـۆنیەتی دابەشبوونی بزوێن و نەبزوێن و بەشداربوونی فۆنیمـەکان لـە چوارچـێوەی بڕگـە و وشەدا و بوون و نەبوونی هێز و چۆنیەتی دابەشبوونی لە وشـە و ڕسـتەدا....هتد. زمانی کوردیش وەك زمانەکانی تر بـە درێـژایی مێـژوو تووشـی گـۆڕان بـووە. ئـەم گۆڕانانەش بەپێی هەندێ یاسا و دەستوور ڕوو دەدەن. ئەگەر ئەم گۆڕانانە پۆلێن بکرێن، لەوانەیە چەند جۆرێك لە گۆڕان لـە نـاو زمـانی مرۆڤـدا هەسـتی پێبکرێـت. هەندێ تایبەتی و دیاردە هەن، کە لە زۆربەی زمانـەکانی جیهانـدا بـەدی دەکـرێن. لەوانەش ئەو یاسانەی کە بۆ گۆڕانی زمانەکان دەستنیشان کراون[١] وەك:

(تواندنەوە (Assimilation)، نـەگونجان یـا دوورکەوتنـەوە(Dissimilation)، سـووان یـا قرتانـدن (Elision)، جێگـۆڕکێ (Metathesis)، دەنگـە گـۆڕکێ (Mutation)، نـەرمبوون، بەرلووتـدان، بـەر نەرمایـیدان یـا بەرمەڵاشـۆدان (Palatalization).

گۆڕانی کونسنانتەکان بە گشتی لە کوردیدا بەم شێوەی خوارەوەیە:

## ٢-١. گۆڕانی مێژوویی کۆنسنانتی (ب ، b)

هـەردوو کونسـنانتی (ب ، پ)[٢] لـە دەنگـە کۆنـەکانی زمـانی هی.ئـە.ین. کونسنانتی (ب) وێنە کۆنەکەی (bh)ی هـ.ئە.یـە. هـەردوو دەنـگ بـە هـۆی ئـەوەی سازگەی دەنگیان و هەڵوێستی دروستبوونیان لە سیستەمی ئاخاوتندا وەك یەکـە، تەنیا لە گڕی و کپی لێك جیـاوازن، بۆیـە زۆر لـە شـوێنی یـەکتر بـەکار دێـن. ئـەم

دەنگە لە کوردیدا یا نەگۆڕاوە، یاخود لە بەرامبەر زمانی پەهـ دا هەندێ شێوازی تری وەرگرتووە کە لێرەدا ئاماژەیان پێدەکەین:

٢-١.١. کونسنانتی (b)ی کوردی لە هەندێ وشەدا لە بەرامبەر (v،w)ی زمانە دێرینەکان دەوەستن، بە تایبەت ئەگەر وشەیەك لە سەرەتادا بە یەکێك لەم دوو دەنگە دەستپێبکات و دەنگی دواتر یەکێك لە ڤاولەکانی (a،ī،ē،ā) بێت. لە هەندێ وشەدا هەر وەك خۆی ماوە، وەك ئەم نموونانەی خوارەوە (اریانپور کاشانی،١٣٨٤:١٢٣)[٣]:

| کوردی | پەهلەوی | ئێرانی کۆن | هیندی دێرین | هیندو ئەورووپی |
|---|---|---|---|---|
| Bēwe<br>بێوە(بێوە ژن) | Vēag-wēw | Vithava | Vidhāva | Widhêwa |
| بەراز Beraz | Varāz | (ئاڤ)Varāz | Varāha | Weros |
| با Ba | Vat-wat | Vata-vava | Vata | Wentos |
| بارانBaran | Waran | vav | Vari-varŝa | Wer |
| باوەڕ Bāwer | Wābar | Var | Vrnōti | Weli |
| بچوك Biçuik | Vaçak(g) | Çiçu | Bhor | Bhrē |
| بەد Bed | Vat-wad | Wad | ------ | Bhoidh |
| بەرف Befr-berf | Vafr | Vaera | Vàpra | Wep |
| بەلگ Belg | Valg-warg | Vareka | ----- | Bhlē |
| بەرخ Berx | Varak-vrrag | Varmak | Vuran | Veren |
| بهار Bihār | Vahār | Vahāra | Vasar | Ves |
| بانگ Bāng | Vang | ------ | ----- | ----- |
| بازار Bāzār | Vāçār | ------ | ------ | ------ |
| بیابان Biyaban | Viyāpān | Vivāpat | ----- | ----- |

٢-١-٢. لە هەندێ وشەدا کونسنانتی (p،B)ی زمانە دێرینەکان لە کوردیدا دەسوێ و نامینێ بە تایبەت ئەگەر لە تەك فۆنیی (m) بێت. وەك ئەم نموونەی خوارەوە[٤].

| کوردی | پەهلەوی | ئێرانی کۆن | هیندی دێرین | هیندو ئەورووپی |
|---|---|---|---|---|
| Sim سم (سمیٚ دەواران) | Sumb | Sum(p-b)a | Saphas | Kapho |

## ٢-٢. گۆڕانی مێژوویی دەنگی (ج،c) [٥]:

دەنگی (C،ج) لە زمانی کوردیدا بەرامبەری (ی،y) ئێرانی دێرین دەوەستێت ئەم دەنگە مێژوویێکی کۆنی لەگەڵ دەنگی (ی،y) دا هەیە ئەگەر (Y،ی) لە سەرەتای وشە دێرینەکان هاتبێت، لە پەهـ وەك خۆی ماوە بەڵام لە کوردیدا دەنگی (C، ج) لە بەرامبەری دێت[٦] وەك ئەم نموونانەی خوارەوە (اریانپور کاشانی، ١٣٨٤:٢١٢).

| کوردی | پەهلەوی | ئێرانی کۆن | هیندی دێرین | هیندو ئەورووپی |
|---|---|---|---|---|
| cow-ce (جە، جۆو) | Yav-cawen | Yawa-yavō (ئاڤ) | Yawa | Yewos-cewo |
| cuwan (جوان) | Yuvān-cuvān | Yuvan-yūnō (ئاڤ) | Yúvan | Yuwen |
| Cavīd (جاوید) | Yāvēt | ----- | Yavaētot | ------- |
| Cām جام | Yām | (Yāma) (ئاڤ) | ------ | ----- |
| Ceger جەگەر | Yakar | Yākar | Yākrt | Yékewr |
| Cimik جمك | Yamag | Yimaka | ---- | ----- |

## ٢-٣. گۆڕانی مێژوویی دەنگی (خ،x):

٢-٣-١. دەنگی (x) یا پاشماوەی زمانە دێرینەکانە یاخود هەندێ کات (k)ی سەردەمی ناوەڕاستە (رۆدیگر اشمیث، ١٩٣٩:٥٤٤) وەك:

| کوردی | پەهلەوی | ئێرانی دێرین |
|---|---|---|
| SāX ساخ | SāK | ------ |
| Melex مەلەخ (مور و مەلەخ) | MalaK | Maəaxa |
| Sīxur سیخور | Sukur | Sukurəna ئاڤ |

٢-٣-٢. کونسـنانتی (x) هەنـدێ جـار لـە گۆڕانـەکانی دەنگـی (H، ﻫ)ێ دروست دەبێ کاتێ کە لە سەرەتای وشەدا بێت و ڤـاوڵی (u) بـە دوایـدا بێـت. لـەم کاتەدا دەنگی(H،ﻫ) دەبێ بە (x). لەم هاوکێشـەدا باشـتر روون دەکرێتـەوە(مهری باقری، ١٤٩:١٣٨٠):




| کوردی | پەهلەوی | ئاڤێستا |
|---|---|---|
| خورXur | Xōr | Hvarə |
| خورمەXurme | Holmāk | ----- |
| خونXun | Hōn | Vohuni |
| خوسرۆXusro | Husrav | Haosravah |

٢-٣-٣. لە هەندێ وشەدا هێشووە ڤاوڵی(xr) و(xl) لە ئـێ.د بـۆ سـەردەمی ناوەڕاست جێگۆڕکێ لە نێوان دەنگی (x) و (r) یـا (x) و(l) روودەدات، سـەرەڕای ئەمەش کونسنانتی(خ،x) لە کوردیدا هەر دەسوێ وەك ئەم نموونانە:

| کوردی | پەهلەوی | ئێرانی کۆن |
|---|---|---|
| سور Sur | surx | Suxra |
| تاڵ–تەحل Tāl-Tehl | Talx | Tāxl |

٢-٣-٤. هەندێ جار لە کوردیدا ئەم جێگۆڕکێیە روودەدات وەك:

| کوردی | پەهلەوی | ئێرانی کۆن |
|---|---|---|
| بەلخ (بازێر) Balx | Baxl | ----- |
| چەرخ Çerx | Çaxr | Çaxra |

٢-٣-٥. لە هەندێ وشەدا دەنگی (X،خ)ی پەه لە کوردیدا دەسوێ و نامینێ وەك ئەم نموونانەی خوارەوە(مهری باقری، ١٣٨٠:٢٣٥).

| هیندو ئەورووپی | هیندی دێرین | ئێرانی کۆن | پەهلەوی | کوردی |
|---|---|---|---|---|
| Pekw | Pêcati | Paktar-pctis | Puxtan | pātin (٧) پاتن |
| Plus | Pulsis | ------- | Paxŝag | Pēŝik پێشك |
| Daughter | Duhitar | Dugedar ئاڤ | Duxt-duxtar | Dut<br>دۆت–دۆتمام |
| Liekw | rēc | Raec | Rēxtan-rēz | Rētin-rēj<br>ڕێتن–ڕێژ |
| Kfuk | Socati | Soac ئاڤ | Soxtan-soz | Sotin-soj<br>سوتن– سوژ |

## ٢-٤. گۆڕانی مێژوویی دەنگی (د،d):

دەنگی (d) لە زمانی کوردیدا پاشماوەی دەنگی (t) هـ.ئەیە، ئەم دەنگە بە شێوەی جیا(y،d،t) دەگاتە کوردی ئێستاش بە هەندێ نموونە باسی دەکەین:

٢-٤-١. لە هەندێ وشەدا دەنگی (t) دەبێت بە (d) بەتایبەت ئەگەر (t) لە تەك دەنگی(r) بێت (مهری باقری، ١٣٨٠:١٠٧) وەك:

| ئێرانی کۆن | پەهلەوی | کوردی |
|---|---|---|
| Arta-xŝaça | Artaxŝēr | Ardeŝêr ئەردەشێر |
| Martya | Mart | Merd مەرد |
| --------- | Vat | Bed بەد |

٢-٤-٢. دەنگی (D، د)ی کوردی لە هەندێ وشەدا بەرامبەر دەنگی(Z، ز)ی پەه.ئەشکانی دەوەستێت(اریانپور کاشانی، ١٣٨٤:٢٧٦) وەك:

| ئاڤێستا | پەهلەوی.ئەشکانی | کوردی |
|---|---|---|
| Dzrd | Zird | Dil (٨) دل |
| Zrayah-zreh | zray | derya |
| Zasta | zast | dest |

٢-٤-٣. دەنگـی (D،د) بـە بەرامبـەر (d) و (dh)ی هـ.ئەیـە، لـە هەنـدێ زمانەکانی دێرین بە تایبەت ئاڤ لە بەرامبەر (z) دەوەستێ. دەبیٚ سەرنجی ئەوە بدەین کە ئەو (z)ی ئاڤ کە بەرامبەر (d)ی ئیٚ.د پاشماوەی (ĝ،hĝ)ی هـ.ئەیە کە لە ئیٚ.د بۆتە (d) و لە هەندێ زماندا بۆتە (z). مەبەستمان لەم هاوکێشەیە روونتر دەبێت (سید حسین اصف اگاه، ٢٨ ، ٢٩:١٣٨٨) **نموونە:**

**ئاڤ** **ئیٚ.د** **هـ.ئە**

**d** ⟵ **dh،Z** ⟵ **ĝ،hĝ**

| ئاڤێستا | ئێرانی کۆن | هیندو ئەوروپی |
|---|---|---|
| دەریا Zrayō | Darya | Greion |
| دوست Zaoŝ | Dauŝtar | Ĝeus |
| دەست Zasta | Dasta | Ĝhosto |

٢-٤-٤. لە هەندێ وشەی کوردیدا لە بەرامبەر زمانی پـەهـ (d،t) دەسـوێن و نامینێن وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

| کوردی | پەهلەوی | ئێرانی کۆن | هیندی دێرین | هیندو ئەوروپی |
|---|---|---|---|---|
| گون Gun | Gund | ------ | Genō | Gnoδ |
| گەنم Genim | Gan(t-d)um | Gantuma | Godhūma | Grnom |
| جوین Cuîn | coy(t-d)an | ……… | …….. | …….. |

## ٢-٥. گۆڕانی مێژوویی دەنگی (ژ.J):

٢-٥-١. هەندێ جار دەنگی (J)ی کوردی لـە هەنـدێ وشـە بەرامبـەر (Ŝ)ی ئێرانی دێرین دەوەستێت وەك ئەم نموونەیە(مهری باقری، ١٩٤:١٣٨٠).

| ئێرانی کۆن | پەهلەوی | کوردی |
|---|---|---|
| Duŝ | Duŝ | **دژ (دژوین)** Dij |

٢-٥-٢. دەنگی (ژ،j)ی کوردی هەندێ جار لە بەرامبەر دەنگەکانی (g،c،Z) زمانە دێرینەکان دەوەستێت (محسن ابوالقاسمی،١٦٩: ١٣٧٣) وەك ئەم هێڵکارییە و نموونانەی خوارەوە:

ه.ئە ← ه.د ← ئیَ.د ← پەه ← ك

g ⟶ c ⟶ g ⟶ c،z ⟶ J

| هیندو ئەورووپی | هیندی دێرین | ئێرانی کۆن | پەهلەوی | کوردی |
|---|---|---|---|---|
| Teig | Têcate | tigra | Tīz-tīc | (تیژ) Tîj |
| Delêgh | Dirghàs | Darga | Draz-drac | درێژ) Drêj) |
| Gwhen | ------ | cathra | Zahr | (ژەهر) Jehr |
| Dheigh | Dih | Uz-daeza | Diz | (دژ، نەیار) Dij |

٢-٥-٣. لە هەندێ وشەی تردا دەنگی (Ç)ی پەهلەوی و ئێرانی کۆن لە هەمبەر دەنگی (ژ،ĵ)ی کوردی دەوەستێت بۆ نموونە(فاضل عمر،٢٠٠٤:٦٠):-

| ئێرانی کۆن | پەهلەوی | کوردی |
|---|---|---|
| Paç | Paç | پێژ(پاتن) Pêĵ |
| Huçiδra | Huçihr | هژیر Hiĵīr |
| Rauçah | Rōç | رۆژ Roĵ |

## ٢-٦. گۆڕانی مێژوویی دەنگی (ز،z):

٢-٦-١. دەنگی (z)ی کوردی بەرامبەر دەنگی( g)ی ه.ئە و ه.د و (z)ی ئیَ.د و (d)ی پەه دەوەستێت وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

| هیندو ئەورووپی | هیندی دێرین | ئێرانی کۆن | پەهلەوی | کوردی |
|---|---|---|---|---|
| Gem | Gāmātar | Zāmātar | پەه Damat | (زاڤا) Zava |
| Gheimon | Hémān | ئاڤ Zāem | ئەش Damestān | Zivistan زفستان |
| Ghom | Ksam | ئاڤ Zām | ئەش Damīk | Zevī–Zevīk زەڤی |

٢-٦-٢. لە هەندێ وشەدا کونسنانتی (ز،z)ی کوردی بەرامبەر (چ،ç)ی پەهلەوی دەوەستی(مهری باقری، ١٧٤:١٣٨٤). نموونە:

| ئێرانی کۆن | پەهلەوی | کوردی |
|---|---|---|
| --------- | Sçak | سزا Siza |
| Saoçaya | Sāç | سۆز Soz |
| Vaç | āvāç | ئاواز Āwāz |
| ------- | Vāçār | بازاڕ Bāzār |

## ٢-٧. گۆڕانی میژوویی دەنگی (S):

٢-٧-١. دەنگی (S،س) لە کوردیدا لە بەرامبەر دەنگی (Z، ز)ی ئیێ.د و (h)ی ه.ئە (ارانسکی، ٥٤:١٣٨٦) و لە بەرامبەر دەنگی (Ŝ،ش) دەوەستێت (مکنزی، ٢٤١:١٣٧٩) وەك:

| هیندو ئەورووپی | هیندی دێرین | ئێرانی کۆن | پەهلەوی | کوردی |
|---|---|---|---|---|
| Bahag | bahu | Buzuś | Bāzāk | (باسك) Basik |
| Reik | Risati | ----- | Riŝtag-riŝtan | ڕێستن Rēstin |
| ----- | ---- | Druviŝta | Drust | درست Dirist |
| ------ | ----- | Taŝta | ------ | تەست Test |

## ٢-٨. گۆڕانی مێژوویی دەنگی (Ŝ، ش):

دەنگی (Ŝ) لە دەنگەکانی زمانی ه.ئە دێرینە وێنەی ئێستای ئەم دەنگە پاشماوەی زمانەکانی دێرینی ئێرانییە کە لە کوردیشدا ماوەتەوە لە هەندێ وشەدا ئەم دەنگە لە کوردیدا بەرامبەر دەنگی تر دەوەستێت کە لێرەدا چەند نموونەیێك باس دەکەین:

٢-٨-١. دەنگی(ŝ) لە هەندێ وشەی کوردیدا، لە بەرامبەر دەنگی (س،s)ی ئیێ.د دەوەستێ (بهرام فرەوشی، ٦١:١٣٥٢). وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

| هیندو ئەورووپی | هیندی دێرین | ئێرانی کۆن | پەهلەوی | کوردی |
|---|---|---|---|---|
| Ghen | Cuhoti | ------ | Šistan | Šiŝtin شۆشتن |
| Ak-hek | Asan | Asan | Asysg | Aŝ ئاش |
| Bhraz | Bhrjati | ------ | Barstan | Biraŝtin براشتن |

٢-٨-٢. هەندێ جار دەنگی (Ŝ)ی پەهـ لە هێشووە دەنگی (rŝ) ئیٚ.د هاتووە، (r)ەکە دەسوێ و تەنیا (Ŝ) دەمینێت بەلاّم لە کوردیدا (Ŝ)ەکەش دەسوێ. وەك ئەم هێلٚکارییەی خوارەوە (مهری باقری، ٢٨٩:١٣٨٠) **نموونە:**

**کوردی** **پەهـ** **ئیٚ.د**

rŝ ⟶ ŝ ⟶ Ø

| ئێرانی کۆن | پەهلەوی | کوردی |
|---|---|---|
| Tarŝna | Tiŝnak | Têni-têhnî تێنی |
| Parŝni | Pāŝnak | Pānî پانی |

## ٢-٩. گۆڕانی مێژوویی دەنگی(Ç):

٢-٩-١. دەنگی (Ç) لە کوردیدا لە بەرامبەر دەنگی (S،س) زمانە دێرینەکان دەوەستێ و لە نموونەی کەمیشدا هەندێ جار بەرامبەر(c) دەوەستێ هەر وەك ئەم نموونانەی خوارەوە (مکنزی ٢٢٣:١٣٧٩):

| هیندو ئەورووپی | هیندی دێرین | ئێرانی کۆن | پەهلەوی | کوردی |
|---|---|---|---|---|
| Rktos | Rksa | Arŝa | Xirs | Hirç هیرچ |
| Spehel | ------ | ----- | Spar | Çeper چەپەر |
| Keng | ------ | ------ | Cang | Çang (چەنگ) |

## ٢-١٠. گۆڕانی مێژوویی کۆنسنانتی (v،w)[٩]:

ئەم دوو دەنگە لە زمانی کوردیدا پاشماوەی ئەم دەنگانەن کە لە زمانەکانی هیندۆ ئێرانی بەکار هاتووە. ئەم دەنگانە بە زۆری تا ئێرانی ناوەڕاست ماون

لەمەودوا تووشـی گـۆڕان بوونـە. لـە خـوارەوەدا ئامـاژە بـە هەنـدێ لـەو گۆڕانانـە دەكەین:

٢-١٠-١. كۆنسنانتی (v،w)ی كـوردی، لـە هەنـدێ وشـەدا هەمبـەر (p،b)ی ئی.د دەوەستن، بە تایبەت ئەگەر ڤاولێكی درێژ لە پێش ئەم دەنگەوە بێـت وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا هاتووە (مهری باقری٨٧:١٣٨٠):

| هیندو ئەورووپی | هیندی دێرین | ئێرانی كۆن | پەهلەوی | كوردی |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| Temp | ------ | Tapayati | Tab-tabidan | Tav تاڤ(هەتاڤ) |
| Nêpōt | Nhāpāt | Napāt | Nab | Nevī نەڤی |
| Libh | Lipati | ------ | Farêb | Firiw فریو |
| Lōpêkos | Lopāsā | Raopi(ئاڤ) | Rōpās | Ruwi روڤی (ریڤی) |
| ----- | ------ | Apamna | Apām | Vam ڤام(قەرز) |
| ------- | ------ | ------ | Pēŝopay | Pêŝewa پێشەوا |

٢-١٠-٢. دەنگــی (v)ی كــوردی لـــە بەرامبـــەر (M) زمانـــە دێرینـــەكان دەوەستێ[١٠] وەك ئەم نموونانەی خوارەوە (اریانپور كاشانی١٣٨٤:٣٢٥):

| هیندو ئەورووپی | هیندی دێرین | ئێرانی كۆن | پەهلەوی | كوردی |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| Teuk | Tohm | Taúmā | Tom | Tov (توڤ) |
| Dumb | Dhumbhma | ئاڤ Dum | Dum-dumb | duil-Duv (دۆڤ-دویل) |
| Sēmi | Nēma | Naema | Nēm-nēmak | Nīv-nīvek (نیڤ) |
| Semmero | Sànà | Hmina(ئاڤ) | Hāmīn | Havin (هاڤین) |
| Gwā | Gāyam | Gāthu | Gām | Gav (گاڤ- پێنگاڤ) |
| Ghom | Ksam | ئاڤ Zām | Zamīk | Zevī زەڤی |

٢-١٠-٣. دەنگی (w)ی زمانی کوردی، لە هەندێ وشەدا بە زمانی ئێرانیی دێرین بەتایبەت ئەگەر دوای فۆنیمی (x) بێت ئەوە ئەم دەنگە لە کوردیدا دەسوێت و نامینێت (مکنزی١٣٧٩:١٦٤)، وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

| کوردی | پەهلەوی | ئێرانی دێرین | هیندی دێرین | هیندو ئەورووپی |
|---|---|---|---|---|
| خان Xan | Xwān-xvan | Xwandra | Svādatê | Swad |
| Xandin خواندن | Xwandan | Xvanat-xvan | Svānti | Swen |
| (خو)Xu | Xwa(t-d) | Xvatō | Swā | Sue |
| Xuiŝk خویشك | Xwahar | Xwahar-wxār | Svāsar | Swesor |

## ٢-١١. گۆڕانی مێژوویی دەنگی (ف.f)

٢-١١-١. لە هەندێ وشەدا دەنگی (f)ی کوردی لە بەرامبەر دەنگی (Ŝ)ی زمانە دێرینەکان دەوەستێ وەك:

| کوردی | پەهلەوی | ئێرانی کۆن | هیندی دێرین | هیندو ئەورووپی |
|---|---|---|---|---|
| (بالیف)Bālīf | Bāliŝ | Bāleŝt | Barhiŝ | Bhelgh |

٢-١١-٢. لە هەندێ وشەی پەهـ لە بەرامبەرەکەی بە کوردی دەنگی (F،ف) دەسوێ و نامینێت وەك ئەم نموونانەی خوارەوە (مهری باقری،١٣٨٠:١٠١):

| کوردی | پەهلەوی | ئێرانی کۆن | هیندی دێرین | هیندو ئەورووپی |
|---|---|---|---|---|
| کویس Kuis قەمبور | Kof | ------- | Kucas | Kuk |
| کوتان Kotan | Koftan-kōstan | ------ | ------ | Kàu |
| گرتن Girtin | Grftan | Grab | Grabh | Ghrebh |
| گوتن Gotin | Goftan | Gaub | Gàdati | Gwet |

### ٢-١٢. گۆڕانی مێژوویی دەنگی (ك،k):

ـ١٢ـ١. دەنگی (ك،k) لە زمانی کوردیدا پاشماوەی دەنگە هـ.ئـەی (x"،q) و ئاری کۆن (g،k)یـە بەرامبـەر (qp)و(qs)ی هـ.ئەیـە. لـە ئـیٚ.د و ئـاڤ بـە شـێوەی (xŝ)، لـە سەنسـکریتی بـە شـێوەی (ks) بـە دیـار دەکـەوێت (رودیگـر اشمیـت، ١٩٣٩:٥٤٤)

| کوردی | پەهلەوی | ئێرانی کۆن | هیندی دێرین | هیندو ئەورووپی |
|---|---|---|---|---|
| (کرین) [11] Kirrīn | Xritan | ------- | Kri-krinati | Kwrinãmi |
| (کەنین)Ken-kenīn | Xandak | ------ | Kakhati | Khakha |
| کەرKer | Xrīn | Xrī-nā | Kri | Kurei |

### ٢-١٣. گۆڕانی مێژوویی دەنگی (گ،G):

٢-١٣-١. کونسنانتی (گ،G)ی لە کوردیدا دەکریٚ لە زمانی ئیٚ.د (ڤ،V) بێت ئەگەر لە دوای ئەم کونسنانتە یەکێك لە ڤاولەکانی (e،a،i) هاتبێت لە کوردیشدا بە هەمان شێوە (گ،G) لەگەڵ ڤاولی (U)هاتووە. وەك ئەم هێڵکارییەی خوارەوە (مهری باقری، ١٣٨٠:٦٤) نموونە:

**ئێرانی دێرین**




| کوردی | پەهلەوی | ئێرانی کۆن |
|---|---|---|
| گوناه Gunāh | Vnās | ------ |
| گورگ Gurg | Gurg | ئاڤ Vəhrka |
| گومان Gumān | Gumān | (ئاڤ)Vimanah |
| گەریان Gearyān[12] | Gartītan | (ئاڤ)Varδt |
| گورز Gurz | Vazr | (ئاڤ)Vazra |

### ٢-١٤. گۆڕانی مێژوویی دەنگی هـ.h:

٢-١٤-١. دەنگی (H)ی کوردی لە بەرامبەر(خ،x)ی زمانە ئێرانییە دێرینەکان دەوەستێ، وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا دەردەکەوێت:

| کوردی | پەهلەوی | ئێرانی کۆن | هیندی دێرین | هیندو ئەورووپی |
|---|---|---|---|---|
| Hord-huîr (هورد) | Xvart-xurd | (ئاڤ)Xvareta | Krdhū | Kerdh |
| هیرچ Hirç | Xirs | Arŝa | Rksa | [١٢]Rktos |
| (هشك) Hiŝk | Xuŝk | Uŝka | Susyati | Sus |

٢-١٤-٢. دەنگی (H ،هـ) لە کوردیدا بە زۆری پاشماوەی دەنگی (s)ی هـ.ئە و هـ.د ە. هەندێ جار ئەم (s)یە بە شێوەی تەواو دێتە ناو ئێ.د و هەندێ جار ئەگەر لە تەنیشت ڤاولێك بێت دەبێتە (H،هـ). لە هەندێ وشەدا بەرامبەر دەنگی (Ŝ)ی ئێرانی دێرین دەوەستێت، وەك لەم نموونانەدا هاتووە.

| کوردی | پەهلەوی | ئێرانی کۆن | هیندی دێرین | هیندو ئەورووپی |
|---|---|---|---|---|
| هەموو Hemŭ | hamag | hama | Saha-sama | Semgh |
| Hêlan-hêŝtin هێلان | Hiŝtan | Harz | Srcati | Selg |
| (گوهـ) Guh | Gōŝ | Gauŝa | Ghōŝa | Ghous |

٢-١٤-٣. (a) و (u)ی سەرەتا لە زمانی پەهـ هەندێ جار لە کوردیدا دەبێ بە دەنگێکی نەرمی وەك (هـ) واتە (a)ی پەهلەوی لە بەرامبەر هێشووە دەنگەکانی hê،(he و ho) دەوەستێت (مهری باقری، ١٤٩:١٣٨٠) وەك ئەم نموونەی خوارەوە:

| کوردی | پەهلەوی | ئێرانی کۆن | هیندی دێرین | هیندو ئەورووپی |
|---|---|---|---|---|
| هەلۆ Helū [١٣] | Aluh | Arduthia | Rjrā | Ereg |
| هەسپ hesp | asp | Aspa | Aswas | Ekwos |
| Hestī-hêstik هێسك | Asteag-astuxān | Asti | Asthi | Osthes |
| هوندر Hondir (لە ناو) | Andar | Antar | Antār | Enter |
| هێشتر Hêŝtir | Uŝtar- Uŝtir | Uŝtra- Uŝtro | Ustra | Wes |

٢-١٤-٤. له هەندێ وشەی زمانه دێرینەکاندا کە بە هێشـووه ڤـاولی (Wa، Va) دەست پێدەکات له کوردیـدا  بەرامبەرەکـەی دەنگـی (Hê،هـێ) دەوەسـتێت وەك ئەم نموونەیە(١٤):

| کوردی | پەهلەوی | ئێرانی دێرین | هیندی دێرین | هیندوئەورووپی |
|---|---|---|---|---|
| هێستر Hêstir | Wastar | Vastra | Vàste | Westis |

٢-١٤-٥. له فۆنۆلۆجی زمانەکانی ئێ.د دەنگێك هەبووە کە لـە سـەردەمی نوێدا نەماوە، ئەویش دەنگی (δ،ث)یە (محسن ابوالقاسمی١٣٨٧:٥). گۆڕانی ئـەم دەنگە لە سەردەمی دێـرین بـۆ ناوەڕاسـت لـە کـۆی دەنگـەکان دەرچـووە و بۆتـە دەنگـی تـر. ئـەم دەنگـە کـە درکانـدنی وەك دەنگـە لێکـدراوی (th) ئینگلیزییـە، هەرچەندە کە لە ئالفا بێی کوردی هیچی بـۆ دانـەنراوە، بـەڵام بـۆ روونکردنـەوەی مەبەستمان لێـرەدا (ث)مـان بـەکار هێنـا. دەنگـی (δ،ث) پاشمـاوەی دەنگـەکانی (th)و (t)و(k)ی هـ.ئەیە کە لـە زمانـە دێرینـەکانی ئێراندا بـە فـۆڕم و وێنـەی جیـا دەرکەوتووە. لە هەندێ وشەدا ئەم دەنگە بە تایبەت لـە ئاڤێسـتادا لـە سـەردەمی ناوەڕاست بۆتە (h) و ئەم (h)یەش یا له کوردیدا  نەماوە یا لە هەنـدێ شـێوەزاردا دەردەکەوێت وەك:

| کوردی | پەهلەوی | ئاڤێستا |
|---|---|---|
| Pān(١٥) | Pahan | Paδana |
| Rê | Rāh | Rāδa |

٢-١٤-٦. یا لە پەهلەویدا دەنگی (h) نـەماوە و لـە کوردیـدا دەردەکەوێتـەوە وەك:

| کوردی | پەهلەوی | ئاڤێستا |
|---|---|---|
| Nīgāh | Nikās | Nikāδa |
| Gewah | Gukās | Vikaδa |

٢-١٤-٧. یاخود لە پەهلەوی و کوردیدا ئەم (h)یە ماوە وەك:

| کوردی | پەهلەوی | ئاڤێستا |
|---|---|---|
| Deh | Dah | Daδa |

### ٢-١٥. گۆڕانی مێژوویی دەنگی (ی،y):

لە هەندێ وشەی پەهلەویدا دەنگی (t) بە کوردی لـە بەرامبەریـدا (y،ī) دێت وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

| کوردی | پەهلەوی | ئێرانی کۆن |
|---|---|---|
| پاییز Pāīz | Pātēz | Patidaiza |
| پەیکەر Peyker | Patkar | Pati-kara |
| پەیمان Peyman | Patmān | ----- |
| بەیان Beyan | Patdān | Paiti-dāna |
| پەیام Peyam | Patigāma | Paytām |

### تەوژمی زمانە دێرینەکان لە سەر زمانی کوردیی ئێستا:

بۆ دیارکردنی تەمەنی دەنگ، پێویستە پشکێنەر شوێنەواری ئەو دەنگە هەڵ بکـات تـا وەك دەچـێتە سـەر بنەڕەتەکـەی. بـۆ وێنـە، دەنگـی نـاو (گات)ەکـانی ئاڤێستا لە کاتی نووسینەوەی ئاڤێستای دواییناوە، دەنگ یا کۆمەڵە دەنگی وەها هاتۆتە ناوەوەی کە لـە وشـەی گاتاکانـدا نـەبووە. بێگومـان تەمـەنی درێـژی ئـەو دەنگە، بۆ درێژی تەمـەنی ئاڤێسـتای دوایـین دەگەڕێتـەوە. بـۆ نموونـە ئەگـەر لـە ئاڤێستای دواییندا وشەی (مەشیە maŝya) هاتبێت، لە کاتێکدا لـە گاتاکانـدا هـەر هەمان وشە بە (مەرتیە martya) هاتبێت، ئەو کات بۆمان دەردەکەوێت کە دەنگی (ش،ŝ)، جێگای کۆمەڵە دەنگی (rt)ی گرتووە و تەمەنیشی (تەمـەنی ئـاڵوگۆڕ) بـۆ تەمەنی ئاڤێستای دوایین دەگەڕێتەوە. یا قەدی (مە،ma) کە لە ئێستادا لە وشەی (مەزن mazin) و(مەرد mard) لە کوردیدا هەن، تەمـەنێکی دوور و درێـژیان هەیـە، بەڵای کەمی بۆ دەمی گاتەکان دەگەڕێتەوە (سۆکۆلۆف ١٩٨٨:١٣).

هەرچەندە کە گۆڕانی دەنگی زمانەکان زۆربـەی کـات بـەپێی هەنـدێ یاسـا و ڕێسای تایبەت بە هەر زمانێك ئەنجام دەدرێت، بەڵام دەبێ تێبینیـی ئـەوە بکـەین کە، ئەم یاسایانە گشـتگیر نـین و هەمیشـە هەنـدێ ناوێزەیـان تێدەکـەوێت. بـەڵام ئەوەندەیە یاساکانی هاتوو زۆربەی لە خۆ دەگرێت. واتە یاسـاکانی پەیوەسـت بـە گۆڕانی دەنگی هەر زمان، وەکو یاساکانی بیرکاری تەواو و بێ کەم و کوڕی نین.

**ئاکاری کۆنسنانتی زمانە دێرینەکان لە سەر زمانی کوردی:**

هەرچی تایبەتە بە کوردی، ئەوە گشت ڤاولەکانی زمانی ئیٚ.د لە زمانی کوردیدا هەن. ئەوە نەبێت کە، هەندێکیان تەنیا لە رێنووسدا جێیان بۆ نەکراوە، ئەگینا لە شێوەزارەکاندا هەن. بۆ نموونە دەنگی (ث،$\delta$)ی ئاڤ و ئیٚ.د کە لە سەدەکانی کۆتایی ناوەند لە ناو کۆمەڵی دەنگەکان سواوە و نەما، هەروەها دەنگی (ذ،$\theta$) کە ئەویش لە ناو زمانانی دێرین هەبووە، بەلاّم لە ناو چووە و نەماوە ٍ کە دەڵێین نەماوە مەبەست ئەوەیە کە لە رێنووسدا هێمای بۆ دانەنراوە، بەلاّم لە درکاندندا هەستی پێدەکرێت و ماوە. هەروەك کوردی ئێستا کە دەنگی (ص،ط) هەن، بەلاّم ئەلەفۆنی دەنگی ترن وەك فۆنیمی سەربەخۆ سەیر نەکراون. راستە کە ئەمانە نابنە هۆی گۆڕانی واتا، بۆیە بە فۆنیم هەژمار نەکراون، بەلاّم لە شێوەزارەکاندا دەکرێ هەندێ جار ببنە هۆی گۆڕانی واتاییش (ارانسکی١٣٨٦:١٢٨)، بۆ نموونە (ك،"k)یە کە لە کرمانجی سەروودا (ك،)یەکی مەلاّشوویییە و لە دەنگ جیاوازە و دەبێتە هۆی جیاوازی واتایی. یاخود دەنگی (ت) و (ط)، کە هەم لە دەنگە و هەم لە جیاکردنەوەی واتاش رۆڵیان هەیە (قەناتی کوردۆ، ١٩٦٠:٧). یاخود هەبوونی هەردوو دەنگی (ث،ذ) لە هەورامیدا و هەبوونی دیفتۆنگی (نگ،ŋ) لە زمانی لوڕیدا. هەرچی تایبەتە بە زمانی پەهلەوی کۆنسنانتەکانی ($\gamma$و$\int$) تایبەت بوون بە پەهلەوی ئەشکانی. لە ئاڤێستادا (wx) لە شوێنی (hw) ئیٚ.د هاتووە. لە فارسی ناوەڕاستدا جگە لەم دەنگانەی سەرەوە، دەنگی (xw) کە بە شێوەی (xv)، (xu)یش دەنووسران هەبوون. (xw) پاشماوەی (xw) ئاڤێستایە. لە شوێنی (xw) ئاڤێستایی لە پەهلەوی ئەشکانی (wx) هاتووە کە پێدەچیت (ux) درکێندرابێت (محسن ابوالقاسمی١٣٨٧:٤١).

گۆڕانی کۆنسنانتی کوردی لەگەڵ کۆنسنانتی پەهلەوی و ئێرانی دێرین لەم خشتەیەدا روون کراوەتەوە (0swald j.l szemerenyi,1999:55-63):

| ش | ا.ب | یە | ك |
|---|---|---|---|
| ١ | P | b،P | b،w،v،P |
| ٢ | B | w،B | p،w،v،Ø،B |
| ٣ | T | d،T | Ø،I،y،d،T |

| | | | |
|---|---|---|---|
| Ø،z،D | δ،D | D | ٤ |
| Ø،g،K | g،K | K | ٥ |
| w،Ui | xw،x ا.م<br>wx،ux یە.ا | X | ٦ |
| Ø،x،H | h | H | ٧ |
| go،p،b،g،w،V | v | V | ٨ |
| h،S | s،Yا.م<br>δ،s،t،Hیە.ا | Δ | ٩ |
| s،Ĵ،Z | zیە.ا | Z | ١٠ |
| k،G | y،G | G | ١١ |
| Ĵ،z،c،Č | ĉ،z ا.م | Č | ١٢ |
| Ø،v،w،F | f | F | ١٣ |
| s،H | s،H | Θ | ١٤ |
| ،ŝ،h،ĉ S | s | S | ١٥ |
| Ŝ،Ĵ،f،h،S | Ŝ | Ŝ | ١٦ |
| Ø،h،k،X | x | X | ١٧ |
| Č،C | Ĵ،z،C | C | ١٨ |
| Γ | γ | Γ | ١٩ |
| k،v،M | m | M | ٢٠ |
| N | n | N | ٢١ |
| R | r | R | ٢٢ |
| Ø،hê،p،b،m،W | w | W | ٢٣ |
| c،Y | yپە.ا<br>c،y ا.م | Y | ٢٤ |

**ئاکاری هێشووە کۆنسنانتی زمانە دێرینەکان لە سەر زمانی کوردی:**

هەندێ فۆنیم بە درێژایی مێژوو تووشی گۆڕان و گەشـەکردن بوونـە. هەنـدێ جار دوو فۆنیمی لێکدراو لەتەك یـەك بـە یـەك فـۆنیم لـە قەڵـەم دەدرێـن. ئـەم دوو فۆنیمە لێکدراوەش تووشی گۆڕان بوونە. ئەم دوو فۆنیمەی کە لـە تـەك یەکـدان و بەیەك فۆنیم سـەیر دەکرێن، بـە هێشـووە دەنـگ یـا هێشـووە ڤـاول یـا هێشـووە کونسنانت ناو دەبرێن. ئەوەی کە لە کوردیدا مابێتەوە هێشووە ڤاوڵی (uiیا ǘ) کە لە بادینان و فەیلیدا ماوە. هەمیشە دیفتۆنگەکان زووتر و ئاسـانتر تووشـی گـۆڕان دەبن بۆیە ئێستا هەست دەکرێت کە لە زاری شاریدا ئـەم دیفتۆنگـە چ لـە بادینـان یاخود لە ناو فەیلییەکان تووشی گۆڕان بووە و بـە(ی،ī) دەدرکێنـدرێت. جگـە لـە مـەش دیفتـۆنگی (ŋ) کـە لـە زاری لوڕیـدا هەیـەو پاشمـاوەی دەنگـە دێرینـەکانی ئێرانییە. ئەوەی کە تایبەت بێت بە زمانی کوردی و تەوژمی هێشـووە دەنگـەکانی دێــرین بــە ســەریەوە، لــەم خشــتەیەدا روون کراوەتــەوە (رودیگــر اشمیــث، ١٩٣٩:١٧٠– محسن ابوالقاسمی، ١٣٨٧:٤٢).

| کوردی | پەهلەوی | ئێرانی دێرین |
| --- | --- | --- |
| r،S | Hr | θR |
| d،z | z | Dz |
| H | S | Ts |
| D | b | Dv |
| Ø،h | F | θV |
| ŝ | ŝ | Xŝ |
| ŝ | ŝ | Fŝ |
| ،ŝØ | ŝ | Rŝ |
| xu،X | x | Xw |
| جێگورکێیl ، x)،(r) | جێگورکێی x ،r | Xr |
| m،Nb | nb | Mb |

**خشتەی ژمارە (٢)**

لە کۆتاییدا ماوە ئەوە بڵێین کە، سەرەڕای ئەو هەموو گوڕان و گەشەسەندنی کۆمەلایەتی و رۆشنبیری و رامیاری و ئابووری و لەناوچوونی ئەو هەموو کلتوور و هەڵسوکەتی سەردەمانی کۆن تا ئێستا، زمانی کوردی هەندی تایبەتی و رەچەلەکی زمانی دێرینی خۆی لە رووی دەنگ و سیما و روخسارەکانی دەنگی تاڕادەییێکی باش پاراستووە. هەروەك چۆن لە چوارچێوەی ئەم کورتە باسەدا دەردەکەوێت، هەندێ لە دەنگەکان هەروەك خۆیان لە چوارچێوەی پێکهاتەی وشەدا ماون و هەندێکی تریش گۆڕانیان بە سەردا هاتووە و بۆ دەنگی تر گۆڕاون.

**ئه نجام:**

له‌م لێكۆڵینه‌وه‌یه‌دا ده‌گه‌ینه‌ چه‌ند ئه‌نجامێك له‌وانه‌ش:

١. له‌ به‌راوردكردنی كۆنسنانتی كوردی له‌گه‌ڵ زمانه‌ دێرینه‌كان، كونسنانتی (هـ.h) زۆرتر له‌ هه‌موو كۆنسنانتی تر جێگره‌وه‌ی ده‌نگه‌ دێرینه‌كان بووه‌. ئه‌م ده‌نگه‌ به‌ هۆی سروشتی پێكهاته‌ی و نه‌رمی له‌ دركاندندا بۆته‌ ده‌نگێكی ره‌سه‌ن له‌ زمانی كوردیدا. جگه‌ له‌مه‌ش ئه‌م كونسنانته‌ له‌ زمانه‌ دێرینه‌كان به‌ تایبه‌تی له‌ هیندی دێرین زۆر به‌كار هاتووه‌ له‌ چاو كۆنسنانتی تر، ده‌كرێ لێكدانه‌وه‌یه‌كی فه‌لسه‌فی بۆ ئه‌م ده‌نگه‌ بكرێت به‌ هۆی ئه‌وه‌ی چه‌مكی وجود (كینونه‌) هه‌ڵده‌گرێت. جگه‌ له‌مه‌ش دروستكه‌ری چه‌مكی رووداني كاره‌ له‌ زمانه‌كانی ئێرانی دێرین نیشانه‌ی بۆ كاره‌كان (ah)یه‌ له‌ ئێرانی دێریندا. هه‌ربۆیه‌ش ده‌بینین له‌ زمانی كوردیدا جێگره‌وه‌ی فۆنیمه‌كانی (س، ش، ك، خ، ر، ئـا، و، ث، ڤ، Ø)یه‌. جگه‌ له‌مه‌ش ئێستاش له‌ كوردیدا له‌ شوێنی ده‌نگه‌كانی (ئ، ع) زۆر به‌كار دێت.

٢. زۆر له‌ وشه‌ كوردییه‌كان به‌ به‌راورد له‌گه‌ڵ هیندوئه‌وروپی دێرین یاخود سه‌نسكریتی یا ئێرانی دێرین، وه‌ك یه‌كن، یا جێگۆڕكێ له‌ ده‌نگه‌كان كراوه‌ یا وشه‌ی وا هه‌یه‌ كه‌ كوردییه‌كه‌ی له‌ وشه‌ ره‌سه‌نه‌ هیندو ئه‌وروپییه‌كه‌ی نیزیكتره‌ له‌ په‌هله‌وییه‌كه‌. هه‌ندێ جاریش له‌ هه‌ندێ وشه‌ ده‌بینین كه‌ وشه‌كه‌ له‌ رووی ده‌نگییه‌وه‌ شێوه‌ دێرینه‌كه‌ی ماوه‌ به‌ڵام له‌ رووی واتاییه‌وه‌ جیاوازه‌ و به‌ درێژایی مێژوو واتا كۆنه‌كه‌ی له‌ ده‌ست داوه‌ و واتایێكی نوێی په‌یدا كردووه‌.

٣. ئه‌م گۆڕانه‌ ده‌نگییانه‌ ئه‌وه‌مان بۆ ده‌رده‌خات كه‌ ئێستاش له‌ زاره‌ كوردییه‌كاندا به‌رده‌وامی به‌م ره‌وته‌ مێژووییه‌ ده‌درێت. بۆ نموونه‌ له‌ هه‌ندێ زاره‌كان (ڤ) شوێنی (ب) ده‌گرێته‌وه‌، یاخود ده‌نگی (ث) و هه‌ندێ ده‌نگی هاوشێوه‌ هێشتا له‌ زاره‌ كوردییه‌كاندا ماون.

٤. تێبینیی ئه‌وه‌ ده‌كرێت كه‌ ئاكاری كۆنسنانتی زمانه‌ دێرینه‌كان له‌ كرمانجی سه‌روودا زۆرتر خۆی پاراستبێت له‌ گۆڕینی وشه‌كاندا.

**سەرچاوەکان بە کوردی:**

١- تالب حوسێن عەلی، فۆنۆلۆجی کوردی و دیاردەی ئاسانبوونی فۆنیمەکان لە زاری سلێمانیدا، نامەی ماستەر- ١٩٨٩، زانکۆی سەلاحەددین.
٢- س ن سۆکۆلۆف، زمانی ئاڤێستا وەرگێڕانی محەمەد ئەمین هەورامی- ١٩٨٨، دار الحریة.
٣- عادل رەشید قادر، فۆنۆلۆجی زمانی کوردی- کرمانجیی سەروو، نامەی دکتۆرا- ٢٠٠٨، زانکۆی سلێمانی.
٤- فاضل عمر، ئاورەك ل زمانێ کوردی- ٢٠٠٤، سپیرێز.
٥- فیردریش مۆلێر+ ئەلبێرت سوسێن+ هۆگۆ مەکاس، زمانی کوردان، چەند لێکۆڵینەوەیەکی فیلۆلۆجی زمان- وەرگێڕانی حمید عزیز- ٢٠٠٦، کۆڕی زانیاری کورد.
٦- هۆرتوم+ شیندلەر، گەنجینەی وشەی زمانی کوردی- وەرگێڕانی حمید عزیز- ٢٠٠٨، موکریانی.
7- Qenatê kurdo، ، Gramatîka zimanê Kurdî- 1960، Êrîvan.

**سەرچاوەکان بە فارسی:**

٨- بهرام فرەوشی، فرهنگ فارسی به پهلوی- ١٣٥٢، انتشارات انجمن اثار ملی.
٩- دیوید نیل مکنزی، فرهنگ کوچك زبان پهلوی، ترجمه مهشید میر فخرایی، چاپ دوم- ١٣٧٩ هـ.ش پژوهشگاه علوم انسانی و مطالعات فرهنگی
١٠-محمد حسن دوست، فرهنگ ریشه شناختی زبان فارسی، جلد اول-١٣٨٣،نشر أثار- تهران.
١١- منوچهر أریانپور کاشانی، فرهنگ ریشەهای هندواروپایی زبان فارسی- ١٣٨٤هـ.ش انتشارات جهاد دانشگاهی.
١٢- ارانسکی، یوسیف میخائیلوویچ، ،زبانهای ایرانی، ترجمه علی اشرف صادق، چاپ دوم- ١٣٨٦، انتشارات سخن.
١٣- ـــــــــ، مقدمه فقه‌اللغه ایرانی، چاپ دوم – ١٣٧٩، انتشارات پیام.
١٤- رودیگر اشمیث، راهنمای زبانهای ابرانی(١٩٣٩)، ترجمه فارسی، زیر نظر حسن رضایی باغ بیدی، جلد اول- ١٣٨٢، انتشارات ققنوس.
١٥- محسن ابوالقاسمی، دستور تاریخی- مختصر زبان فارسی، چاپ ششم- ١٣٨٧، سازمان مطالعه و تدوین کتب علوم انسانی دانشگاەها(سمت).

١٦- مهری باقری، واجشناسی تاریخی زبان فارسی- ١٣٨٠، نشر قطره.
١٧- سیدحسین آصف آگاه؛ پهلوانی نامگ، آموزش خط و زبان پهلوی (اشکانی، ساسانی) نشر مجمع الذخائر الاسلامیه، ١٣٨٨:

**ENGLISH REFERENCES**

18- Mackenzie، notes on the transcription of Pahlavi- 1967، In bulletin of school of oriental & African studies،xxx،pt.7.
19- Oswald J. L. Szemerényi، Introduction to Indo-European linguistics، 4th edition-1990، Oxford university press.

**Internet saits:**

20- hptt.www.artarena.force.co.uk/parthlit.htm
21- hptt.www.Persianlanguage.ir
22- hptt.www.linguist 87 blogfa .com
23- Hptt: linguistica . com

**پەراوێزەكان:**

(١) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە (محمد معروف، 1987:96- بیرنارد كمری، 47:1939 - رحمان اسماعیل، 1991: 98)

(٢) ئەم دوو دەنگە لە زمانی كوردیدا زۆر لە شوێنی یەكتر بە كار دێن بە تایبەت ئەگەر ئەم دەنگانە لە دوای ڤاولێك بێن، بۆ نموونە ئەسپ و ئەسب– ئاشوب و ئاشوپ پاپەك و بابەك، بار پار(بەش)....هتد. ئەم دیاردەیە لە زمانی ئێرانی دێرین بە تایبەت لە ئاڤێستا بۆ زمانەكانی ئێرانی ناوەڕاستیش ڕۆیشتووە بۆ نموونە:

ئاڤێستا: ap ئاڤ apaxtara باختەر apərənāyu ڤرنی xŝap شەڤ apē بێ

ئێرانی ناوەڕاست: ab bāxtar bornā ŝab bī

(٣) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە (مهری باقری، ١٣٨٠: ٨٧– فاضل عمر، ٢٠٠٤: ٥٧).

(٤) كەوتنی (b)ی تەنیشت (m) پێشبینی كراوە وەك (سمبێل–سمبورە – تەمبەڵ) دەكرێ وەك (سمێل– سمۆرە– تەمەڵ) دەربڕێت ناسینەوەی (b) لە تەك (m) لە مێشكدایە و ئەمەش بە زانستی ئاوەزی (Sycological reality) ناسراوە(بڕوانە عادل رشید،٢٠٠٨:٩٥).

(٥) كاتی تەواو و دیاری گۆڕانی ئەم دەنگە لە سەرەتای وشەكان دیار نییە، لەوانەیە وشەكانی چاوگی(y)یی بە پاراستنی ئەم دەنگەی سەرەتا گەیشتبێتە سەردەمی ناوەڕاست و لە هەموو سەردەمی ئەشكانییەكان (y)ی سەرەتا بێ گۆڕان وەك خۆی ماوە. لە كۆتایی سەردەمی ناوەڕاست گۆڕانی بۆ (c) دەستی پێكردووە، لەبەر ئەوەی ئەو وشانەی كە وێنەی سەردەمی دێرین بە(y) دەستیان پێكردبێت و لە سەردەمی ناوەڕاست بە هێواشی كەوتوونەتە ناو زمانی ئەرمەنی هەندێكیان بە شێوەی (c) و هەندێكیان وەكو (y)ماون، بەڵگەیەكی تر لە دیار نەبوونی ئەم گۆڕانە تایبەتییەكانی ڕێنووسی ئێرانی ناوەڕاست(پەهلەوی)یە، لە بەرئەوەی ڕێنووسێكی چەنددەنگی(Poly phonic) بووە و بۆ نووسینی (c) و(y) لە یەك هێما كەلكیان وەرگرتووە.بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە (مهری باقری ٥٨:١٣٨٠).

(٦) وشەكانی كە دەنگی (y) لە سەرەتا بێ و گۆڕانیان بە سەردا نەهاتبێت، زۆربەی ناوە تایبەتییەكانن یا هەندێ بەها ئایینی و لایەنی تقدیسین كە بۆتە هۆی ئەوەی شێوە دێرینەكەیان وەك خۆی بمێنێت، وەك یۆنان، یوسف، یەزدان، یەشت.....هتد.

(٧) لە كرمانجی سەروودا پێشتر شوێنی (خ)ی دێرین بە (ه) پڕكراوەتەوە بۆ نموونە لە شوێنی پاتن، ڕێتن، سوتن،تاڵ (پەهتن، ڕێهتن، سوهتن، تەهل) هەبووە و ئێستا بەرەو نەمان ڕۆیشتووە.

(٨) هەڵبەت لە هەندێ وشەدا ئاڤێستایی بە (ز) دەستپێدەکات و لە پەهلەوی دەبێ بە (د) لە کوردییەکەدا دەگەڕێتەوە سەر (ز). بڕوانە(٢–٦).

(٩) لێرەدا مەبەست ئەوە نییە کە هەردووکیان لە کوردیدا یەك دەنگن بەڵکو لە زمانە دێرینەکانی ئێراندا بە یەك فۆنیم سەیر کراون، لە گۆڕانی دەنگیشدا یەك شێوە هەڵسوکەوتیان کردووە بۆیە لێرەدا بە پێویستم نەزانی لێك جیا بکرێنەوە.

(١٠) (ڤ)ی کوردی ئێستاش لە بەرامبەر (م)ی فارسی لە زۆر وشەدا دەوەستێ (حمید عزیز،٢٠٠٥:٧٤)وەك:

کوردی: زیڤ گاڤ نیڤ سلاڤ ناڤ

فارسی: سیم گام نیم سلام نام

(١١) هەروەك لەم وشانەدا دەردەکەوێت تەنیا لە پەهلەوی دەنگی (k) بۆتە (x) ئەگینا کوردیش ئەم دەنگەی باشتر لە پەهلەوی پاراستووە.

(١٢) بەپێی ئەم یاسایە بوایە دەبوایە ئەم وشەیە بە شێوەی (Guryan) لە کوردیدا دەرکەوتبوایە، دەکرێ لە سەردەمێك بەم شێوەیە بێت دواتر ڤاولی (u) شوێنی لەگەڵ (e) گۆڕیبێت.

(١٣) لەم وشەیەشدا جێگۆڕکێ بە (k) و (r) کراوە واتە (kr)بووە و بۆتە (xr) و لەکوردیشدا بۆتە (hr).

(١٤) وا هەست دەکرێت کە یاسای جێگۆڕکێ یا قلب بەسەری داهاتبێت لە بەر ئەوەی تەنیا دەنگی (ه) لە کۆتایی وشەی پەهلەویدا هاتۆتە سەرەتای وشەی کوردی بەڵام ناکرێت وا بیر بکەینەوە کە لە وشەکانی تریشدا هەمان یاسا چەسپێنراوە لە بەر ئەوەی لە وشە کۆنەکانی زمانانی پێش پەهلەویش دەنگی (ه) نەبێت.

(١٥) لێرەدا وا دەردەکەوێت کە بە هۆی هاتنی دەنگی (h) کە دەنگێکی لاوازە لە تەك ڤاولی (a) دەنگی (h) تووشی توانەوە (assimilation ) بووە و ڤاولی(ā)ی درێژ جێی گرتووە. هەرچەندە کە لە هەندێ شێوەزاری وەك باکوری رۆژئاوا دەنگی (h) بە هۆی مەلاشۆ قەڵەو دەکرێت و ئەم وشەیە دەبێتە (پەحن).

**ملخص البحث:**

هذه الدراسة محاولة لتوضيح وتشخيص بعض الجوانب المخفية لفونولوجيا اللغة الكوردية، المسار التأريخي والتحويل الصوتي لخمسة عشر صوامت عبر اللغات القديمة وحتى العصر الحاضر. والدراسة تلقي الضوء على التغيرات التى تحصل على كل صامت بمرور الزمن. بناء على ذلك يمكن اعتبار الدراسة تأريخية ئيتمولوجية لتوضيح وتفسير التغيرات التى تطرأ على هذه الصوامت حسب المراحل الزمنية التى مرت بها. تقع الدراسة في محورين وكل محور يضم بعض التحليلات على الصوامت . ففي المحور الأول من الناحية النظرية يحلل التغيرات التى وقعت على هذه الصوامت في اللغات الايرانية القديمة الى الوسيطة وبعدها من اللغات الايرانية الوسيطة الى اللغة الكوردية الحالية وكيفية تغيرها.

والمحور الثاني تحلل الصوامت (١٥) الخمسة عشر التي وقعت عليها التغيرات حسب الزمن ويبين الشكل والاسلوب التي تظهر في اللغات القديمة وحتى يومنا الحاضر بأمثلة توضيحية ويبين الاسباب والمراحل التي مرت بها تغيرات هذه الصوامت وتختتم البحث بعض النتائج التي توصلت اليها الدراسة.

## Abstract

This study is an attempt to clarify and diagnosis some hidden aspects of Kurdish language phonology, historic track and conversion of fifteen consonant across ancient languages to the present era. The study sheds light on the changes that happen to the consonants witnh passage of time. Therefore، the study can be considered a historic Etymologic to clarify and interpret the changes in these consonants through time. The study is in two axes and each axis includes some analysis the changes on the consonants in the first axis theoretically analyzes the changes that took place on these consonants in the ancient Iranian language to intermediate and then languages of Iranian Kurdish language middleware to present and how they underwent these changes.

The second axis is the decomposition of fifteen consonants signed by changes according to time and shows the shape and style، which appear in the ancient languages to the present day with illustrative examples and shows the causes and the stages through which changes in these consonants happened.

study end with a number of concluding points and references.

# زمان و زمانزانی و
# بەکارهێنانی کارکردەیی زمان (پراگماتیك)
# لە بەرهەمەکانی سەلامدا

د. هۆگر مەحموود فەرەج
بەشی کوردی – کۆلێژی زمان – زانکۆی سلێمانی

## پێشەکی:

ئاشکرایە، کە شێخ سەلامی شاعیر کەسێکی زمانزانی زمانپاراوی نەتەوەیی بووە، بۆیە هەر هەنگاوێک و هەر کارێک و هەر نووسینێکی هەبووبێت، ڕەنگدانەوەی ئەو لایەنانە بوون. نەک هەر ئەوەش، بەڵکو دەکرێت بڵێین کە نەتەوەییبوونی ئەو هاندەر و پاڵنەری هەڵوێستەکانی بوون، ئەمەش وایکردووە، کە ئەدەب بکاتە هۆکاری گەیاندنی پەیامەکانی.

جا سەلام خۆی کە زمانزان بووە و زمانیشی بە کۆڵەکەی یەکەمی بوونی نەتەوەکەی زانیوە، بۆیە هەوڵیداوە نووسین و هۆنراوەکانی بە زمانێکی پاراو پێشکەش بکات، هەروەک چۆن پەخشانی هونەریشی هەر بەو شێوەیە بەرهەمهێناوە. هاوکات زمانزانی و فراوانیی فەرهەنگی ئاوەزیی سەلام وایکردووە، کە بەکارهێنێکی بەتوانای زمانی کوردی بێت، بەشێوەیەک کە بەکارهێنانی کارکردەیی زمان لای سەلام بە چەشنێکی وایە گۆواییبن بۆ بەئاگایی ئەو لە کەلتووری کورد و تەنانەت لە مێژوو و هەلومەرجی ڕامیاریی ئەو دەمەی سەدەی بیست. دیارە ڕەچاوکردنی کارکردەیی زمان لە زۆر باردا بەتایبەت لە بەرهەمی ئەدەبیدا، لە بیرکردنەوەی وردەوە سەرچاوە دەگرێت، هەر بە بیرکردنەوەی وردیش بەرهەمی ئەدەبیی باڵا دەڕسکێت، نەک بە گوزارشتکردنی ڕاستەوڕاست لە خواست و مەبەستەکانی قسەکەر و نووسەر. هەر ئەمانەش هاندەربوون بۆ ئەم لێکۆڵینە، کە لەیەک بەشداو بەسێ پار، کە دووانیان کورت و دیاریکراون، ئەو لایەنانە بخرێنە ڕوو، کە بریتین لە یەکەم:

زمان و زمانزانیی سەلام، پاری دووەم: پەخشانی هونەری، نیشانەیەکی باڵای زمانزانی و فەرهەنگفراوانیی سەلام، پاری سێیەم: بەکارهێنانی کارکردەیی زمان (پراگماتیــــك) لە شــــیعرەکانی ســــەلامدا. لێکــــۆڵینەکە بە پێشــــەکییەک دەستپێدەکات، لە کۆتاییشدا چەند ئەنجامێک پێشکەش دەکرێن و دواتر ســەرچاوەکان و کــورتەی لێکــۆڵینەکە بە زمانەکــانی عەرەبــی و ئینگلیــزی دەخرێنەڕوو.

## پاری یەکەم
## زمان و زمانزانیی سەلام:

دیارە سەلام، کەسێکی نەتەوەیی بووە، ئەوەی زانیوە، کە زمان پایەی یەکەمی مانەوەی هەر نەتەوەیەکە، هەربۆیە وتوویەتی:

موحەقەقەمە کە ڕۆحم دێتەوە بەر
بە کوردی دای بدەن تەلقین و یاسین[1]

هۆی ئەوەشە خۆشەویستیی زمان و نەتەوە بە شیعرەکانییەوە دیارن، بێگومان هەر بەرهەمێکی ئەدەبی، لەباری ئاساییدا، بە زمانی ئەفرێنەی بەرهەمەکە دەبێت، کە زمانی یەکەم یاخود زمانی زگماکی کەسەکەیە. جا شێخ، کە خۆی کوردە و کوردییش زمانییەتی، ئەوا دەبێت ئەو زمانەی کە بەرهەمەکانی پێ نووسیون، سەر بە یەکێک لە زارەکانی ئەو زمانە بێت. لێرەدا جێگەی خۆیەتی، گەر بڵێین ئەو زارەی زمانی کوردی و بەتایبەت یەکێک لە گۆڤەرەکانی، کە پێش هاتنە ژیانی سەلام بە پتر لە نیو سەدە، ڕێچکەی بوونە ستانداردی گرتبوو، سەلامیش کە ڕۆڵەی ئەو ناوچەیە بوو، یاخود ڕاستتر بڵێین، کە هەر لە زووەوە هاتبووە شاری سلێمانی، بۆیە دەبینین هۆنراوەکانی بەو گۆڤەرە ڕێچکە گرتووەی ستانداردی کوردی بوون.

لەگەڵ ئەوەشدا لێرەو لەوێ لەناو هۆنراوەکانیدا، هێندێک بەکارهێنانی ناوچەی وارماوا، بەتایبەت مەڵبەندی لەدایکبوونەکەی، کە عازەبانە و هەر ئەوەش دەکرێت بە زمانی زگماکی دابنرێت، دەبینرێت. جا لەبەرئەوەی کە سەلام پێیوابووە یاخود ئەوەی بەڕاست زانیوە، کە دەبێت لە زمانی ناوچەیی

خۆ بپارێزێت، بۆیە بەزۆری گۆڤەری سلێمانی ڕەچاو کراوە و ئەو کەم تازۆرە نەبێت، بەکارهێنانە ناوچەییەکە نابینرێت. هەر بۆ نموونە لە سلێمانیدا مۆرفیمی (ەوە) لەکاردایە و پێڕەوبەندە و لە زۆر ناوچەی تری کوردستاندا، کە بڕوایان بە بەستانداردبوونی ئەم گۆڤەرە هەیە، بەکاردێت. بۆنموونە چاوگی (چوون) کە دووبارەبوونەوە بگەیەنێت، ئەو مۆرفیمەی دەچێتەسەر و دەبێتە (چوونەوە). هێندێک جاریش چاوگی نوێ دروستدەکات، کە مەرج نییە دووبارەبوونەوە بگەیەنێت، وەک: هێشتنەوە، بڕینەوە، سڕینەوە، بەربوونەوە، بیرچوونەوە...تاد. کە بەم پێکهاتەیە لە ناوچەی سلێمانیدا لەئارادایە. ئەمە لەکاتێکدا کە لە هێندێک ناوچەی سەر بە پارێزگای سلێمانیدا ئەو مۆرفیمە، کە (ەوە)یە، بە (ۆ) دەگۆڕرێت، یاخود بەکاردێت، کاتێک کە وەک کار بەکاربێت. بۆنموونە، دەوترێت: دەچێتۆ، دەبڕێتۆ، دەسڕێتۆ، بەردەبێتۆ، بیردەچێتۆ...تاد.

لێرەوە خشتەیەک بۆ ئەو بەکارهێنانانە، بە هەردوو گۆڤەرەکە دەکەین، هاوکات ئەو لاپەڕانەی کە مۆرفیمی (ەوە) بە (ۆ) لەلایەن شێخ سەلامەوە، هێنراون، دەستنیشان دەکەین:

| گۆڤەری سلێمانی | گۆڤەری شارەزوور و گەرمیان لەناویشیاندا عازەبان | لاپەڕە |
|---|---|---|
| تەریق نابیتەوە | تەریق نابیتۆ | ٥٧ |
| درێژئەبێتەوە | درێژئەبێتۆ | ٨٩ |
| بەرزئەبێتەوە | بەرزئەبێتۆ | ١٠٧ |
| بانەداتەوە | بانەداتۆ | ١٥٦ |
| بیبەرەوە | بیبەرۆ | ١٦٤ |
| ماوەتەوە | ماوەتۆ | ١٨٢ |
| تۆ بە شمشێرەوە | تۆ بە شمشێرۆ | ١٨٤ |
| وەرە بۆ ماڵەوە | وەرە بۆ ماڵۆ | ٢٠٨ |
| زوو وەرەوە | زوو بێرۆ | ٢٢٣ |
| لەپێشیانەوە | لەپێشیانۆ | ٢٣٨ |
| بەرئەبمەوە | بەرئەبمۆ | ٢٤٢ |
| بدۆزمەوە | بدۆزمۆ | ٢٤٥ |

جـا کە ئەم نموونـانە لەلایەن شـێخ سـەلامەوە بەکارهـاتوون، هاوکـات زۆرینەی بەکارهێنانەکانی تری، بەپێی ستانداردەکەیە. هەروەک لەم نموونـانەدا دەردەکەون:

| لاپەڕە | نموونەکان |
|---|---|
| ٢٣٥ | گردئەبنەوە |
| ٢٣٥ | وردئەبنەوە |
| ٢٣٨ | خۆمان شاردەوە |
| ٢٣٩ | بگێڕێتەوە |
| ٢٢٥ | ئەیکاتەوە |

بێگومان هەروەک نموونە ئەم ژمارەیە دەخەینە ڕوو، دەنا بەم شێوەیەی زۆرن.

شـتێک کە جـێگەی تێبینیـیە، ئەوەیە، کە لە یەکێـک لە هۆنراوەکانـدا، لە دیـوانەکەدا، بەکارهێنـانی (ئەخـوێنێتەوە) هەیە، کە پێـدەچێت بەهەڵە لەلایەن نووسەرەوەی دیوانەکەوە، گۆڕرابێت، چونکە ئەگەر وابێت ئەوا شـیعرەکە لەنـگ دەبێت، کە ئەمەش دوورە لە توانـا و سـەلیقەی شـیعریی شـێخ سـەلام. واتە لە شیعرەکەدا، کە نووسراوە:

چاویلکەی پیسی کۆنـی خـۆڵاوی
بە بەن پـێچراوی چـڵکن تۆزاوی
لە گیرفان دەرهات خستیە چاوی
نـاو ئـەخـوێـنـێتەوە بەدڵ داماوی[٢]

لە دووەم دێـڕدا لەبـری (١٢) بـڕگە، بـووەتە (١٣)، کە ئەمەش بەهـۆی هەڵەی گـۆڕینی (ئەخوێنێتـۆ)وە ڕوویـداوە، کەواتە لەمەشـدا شـێخ بەشـێوەی عازەبان بەکاری بردووە، نەک سلێمانی.

هێنـدێک جـار کە سـەرنج دەدەیـن، دەبینـین سـەلام وەک ئەوە وایە، بەمەبەسـت بەشـێوە و گـۆڤەری تـر وشـە و بەکارهێنـانی زمـانیی هێنابێـت.

بۆنموونە وشەیەکی وەک (زمان)ی بەکاربردووە، کەچی بەشێوەی (زووان)یش دەبینرێت، بۆنموونە لە ل (٢١٧)، دەڵێت:

ناوی تۆ ویردی زمانە

کەچی، لە ل (١٧٣)دا، وتراوە:

کوردێ بۆ حەقی زووانی نەگەڕێ

شێخ سەلام بەپێی ئەو نموونانەی لەبەردەستدان، پێدەچێت ئەو بۆچوونەی پێشوومان دروستبێت، چونکە لە هۆنراوەی (لە بیابانێکی لمیندا) دەڵێت:

بێچارە چی بکا دڵ هەزار نییە

تاقە یەکێکە یەک کەس بردییە [٣]

واتە لە جێگەی (بردوویە) یان (بردوویەتی)، سەلام (بردییە)ی بەکاربردووە، کە پتر لە ناوچەکانی سۆران بەرچاو دەکەوێت.

گومان لەوەدا نییە، کە شێخ سەلام زمانزانێکی بەتوانا بووە و فەرهەنگێکی فراوانی زمانەکەی لە ئاوەزدا هەڵگرتووە و ناوەناوە بەپێی پێویستیی شیعرەکانی وشەی جوانی لێوە هێناون. بۆنموونە لە هۆنراوەی (یار لە خەوما)دا، وشەی (بەرەنسک)ی بەکاربردووە، کە دەڵێت:

بە فرمێسکی چاو بەرچاو بوو ڕەنگین

بەرەنسک ئەهات لەجێی گریە و شین [٤]

لێرەدا ئەم وشەیە، کە لە بنەچەدا لە (بەرە هەنسک)ەوەیە و هەروەک پێکهاتەی (بەرەژان) دارێژراوە، نیشانەیەکی تا بڵێی لەبارە سەبارەت بە ئاوەزمەندیی مرۆڤی کورد، کە چۆن لە زمانەکەیدا توانیویەتی بە وشەی لەبار، گوزارشت لە وردترین باری دەروونیی مرۆڤ بکات، چونکە (هەنسک) هەستپێکراوە و دەکرێت بە دوو کەناڵ، کە بیستن و بینینن، لێی بەئاگابین، بەڵام (بەرەنسک) هێشتا نەبووەتە هەنسک، بۆیە ئەمە تەنیا ئەوکەسەی کە خۆی لەبارە دەروونییە نالەبارەکەدایە هەستی پێدەکات، نەک دەوروبەر. لە هەندێک جێگەشدا سەلام بەکارهێنانی تایبەت بە خۆی بۆ وشە، هەیە. بۆنموونە لە هۆنراوەی (شیوەنی بەکوڵ)دا، دەڵێت :

بلێ هەی سەرشێت سەودای نیگاران
دێـــوانــەی دیـنــی دیـده خوماران[٥]

لێـرەدا لەبـری (بینـین) یـاخود (دیـتن)، دیـن بەکاردەهێنێـت، کە ڕەنـگە بەمەبەسـت وایکردبێـت، تـاوەکو بەواتـای (دیـن) و (بینـین)یش لێکبـدرێتەوە. هاوکات دەشێت وشەی (دین) هەر بە واتای شێت هێنرابێـت وەک ئەوەی کە لە هێنـدێک زار و گـۆڤەری بەتـایبەت کرمـانجیی بـاکوردا هەیە و بە شـێت (دیـن) دەوترێت، جا ئەگەر وابێت ئەوا وەک ئەوە وایە کە بڵێت: دێوانەی شـێتی دیـدە خومـاران. هەر کامێکیشـیان بێـت، واتـای دێـڕەکە هەر بەجـێ و دروسـتە، کە ئەمەش وردیی سەلام دەردەخات.

شایانی سەرنجە، گەر بڵێم ئەم گوزارشتەی سەلام، کە دەڵێت: "بلـێ هەی سەرشێت سەودای نیگاران" ڕووتێکردنێکی سەرکۆنەی کوردانەی پڕ کـاریگەرییە و هاوکـات هـۆی ڕووتێکـردنەکەش خـراوەتە ڕوو، هەر ئەم کـاریگەرییە و ئەو گوزارشتەشە، کە لە هەست یـان نەسـتی دیلانـی شـاعیردا کـاریگەریی هەبـووە، بۆیە ئەویش لە شیعری (ڕەز)دا ڕوودەکاتە خەیامی شاعیری فارس و دەڵێت:

"بلێ... هەی سەرشێت کوشتەی گڕی تەڕ
گـەر تێتا مـاوە یـەک تـۆز نـرخ و فـەڕ"[٦]

## پاری دووەم

## پەخشانی هونەری، نیشانەیەکی باڵای زمانزانی و فەرهەنگفراوانیی سەلام:

بەپێی ئەوەی کە سەلام ڕۆشنبیرێکی سەردەمی خۆی بـووە و وێژەوانێکـی بەتواناش بووە، ئەمە وایکردووە لەپێنـاوی پەیـامە نەتەوەییەکەیـدا، زۆرێـک لە ڕەگەزە وێژەییەکـــان تاقیبکـــاتەوە. یەکێـــک لەو ڕەگەزانەش (پەخشـــانی هونەری)یە. بێگومان لە نووسینی پەخشانیشدا، دەکرێت بڵێـین نەک هەر تەنیـا پەیامێک، بەڵکو لەگەڵیدا پەیامێکی تریشـی گرێـداوە، کە وەک ئاکـام هەر یەک مەبەست دەپێکن، ئەویش ئەوەیە، کە هەوڵیداوە بە زمـانێکی پـاراوی کـوردی و بە وشە و گوزارشتگەلێکی کاریگەر گوزارشـت لە پەیـامە نەتەوەییـیەکەی نـاخی بکات.

دیارە و هەروەک پێشتریش لێیدواین، سەلام چاک لە گرنگیی ڕۆژنامە و ڕۆژنامەگەری گەیشتووە، لەوەدا، کە ڕۆژنامە دەبێتە زمانی گوزارشتکەر و بەرگریکار لە نەتەوە و هەبوونی ڕۆژنامە نیشانەی هەبوونی ڕۆشنبیرانە لە نەتەوەدا، نەبوونیشی پێچەوانەکەیەتی. ئەمەش وایکردووە، کە سەلام چ بە شیعر و چ بە پەخشان هەوڵی دەرخستنی گرنگیی ئەم بابەتە بدات. ئاشکراشە ئەمەی لەپێناوی نەتەوەکە و مافە ڕەواکانیدا، کردووە.

جا ئەوەی کە زانراوە، ئەوەیە کە سەلام چەندان پەخشانی هونەریی نووسیون و لە ڕۆژگاری خۆیدا چەند پەخشانێکی لێ بڵاوکردوونەوە [٧]. هەر بۆ نموونە لە پەخشانی (سەلامی سەلام بۆ ژیان)دا، کە لە ١٩٣٥دا لە خوارووی بەسرا نووسیویە و لە ژمارە (٤٣٥)ی ڕۆژنامەی (ژیان)دا بڵاوکراوەتەوە، دەبینین بە زمانێکی جوان و پاراو و بگەیێن و سانا، دەڵێت :

"ژیان، گلێنەی دیدەم، زۆر بۆت بەپەرۆشم، بێ دەست و بێ کەسم، داماوم، هەمیشە چاوەڕێی تۆم، توخوا بێ ترس و پرس چالاک و بێباک، ڕێک و پێک، یەک لەسەر یەک وەرە لام، دڵی تەنگی تاریکم ڕووناک کە، هیوای وردی باریکم قەوی، سەری گێژی شێواوم چاک بکەرەوە.

ژیان، کوولەکەی ڕۆحم، چەن شیرین و ڕەنگینی کە خۆتت وەکو خونچەی بەهاری پێچاوەتەوە، پڕ توێی دەروونتە لە بۆنی خۆشی گوڵی گوڵزار، چیمەن و لالەزار، نەسرین، یاسەمەن — حاڵ و هەواڵی وەتەن — لەگەڵ بینینم بە هالاوی هەناسەی گەرمی دڵی کەیلم شاگوڵی سەرپەڕەکەت ئەگەشێتەوە، دەم ئەکەیتەوە، وردە وردە سرپە سرپ دەست پێ ئەکەی.

ژیان چەن خۆشە کە لە ناکاوا وەکو نەسیمی بەری بەیان شنەشن، بەدەمی بە پێکەنینەوە، بە پاک و خاوێنی بەناو شنەی شەماڵی شیمالدا سەرەوژێر خۆت لوول ئەدەی و لە دەشتی چۆڵ و هۆڵی خوار بەسرەدا لەناو گەردەلوولی گێژەڵووکەی تەپ و تۆزی لمی بیابانێکی کاکی بە کاکی دا بەدیم ئەکەی بێ پەروا خۆت ئەهاویتە کۆشم.

ئۆخەی کزەی جەرگی بریندارم، دەرمانی دڵی پڕ ئازارم. بەو هەوای تۆیە تۆز و خاک و خۆڵی شان و ملم پاک، برینی ناسۆری جەرگ و دڵم ساڕێش و چاک ئەبێتەوە، بە هەوا فێنکە پاکە بێگەردەکەت ماندوویێتیم ئەحەسێتەوە.."(٨)

بێگومان پەخشانەکە درێژە، بۆیە ئێمە تەنیا بە خستنەڕووی ئەم بەشەی، کە کوردواتەنی مشتێک نموونەی خەروارێکە، دەیخەینە ڕوو. جا گرنگ ئەوەیە، کە ئەم چەند دێڕە گۆواهی ئەوە دەدەن، کە سەلام زمانزان و خاوەن توانا بووە لەلایەنی پەخشانی هونەرییەوە، هەروەک چۆن شێوازێکی لەبار و فەرهەنگێکی فراوانی وشە و زاراوەی کوردیی پەتی بۆ گوزارشتکردن لە ناخی خۆی خستووەتە کار. دیارە هەروەک لە ناونیشانی پەخشانەکەشدا هاتووە، پەخشانەکە بۆ خودی ڕۆژنامەی ژیان نووسراوە، واتە نامە بۆ نووسراوی ڕاستەوخۆ ڕۆژنامەکەیە، بەڵام ناڕاستەوخۆ پیرەمێرد مەبەستە، گەرچی سەلام بۆ کەسی دووەم، دەدوێت، کە ڕۆژنامەی (ژیان)ە و باری دەروونیی خۆی بۆ دەخاتە ڕوو لەو دەمانەدا کە ڕۆژنامەکەی بەدەست دەگات، هاوکات لە زۆر جێگەدا ئەو ڕۆڵەی کە بە ڕۆژنامەکەی داوە، لەگەڵ خودی ناوی ڕۆژنامەکەدا، کە (ژیان)ە، ئەمانە وا دەکەن، کە خوێنەری پەخشانەکە، نامە بۆنووسراو بە کچێک تێبگات. هەر چۆنێک بێت، پەخشانەکە لەزۆر لایەنەوە توانای شێخ سەلام دەردەخات.

## پاری سێیەم
## بەکارهێنانی کارکردەییی زمان (پراگماتیک) لە شیعرەکانی سەلامدا:

بێگومان لە لایەنی گەیاندنەوە بۆ واتای هەر وتراوێک، زمان دوو ئاست ڕەچاو دەکات، یەکەمیان ئاستی سیمانتیکە، ئەم ئاستە لایەنی گەیاندنی ئاساییی واتای وشە و زاراوە و سەرجەم دەربڕراوەکانە. هەرچی ئاستی دووەمیشە، بە پراگماتیک ناودەبرێت، کە کارکردەیی زمانە، ئەوا ئەم واتایە لەڕێگەی واتای ئاسایی وتراوەکانەوە ناگات، بەڵکو زۆر لایەنی تر دێنە ناوەوە و هەریەکەش بەپێی هەلومەرجی خۆی ڕۆڵ لە گەیاندنی واتای وتراودا دەبینێت. لەوانەش: خودی قسەکەر یاخود نووسەر یان شاعیر، کێیە؟، بۆنەی وتنی

شیعرەکە چییە؟ کاتی وتنی کەیە؟ تەنانەت شوێنی وتن و کردەی زمانی لە ناو خـودی شـیعرەکەدا و لەمەشـدا هـاوڕێیەتیی واتـاییی کەرەسـتەکان، جـا چ هاوڕێیەتیی ئاسـاییبن یـاخود نائاسـایی، ئەمـانەش ڕۆڵیـان لە گەیانـدنی واتـای وتراوەکەدا دەبێت. لە سەروو ئەمانەشەوە، زۆرجـار کەلتـووری نەتەوەی خـاوەن زمان دەکرێتە وێستگەیەک، کە تێیدا خودی کەلتوورەکە ڕۆڵی بانکێکی زانیـاری یاخود بانکێکی ئاسایی دەبینێت و تێیدا ئەو وشە و زاراوە و وتـراوانە بەوێـنەی کـاغەزی دارایـی ئاڵوویریـان پێـدەکرێت و لەمەشـەوە بەهـای واتـاییی وتـراو، دەستەبەر دەبێت.

بێگومـان هەروەک ئەوەی، کە کەلتـوور بەرهەمـی مێـژووی دوورو نزیکـی نەتەوەیە، هەر بەو چەشنەش خودی مێژوو جارێکی دی دەبێتەوە بە هۆکارێـک، تاوەکو لەڕێگەی دەرکەوتە و دەرهاویشـتەکانییەوە، کە دەبـنە دۆزگە بـۆ واتـای وتـراو، لەڕێیـانەوە واتـا بە گـوێگر و خـوێنەر دەگـات. بێگومـان بەبـێ ئەوانە، دەشێت کەلێن بکەوێتە نێوان مەبەستی شـاعیر و خواسـتی تێگەیشـتنی گـوێگر یاخود خوێنەرەوە. کاتێکیش، کە دەڵێـین مێـژوو، ئەوا گومـانی تێـدا نیـیە، کە دەکرێت سـەرجەم ڕووداو و بەسـەرهات و گۆڕانەکـان، کە بەسـەر شـاعیر خـۆی یاخود شـار و نەتەوە و وڵات و بگـرە جیهانیشـدا هـاتبن، ئەمـانە بـۆ گەیانـدنی واتــای کــارکردەییی زمــان (پراگمــاتیکی) لەو شــیعرانەدا، کە زادەی بیــر و ئەندێشەی ئەون، دەشـێت ڕۆڵیـان هەبێـت. بەبێئاگـاییش لەمـانە، ئەوا دەشـێت واتای زۆر وتـراو نەگەن، یـاخود مەبەسـتی شـاعیر لەو شـیعر و وتـراوانە، ڕوون نەبن.

جـا ئەگەر لەم ڕوانـگەیەوە لە شـیعرەکانی شـێخ سـەلام بـڕوانین، ئەوا نمــوونەی زۆرمــان بەرچــاو دەکەون. لەوانەش، لە شــیعری (هەرچــی)دا، کە دەڵێت:

چۆن قبووڵی تۆ ئەفەرمووی، (سیدی خیر البشر)
دوژمـنــی دیـنت، بباتن، دۆستی ئیسلامت بەدیل[٩]

لێــرەدا، ئەگەر شــێخ ســەلام خــۆی مێــژووی نووســینی ئەم شــیعرەی نەنووسیبا، ئەوا بەهیچ جۆرێک لە واتای ئەو (دوژمنی دین)ە نەدەگەیشتین، کە

مەبەست ئینگلیز بووە، چونکە هەروەک فەیلەسووفەکانی "ئۆکسفۆرد" و "ڤیتگنیشتاین" بۆی دەچن، گوزارشتەکان، ئەگەر لە دەوروبەرێکی دیاریکراودا نەبن، واتایان نابێت. واتە گوفت واتاکەی لەو بۆنەیەوە وەردەگرێت، کە تێیدا بەکارهاتووە[10]. جگە لەوەش لە وشەی (دیل)، کێ مەبەستە؟، ئەگەر (دۆستی ئیسلام) وەک دەستەواژەیەک نەهاتبا، دیسان نەماندەزانی کێیە. واتە ئەو دۆستی ئیسلامە کێیە؟، نەدەزانرا. لەسەروو ئەمانەشەوە، واتای دروستی بەیتەکە هەر نەدەزانرا، ئەگەر مێژووی نووسینی شیعرەکە لەئارادا نەبووایە، کە (١٩١٩)یە. بەبوونی مێژووی شیعرەکەش، ئەگەر خوێنەر لە مێژووی کورد و ڕووداوە دیارەکانی ئەو ساڵە بەئاگا نەبێت، دیسان نازانێت، کە مەبەست شێخ مەحموودی نەمرە، کە لە دەربەندی بازیان بە برینداری لەلایەن ئینگلیزەکانەوە بە دیل گیرا و برا بۆ بەغداو دواتر بۆ هیندستان، دوورخرایەوە. کەواتە ئەم بەکارهێنانەی زمان لەلایەن شێخ سەلامەوە لەو بەیتەدا، مەبەست و واتای پراگماتیکی گەیێنراوە، بەڵام دەبێت ئەوەش چاک بزانین، کە ئەمانە بۆ گوێگر یان خوێنەری بێئاگا لەو لایەنانەی خرانەڕوو، تێگەیشتنیان نابێت. واتە تارادەیەک دەقێکی کراوە دەبێت، نەک دیاریکراو بەپێی مەبەستی شاعیر. جا هەروەک (براون و بۆل) وتوویانە: "دەبێت بواری پەیام ڕەچاوی ئەو دەوروبەرە بکات کە پەیامەکەی تێدا دەرکەوتووە، دەوروبەریش لایان پێکدێت لە: قسەکەر/ نووسەر، گوێگر/ خوێنەر، هەروەها کات و شوێن، چونکە ڕۆڵێکی کاریگەر لە لێکدانەوەی پەیامدا دەبینن، هەروەک زۆرجار وادەکات، کە هاتنەکایەی وتراوێک لە دوو دەوروبەری جودادا دوو لێکدانەوەی جودای بۆ بکرێت[11].

لە هۆنراوەیەکی تردا، کە بەناونیشانی "گەر لەلام باشە"یە، شێخ سەلام، دەڵێت:

تۆ ئەبێ بۆچی دڵت خۆشبێ بە تەرفیع و نیشان
زوو لە شانت لائەبا سەرزین، نیشانی کاپیتان[12]

لەم بەیتەدا وشەی ئەسپ یاخود مایین، بوونی نییە، بەڵام سەلام ئەو واتایەی پراگماتیکییانە گەیاندووە. جگە لەوەش بەیتەکە وشەی ئەفسەری تێدا نەهاتووە، بەڵام واتاکەی گەیێنراوە، چونکە نیشانی کاپیتان بۆ ئەفسەرە. جا

خـوێنەر ئەگەر لە مێـژووی وتنـی شـیعرەکە بەئاگـا نەبێـت، کە (١٩١٩)یە و هەروەها لەڕێگەی هاتنی وشـەی (کاپیتـان)ەوە، کە نـاوی پلەیەکـی ئەفسـەریی ئینگلیزەکـانە و شـوێنی وتنـی شـیعرەکەش، کە سـلێمانی بـووە، ئەوا بەمـانەدا دەزانرێت، کە دەمی دوای گرتنی سلێمانییە، لەلایەن سوپای بەریتانیاوە.

لەڕێـگەی هەمـوو ئەمـانەوە، تێـدەگەین مەبەسـت لە بەیـتەکە، کەسـێکی خۆفرۆشە و ئینگلیزەکان وەک هاندان پلەو نیشانی ئەفسەرییان داوەتێ، تاوەکو کـاری داگیـرکەرانەی خۆیـانی پـێ مەیسـەر بـکەن. هەربـۆیە سـەلام پـلە سـەربازییەکە، بە سـەرزین ناودەبـات، کە پـارچە لبادێـک یـاخود کوتـاڵێکە و بەسەر زینی ئەسپدا دەدرێت. هەرکاتێک سوارەکە لە ئەسپەکە دابەزێت، ئەوا سەرزین و زینەکەش لادەبرێن، چونکە تەنیـا بـۆ جـوانی یـاخود بـۆ نەرمکردنـی جێگەی سوارەکەیە، یـاخود هەر بـۆ کـاتی سـواربوونەکەیە و هەمیشـەیی نیـیە. کەواتە سـەلام بە کەسـەکە دەڵێـت: تـۆ مـایین یـاخود ئەسـپیت و غاردانـت بـۆ داگیرکەرە و هەر بۆئەوەش تۆی دەوێت.

لە بەیتێکی تردا، دەڵێت:

با لە پێ دەرپێ فڕێ دەن ئاڵ و ناوماڵی حەرەم
اکـرم الضیف بەخێربێن کافرە لینگ ڕووتـەکان[١٣]

لێـرەدا بـۆ بەئاگـا لەوەی، کە سـوپای بەریتـانی، سـەربازەکانیان، لەو سەردەمەدا، کە کوردستانیان داگیرکردووە، پانتۆڵی کورتیان لەپێدا بـووە. ئەوا واتـای (ئینگلیـز) لەڕێـگەی زانیـاریی پۆشـاکی ئەو سـەردەمەی سـوپاکەیانەوە، گەیشـتووە، بەڵام ئەوە نەوتـراوە، کە ئەوانەی ئینگلیـز بە داگیـرکەر نـازانن، بـا ئامـادەبن ژن و مـاڵ و منـداڵیان لەلایەنیـانەوە دەسـتدرێژییان بکرێتەسـەر و ئەمەش بە ڕێزلێنـان لە میـوان بـزانن، کەچـی ئەم واتـایە بە کـردنە هـاوڕێی کەرەسـتە و دەربـڕراوە دژیەکەکـانی (دەرپێ فڕێـدان) و (ڕێـز لە میواننـان)ەوە، دەگات.

لە هۆنراوەیەکی تریدا، کە (بە یادی گیانی پاک و خاوێن و بەرزی سـالمی ساحێبقڕان) ناونیشانی دراوەتێ، دەڵێت:

ئێستە عەسری وەعیە، هەرکەس هەوڵی قەومی خۆیەتی
پێشمەرگەی دوژمنە کوردیش، بەڵێ هـەروەک پاڵـەوان[١٤]

لێرەدا وشەکانی جاش و خۆفرۆش و نەفام و دڵسۆزی و داگیرکەر، بوونیان نییە و نەهاتوون، بەڵام بەشێوەی پراگماتیکی واتایان گەیێنراوە، چونکە لە دێڕەکەدا، کە (عەسری وەعی بێت) و کوردیش پێشمەرگەی نەتەوەکەی نەبێت و بەپێچەوانەوە هی دوژمن بێت، کەواتە جاشە و جاشێتیش کاری پیاوی هۆشیار نییە. دەستەواژەی (هەروەک پاڵەوان)یش، واتای بە دڵسۆزی جاشێتیکردن بۆ دوژمن، دەگەیێنێت.

لە هۆنراوەی (کانی مانگا)دا، کە دەڵێت:

بەختەکەم بەدبەخت و شوومە سەر لە جێگەی پێ ئەنێم
ئارەزووم ئاوی (حەیاتە) (کانی مانگا) دێتە ڕێم[١٥]

لێرەدا ئەگەر نیوەی یەکەمی بەیتەکەش نەبێت، کە سەلام لە بەدبەختیی خۆی دواوە، ئەوا تەنیا بە نیوەی دووەمی بەیتەکە، لەڕێگەی زانیاریی بۆماوەوە، ئەوە دەگات، کە شێخ مانەوەی لە کانی مانگادا بە مردن زانیوە، چونکە ئەگەر ئاوی ژیان ئەوە بێت، کە لە کەلتووری گەلاندا و لەوانیش موسڵمانان، باسی لێدەکرێت، گوایە ئەوەی بیخواتەوە نەمر دەبێت، ئەوا ئەم واتایەی ژیانی هەتاهەتایی و مردن پراگماتیکییانە گەیێنراون، دەنا مەرج نییە کەسانی بێئاگا لەم زانیارییانە، لە واتای مەبەستی شێخ سەلام بگەن.

هەر لەو هۆنراوەیەدا و لە بەیتێکی دیدا، دەڵێت:

پێم وت ئاخر تاقە ساتێ مۆڵەتم دە توخوا
تووڕە بوو، مردووت مرێ بۆچی منیش وەک (لەرزوتێم)[١٦]

لێرەدا، کە شێخ سەلام دەردەدڵێ دەکات و بە نەخۆشییەکەی، کە مایەسیری بووە، دەڵێت: یەک سات لەکۆڵم نابیتەوە؟، بەڵام ئەمە لەڕێگەی خواستەکەی سەلامەوە گەیێنراوە. واتە دەتوانین بڵێین، کە خواستەکە لە بنیاتی ژێرەوەدا بەم واتایە دێت، بەڵام ئەوەی کە پراگماتیکییانە گەیێنراوە، ئەوەیە کە لەڕێگەی زانیاریی مرۆییەوە سەبارەت بە نەخۆشییەکان، دەگات، چونکە لەرزوتا ناوبەناوە و بەردەوام نییە. واتە ساتێک لەرزە و ساتێک نەخۆشەکە بەپێچەوانەوە، تای لێدێت. هەربۆیە وەڵامی مایەسیرییەکەش پرس نییە، چونکە لەپێشییەوە (مردووت مرێ) هاتووە، بۆیە ئەگەر دەستەواژەی

(تووڕە بوو)ش لەئارادا نەبێت، هەر تووڕەبوون دەگەیێنێت و ڕەتکردنەوەی خواستەکەشە. واتە وەک ئەوە وایە بڵێت: لەکۆڵت نابمەوە، هاوکات تووڕەبوونیشی لەگەڵدایە.

له هۆنراوەی (حەقیقەت)دا، دەڵێت:

پەری دەستی لەدڵ داوە، بە زەحمەت

بە شێتی لەم تەلیسمی عەشقە دەرچین[١٧]

لێرەدا واتای (من شێت بووم) بەشێوەیەکی پراگماتیکی گەیێنراوە، ئەم گەیاندنەش لەڕێگەی کەلتووری کوردەوارییەوەیە، چونکە لە کوردەواریدا، دەوترێت: پەری دەست لە هەرکەس بدات، شێت دەبێت. ئەم بۆچوونە چ لەسەر زمانی خەڵک و چ لە فۆلکلۆردا دووبارە دەبێتەوە. خودی وشەی پەری لە کوردیدا، ئەگەرچی جوانی سیمایەتی، کەچی پێدەچێت لەدوای موسڵمانبوونی کورد و ئاشنابوونی بە وشەکانی (جنی) و (مەلائیکەت)، وشەی پەری سیمای ناشیرینی وەرگرتبێت، هەرچەندە خودی وشەکە لە کوردیدا هەر بە چەمکە کۆنەکەی لەکاردایە، واتە هەر سیمای جوانی هەیە. کەواتە لە کوردیدا وشەکانی پەری و فریشتە و جنۆکەش لە ئێستادا بوونیان هەیە. بەزۆرییش ناشیرینی و شەڕەنگێزی دراوەتە پاڵ جنۆکە، کە لە کوردیدا پەرییە و فریشتەش جوانە و یاریدەدەری منداڵان و لێقەوماوانە. هەروەک ئەوەی کە لەکاتی کەوتنی منداڵدا، لە کوردەواریدا، کاتێک کە تووشی زیان نەبێت، دەوترێت: منداڵ فریشتەی لەگەڵدایە، بۆیە دەپارێزرێت. لێرەشەوەیە، کە شێخ سەلام دەڵێت: (پەری دەستی لەدڵ داوە) ئەمە لەبری ئەوەی بڵێت شێت بووم. جگە لەوەش لە کەلتووری کورددا، ئەوە وتراوە کە گوایە مرۆڤ ئەگەر بەریەککەوتنی لەگەڵ جنۆکەدا هەبێت، ئەوا تووشی زیان و بگرە شێتبوونیش دەبێت. تەنانەت گێڕانەوەی ئەفسانەییش هەن، کە تێدا مرۆڤ لەگەڵ پەریدا بەریەککەوتن و لێک ئاشکرابوونی هەبووە و مرۆڤەکە ئاشقی پەرییەکە بووە[١٨]، ئیتر لەو دەمەوە لە ژیانی مرۆییی خۆیدا، ئاسایی نەماوە و شێت بووە. هەر لەمەشەوەیە شێخ سەلام، دەڵێت: مادام کەوتوومەتە ئەم تەلیسمی عەشقەوە و شێت بووم، کەواتە زەحمەتە لێی دەربچم.

هەر لەو هۆنراوەیەدا و لە بەیتێکی تردا، دەڵێت:

گلێنەی چاوەکانم عەکسی تۆی گرت
هـەمـوو برژانگەکانی کرد بە پەرژین [19]

لێـرەدا (چـاوپێکەوتن) گوزارشـتی لـێ نەکـراوە، بەڵام پراگماتیکییـانە گەیێنراوە. هەروەها ئەوە نەوتراوە، کە ئیتر لەبیری ناکات یاخود هەر لەبەرچـاو و لەیادگەیدا دەبێت، بەڵام لەڕێگەی پەرژینکردن بەدەوری وێنەکەیدا، کە وەک کامێرا چاوی سەلام گرتـوویەتی، ئەو واتـایە گەیێنـراوە، چـونکە خـودی وێـنەی دڵخـوازەکەی وەک شـتێکی نەجـووڵ نابینێـت، بەڵکـو وایـدەبینێت، کە خـودی دڵبەرەکەیەتـی و دەشـێت لە سـاتێک لە سـاتەکاندا بـڕوات و لەچـاو ون ببێـت، بۆیە برژانگەکانی بۆدەکاتە پەرژین لەپێناو ڕێگرتن لە ڕۆیشتنی، کە تەنیـا بەمە دەتوانێت لای خۆی بیهێڵێتەوە. واتە (گـرتن) بە دوو واتـا هێنـراوە، یەکێکیـان وێنەگـرتنە و ئەویتریـان زینـدانیکردنە، چـونکە برژانگەکـانی کـردوونەتە شیشـە ئاسنینەکانی بەندیخانە. هەروەک دەشێت ئەوەش هەڵبهێنجرێت، کە مەبەستی شـاعیر ئەوەبێـت، کە خـودی ئەو گـوڵە و وێـنەش وێـنەی گـوڵە، گـوڵیش لە بـاخچەدا پەرژینـی پێـدەوێت، تـاوەکو لەدەسـتی بزێـو و نـاحەز بپارێزرێـت. لێرەشەوەیە کە دەکرێت بڵێـین مەبەسـتی شـاعیر، گەرچـی تـا ئاسـتێکی بـاش بەهۆی دەوروبەری زمانی و نازمانیی هۆنراوەکەوە دەشێت بگات، هاوکات هێشتا ناتوانرێـت لەڕێـگەی ڕەگەزەکـانی پراگماتیکیشـەوە بگەیـنە مەبەسـتی تەواوی شاعیر. واتە ئەوەی کە بە ڕاستی لە ئاوەزی ئەودا بووە. واتە ئەرکـی ئەو دەقە چییە، مەرج نییە تەواو ڕوون بێت، ئەمەش کۆکە لەگەڵ بۆچوونێکی (کـلاووس برینکر)دا، کە دەڵێـت: "تەنیـا بـاوبوونییەکە و پێکهـاتە زمانییەکـان پێـوەرێکی لەبارنابن بۆ دیـاریکردنی ئەرکـی دەق، چـونکە ئەوە دیـدێکە بەزۆری لەڕواڵەتـی دەقدا کار دەکات" [20].

لە هۆنراوەی (بەیادی چاوەکانی)دا، سەلام، دەڵێت:

گەمارۆی دام بەگەرمی حەزرەتی شێخ
بەنـاوی دیـنـەوە لاقـی ئـەگـەستم [21]

لەم بەیتەدا نە وشەی (سەگ) و نە گوزارشتی (شێخ سەگە)، نەهاتوون، بەڵام ئەم واتایانە پراگماتیکییانە گەیێنراون، ئەو گەیاندنەش لەڕێگەی بەهاوڕێکردنی نائاسایی وشەکان لەگەڵ یەکتردا دێتە ئاراوە. وشەی گەمارۆ لە بنەچەدا بۆ سەگە، ئەگەرچی ئێستا بۆ بواری سەربازیش بەکاردێت. جگەلەوەش وشەی گەستن، کە ئەمیش بۆ ئاژەڵە و بەتایبەت بۆ سەگ و مار و درندەکان بەکاردێت. لەوانەش بەهێزتر، کە واتای پراگماتیکیی سەگی پێگەیێنراوە، ئەوە کردنە هاوڕێی گەستن و لاقە لەگەڵ وشەی شێخدا. کۆی ئەو هاوڕێیەتییانەی وشەکانی بەیتەکە، وادەکات وشەی حەزرەت، کە پیرۆزیگەیێنە، لەو پیرۆزییە دابماڵرێت و سووکایەتیپێکردن بگەیێنێت.

لە هۆنراوەی (زۆر عەیبە)دا، کە دەڵێت:

تاکەی چاوەڕێی ئەم و ئەو ئەبی[22]

جێناوەکانی (ئەم، ئەو)، کە جێناوی ئاماژەن بۆ کەسی نزیک و دوور، کەچی، ئەم کەرەستانە پراگماتیکییانە بەکارهاتوون و واتایەکی رامیاری دەگەیێنن، مەبەست لێیان دەوڵەتانی نزیک و دوور، یاخود هەرێمی و نێودەوڵەتی، مەبەستن.

لە جێگەیەکی تردا، دەڵێت:

تاکەی بۆ ڕاوی قەومت کەو ئەبی[23]

لێرەدا (کەوبوون) بۆ دوژمن، بوونە نێچیربوون ناگرێتەوە، بەڵکو ئەمە بەپێی کەلتووری کوردەواری و بەئاگایی لە پەلەوەری کەو و بەکارهێنانی لە ڕاودا بۆئەوەی هاوڕەگەزەکانی لەخۆی کۆبکاتەوە، تاوەکو دوژمن یان ڕاوکەر بیانکوژێت یاخود بیانخاتە داو، بەکارهاتووە. واتە ئەم بەکارهێنانە واتای خۆفرۆشی و جاشێتی دەگرێتەوە، کە دژ بە نەتەوە و ڕەگەزی خۆیان بۆ دوژمن کاردەکەن.

لە هۆنراوەیەکی تردا، کە بەناونیشانی (من و خەم)ە، دەڵێت:

نە تۆ بەبێ من، نە من بەبێ تۆ
لە ژین لە ژیان
ئالاین بەیەکدا وەکو تان و پۆ
یەک لاشە یەک گیان[24]

لەم دوو دێـڕەدا، (تـۆ) کە جێنـاوی کەسـی دووەمـی تـاکی جـودایە، بەشـێوەیەکی ئامـاژەیی بەکارهـاتووە و ئەم بەکارهێنـانە بەکارهێنـانێکی چاولەپێشـە، چـونکە (تـۆ) کێـیە؟، نازانرێـت، بەڵام کە لەپێشـتر دەڕوانـین، دەبینین دەستپێکەکەی، دەڵێت:

هەی غەم هەی ڕەفیق....[٢٥]

کەواتە (تـۆ) واتـاکەی بەبـێ ئاگـاداربوون لە دەقەکە ناگـات، هەروەک جێناوی (من)یش بۆ بێئاگا لەوەی کە ئەمە لە هـۆنراوەیەکی سـەلامدا هـاتووە، نازانرێـت کێـیە. هەروەک چـۆن لە (ئـالاین بەیەکدا)شـدا جێنـاوی لکـاوی (ن) مەبەسـت لێـی کـێن؟، ڕوون نیـیە، بەڵام بە بەئاگـایی لەوەی کە لە شـیعرەکەی سەلامدا هاتووە، ئەوا واتاکەی ڕووندەبێتەوە، کە دووکەس نین، بەڵکـو (سـەلام و غەم) مەبەستن. ئەم هەلومەرجەش وایکـردووە، کە کـارکردەیی زمـان بوترێـت لێکـۆڵینە لەوەی کە وتنەکـان لە شـوێنی وتنیانـدا واتایـان دەبێـت، بەمەش لە واتاسازی جودا دەکرێتەوە کە بەگوێرەی بارە و لە دەوروبەر دادەبڕێت[٢٦].

شێخ سەلام، لە هۆنراوەی (ڕاز و گلەیی (ژیان) بۆ (ژین)دا، دەڵێت:

برژانـگی چاوم ئـەکەم بە سووژن
ئەیدەم لە یەخەت لە ترسی دوژمن[٢٧]

ئەم بەیتە، پراگماتیکییـانە کۆمەڵێـک زانیـاری، کە لە بۆچـوونە کۆنەکـانی کوردەوارییەوە سەرچاوە دەگـرن، دەگەیێنێت، چـونکە لە کوردەواریـدا وتـراوە، ئەو دایکـانەی کە منـداڵیان بـۆ نامێنێـت، ئەوا واچـاکە هەر لەگەڵ بـوونی منداڵەکەدا، بۆ چەندان ڕۆژ ئێشکی بۆ بگیرێت. جگە لەوەش دەبێـت دەرزییـەک یاخود سووژنێک بدرێت لە یەخەی، چونکە ئەم کارانە وادەکەن، کە (شـەوە) و (دایکی هاڵ)[٢٨]، کە جنۆکەن نەتوانن زەفەری پێبەرن. کەواتە سـەلام خـودی (ئێشـکگرتن)ەکەی لەڕێـگەی ئەوەوە گەیانـدووە، کە برژانگەکـانی کـردوونەتە سووژن. دیارە وشەی برژانگ سەربە پەرێـزی واتـایی چـاوە و چـاویش هۆکـاری بینـین و چـاودێریکردنە[٢٩]. بێگومـان سـەلام لەڕێـگەی (شـەوە) و (دایکـی هـاڵ)ەوە، واتـایەکی پراگمـاتیکی دەگەیێنێـت، کە مەبەسـت لێیـان ڕژێمـی پاشـایەتیی سـایەی ئینگلیـز و سیخوڕە خۆمـاڵییە ڕاپۆرتنووسـەکان بـوون، کە

هەمیشە بەدوای ڕۆژنامەکەوە بوون. واتە ڕۆژنامەی ژیـان لەبەرئەوەی لە خەمـی هۆشیارکردنەوەی کورددا بووە، ئەمە بە زییان بۆ دەسەلاّت و بەرژەوەندییەکانی دانراوە. بۆیە دژایەتی کراوە و دواتر داشخرا. کەواتە بە بەئاگابوون لە کەلتوور، بڕێک زانیاریمان سەبارەت بە کەرەستە بەکارهاتووەکان پێدەگات، خۆ ئەگەر لە کەلتوور بەئاگا نەبین، ئەوا واتای ئەوانەش ناگات. جـا گرنـگ ئەوەیە، کە شـێخ سەلام لەڕێگەی ئەو زانیارییانەوە مەبەستی پراگماتیکی گەیانـدووە، نەک ئەوەی کە بەتەنیا لە کەلتوورەوە بەدەستدێت. تەنانەت خودی ناوەکانی ناو ناونیشـانی هۆنراوەکەش، بۆ بێئاگا لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی، ڕوون نابێـت، چـونکە واتای فەرهەنگییان ئاشکرایە، بەلاّم بە کردنیان بەناوی مرۆڤ، ئەوا دەشـێت بە زۆری کچبن، ئەگەرچی (ژین) بۆ ناوی کـوڕیش لەئـارادایە. کەواتە بە بەئاگـایی لەکـاتی نووسـینی هـۆنراوەکە و هەلـومەرجی ڕامیـاریی ئەو سـەردەمە و بـاری ڕۆژنامەگەریی کورد، ئەوا تێدەگەین، کە ئەو ژیان ناوەی شێخ سەلام هێنـاویەتە قسە، مرۆڤ نییە، بەلاّم سەلام ڕۆلّی دایکێکـی دلّسـۆز و کـارامە و بەئەزمـوونی لە ئامۆژگـاریکردنی (ژیـن)دا، پێبەخشـیوە و ئەوەی بە ئـاوەزی شـێخ خۆیـدا هــاتووە و هەسـتی پێکـردووە، لەڕێـگەی هێنـانەگۆی ڕۆژنـامەکەوە بەگـوێی گوێگرەکەی (ژیان)دا، کە (ژین)ە، دەیدات.

دیارە گومان لەوە نییە، کە مەبەستی شێخ، پیرەمێـردی شـاعیرە، چـونکە هەروەک دیارە ڕۆلّی قسەبۆکراو بە (ژین) دراوە، بەلاّم قسەبۆکراوی ڕاستەقینە، پیرەمێردە. جا ئەم واتا و مەبەستە بە بێئاگایی لەوەی، کە پیرەمێرد هەرخـۆی سەروکاریی (ژین)یشی کردووە و جـگەلەوەش لە دیـوانەکەی سـەلامدا، بەیتێکـی پیرەمێـرد هەیە، کە لەسـەروبەندی بەدەستگەیشـتنی هـۆنراوەکەی سـەلامدا، کە ١٩٣٩دا لە حیللە نووسیویە و بۆ پیرەمێـردی نـاردووە، پیرەمێـرد بەو بەیـتەی، کە دەلّێت:

سەلام تۆ شیعرت لە من باشترە
تا لە دوورتر بی نالّەت خۆشترە [٣٠]

ڕاستیی بۆچوونەکان سەبارەت بەو بەکارهێنانە زمانییانەی سەلام لەلایەنـی مەبەستەوە، دەگەن و ڕووندەبنەوە.

لە هۆنراوەیەکی تردا، کە بەناونیشانی (لە ڕێگەی چەمچەماڵ)ە و لەگەڵ فایەق بێکەسی شاعیردا دایاننـاوە، بەڕاشکاوی و بە ناڕاشکاوی بەجووتە کەوتوونەتە سووکایەتیکردن بە پیاوانی میریی ئەو سەردەمە.

جا هەروەک شێخ خۆی لە دیوانەکەیدا، دەڵێت: "ئەودەمە، واتە لە ١٩٢٨ لە مەئموورییەت دەرچووبووم، شەش کەرم کڕیبوو، لەڕێگەی چەمچەماڵ بۆ دائیرەی ئەشغال ئیشم ئەکرد و بەکرێی کەرەکان گوزەرانم ئەکرد. فائیق بێکەس بۆ دیدەنی هاتە لام و لە ستایشی کەرەکاندا پێکەوە ئەم هەڵبەستەمان نووسی".(٣١)

جا ئەوەی جێگەی سەرنجە، ئەوەیە کە پێدەچێت نەیانویستبێت بەئاشکرا ببنە جێگەی سەرنجی پیاوانی ئایینیی ئەودەمە، بۆیە لەجێگەی ئەوەی بڵێن "هەزاران سڵاوات لە تۆ" گۆڕیویانە بۆ "بەر تۆ هەزاران عەڵبە جۆ" بێگومان یەکەمیان لە کەلتووری کوردی موسڵماندا درووديکە و پیرۆزیی خۆی هەیە. نەک هەر ئەوەش، لای کورد زۆرجار بە تەوسیشەوە بەرامبەر بە بۆچوونێکی هەڵە، یان نادروستی کەسێک، دەوترێت سەڵڵا لە ئەقڵت. لەسەروو ئەوەشەوە ئەو دێڕە، کە چەندبارە دەبێتەوە، ئەگەر لە هۆنراوەی کەسێکی وەکو زێوەر، یاخود بێخوددا بووایە، هەرگیز ئەم بۆچوونەمان نەدەبوو، چونکە ئەوان بیرکردنەوەیان لەگەڵ ئەماندا جیاواز بووە. لەگەڵ ئەوەشدا، وەک دەوترێت: "واتای پراگماتیکی ئەوەیە، کە لەگەڵ جیهانی دەقەکەدا کارلێک دەکات و بەواتا ژێرەوەییەکەی دەقەکەدا ڕۆدەچێت، لە واتا دیارەکەی دەردەهێنێت..."(٣٢). لە هۆنراوەکەدا، هەر لەسەرەتاوە سووکایەتی بەو کەسانە دەکەن، کە ملکەچی ئینگلیز بوون و لە سایەیاندا پلەوپایە و پۆستیان وەرگرتووە و بە سەرزارییش وا خۆیان دەرخستووە، کە گوایە ئەوان سیاسەت دەکەن و سیاسەتیش سەربزێوی ناوێت. هەربۆیە ئەمانیش لە هۆنراوەکەدا، کە ڕوو لە کەرەکان کراوە، دەڵێن:

کورتانم کرد ئەمڕۆ بۆ تۆ
شەڵتەی جەزا بگرە و بڕۆ
بار هەڵگرە تا نیمەڕۆ

سیاسی بە، زۆر دەستەمۆ
بەرتۆ هەزاران عەلَبە جۆ[٣٣]

کەواتە پراگماتیکییانە سەرجەم ئەو بەناو سیاسییانە بە کەر لەقەڵەم دەدەن، کە لەو هەلومەرجەدا خۆیان بە سیاسی زانیوە و لە پەنا ئەم خۆ و خەڵکی هەڵخەڵەتاندنەدا گزیرییەتیی ئینگلیز و دەوڵەتی ئێراقی تازە کوورەی ئەودەمەیان کردووە.

دواتر، دەڵێن:

مودیرەکەی شاری پێنجوێن
بەتۆ ناگا بە جێگە و شوێن
بۆ خورماڵیش بۆت ئەخۆم سوێن
تۆ لە کوێیت و ئەوان لە کوێن
بەرتۆ هەزاران عەلَبە جۆ[٣٤]

لێرەدا لەم بەکەرگرتنەی (مودیرەکەی پێنجوێن)ی ١٩٢٨دا، نازانین کێیە، مەگەر بە تۆمارەکانی ئەوکاتەی میریدا بگەڕێین. بۆئەوەی خورماڵیش هەر بەوپێیە. ئەم کۆپلەیە ئەگەر بە گەڕانەوە بۆ یەکەم نەبێت، ئەوا واتا و مەبەست لە جێناوی کەسی دووەمی جودای تاک، کە (تۆ)یە، کێیە؟ نازانرێت، بەڵام بەو بەئاگابوونە، ئەوە ڕوونە، کە کەرێک لە شەش کەرەکەی شێخ مەبەستە. تەنانەت دەربڕاوی ڕواڵەت پرسئاسا و ناوەرۆک بەراوردکاریی (تۆ لەکوێیت و ئەوان لەکوێن) پراگماتیکییانە ئەوە دەگەیێنێت، کە کەرەکە لە مودیرەکەی پێنجوێن و خورماڵ شیاوتر و لەبارترە.

لە کۆتایی هۆنراوەکەشدا، دەڵێن:

جووتێ کەرم وا لە سووورداش
یەکێ پیر و یەکێکیان جاش
بۆ یەک ئاخوڕ بوون بە وێڵداش
باری خۆیان ئەگرن معاش
بەرتۆ هەزاران عەلَبە جۆ[٣٥]

لێرەدا دیسان پراگماتیکییانە ئەو واتایە گەیێنراوە، کە کەسێکی بەتەمەن و یەکێکی لاو، کە بەجۆرێک لە جۆرەکان پێوەندییان بە سەلام و بێکەسەوە هەبووە، بەڵام لە خزمەتی میریدا بوون. جا لێرەدا جێناوی (م) کە بۆ کەسی یەکەمی تاکی لکاوە و شێخ سەلام یاخود بێکەس یەکێکیانن، ئەو واتا پراگماتیکییە دەگەیێنن، کە ئەو دوو مووچەخۆرەی داگیرکەر، کە لە سووورداشن، وەک شەش کەرەکەن بۆم، بەڵام ئەوان خۆیان ڕۆزیی خۆیان بە نۆکەریی داگیرکەر دەستەبەر دەکەن. جا وشەی (معاش) کە عەرەبییە و واتای مووچە دەگەیێنێت، کراوە بە هاوواتای ئالیک. هەرچی وشەی (ئاخوڕ)یشە، ئەوا بەواتای شوێنکار و فەرمانگەکەیان هێنراوە. جا لەبەرئەوەی واتای پراگماتیکی پێویستی بە کات و شوێن و بۆنە و...تاد، هەموو ئەوانە هەیە، واتە زۆرینەی ڕەگەزەکانی ئەو دەوروبەرەی شیعرەکەی تێدا وتراوە، لەبەرئەوە مەرج نییە بە گەڕان بە تۆماری ئەودەمەی سووورداشیشدا، بتوانرێت ئەو دوو کەسە، مەبەست لێیان کێ بوون، بزانرێت. هەربۆیە لە ئاستێکی دیاریکراودا نەبێت، ناتوانین لە مەبەستی شاعیرەکان بەگشتی بگەین، چونکە دەشێت دوو فەرمانبەری ئاسایی بووبن، نەک مودیر. هاوکات لە قەزا و ناحیەکاندا دەشێت ژمارەیەکی زۆر مووچەخۆر و فەرمانبەر و تەنانەت چەند مودیرێکیش هەبن، ئەگەرچی بە پلەی یەکەم، کەسە باڵادەستەکان دەکرێنە ئامانج، کە مودیر ناحیە و سەرووترین. دیارە ئەمەش کۆکە لەگەڵ ئەوەدا، کە دەوترێت: واتای پێوەند بە شوێنەوە، بنیاتدەنرێتە سەر واتایەکی تایبەت، کە شوێنەکە پێیدەبەخشێت، نەک گوفت و پێکهاتەکەی، پێیدەبەخشێت.(٣٦)

شێخ سەلام، لە هۆنراوەی (چاوەڕوانی)دا، کە لە (١٩٤٦) لە قەڵادزە نووسیویە، بەجۆرێک لایەنی ڕامیاری و نەتەوەیی و ئەوینداری ئاوێتە کردوون، کە مەگەر خوێنەری وریا بتوانێت بەیاریدەی کاتی وتنەکەی، لە مەبەستی شاعیر بگات، کە ڕووی دەمی لە نەتەوەی کورد و لە ئازادی و لە کۆماری کوردستانە، چونکە پێدەچێت کۆمار بەنیاز بووبێت شاری سەردەشت بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، بەڵام هەلومەرجەکە لەبار نەبووبێت. بۆیە شێخ سەلام، لە هۆنراوەکەیدا، دەڵێت:

پـێـی وتـم تـۆ چـاوەڕێ بە دوای سەعاتێ دێمە لات
ئەم سەعاتە چەند درێژە چی بوو هەر دوایی نەهات[(٣٧)]

دەربڕراوەکانی ئەم بەیتە، دەبێت پراگماتیکییانە بۆ مەبەستیان بگەڕێین، چونکە سـەعات بەواتـای ٦٠ خـولەک نەهـاتووە، بەڵکـو هەروەک لە قسـەکردنی ئاسـایی کـورددا زۆرجـار دەسـتەواژەکانی: پـاش کەمێـک، یەک دەقیقە...تـاد، واتای پیتەکی ناگەیێنن، بەڵکو مەبەست ئەوەیە، کە زۆر ناخایێنێت. جا هێنانی دەسـتەواژەی (دوای سـەعاتێ) لەپێنـاوی ئەوەدا هێنـراوە، کە وەک ژوانـی دوو دڵدار سەیر بکرێت، چونکە ئەم ئازادیی مەبەستە، واتە ڕزگـارکردنی سەردەشـت و ناوچەکـانی تـر. کەواتە ئەوەی بە (پێـی وتـم) گوزارشـتی لێکـراوە، ئەوە (کۆمار)ە، کە ئەو ژوانەی دیاریکردووە، نەک تاکەکەس.

دواتر، دەڵێت:

مـن دڵم لای تـۆیە بەخوا لێی بپرسە تووخوا
ڕۆح لەبەر وادەی ویساڵە چاوەڕوانە دەرنەهات[(٣٨)]

لێـرەدا دیسـان (تـۆ) مەبەسـت لە (ئـازادی و ڕزگـاربوون)ە، نەک کەسـی دووەمـی تـاک. جێنـاوی لکـاوی (ی)ش، کەسـی سـێەمی تـاک نـیـیە، بەڵکـو مەبەست دڵی شێخ سەلامە، کە لەلای ئازادییە. ویسـاڵیش، مەبەسـت گەیشـتنە بە ئازادی، دەنـا شـاعیر ئەو خواسـتی گەیشـتنەی بە ئـازادی نەبـووایە، گیـانی دەردەچوو. ئەمبیرتۆ ئیکۆ، سـەبارەت بە هێمـای ڕۆمانسـی، بۆچـوونێکی هەیە، کە دەڵێـت:"... هەر کە واتـای دووەم بەدەسـتبێنین، ئیتـر واتـای یەکەم وەلادەنێین، چونکە دووەم بە فێڵ دادەنێین و مەبەستە راستەقینەکە نییە"[(٣٩)].

ئەم بەیتە لایەنێکـی کەلتـووری کـوردەواری تێـدا ڕەچـاوکراوە، کە ئەویـش ئەو بۆچـوونەیە، کە گـوایە مـرۆڤ لەکـاتی سـەرەمەرگدا، ئەگەر چـاوەڕێی خۆشەویستێکی بکات، ئەوە دەبێتە هـۆی ئەوەی کـاتێکی زۆرتـر بە گیـانەڵاوە بێت و گیانی دەرنەچێت، تا ئەوکەسە دێتەوە، ئەوجا گیانی دەردەچێت. کەواتە ئەم کەرەسـتە زمانییـانە پراگماتیکییـانە بەکـاربراون، نەک بەشـێوەی ئاسـایی یاخود سیمانتیکی.

دواتر، دەڵێت:

تیرە تیرە جەمعی میللەت هات و ڕێی دیلی بڕی
کوردی بێچارە بەجێما کەوتە ڕێی هات و نەهات[(٤٠)]

دەربڕراوی (تیرە تیرە) بەواتای (نەتەوە بە نەتەوە) هێنراوە و (بڕینی ڕێی دیلی) بەواتای (بەئازادی گەیشتن) هێنراوە. (بەجێمانی کورد) بەواتای (بە دیلی مانەوە)یە. واتە ئازادبوونی کەوتووەتە ڕێی هات و نەهاتەوە.

لە بەیتێکی تردا، دەڵێت:

پڕ بەپێ زنجیری دیلی تەوقی زیللەت پڕ بە مل
گـەر زمـانـم بۆ بچەرخێ باسی ئازادی ئەکات[٤١]

لە نیوەی یەکەمدا، نە جێناوی لکاوی کەسی یەکەمی تاک، کە (م)ە و نە جێناوە جوداکەی، بوونیان نییە، بەڵام بە هاتنی جێناوی (م) لە نیوەی دووەمدا، واتای ئەوانەی یەکەمیش دەگەن. کەواتە ئەوە پێی شێخ سەلامە لە زنجیری دیلیدایە و ئەوەش هەر ملی ئەوە، کە لە تەوقی زیللەتدایە و بەو بارەشەوە، ئەگەر تەنیا بتوانێت زمانی بجوولێنێت، ئەوا لە ئازادی دەدوێت.

دواتر، دەڵێت:

قەدی سەرووم گرتە باوەش، دەم بەرم بۆ ناودەمی
زوڵفەکەی ئاڵا بە ملما ماری سەرچەشمەی حەیات[٤٢]

لێرەدا شێخ وێنەیەکی شیعریی جوانی خستووەتە ڕوو، چونکە ئازادیی وەک باڵای شۆخێکی تەنکە وێنا کردووە، کە ئەم باوەشی پێدا کردووە، بەڵام دوای باوەشپێداکردنی مرۆی نێری عەزرەتی، دیارە خدەی ماچکردن دەهەژێت و لەو ساتەدا ژیان لە دەم گەیاندنە دەمی دڵبەردا دەبینرێت. جا ئەگەر زوڵفی پەرێشانی دوڵبەر بە ملی دڵداردا بئاڵێت، ئەوا ڕێگری لە ماچکردنەکە دەکات. کەواتە ئاوی ژیان (حەیات)، کە مرۆڤ لە سەردەمە کۆنەکانەوە وێڵە بەدوایدا، تاوەکو بە ژیانی نەمری بگات، ئەوا ئەو ئاوی ژیانە لە دەمی شۆخەکەدایە، بەڵام زوڵفەکەی لێ بووە بەو مارەی، کە ناهێڵێت دڵدار بەو ئاوی ژیانە بگات. کۆواتای دێڕەکەش نەگەیشتنە ئازادیی تەواوە، کە بەوەش لە ژیانی ژێردەستەیی ڕزگار دەبین، دەنا بەدەر لەوە ژیانی دیلی و مردنە.

لە دێڕێکی تردا، دەڵێت:

شەوقی خۆر ئەبڕێت و دنیا ڕەش ئەکا جەبهەی غرووب
حەقیەتی گەر ڕۆژ پەرست ڕووی خۆی بکا بۆ ڕۆژهەڵات[٤٣]

شـێخ سـەلام، لەم دێـڕەدا، ئـایین و مێـژوو و رامیـاری، هەمـوو پـێکەوە پراگماتیکییانە دەخاتە ڕاژەی مەبەست و پەیامەکەی خـۆی، لەوەدا کە ئەرێ بە کۆمـار و قـازی دەدات، کە کـارێکی چـاک دەکەن، کە لەگەڵ بلـۆکی ڕۆژهەڵاتـدا واتە لەگەڵ سۆڤێت و کۆمۆنیستەکاندا دۆست و هاوکاربن، چونکە ڕۆژئاوا لەگەڵ خواستی ئێمەی کورددا نین. بێگومان (جەبهەی غرووب) وەک ئاماژە بۆ بلـۆکی ڕۆژئاوا هـاتووە و هاوکـات بەواتـای ڕۆژئاوابوونیشـن. جـا وەک ئەوەی کە کـورد میترایـی و زەردەشـتی بـووە و ئەوانەش بە ڕۆژپەرسـت و ئاگرپەرسـت لەلایەن ناحەزانیـانەوە باسـکراون، کەواتە (شـەوقی خـۆربڕین) بەواتـای دژایەتیکردنـی ئـازادیی کـوردە، سـەلام لەوە گەیشـتووە، کە ڕۆژئاواییـیەکـان، بەتـایبەت لەو ڕۆژگـــارەدا، لەگەڵیـــدا نەبـــوون. بەڵـــگەی ئەوەش ئەو پەیماننامـــانەن، کە داردەســـتەکانی ڕۆژئـــاوا بە چـــاودێریی ئەوان لەنێـــوان وڵاتـــانی داگیـــرکەری کوردســـتاندا، بەســـتوویانە و شـــێخ خـــۆی بە شـــیعر لەو پەیماننامـــانە دواوە. (ڕۆژپەرسـت)یش بەواتـای (کـورد) هێنـراوە، هەروەک پێشـتر ڕوونمـانکردەوە. ڕووکردنە ڕۆژهەڵاتیش لەواتای ئاساییدا، دیـارە سـرووتێکی ئاسـاییی میترایـی و ئایینە کۆنەکـانی کـوردە، بەڵام واتـا پراگمـاتیکییەکەی ئەوەیە، کە خـرایە ڕوو، لەوەدا کە کورد مافی خۆیەتی، گەر لەپێناو ئازادیدا ڕوو لە سۆڤێت بکات، وەک ئەوەی کۆماری کوردستان لەو ڕۆژگارەدا کردی.

لە دێڕی دواتردا، دەڵێت:

مالّی بابی تـۆیە ئەم موڵکە برا بەش بەش کرا
بێ کەسی وا دەستی بەستی، قانعن مام و برات [٤٤]

لێـرەدا جێنـاوی جـودای کەسـی دووەمـی تـاک، کە (تـۆ)یە، (کـورد) مەبەسـتە، (موڵـک) بەواتـای (کوردسـتانی گەورە) هـاتووە. سـەبارەت بە دەربڕراوی (برا) ڕوون نییە، ئایا مەبەست (برا)یە یاخود (بـررا)یە، چونکە لە کوردیدا ئەگەر فۆنەتیکییانە لە چاوگی (بردن)ەوە، بکەرنادیاری (بـررا) ڕەچـاو بکەین، ئەوا زۆر جار وەک (برا) گۆ دەکرێت یاخود دێتە گوێ، کە ڕاستییەکەی (بررا)یە. بۆیە ڕەنگە سەلامیش فۆنەتیکییانە ڕەچاوی کردبێت، بەڵام (بـررا)ی مەبەسـت بووبێـت. خـۆئەگەر وابێـت، ئەوا (بـررا) بەواتـای (دزرا) هێنـراوە.

بێگومان ئەمە لەگەڵ کۆی واتـای هۆنراوەکەشـدا کـۆکە، چـونکە داگیـرکەران لە هەمـــوو بارێکـــدا، دزن. ولاّتـــی ئـــێمەش لەلایەن زلهێـــزان و داگیـــرکەرانەوە پارچەپـــارچە و بەشبەشـــکراوە. لە نیـــوەی دووەمـــی دێڕەکەشـــدا، کە وشـــەی (بـــێکەس) هـــاتووە، (کەس) بەواتـــای (بێپشـــتەوانیی نێـــودەوڵەتی) هـــاتووە. وتراوی (قانعن) بەواتای (ملکەچن) هێنـراوە، چـونکە کـورد دەڵێـت: (پیـاو بە بێکەسی، هەژار دەبێت)، دیارە هەژاریش لەزۆر باردا بەرامـبەر بە دەسـەڵاتداران و ملهوڕان ملکەچ دەبێت. ئەم هەلـومەرجە زمانییـانە بـوونەتە هـۆی ئەوەی، کە زانایان بڵێن: "لەلایەنی چەمکی فەرهەنگییەوە زۆر لە وشـەکان دەبـنە هێمـا بـۆ پتـر لە واتـایەک، جـا ئەوەی ئەو واتایـانە جـودا دەکـاتەوە، ئەوە دەوروبەری دەقەکەیە"[٤٥]، دیارە ئەمە بۆچوونێکی دروستە، چونکە هەرکام لەو کەرەسـتانە بگرین، ئەوا واتایەکی فەرهەنگیـی خۆیانیـان هەیە، کە بە بەئاگـایی لەوەی کـێ دەقەکەی بەرهەمهێناوە و کەی و لە چ ساڵ و ڕۆژگارێکدا، ئەوا واتای مەبەستی شاعیرەکە ڕوون دەبێتەوە، وەک ئەوەی کە خستمانەڕوو.

لە دێڕێکی دواتردا، دەڵێت:

بای شەماڵ ئەمڕۆ موحەققەق (پەرچەمی) جووڵاندووە
بۆنی نێرگس، بۆنی گوڵ، بۆنی وەنەوشەی لێ ئەهات[٤٦]

لەم دێڕەدا (شەماڵ) بەواتای (ئازادی) هێنراوە، کە ئازادییش هات، دیارە ئاڵا هەڵدەکرێت، کە ئـاڵاش هەڵکـرا، ئەوا شـەکاندنەوە ئاسـایی دەبێـت. کەواتە وشەی (پەرچەم) بە هەردوو واتاکەی هێنراوە، چونکە واتای (ئـاڵا) و هەروەهـا بە (ئەو بەشەی قژیش دێت، کە ئافرەتان بۆ جوانی بەسـەر ناوچەوانـدا شـۆڕی دەکەنەوە). لە نیوەی دووەمدا، کە دەڵێت: (بـۆنی نێـرگس، بـۆنی گـوڵ، بـۆنی وەنەوشەی لێ ئەهات)، سـەرجەم ئەم نیـوە دێـڕە ڕەنگـی ئـاڵاکەی کوردسـتانی سـەردەمی کـۆمەڵە بـووە، هاوکـات واتـا پراگمـاتیکییەکەی ئەوەیە، کە بەهـار هاتووە یاخود مژدەی بەهار دەدات. ئەوەشمان لەبیرنەچێـت، کە لە کوردسـتانی کۆندا خودی (بەهار) تاڕادەیەکی زۆر واتای ڕزگاربوون بووە لە سەرماوسـۆڵە و بگرە لە مردنیش، چونکە لە قاتوقڕییەکاندا، هەرکەسێک بگەیشـتایەتە بەهـار و نەمـردایە، ئیتـر لە مـردن ڕزگاریـدەبوو، چـونکە تەنیـا بە گژوگیـای بەهـارەی کوردستان دەیتوانی درێژە بە ژیـان بـدات. کـۆی واتـای دێـڕەکە، کە وێنەیەکـی

شیعریی ئاشکرای تێدایە، ئەویش ئەوەیە، کە ئافرەتانی شۆخوشەنگ جگە لەوەی کە جوانی و لەشولاریان، بهەژێنی مرۆڤن، سەرباری ئەوەش لەزۆر باردا بۆنی خۆش لە سەر و مل و لەخۆیان دەدەن، جا کە شەماڵ لێیانبدات و قژ و پەرچەمیان بجوولێنێت، ئەوا نزیکەکانیان بەو بۆنە خۆشانە مەست دەکەن.

لە دێڕێکی تردا، دەڵێت:

مەمکەکانت سێوی (سەردەشتە) نەخۆشت کۆمەڵە
بۆ دەوا مـەعلوومە قازی سەدکەڕەت فتوا ئەدات [٤٧]

لێرەدا کەلتووری ئیسلام، بەتایبەت کوردی موسڵمان، وەک ڕەگەزێکی پراگماتیکی بۆ گەیاندنی واتای دێڕەکە ڕەچاوکراوە. ئەوەش لەوەدا، کە دەڵێت (کۆمەڵ نەخۆشە)، دیارە لێرەدا نەتەوەی کورد مەبەستە و نەخۆشییەکەشی بە گەیشتنە ئازادی چارەسەر دەبێت و ئازادییش کە چاکبوونەوەیە لە نەخۆشییەکە، بەدەست نایێت، بەگرتنە دەستی مەمک نەبێت، کە ئەمەش حەرامە. کەواتە لە کەلتووری کوردی موسڵماندا ئەوە هەیە، کە لەپێناوی چارەسەری نەخۆشیدا، دەشێت حەرام حەڵاڵ بێت، وەک ئەوەی کە مەی بۆ چارەسەر بە حەرام دانانرێت. کەواتە کێ دەتوانێت فەتوای ئەوەبدات، کە ئەو حەرامە، حەڵاڵە؟ ئەوە موفتییە و لێرەدا بڕیار بەدەست قازییە، کە مەبەست قازی محەمەدی پێشەوایە. کەواتە ئەو دەتوانێت بڕیاری ئەوە بدات کۆمەڵ، کە کورد مەبەستە و نەخۆشە، با بۆ چارەسەر، کە ئازادییە مەمکەکانی کوردستان، کە ناوچەی سەردەشتە، بگرێت. کەواتە سەردەشت مەمکەکانی ئازادییە، کە گرتنیان دەبێتە مایەی چاکبوونەوەی کۆمەڵ لە نەخۆشییەکەی، کە ژێردەستەییە و حەرامبوونەکەشی لەڕوانگەی بەرژەوەندیی داگیرکەرانی کوردستانەوەیە.

لە دوا دێڕی هۆنراوەکەشدا، دەڵێت:

لابە دیلی بگرە ئازادی لە شیعر و قافیەش
ڕاست ئەڕۆم و سەربەخۆ گەربێتە ڕێم پردی سیرات [٤٨]

لەم دێڕەدا هەموو دیوە ئاشکراکە، کە ئەویندار بوو، وەلای دەنێت و دیوە نائاشکراکە، کە قسەکردن بوو لە ئازادی، ئاشکرا کراوە. تەنانەت بۆ شیعریش، دەڵێت: دیلی قافییەش نابم و بە شارراوەییش شت دەرنابڕم، بۆئەمەش چیم دێتە ڕێ، باکم نییە.

## ئەنجام

١ - توانا و زمانزانیی سەلام بەشێوەیەکی لەبار، وایکردووە، کە بتوانێت، بە زمانێکی پاراو و پێڕەوبەند شیعر و پەخشانی هونەری بنووسێت و ڕەچاوی ئەو زارەیشی کردووە، کە ڕێچکەی ستانداردبوونی گرتووە.

٢ - لە نووسین و هۆنراوەکانیدا بەشێوەیەکی کارامانە کارکردەیی زمان (پراگماتیک)ی لەپێناوی گەیاندنی واتای مەبەستدا بەکارهێناوە.

٣ - گەپ و پلاری کردووەتە دوو کەرەستەی دەربڕینی کارکردەیی زمان بۆ گوزارشتکردن لە خواستەکانی و دژایەتیکردنی داگیرکەران و نۆکەرانیان.

٤ - کەساندنی ئاژەڵ و بێگیان و کردنیان بە هۆکاری گەیاندنی واتای کارکردەیی زمان، بەشێوەیەکی لەبار بە چەشنێک کە گوۆای زمانزانی و هۆشیاری و ڕۆشنبیریی شێخ سەلامین.

## سەرچاوە و پەراوێزەکان:

(١) دیوانی سەلام، ئامادەکردن و پێداچوونەوە و پێشەکی بۆ نووسینی: ئومێد کاکەرەش، لە بڵاوکراوەکانی پرۆژەی هاوسەر، سلێمانی ١٩٩٠ .ل (١١٢).
(٢) بڕوانە: دیوانی سەلام، ل (١٣٠).
(٣) دیوانی سەلام، ل (٧٠).
(٤) سەرچاوەی پێشوو، ل (٩٧).
(٥) سەرچاوەی پێشوو، ل (٧٩).
(٦) دیوانی شیعر، محەمەد صالح دیلان، ل (٢٦٨).
(٧) دیوانی سەلام، ل (٢٠).
(٨) سەرچاوەی پێشوو، ل (٢٠ — ٢٢).
(٩) دیوانی سەلام، ل (٤٦).
(١٠) بڕوانە: اللغة والمعنى — مقاربات في فلسفة اللغة، دليل محمد بوزيان ورفاقه، ص (١٨٥).
(١١) لسانيات النص، مدخل الى انسجام الخطاب، محمد خطابی، ص (٥٢).
(١٢) پێشتر لەم بەیتەو هۆنراوەکە دواوین، بەڵام لەپێناو لایەنێکی تری زمان و شیعری سەلامدا بوو.
(١٣) دیوانی سەلام، ل (٤٨).
(١٤) سەرچاوەی پێشوو، ل (١٨٠).
(١٥) دیوانی سەلام، ل (٦٦).
(١٦) سەرچاوەی پێشوو.
(١٧) سەرچاوەی پێشوو، ل (١١٢).
(١٨) لە ئەدەب و فۆلکلۆری کورددا، پەری هەمیشە جوانە، ئەمەش وایکردووە، کە دڵبەری جوان بە پەری بچوێنرێت و ئەویندداربوونی زۆریش، بە کەوتنە تەلیسمەوە، دابنرێت.
(١٩) دیوانی سەلام، ل (١١٢).
(٢٠) التحليل اللغوي للنص – مدخل الى المفاهيم الاساسية والمناهج، کلاووس برینکر، ص (١٤٢).
(٢١) دیوانی سەلام، ل (١١٣).
(٢٢) سەرچاوەی پێشوو، ل (٢٢٧).
(٢٣) سەرچاوەی پێشوو، ل (٢٢٧).

(٢٤) دیوانی سەلام، ل (١١٨).
(٢٥) سەرچاوەی پێشوو.
(٢٦) الظاهرة الدلالية، د. صدرالدين زرال، ص (٣٩٦).
(٢٧) دیوانی سەلام، ل (١٢٢).
(٢٨) لە کوردەواریـدا، دەوترێـت، کە ئەمـانە جنـۆکەن و منـداڵیان مـردووە، بـۆیە هەمیشە دەیانەوێت کۆرپەی نەوزا بۆخۆیان ببەن. تەنانەت دەوترێت شەوە هێنـدە منداڵی خۆشدەوێت، کە بەهێز بەخۆیەوە دەیگوشێت و بەمەش منداڵەکە دەمرێت.
(٢٩) بڕوانە: بوارە واتاییەکان، هۆگر مەحموود فەرەج، ماستەرنامە، ل (٤٨ — ٤٩) (چاپ نەکراوە).
(٣٠) بڕوانە: دیوانی سەلام، ل (١٩).
(٣١) سەرچاوەی پێشوو، ل (٥٥).
(٣٢) بڕوانە: اللغة والمعنى، دليل محمد بوريان وآخرون، ص (١٣٥).
(٣٣) دیوانی سەلام، ل (٥٤).
(٣٤) سەرچاوەی پێشوو.
(٣٥) دیوانی سەلام، ل (٥٤).
(٣٦) اللسانيات: المجال، الوظيفة، المنهج، الدكتور سمير استيتيه، ص (٢٩٠).
(٣٧) دیوانی سەلام، ل (١٤٦).
(٣٨) سەرچاوەی پێشوو، ل (١٤٦).
(٣٩) السيميائية وفلسفة اللغة، امبيرتو ايكو، ص (٣٤٢).
(٤٠) سەرچاوەی پێشوو.
(٤١) دیوانی سەلام، ل (١٤٦).
(٤٢) سەرچاوەی پێشوو.
(٤٣) سەرچاوەی پێشوو، ل (١٤٦).
(٤٤) دیوانی سەلام، ل (١٤٦).
(٤٥) منهج البحث اللغوي بين التراث وعلم اللغة الحديث، علي زوين، ص (١٨٥).
(٤٦) سەرچاوەی پێشوو، ل (١٤٧).
(٤٧) دیوانی سەلام، ل (١٤٧).
(٤٨) دیوانی سەلام، ل (١٤٧).

## ملخص البحث

يتلخص البحث في فصل واحد، متمثلاً بثلاثة مباحث، أما في المبحث الأول: نتكلم عن الشاعر شيخ سلام كشاعر وطني مخلص لبني جلدته ومتفاني لوطنه كوردستان وملماً ولعاً بلغته الأم، كما وكان له إلمام باللغات الاقليمية كالعربية والفارسية. وهذا بطبيعة الحال كان له تأثير عظيم لتصقيل ثقافته ومواهبه الادبية واللغوية. أما في المبحث الثاني: فنتناول النثر الفني وقدرة الشاعر في هذا المضمار، كما ونتكلم عن المعجم اللغوي الذهني الواسع والزاخر بمفردات اللغة الكوردية وتمكنه من التعابير الجميلة لإيصال أغراضه الشعرية بطريقة سلسة. أما في المبحث الثالث والاخير فنتكلم عن الاستعمال التداولي للمفردات والتعابير اللغوية عند الشاعر سلام ببراعة بحيث يشهد على معرفته لا باللغة فحسب بل بالتراث الكوردي ودقائقها، كما ويدل على سعة ثقافته في مجالات عديدة. فالبحث يستهل بمقدمة ويختتم بعدد من النتائج ومن ثم بقائمة المصادر، وبعدها يأتي الملخص باللغتي العربية والانكليزية.

## Abstract

The study is composed of one chapter represented by three sections. The first section is about the Kurdish poet Sheikh Salam who was a patriotic, sincere and national poet dedicating his life for serving his homeland, Kurdistan. He was also familiar with and fond of his mother tongue. As Salam was familiar with other regional languages such as Arabic, and Persian, this of course has had a great influence for glossing his education and literary and linguistic talents. The second section is dedicated to focus on the artistic proses and the ability of the poet in writing them. It also reveals his rich and comprehensive repertoire which is full of Kurdish vocabularies and his ability in using the attractive expressions to deliver his poetic purposes smoothly. The third and the last section is devoted to discussing the poet’s fantastic and creative semantic usage of the vocabularies and linguistic expressions. His creativity cannot be witnessed only by his mastering of the Kurdish language, but also by his minute knowledge about the Kurdish legacy and heritage. This indicates the broadness of his personal education in different walks of life. The study begins with an introduction and ends with a number of results and conclusions along with a list of bibliography.

# زمان له نێوان خواستی زمانەوانان و ڕاگەیاندنناساندا

د. ئازاد ڕەمەزان عەلی
زانکۆی پۆلیتەکنیکی هەولێر

## پێشەکی

### - ناوونیشانی لێکۆڵینەوەکە:

ناوونیشانی لێکۆڵینەوەکە (زمان لە نێوان خواستی زمانەوانان و ڕاگەیاندنناساندا) یە، زمان وەك دیاردەیەك پێوەندییەکی پتەوی بەمرۆڤ و ژینگەکەیەوە هەیە، گرینگییەکەی لەوەدایە، کە تەواوکەری پێوەندیکردنی مرۆڤە لە نێوان خۆی و ئەندامانی ژینگەکەی و ڕێگا خۆشکەرە بۆ گوزارشتکردن لە هەست و سۆز و بیر و هۆش و گەیاندنی بۆ کەسانی دەوروبەری. هەریەکێك لە زمانناسی و ڕاگەیاندنناسی دوو زانستی جیاوازن و مەیدانی کارکردنیان لەگەڵ یەکتری جیاوازە، بۆیە کاتێ کە زمان دەبێتە کەرەستەی هاوبەشی لێکۆڵینەوە بۆ هەردووك لەم زانستانە، خواست و ویستی توێژەرانیان، لە هەندێك لایەن جیاواز دەبێت، لە هەندێ لایەنی تریش هەمان خواست و ویستیان دەبێت .

### - سنووری لێکۆڵینەوەکە:

ئەم لێکۆڵینەوەیە، لێکۆڵینەوەیەکی وەسفییە بۆ زمان وەکو کەرەستەیەك لە نێوان هەردوو زانستی زمان و زانستی ڕاگەیاندن، بە شێوەیەکی گشتی باس لە خواست و ویستی هەریەکێك لە زمانەوانان و ڕاگەیاندنناسان و خستنە ڕووی تێڕوانین و بۆچوونی هەندێکیان بۆ زمان وەکو کەرەستەیەکی گرینگ بۆ بابەتی زمانەوانی و ڕاگەیاندنناسی، لەسەر ئاستی گشتی نەك زمانێکی تایبەت، واتە باس لە زمانی ڕاگەیاندنی زمانێکی تایبەت ناکات، بەڵام لەهەندێ شوێندا ئاماژە بە زمانی ڕاگەیاندنی کوردی کراوە لەگەڵ خستنەڕووی هەندێ تێبینی دەربارەی دۆخی زمانی ڕاگەیاندنی کوردی لە چوارچێوەی ناوەرۆکی لێکۆڵینەوەکەدا.

**- گرینگی لێکۆڵینەوەکە:**

زمـان دیاردەیـەکی کۆمەڵایەتییـە و پێویسـتییەکی پێوەندیکردنـە لـە نێـوان کۆمەڵانی مرۆڤدا. لەلایەك پێویستییەکی گشتییە بۆ جێبەجێکردنی کـاروکردەوەی ڕۆژانەی خەڵك، لەلایەکی تـر پێویسـتییەکی تایبەتـە بـۆ گوزارشـتکردن لـەو بـیر و بۆچوونانەی کـە لـە هـزر و مێشـکی تاکدایـە. هـەردووك لـەم پێویسـتییانە کەسـی ڕاگەیاندنکار و زانستی ڕاگەیاندن بەشێوەیەکی تایبەت پێویسـتییەتی بەمەبەسـتی جێبەجێکردنی ئەرکە بناغەییەکانی. پرۆسەی ڕاگەیاندنیش، پرۆسەیەکی جێگیر و وەستاو نییە، بەڵکو پرۆسەیەکی دینامیکی و بە جووڵەیە، کە زمان لەو چوارچێوە ڕۆشنبیرییەی پێوەندیکردن، شوێنێکی تایبەتی هەیە و ئەرکێکی تایبەت جێبـەجێ دەکات (نهر، ١٩٨٨، ل٨٩). گرینگی ئەم لێکۆڵینەوەیـە لەوەدایـە، کـە زمـان وەك کەرەستەیەکی هاوبەشی نێوان زماننـاسی و ڕاگەیاندنناسی و خستنەڕووی خواست و تێڕوانینـی هـەر یـەکێك لـە زمانناسـان و ڕاگەیاندنناسـان بـەهۆی جیـاوازی و هاوڕایی هەرلایەکیان بۆ ئـەم بابەتـە، کـارێکی ئـاڵۆزە، کـە ئەمـەش بەشـێوەیەکی سـەرەکی بـۆ جیـاوازیی بـوار و مەیـدانی کـارکردنی هەریـەکێکیان بـۆ ئـەم بابەتـە دەگەڕێتەوە .

ئەگەرچی ئەم لێکۆڵینەوەیە بەسەر زمانێکی تایبەتدا پیادە نـەکراوە، بـەڵام بەشـــێوەیەکی گشـــتی بابـــەتێکی گرینگـــە لـــە هـــەردوو بـــواری زماننـاســـی و ڕاگەیاندنناسـیدا و پیشـاندانی جـۆرە بەراوردێکـە لـە نێـوان خواسـت و تێڕوانینـی زمانناسان و ڕاگەیاندنناسان بۆ زمان و هیواداریـن سوودی خۆی هەبێت .

**- گرفتی لێکۆڵینەوەکە :**

هەریەك لە زانستی زمـان و زانسـتی ڕاگەیانـدن ، بـەش و لقـی جیاجیایـان لێ دەبێتەوە ، کە وادەکـات تێکـەڵی زانسـتی تـرین، بۆنموونـە: زماننـاسـی پێوەنـدی لەگەڵ دەروونناسی و کۆمەڵناسی و پەروەردە و فیزیا...هتد هەیـە، ڕاگەیانـدنیش بەهەمان شێوە، واتە هەموو ئـەو زانسـتانەی باسمـانکرد تێکـەڵاوی هەریـەکێك لـە زمانەوانی و ڕاگەیاندنناسی دەبن.

زمان دیاردەیەکە لە دیاردەکانی ئاکاری مرۆڤ و تێکەڵە لەگەڵ پێکهاتەی کۆمەڵگا ، کە بەهۆیەوە تاك و کۆمەڵ پێوەندیکردن ئەنجام دەدەن و زانیاری و شارەزایی لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی تر، یان لە کۆمەڵ بۆ کۆمەڵ و نەوە دوای نەوە دەگوازرێتەوە، لەم چوارچێوەیەدا هەست و سۆز و تێگەیشتن و قایلکردن دروست دەبێت . زانایانی زمان و ڕاگەیاندن و پەروەردە و دەروونناسی و کۆمەڵناسی .... هتد جەخت لەسەر توانستی زمان لە تێگەیاندنی جەماوەر و گەیاندنی زانیاری و بیر و بۆچوون لە ڕێگای هۆکارە جیاجیاکانی ڕاگەیاندن دەکەنەوە، کە گوزارشتی زمانیش بەشێکی گرینگە لە پرۆسەی ڕاگەیاندندا . لە چوارچێوەی ئەم پێوەندییە فراوانەی زمان بەهەموو ئەو زانستانەوە و دەستنیشانکردنی خواستی جیاجیای هەریەکێکیان بۆ زمان لە سنووری زانستەکەی خۆیان، کارێکی ئاسان نییە، چونکە لەهەندێ لاوە جیاوازی تێ دەکەوێت و لە هەندێ لاش هاوبەشی.

**– کەرەستەی لێکۆڵینەوەکە:**

لەم لێکۆڵینەوەیەدا پشت بەو سەرچاوانە بەستراوە، کە هەندێکیان تایبەتن بە بابەتی زمان و زمانەوانی، هەندێکی تریان بەڕاگەیاندن و زانستی ڕاگەیاندن، یاخود تایبەتن بەهەردوولا.

**– ئامانجی لێکۆڵینەوەکە:**

زمان وەکو ئامرازێکی پێوەندیدار بەکار و چالاکی زمانەوانان و ڕاگەیاندنناسان ، واتە لە نێوان کەسانی پسپۆڕ لە هەردوو بواری زمانەوانی و ڕاگەیاندن، هەریەکێکیان کاتێك کە ئیش لە سەر زمان دەکەن وەکو کەرەستەیەکی گرینگ، تێڕوانین و بیروبۆچوونی تایبەتیی خۆیان هەیە بۆی، لە بواری زمانەوانیدا، زمان کەرەستەیەکی گرینگی مەیدانی لێکۆڵینەوەی ئەم زانستەیە و هەموو ئەو پێناسانەی لە دووتوێی لێکۆڵینەوەکەدا بۆی کراوە، سنووری ئەو کار و چالاکییە پیشان دەدات کە لەو بوارەدا دەکرێت. بە گوێرەی ڕاگەیاندنناسیش، هەموو ئەو لێکۆڵینەوانەی لەم بوارەدا کراون، ئەوە دەردەخەن کە زمان پێوەندییەکی پتەوی بە ڕاگەیاندنەوە هەیە و ڕاگەیاندنیش بەهەمان شێوە، لە ژێر ڕۆشنایی شیکردنەوەی ئەم پێوەندییەی نێوان زمان و ڕاگەیاندن،

ڕاگەیاندنناسان وای دەبینن، کە زمان هەر تەنها هۆکارێك نییە لە هۆکارەکانی پێوەندیکردنی جەماوەری (ڕاگەیاندن)، بەڵکو پێوەندیکردن ئەرکێکە لە ئەرکەکانی زمان، ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیە خستنەڕووی خواست و ویستی هەریەکێك لە زمانەوانان و ڕاگەیاندنناسانە بۆ زمان، چونکە بە گوێرەی تێڕوانینیان بۆ زمان وەك ئامرازێکی گرینگ لە مەیدانی کار و چالاکی هەریەکێکیان، لە هەندێ باردا خواست و ویستیان جیاوازە لە هەندێ باریشدا هاوخواستن.

**– ناوەرۆکی لێکۆڵینەوەکە:**

لێکۆڵینەوەکە لە دوو تەوەر پێکهاتووە :

تەوەری یەکەم دوو بابەت لەخۆی دەگرێ کە بریتین لە ( زمان و زمانەوانی و زمان و ڕاگەیاندن ) لە تەوەری دووەمیشدا باس لەو بابەتانە کراوە (شێوەکانی زمانی ڕاگەیاندن، زمانەوانان و زمانی ڕاگەیاندن) لە کۆتاییدا ئەنجامەکان و کورتەی لێکۆڵینەوەکە بە هەردوو زمانی ئینگلیزی و عەرەبی خراونەتە ڕوو.

## تەوەری یەکەم

### - زمان و زمانناسی:

پێوەندیی نێوان مرۆڤ و زمان، وەکو پێوەندیی نێوان مرۆڤ و ژیان وایە ، چونکە کاتێ مرۆڤ ئاشنای زمان بوو، جیهانی داخراوی لە ژیانی خۆیدا دۆزییەوە ، واتە زمان یارمەتیدەری بوو لە چوونە دەرەوەی لەو ژیانەی گیانداری و داخراوییەی کە تێیدا بوو، بۆ بیرکردنەوە و ڕێکخستنی ژیان و گەیشتن بەو پێشکەوتنەی کە ئێستا تێیدایە. دونیای زمان تاکە دونیایە، کە ڕەگەز و بناغەییەکانی لێکۆڵینەوەی مرۆیی دەستەبەرکرد ، کەواتە زمان تاکە هۆکارە بۆ گەشەکردن و پێکهێنان و پێشخستنی زانیاریی مرۆیی.

نازانرێ مرۆڤ چەندین ساڵی بەسەر بردووە لە بەکارهێنانی زمان بێ ئەوەی خۆی ماندوو بکات لە نهێنی و لایەنە شاراوەکانی ئەم دیاردەیە بکۆڵێتەوە، بەلاّم بەبەراورد لەگەڵ بوونی مرۆڤ لەسەر زەوی و مێژووی لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان زۆر لەمێژ نییە بیری لەم بابەتە کردۆتەوە، کە لە پاشماوەی میسرییە کۆنەکان و پاشان سۆمەری و ئەکەدییەکان و ئینجا هیندییەکان و یۆنان و ڕۆمان و عەرەب و هتد..... دیارە. (نهر، ١٩٨٨، ل٧-٨) نەك هەر تەنها زمانەوانان بەڵکو بیرمەندانیش بە درێژایی سەردەم لە هەوڵی لادانی پەردە بووینە لەسەر گەلێك لایەنی لێڵی و شاراوەیی زمان، کە تاکو ئێستاش نەتوانراوە بگەنە ئەو ئاستەی، کە لە سەر هەموو لایەنەکانی لادەن و وەلاّم بۆ هەندێ لەو پرسیارانە بەدەست بێنن ، کە لەماوەی هەزاران ساڵی ژیانی مرۆڤ لە سەر زەوی وروژێنراوە، وەکو ئەو پرسیارانەی کە پێویستییان بە ڕەچەڵەکی زمانەکانەوە هەیە، کە ئایا هەموویان یەك ڕەچەڵەکیان هەیە ؟ یان زیاتر؟ چۆن سەری هەڵداوە ؟ چۆن بلاّوبۆتەوە ؟ چۆن گۆڕاوە ؟ کامەیان سەر بەیەك گرووپن؟ ژمارەی زمانەکانی جیهان چەندن ؟ بەدرێژایی سەدە زمان لە ڕووی دەنگ یان ڕێزمان یان واتای وشەکانی چۆن دەگۆڕێت؟ پێوەندیی کۆمەڵ بەم گۆڕانکارییانەوە چییە ؟ دیالێکت چۆن سەر هەڵدەدات و چۆن دابەش دەبێت؟ ئەمانەو دەیان پرسیاری تر ، کە لەوانەیە کۆتاییان نەبێت، هەموو ئەوە دەردەخەن کەوا مرۆڤ هەر لەکۆنەوە تاکو ئێستا بایەخێکی زۆری بە لێکۆڵینەوەی زمان داوە، کە سوودی لێکۆڵینەوە

زمانەوانییەکان بایەخەکەی هاوتایە لەگەڵ بایەخی زمان خۆی کە دەبێتە بابەتی لێکۆڵینەوەکە. (خرما،١٩٨٧، ل١٧-١٨)

مرۆڤ تەنیا دیاردەیەکی کۆمەلآیەتی نییە، بەڵکو دیاردەیەکی زمانیشە ، کەسایەتی مرۆڤ ، شێوەی بیرکردنەوە و تێگەیشتنی لە جیهانی دەوروبەری و ڕادەی ڕووناکبیری ، پێش هەر شتێك لە زمانەکەیدا دەردەکەون. زمان بۆ گرووپ و نەتەوەیش دەتوانێت بەهەمان شێوە بێت ، ئاستی فیکر و ئاوەز و شارستانییەتی و تایبەتمەندییەتی کولتووری، ئیتنیکی و نەتەوەییەکانیان پیشان بدات. (سابیر، ٢٠٠٨، ل٩)

زمان پەیوەندییەکی پتەوی بەمرۆڤ و ژینگەکەیەوە هەیە، گرینگییەکەی لەوەدایە کە تەواوکەری پێوەندیکردنی مرۆڤە لە نێوان خۆی و ئەندامانی ژینگەکەی و ڕێگا خۆشکەرە بۆ گوزارشتکردن لە هەست و سۆز و بیر و هۆشی و گەیاندنی بۆ کەسانی دەوروبەری، بەمەش کەسایەتی خۆی لەو کۆمەڵگایەدا دەچەسپێنێ کە تیایدا دەژیت. (زکریا، ١٩٨٣، ل١٩) کەواتە زمان ئامێرێکە بۆ جێبەجێکردنی پرۆسەی پێوەندیکردن لە نێوان خۆی و ئەندامانی ژینگەکەی و ڕۆژانە بەکاری دەهێنێت. (هەمان سەرچاوە)

زمان دیاردەیەکە لە دیاردەکانی ئاکاری مرۆڤ و تێکەڵە لە پێکهاتەی کۆمەڵگا، کەبە هۆیەوە تاك و کۆمەڵ پێوەندیکردن ئەنجام دەدەن و زانیاری و شارەزایی لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی تر ، یان لە کۆمەڵەوە بۆ کۆمەڵ و نەوە دوای نەوە دەگوازرێتەوە لەم چوار چێوەیەدا هەست و سۆز و تێگەیشتن و قایلکردن دروست دەبێت. زمان سیستەمێکی باوە، پێکهاتەکەی لە ئاخاوتندا ڕەمزە دەنگییەکانە، لە نووسینیشدا ڕەمزە نووسراوەکانە (وێنە ڕەمزییەکان )، ئەم ڕەمزانەش لەنێوان کۆمەڵێکی دیاریکراودا ناسراون ئەندامەکانی بۆ پێوەندیکردن و گوزارشتکردن لە بیر و بۆچوونەکانیان بەکاری دەهێنن. کەواتە زمان دەنگە و ئەندامانی ئاخاوتن دروستی دەکات لە ڕێگای شەپۆلەکانی هەواوە بۆ گوێی گوێگر دەگوازرێتەوە. (عطیة، ٢٠٠٨، ل١٦-١٧) شایانی باسە زیاتر لە سێ هەزار سیستەمی دەنگی و ڕەمزی هەیە، کە مرۆڤ وەکو هۆکارێك بۆ تێگەیشتن و پێوەندیکردنی کۆمەلآیەتی بەکاری دەهێنێت .(عبدالهادي وآخرون، ٢٠٠٣، ل١٧)

زمانناسی وەکو زاراوە لە زمانی کوردیدا زاراوەی (زمانەوانی، زمانناسی، زانستی زمان، زمانەوەری)ی بۆ بەکارهاتووە (ناوخۆش ، ٢٠٠٥، ل٤) .

گەلێك پێناسە لەلایەن زمانەوانان و توێژەرانی زمانەوانی بۆ ئەم زانستە خراونەتە ڕوو:

– زمانناسی ئەو زانستەیە کە لە زمان دەدوێت و سروشتی کۆمەڵایەتی و ئەرکی پێکهاتنی ناوەوەی، دەستووری کارکردنی ، پێشکەوتنی مێژوویی و دابەشبوونی زمانانی دیاریکراو ڕوون دەکاتەوە. (میدیا، ١٩٩٨، ل١٣) .

– زانستی زمان بریتییە لەو دیراسە سیستەماتیکییە، کە دەربارەی زمان دەکرێ و هەوڵی وەڵامدانەوەی دوو پرسیار دەدات، کە: زمان چییە؟ چۆن زمان کار دەکات؟ (وەیس، ١٩٨٤، ل١١) .

– زمانناسی یەکێکە لە زانستە بنچینەیییەکانی مرۆیی، کە زمانی مرۆڤ بابەتەکەیەتی و وەسفی دەکات و بنەماکانی شی دەکاتەوە . بەهۆی پێوەندیی زمان بەلایەنی جیاجیای ئاکار و ڕەوشت و چالاکیی مرۆییەوە، زمانناسیش پێوەندیی پتەوی بە زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتی و دەروونناسی و پەروەردە و مرۆڤناسی و فەلسەفە و کۆمپیوتەر ....هتد هەیە. ئەم زانستە بایەخێکی گرینگ بە بنەمای زمانەکان و بەکارهێنان و فێربوون و فێرکردن و ڕەوتی پێشکەوتنیان بەدرێژایی ڕۆژگار دەدات و هەوڵ دەدات وەڵامی گەلێك پرسیار بداتەوە لەوانە :

أ– سیماو کۆڵکەی هاوبەشی زمانان چییە؟ لایەنی جیاوازییان چییە؟

ب– خەڵك چۆن فێری زمان دەبێت؟ بۆچی منداڵ بەئاسانی و خێرایی بەبەراورد لەگەڵ گەورەدا فێری دەبێت ؟

ج– واتاکانی ئاخاوتن چۆن دەچێتە پاڵ وشەکانەوە؟ وشەکانیش چۆن لەگەڵ یەکتریدا دەگونجێن بۆ پێکهێنانی دەستەواژە و ڕستە؟

د– بەدرێژایی ڕۆژگار زمانەکان چۆن دەگۆڕێن؟ چۆن دەتوانین ڕەوتی مێژوویی فراژۆبوونی زمان بەبێ بوونی تۆمار و بەڵگەنامە دیاری بکەین ؟

هـ– جیاوازیی زمانی هێما و ئیشارەت کە کەڕولاڵ بەکاری دەهێنێت لەگەڵ زمانی درکێنراو لە چیدایە؟ لایەنی وێکچوونیان چییە؟

و- چۆن دەنگەکانی زمان بەرهەم دێت و چۆن وشەکان پێکدێت؟ (فارع وآخرون، ٢٠٠٦، ل٩-١٠) .

• زمانناسی زانستێکە لەم لایەنانەی زمان دەکۆڵێتەوە: (دەنگسازی، وشەسازی، ڕستەسازی، واتاسازی، لایەنی دەروونی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگسازی). زمانناسی دوو جۆری هەیە: زمانناسیی تیۆری و زمانناسیی کارەکی ، لقەکانی زمانناسیی تیۆری بریتین لە: فۆنەتیك، فۆنۆلۆجی، مۆرفۆلۆجی، سینتاکس و سیمانتیك.

زمانناسیی کارەکیش لقەکانی بریتین لە: (فەرهەنگسازی، زمانناسی، دەروونناسی، کۆمەڵایەتی و بەراوردی، مێژوویی ....هتد. (الخولي، ١٩٩١، ل١٥٧)

زمانەوانی سەردەم و پەیڕەوکارانی زمانناسی لە سەر ئەوە ڕێککەوتوون، کە دیاریکردنێکی ورد بۆ چەمکی زمان تاکو ئێستا یەکلایی نەبۆتەوە، بەڵام هاوڕاییەك لە نێوانیاندا بۆ ئەم مەبەستە هەیە ، کە زمان سیستەمێکی هێمایی دیاریکراوە و یەکێك لە ئامانجە بناغەییەکانی بریتییە لە دەستەبەرکردنی پرۆسەی پێوەندیکردن. (کرم ، ١٩٩٢، ل٩)

## زمان و ڕاگەیاندن:

زمان پێوەندییەکی پتەوی بە ڕاگەیاندنەوە هەیە و ڕاگەیاندنیش بەهەمان شێوە، کە ئەمەش لە پێوەندیکردنی جەماوەریدا بەرجەستە دەبێت (فندريس) لە پێناسەی زماندا دەڵێ: زمان کارێکی کۆمەڵاتییە و پێویستییەکی پێوەندیکردنە لە نێوان کۆمەڵانی مرۆڤدا، لەلایەك پێویستییەکی گشتییە بۆ جێبەجێکردنی کار و کردەوەی ڕۆژانەی خەڵك ، لەلایەکی تر پێویستییەکی تایبەتە بۆ گوزارشتکردن لەو بیروبۆچوونانەی کە لە هزر و مێشکی تاکدایە، هەردووك لەم پێویستییانە کەسی ڕاگەیاندنکار و زانستی ڕاگەیاندن بە شێوەیەکی تایبەت پێویستییەتی بەمەبەستی جێبەجێکردنی ئەرکە بناغەییەکانی: هەواڵ، لێکدانەوە و شیکردنەوە، ئاراستەکردن،خۆشیبەخشین، ڕیکلام، فێرکردن و پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی، هەموو ئەمانە لە بیر و هزری ڕاگەیاندنکاردایە، ئەرکی ڕاگەیاندنکاریش گوزارشتکردنە لێیان بەمەبەستی گەیاندنیان بەگوێی گوێگردا. (البكاء، ٢٠٠٤، ل١٧٦-١٧٧) .

زانایانی زمان و ڕاگەیاندن و پەروەردە و دەروونناسی و کۆمەڵناسی ...هتد، جەخت لەسەر توانستی زمان لە تێگەیاندنی جەماوەر و گەیاندنی زانیاری و بیر و بۆچوون لە ڕێگای هۆکارە جیاجیاکانی ڕاگەیاندن دەکەنەوە، کە گوزارشتی زمانییش بەشێکی گرینگە لە پرۆسەی ڕاگەیاندندا، لە بەرانبەریشدا چۆنیەتی وەرگرتن و لێکدانەوە و پێشخستنی زانیاری تەواوکەریەتی، (نهر، ١٩٨٨، ل٩) .

لە ژێر ڕۆشنایی شیکردنەوەی پێوەندیی نێوان زمان و ڕاگەیاندن بەتێگەیشتنی ڕاگەیاندن بۆ هۆکارەکان ، زمان هۆکارێك نییە لە هۆکارەکانی پێوەندیکردن ، بەڵام پێوەندیکردن ئەرکێکە لە ئەرکەکانی زمان (خلیل، ١٩٩، ل٣٣) بەهۆی ئەوەی مرۆڤ بوونەوەرێکە حەزی لە پێوەندیکردنە و جێبەجێکردنی ئەم مەبەستە فاکتەرێکی گرینگ بوو بۆ هاندانی تاکو بتوانێت زمان دابهێنێت. بۆیە ئەرکی پێوەندیکردن بەگرینگترین ئەرکەکانی زمان لە قەڵەم دراوە و مرۆڤیش هەستی بەم گرینگییە کردووە، لەو ڕۆژەوە و لە پێش دەرکەوتنی زمانی درکێنراو و ڕێگاکانی لێك تێگەیشتنی بەهێما و جووڵە و وێنە و دەنگ داهێنا (الهیتي، ٢٠٠١، ل٨٨).

پرۆسەی پێوەندیکردنی جەماوەری (ڕاگەیاندن) پرۆسەیەکی جێگیر و وەستاو نییە، بەڵکو پرۆسەیەکی دینامیکیی بە جووڵەیە و، کە زمان لەو چوارچێوە ڕۆشنبیرییەی پرۆسەی پێوەندیکردن، شوێنێکی تایبەتی هەیە و ئەرکێکی تایبەت جێبەجی دەکات. (نهر، ١٩٨٨،ل٨٩). زمان بۆ بەهێزبوونی پشت بەئاستی گشتی زمان دەبەستێت ، کە لەسەر بنەمای گونجان لە نێوان ئاستەکانی زانستی و ئەدەبی و کارەکی دامەزراوە ، چونکە کاتێ تاکەکانی کۆمەڵ ئاخاوتنی ڕۆژانە بەباشی ئەنجام دەدەن، زمان چالاك دەبێت و گەنجێتی بۆ دەگەڕێتەوە .

ڕاگەیاندن پرۆسەیەکی ڕێکخراو و پلان بۆ داڕێژراوە ، لەسەر بنەمایەکی زانستی و بابەتی دامەزراوە ، ئامانجی پەخش و بلاوکردنەوە و ڕوونکردنەوەی زانیاری و ڕووداو و ڕاستییەکانە، بە شێوەیەك یارمەتیدەر بێت بۆ هەستکردن بە ڕەهەندەکانی تێگەیشتن ، بەبێ ئاوەژووکردن یان گۆڕین ، تاکو کاریگەری بەسەر تاك و کۆمەڵدا هەبێت ، لە پێناو هۆشیارکردنەوە و ناساندنی ڕاستییەکان لە هەموو بوارەکان و بابەتەکانی ژیان (نهر، ١٩٨٨، ل١٢) دیاریکردنێکی

ئەکادیمییانە بۆ چەمکی ڕاگەیاندن کارێکی ئاسان نییە ، چونکە واژەیەکی هاوبەش و بەکارهاتووە لە مەیدانی تەکنیکی و زانستی و جەماوەریدا . لە زمانی کوردیدا زاراوەی ڕاگەیاندن یان میدیا یان ناوەندەکانی پێوەندیکردن یان پێوەندیکردنی جەماوەری بەکاردێت. دەشێ بڵێین هیچ یەکێك لەم زاراوانە چەمکی ئەم زانستەو هەموو ئەو پرۆسەیە و جموجوولانەی کە لە چوارچێوەی ئەم بابەتەدا بەرێوە دەچێت نادەن بەدەستەوە ، چونکە هەروەکو ئاماژەمان پێدا ، پرۆسەکە لایەنی تەکنیکی و زانستی و جەماوەری دەگرێتەخۆ.

بەلام لە چوارچێوەی زمانناسیی نوێدا زمانەوانە ئەوروپییەکان لەسەر زاری (غرادیس جولیانا غریماس) واژەی ڕاگەیاندن بە (information) دەستنیشان دەکات ، لە پێناسەیشدا دەڵێ: بریتییە لەوەی کە هەر ڕەگەزێك بتوانرێ بەهۆی ڕەمز یان هێماوە گوزارشتی لێوە بکرێت. ڕاگەیاندکارانیش لە نێوانیاندا (فرنانند ترو) لە پێناسەی ڕاگەیاندندا دەڵێ: بریتییە لە بلاوکردنەوەی ڕەگەزەکانی زانیاری لە چوارچێوەیەکی گونجاودا ، لە ڕێگای دەنگ و وشە و وێنەکانیان بەشێوەیەکی گشتی ، بە هۆی هەر هۆکارێکی پێوەندیکردن بەجەماوەرەوە .(کرم، ١٩٩٢، ل١١)

ئەمڕۆ زمانی پروپاگەندە و شەڕی دەروونی و پەیامی ئیعلامی پێویستی بە سیستەمێکی ئالۆزی پێوەندیی زمانی و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری هەیە بە مەبەستی بەرهەمهێنانی واتا بۆ ئەو دەقەی کە بۆ وەرگری دەنێرێ . بەم شێوەیە دەبینین کە زمانی ڕاگەیاندنی نوێ سوودی لە پێشکەوتنی زمانی ڕۆژنامەنووسی بینیوە بۆ هەنگاونان بەرەو قۆناغی پێشکەوتنێکی نوێ. کە ئەویش قۆناغی (زمانی ڕاگەیاندن)ە، کە لەسەر ڕەگەزە بناغەییەکانی سەرچاوەکانی زمانی ڕۆژنامەنووسی دامەزراوە، تاکو سیستەمێکی ڕەمزیی واتایی بۆ زیاد بکات کە فاکتەر و ڕێگای کارکردنی تایبەتی هەیە . لێکۆڵینەوە لەزمانی ڕاگەیاندن و ئاشنابوون بە شێوازەکانی پێکهێنانی واتا ، پێویستی بە ڕامان و وردبوونەوە لە ڕێباز و پەیڕەوە هزری و کۆمەلایەتییە نوێیەکان هەیە، هەروەها هەوڵدانی بێ وچان بۆ سوودوەرگرتن لێی لە پێناو تێگەیشتن و شیکردنەوەی گوتاری ئیعلامی ، کە ئێستا زمانێکی تایبەتی گوزارشتکردنی هەیە لە ژێر ڕۆشنایی ئەو ململانێیەی

ڕاگەیاندن، کە هەموو دونیای گرتۆتەوە بەهەموو جۆرەکانی گوتاری ئیعلامی (جواد، ١٩٩٨، ل٤٦) بۆیە گرینگە ڕاگەیاندکارانی کوردیش ئاگاداری هەموو وردەکاریی ئەو زمانانە بن کە ڕۆژانە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن، لە ڕووی پێکهاتەی زمانییانەوە و لایەنی دەنگسازی و ڕێزمان و واتاسازییان، تاکو بتوانن بەسەرکەوتوویی هەموو بابەتەکانی ڕاگەیاندن لە هەواڵ و وتار و ڕیپۆرتاژ و...هتد لە کەناڵە جیاجیاکان (خوێندراو، بیستراو، بینراو) بەسەرکەوتوویی ئەنجام بدەن. ئەگەرچی زمانی ڕاگەیاندنی کوردی تاکو ئێستا خاوەنی ڕێنمایی و ڕێکارییەکی تایبەت نییە تاکو ڕاگەیاندنکارانی کورد پشتی پێ ببەستن کە هەندێکیان پێوەندییان بە پێویستییە بناغەییە گشتییەکانەوە هەیە، هەندێکی تریان پێوەندییان بە زمانەوە هەیە .

هەستکردنی ڕاگەیاندنکار بەزمان لە کاتی پێشکەشکردنی بابەتێکی ڕاگەیاندن ، کارلێکی پێوەندیکردن لەگەڵ جەماوەردا بەهێز دەکات. جوانی دەربڕین یەکێکە لە دیاردە دروستەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ واژە و وشەکانی زماندا، ئەمەش پێویستی بە دەربڕینێکی پاراو هەیە لەگەڵ ڕەچاوکردنی هێز و ئاوازەی دەنگەکان، کە ئەمانە لەلایەك گوزارشت لە هەستکردن بەزمان دەکەن، لەلایەکی تر بەلایەنی دەروونی، وەکو گوزارشتکردن لە هەست و سۆز و ئاراستە و ...هتد. بۆ نموونە ئاوازە و تۆنی دەنگ واتای غەمباری و خۆشی و ناخۆشی و گاڵتەجاڕی و بڕوا بەخۆبوون ....هتد دەگەیێنێ. بۆیە دەکرێ دوو ئاوازەی جیاواز بۆ وشەیەك یا ڕستەیەك ، دوو واتای جیاواز بدات .لەم بوارەدا (دەنگسازی) زمانیی زمانەکان لەگەڵ یەکتری جیاوازن لە ڕووی هێز و ئاوازە لە سەر وشە و ڕستە ، بۆیە زمانی کوردی وەکو زمانێکی سەربەخۆ تایبەتمەندیی خۆی هەیە ، بەڵام ئەوەی پێوەندیی بە توێژینەوەی زمانی لە بواری دەنگسازی زمانی کوردییەوە هەیە کە بەکەڵکی ڕاگەیاندنکاری کورد بێت زۆر کەمە یان دەتوانین بڵێین هەر نییە، بۆیە ڕاگەیاندنکارانی کورد هیچ هەوڵێکی ڕوون لای زمانەوانی کورد دەربارەی ئەم بابەتە بەدی ناکەن، کەچی بە پێچەوانەوە لە وڵاتە پێشکەوتووەکان، بۆنموونە لە وڵاتێکی وەکو بەریتانیا، گرینگییەکی زۆر بەم لایەنە دەدرێت، لە ئێزگەی بەریتانیا (BBC) لێژنەیەکی ڕاوێژکاریی تایبەت هەیە

کە چەند کەسێکی پسپۆری لە زماندا هەیە و ئەم لێژنەیەش چەند لقێکی لێ دەبێتەوە، کە هەریەکێك پسپۆرە لە لایەنێکی دیاریکراوی گرفتەکانی زمان، ئەرکەکانیان بریتییە لە: (الهیتی، ٢٠٠١، ل٩٢-٩٣)

١- دانانی ڕێسا و یاسای گشتی بۆ دەربڕینی دروست بۆ ئەو وشانەی کە گومان لە دەربڕینیان هەیە یان بە شێوەی جیاجیا لەلایەن خەڵکەوە گۆ دەکرێن .

٢- هەموار یاخود ڕاستکردنەوەی دەربڕین یان گۆکردنی ناو و شوێنی بیانی بەگەڕانەوە بۆ سەرچاوە ڕەسەنەکەی.

٣- گۆڕینی وشە بیانییەکان بۆ شێوەی ئینگلیزی (Anglification ) واتە بە ئینگلیزیکردن ئەمە وەك بەشێك لە ئەرکەکانیان و وێڕای دەیان ئەرکی تری زمانەوانی .

بۆیە نەبوونی ڕێنمایی و ڕێککاری هۆیەکی سەرەکییە بۆ کەمکردنەوەی کاریگەریی پەیامی ڕاگەیاندن و لاوازکردنی باوەڕی جەماوەر بۆنموونە: هەبوونی ژاوەژاوی واتایی لە دووتوێی پەیامی ڕاگەیاندندا کە یەکێکیان لێڵیی واتاییە، کە ئەم دیاردەیە زۆر جار لە پەیامەکانی ڕاگەیاندنی کوردیدا بەدی دەکرێت ، هۆیەکە بۆ تێنەگەیشتن وکەمکردنەوەی کاریگەری لە سەر جەماوەردا. هەروەها زمانی ڕاگەیاندنی کوردی وەکو پێویست سوودی لە زۆر توانست وسیمای زمانی کوردی لە ڕووی داڕشتن و داتاشین و وەرگرتن ...هتد وەرنەگرتووە بۆیە گەلێك وشە و دەستەواژەی داڕێژراو یان داتاشراوی بە هەڵە بەدی دەکرێت کە ئەمەش بۆ بێ ئاگایی ئەو ڕاگەیاندنکارانە لە وردەکارییەکانی ڕێزمان و زمانی کوردی دەگەڕێتەوە. یاخود لە چوارچێوەی دەقێکی ڕاگەیاندندا هەندێ وشە و دەستەواژە چەند بارە دەبێتەوە . بۆیە ئەگەر بێت و زمانی ڕاگەیاندنی کوردی لەگەڵ زمانێکی تردا بەراورد بکەین ئەوکات هەست دەکەین کە زمانی کوردی پێویستی زیاتری بەدەوڵەمەندکردنە لە ڕووی وشە و دەستەواژەوە و ڕاگەیاندنکاری کوردیش پێویستی بە شارەزایی و قووڵبوونەوەی زیاترە لە زمانەکەی خۆی و وێڕای فێربوونی زمانی تر.

بەڵام گرینگە ئاماژە بەوەش بکەین، کە زمانی ڕاگەیاندنی کوردی هاوکارییەکی باشی زمانی کوردی کردووە لە ڕووی پێشکەشکردنی دەیان وشە و

دەستەواژە کە ئەمڕۆ جێگـای خۆیـان لـەناو زمانەکـەدا کردۆتـەوە، کـە نـە کـۆڕی زمانەوانییەکان و نە دەزگا زانستییەکان لە پشتی سەرهەڵدانیانەوە نەبوون، چاکی ئەمە بۆ ڕاگەیاندن و زمانی ڕاگەیاندنی کوردی دەگەڕێتـەوە ئەگەرچـی هەنـدێکیان جێگای تێبینیی زمانـەوانانی کـوردن بـەڵام پێشـکەوتنی تەکنـەلۆجیای ڕاگەیانـدن فاکتەرو پێویستییەکی سەرەکییە بۆ هەنگاونانی زمان شـان بەشـانی ڕەوتـی ئـەو پێشکەوتنە و ناکرێ ڕاگەیاندنکاران لە هەندێ باردا چـاوەڕوانی زمانـەوانان بـن بـۆ بڕیاردان، جێگای ئاماژەپێدانە کە تاکو ئێستاش دەیان بابەتی زمانەوانیی تایبـەت بە زمانی کوردی جێگای مشتومڕی زمانەوانانی کوردە و لەسەری ڕێـك نەکـەوتوون و هەر یەکێك خاوەنی بیر و بۆچوونێکە دەربارەیان.

### تەوەری دووەم

### شێوەکانی زمانی ڕاگەیاندن:

شێوەکانی زمانی ڕاگەیاندن بەندن بە جۆرەکانی ڕاگەیاندنەوە، کە ڕاگەیاندن بەشێوەیەکی گشتی خۆی لە سێ جۆری سەرەکیدا دەبینێتەوە (نووسراو، بیستراو، بینراو)، بۆ هەریەکێك لەم جۆرانەی ڕاگەیاندن شێوەزمانی تایبەت بەکاردێت ، کە ئەویش زمانی ئاخاوتن و زمانی نووسینە، لەنێوان ئەمانەشدا نابێ زمانی جەستە و هێما و وێنە و ....هتد لە بیر بکرێت . هەموو ئەم شێوانەی زمان دەشێ لە دوو جۆری زماندا کۆیان بکەینەوە ، کە ئەوانیش زمانی گوتەیی و زمانی ناگوتەیین. زمانی ڕاگەیاندن لەلایەك بەرهەمی ئاستە جیاجیاکانی زمانییە، بەتایبەتیش ئاستی ئەدەبی و ئاستی زانستی و ئاستی کۆمەلأیەتی، لەلایەکی تر بەرهەمی کارلێکی نێوان زمانی ستاندارد و زمانی گشتییە ( زمانی ئاخاوتنی ڕۆژانەی خەڵك )، ئەمەو جگە لەوەی کە لە ژینگەوە بەرهەم دێت، لەلایەنی مادی و مەعنەوی ولە هەموو بوارەکانی کۆمەلأیەتی و دەروونی و ڕامیاری و ئابووری و تەکنەلۆجی و سروشتی بەپێی ئەو بنەمایەی کە زمان کاریگەری لەگەڵ دیاردەکانی کۆمەڵدا ئاڵوگۆڕ دەکات (الهيتى،١٩٩٧، ل١٠١)

ئەوەی لێرەدا گرنگە ئاماژەی پێ بکرێت ، هەریەك لە زمان و ڕاگەیاندن تەواوکەری یەکترن، واتە زۆر ئاستەنگە ڕاگەیاندن و هۆکارەکانی ڕاگەیاندن بەبێ زمان هیچ ڕۆڵێك بگێڕن و لەبەرانەریشدا زمان لە پرۆسەی ڕاگەیاندندا ناتوانێ دەستبەرداری هۆکارەکانی ڕاگەیاندن بێت، چونکە هۆکارەکان ئامێری پێوەندیکردنن لەم نێوەندەدا یارمەتی زمان دەدەن لە فراژۆبوون و پێشکەوتن لە چوارچێوەی بەکارهێنانی بەردەوامدا (النعيمي، ٢٠٠١، ل٢٩) بەو پێیەی کە زمان کۆمەڵە ڕەمزێکی ڕێکخراوە و لە پرۆسەی پێوەندیکردندا بەکاردێت و ڕاگەیاندنیش بەهۆی دەنگ و وشە و هێماکان جێبەجێکاری پێوەندیکردنە، دەستنیشانکردنی زمانێکی تایبەت بە ڕاگەیاندن گرینگە . لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوەکانی ڕاگەیاندن دوو ئاراستە یان دوو بۆچوونیان هەیە.

یەکەمیان وای دەبینن کە زمانێکی ڕاگەیاندنی تایبەت پیادە بکرێت بەسەر پەیامە ڕاگەیەندراوەکانی دەرچووی هەچ هۆکارێکی ڕاگەیاندن بێت، بوونی نییە.

بەڵام ئـەوەی دووەمیـان وای دەبینێـت، کـە وێـڕای جیـاوازیی ڕێگاکـانی داڕشـتنی پەیامەکانی ڕاگەیانـدن، بـەڵام تایبەتمەندییـەکی گشـتی هەیـە، کـە هـەر دەقێکـی ڕاگەیاندن لە دەقە ئەدەبی و زانستی و فەلسەفە و فێرکارییەکان جیـا دەکاتـەوە. (هەمان سەرچاوە، ل٣٠-٣١) .

ڕاگەیاندنکاران لە نـاردنی پەیامـدا پشـت بـە سـێ ئاسـتی زمـانی دەبەسـتن، یەکەمیان ئاستی کارەکی کۆمەڵایەتییە کە بـوارێکی فـراوان لـە ڕاگەیانـدندا داگـیر دەکات، دووەمیان ئاستی چێژی هونەری و جوانییـە لـە ئـەدەب و هونـەردا بـەکار دێت، سێیەمیشیان ئاستی زانستییە لە زانیاری و زانستدا بەرجەستە دەبێـت، کـە ئەم دووەی دوایی لە بواری ڕاگەیاندندا تـەنها لـە بابەتـە ئـەدەبی و زانسـتییەکاندا بـــەکاردێت، لەگـــەڵ پابەنـــدبوونی بێـــژەر بـــەوەی کـــە زمانەکـــەی لـــە ئاســـتی جەماوەرەکەیـدا بێـت کـاتێ کـە ئـەم دوو بابەتـە لـە پەیامەکانیـدا دەوروووژێنـێ (الهيتي،١٩٩٧، ل٢٢-٢٣) کەواتە زمانی ڕاگەیاندن زمانێکی تایبـەت نییـە، زمـانی تایبەت لای زمانەوانان ئەو زمانەیـە، کـە خـەڵکێکی تایبـەت بـەکاری دەهێـنن لـە بارێکی تایبەتدا، وەکو زمانی یاسایی لە بـوارە دادگاییەکانـدا، یـان بـەکارهێنانی زمـانی لاتینـی لەلایـەن کاسـۆلیکییەکان لـە بۆنـە تایبەتییەکانـدا و پاشـان زمانـە گشتییە تایبەتەکان. کاتێ کە جەخت لەوە دەکەین کە زمانی ڕاگەیانـدن زمـانێکی تایبەت نییە، لەسەر ئەو بنەمایەیە، ڕاگەیانـدن هـەموو گۆشـە یاسـایی و ئـاینی و کۆمەڵایەتییەکان و....هتد چارەسـەر دەکـات. بـەڵام بـە زمـانی خـۆی کـە زمـانی ڕاگەیاندنە (الشريف ، ٢٠٠٤، ل٣٧) .

**زمانەوانان و زمانی ڕاگەیاندن :**

زمـانی ڕاگەیانـدن سروشـت و توانـا و شـێواز و گوزارشـتکردن و فەرهـەنگ و سیستەمی خۆی هەیە، وێـڕای پاشـخانی دەروونـی و کۆمەڵایـەتی، چـونکە زمـانی پەخشکردن و کاریگەریی ئایدلۆژییە، کە ڕاستەوخۆ ئاراسـتەی خـەڵك دەکرێـت لـە هـەر کۆمـەڵێك بـن ، ئاسـتی سـەرکەوتنی ئـەم کـارە گـرینگ و هەسـتیارە ،بەنـدە بەتوێژینەوەی زمانەوانی و کۆمەڵایەتی و دەروونی ....هتد، کە تیایدا زمانـەوانان و کۆمەڵناسـان و دەروونناسـان و ئەنـدازیاران و هونەرمەنـدان و پـەروەردەکاران ...هتد بەشدار دەبن. (نهر، ١٩٨٨، ل١٩)

زمانی ڕاگەیاندن نەزمانی ڕازاوەی ئەدەبە و نەزمانی ڕووتی زانستە، بەڵکو زمانێکە بۆ دەربڕین و ڕێکخستنی بیرە، زمانێکە وشەی گونجاو لە شوێنی گونجاو بەکاردێنێ. (دزەیی، ٢٠٠٥، ل٥٩)

زمانی ڕاگەیاندن یەکێکە لەو ئاستانەی زمان، کە زیاتر شان بەشانی دیاردەکانی ژیانی ڕۆژانە هەنگاو دەنێ، بۆیە ڕاگەیاندنکاران سڵ لە بەکارهێنانی هەندێ واژە و وشە ناکەنەوە کە زمانەوانان لایان کارێکی نەخوازراوە، چونکە ڕاگەیاندکاران وای دەبینن کە پێویستە بگەنە کاروانی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و ئابووری و هزریی نوێ. لە کاتێکدا موفرەداتی هزر و ژیانی مرۆڤایەتی ڕوو لەزیادبوونە، ڕاستییەکانی سەردەمیش بەبەردەوامی پێویستییە هزرییە نوێیەکان دەسەپێنن ، کە ئەمەش وادەکات پێکهاتەی زمانیی لەو جۆرە بسەپێنێ بۆ ئەوەی بتوانێ وێنا و گوزارشتیان لێوە بکات. ئەگەرچی هەندێ جاریش ئەم وشە و زاراوانە دەبنە مایەی ڕەزامەندیی خەڵك و زمانەوانان و جێگای خۆیان لەناو زمانەکەدا دەکەنەوە و خەزێنەی ئەو زمانە دەوڵەمەندتر دەکەن.، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ڕووبەڕووی تەوژمێکی بەهێزی هەندێ لە زمانەوانان دەبنەوە کە زمانی ڕاگەیاندن بەوە تاوانبار دەکەن، کە پڕیەتی لە هەڵە و لە هەندێ باردا کاریگەریی نەرێنی بەسەر زماندا دەبێت. (الهیتي، ٢٠٠١، ل٩٦–٩٨)، چونکە پێوەندیی نێوان زمان و ڕاگەیاندن هەموو کاتێك هاوتەریب شان بەشانی یەکتری ناڕۆن، واتا وەکو یەك کاریگەری ناگۆڕنەوە، ئەمەش بەهۆی نەبوونی هاوئاستیی نێوانیانە، لەبەر ئەوەی ڕاگەیاندن بەهێزترە، بۆیە کاریگەری بۆ سەرزمان زۆر بەهێزدەبێ و تایبەتمەندییەکانی زمان لاواز دەکات و زیانی پێ دەگەیەنێ و هەندێ جار جوانیی زمان تێك دەدات . بۆیە کەم ڕوودەدات کە زمان خۆی بەسەر ڕاگەیاندندا بسەپێنێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە ڕاگەیاندن خۆی بەسەر زماندا دەسەپێنێت و دەیخاتە ژێر ڕکێفی خۆی و کاریگەری بەسەر پێکهاتەکانیدا دەبێت.

هەر لەزووەوە ڕۆژنامەکان پێشوازییان لە تێبینیی زمانەوانان کردووە هەندێك جار گۆشەی تایبەتییان لە سەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکان و هۆکارەکانی تری ڕاگەیاندن بۆ ئەم مەبەستە تەرخانکردووە و هەندێ لە ڕۆژنامەنووسان ئەم کارەیان بە ڕووبەڕووبوونەوەی زمانی ڕاگەیاندن زانیوە و بیروڕای هەندێك لە

زمانەوانانیان دەربارەی هەڵـەکانی زمـانی ڕاگەیانـدن بـەزیادەڕۆ وەسـف کـردووە، بەوەی کە زمانەوانان ئاگاداری بیر و بۆچوون و ئاراستەی جیاجیا دەربارەی هەڵـە و ڕاسـتی لـە زمانـدا نـین. هەنـدێ لـە زمانـەوانان گرینگـی بەبنـەما ڕاسـتییەکانی زمانەوانی و دەرخستنی دەدەن بەبێ سەپاندنی ئەو لایەنە زمانەوانییانە و لەگـەڵ بایەخدان بە بەکارهێنانێکی واقیعییانە، بەرانبەر ئەمەش هەندێ بیر و بۆچوونی تر بە پێچەوانەی ئەوەوە دەوەستێتەوە و وای دەبینێ کە ژمارەیەك ڕێسا و پێـوەری نموونەیی هەن پێویستە لە بەرچاو بگیرێن و کاریان پێ بکرێت. هـەروەها هەنـدێك لە زمانەوانان ئاگاداری ئەوە نین کە دیاریکردنی هەڵە و ڕاستی لە زمانـدا هـەر لـە کۆنـەوە سـەری لەخـەڵك شـێواندووە، نهێنیـی ئەمـەش بـۆ نـەبوونی پێوەرێـك کـە سوودی هەبێت بۆ بڕیاردان لە هەموو ئان و ساتێکدا دەگەڕێتەوە، چونکە ڕەگەزی کـات و فاکتـەرەکانی پێشـکەوتن بڕیـار لەسـەر ئـەم مەسـەلەیە دەدەن، کـە بـۆ سەردەمێك گونجاوە ، بەڵام بۆ سەردەمێکی تر نەگونجاوە (الهیتـی، ٢٠٠١، ل٩٩)، چونکە پێشکەوتنی زمان بەشێوەیەکی یـەکجار تونـدوتۆڵ بـە مێـژووی کۆمەڵـەوە بەندە، بەو بارودۆخە کۆمەڵایەتییەوە کە تێیدا زمـان بـەکاردێنرێ و هـەروەها بـەو ئەرکـە کۆمەڵایەتییـەی زمـان بـەجێیان دێنـێ (ف.پ.فـیلین) نووسـیوێتی ئەرکـە کۆمەڵایەتییەکانی زمان، تەنیا بریتی نین لە پێکهاتنی نسبی دەرەکی و پێوەنـدیی سیستەمی و ڕێـك و ڕەوانیـی پێشـکەوتنی. پێویسـتە ئـەوە بـزانین کـە زمـان وەك پێکهاتن شتێکە و بەکارهێنانی لە کۆمەڵدا بەتەواوی شتێکی دییە. (میدیا، ١٩٩٨، ل١٧٦) بۆیە هەندێ لە ڕاگەیاندنکاران وای دەبینن ئـەوەی پێویسـتە بایـەخی پـێ بدرێت بریتییە لە کاری زمان لـە ڕاپەڕانـدنی ئـەرکی پێوەنـدیکردنی کۆمەڵایـەتی و دەروونی، هەر دەستێوەردانێك یان تێکدانێکی ئەم ئەرکـە دوورخسـتنەوەی زمانـە لەڕاستی و دروستی. (الهیتي، ٢٠٠١، ل٩٩)

گرینگترین ئەو تێبینییانەی کە زمانەوانان دەربارەی زمانی ڕاگەیاندن هەیانە دەشێ لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا بیانخەینە ڕوو:

١– لێـدوانی زمانـەوانان دەربـارەی زمـانی ڕاگەیانـدن، پێوەنـدیی پتـەوی بەدابەشکردنی چالاکیی زمانییەوە هەیە بۆ زمانی درکێنراو (منطـوق) ، (گـوتراو و بیستراو) و زمانی نووسین. زمانەوانان لە چوارچـێوەی توێژینەوەکانیانـدا بـۆ ئـەم

زمانـە (زمـانی ڕاگەیانـدن) جـەخت لـە زمـانی ئاخـاوتن دەکـەن، بـەوەی کـە ئـەم شێوەیەی زمان ڕەسەنترە و زمانی نووسین لقێکە لێی، درکێنـراو پاشـان بیسـتراو سەرچاوەی یەکەمن کە مرۆڤ پێوەرەکـانی زمـانی لێ هەڵدەهێنجێ. (نهـر، ١٩٨٨، ل١٩–٢٠) نووسین دوو جار دوورکەوتنەوەیە لە ڕاستیی ڕووداوەکان (واقع) چونکە ڕەمزە بۆ ڕەمزی تر (گوتن). زمان زیاتر گوتنـە تـا نووسـین، بـەواتای زمانـەوانان بەگشتی باوەڕیان وایە کە قسە یان گوتن ، بنچینەی زمانـە بـەوەی کـە زۆر پـێش ئەوەی نووسین دابێت مرۆڤ شێوەی قسەکردنی زمانی زانیوە و منداڵی ساوا یەکـەم جار فێری شێوەی قسەکردن دەبێت ، ئینجا پاش ماوەیەك شێوەی نووسین، قسە یان گوتن دەورێکی باڵاتر دەبینێت لە ژیانمان و شێوەی نووسین تاماوەیەکی زۆر دەتـوانین بیگـۆڕین بـە قسـە یـان گـوتن بـێ ئـەوەی شـتێکی لێ بفـەوتێت (فتـاح، ٢٠١١،ل٢٢١)، هــەروەها ئــەوەی زیــاتر ســەرنجی زمانــەوانان بــۆ ئــەم لایەنــە ڕادەکێشێت، هەندێ دیاردەی دەنگییە، کە زمانی نووسـین ناتوانێـت گوزارشـتیان لێوە بکات، وەکو هێزو ئاوازە، کە کاریگەرییەکی زۆریـان لـە سـەر گـۆڕینی واتـای وشە و ڕسـتەدا هەیـە. (خرمـا، ١٩٧٨، ل٥٢–٥٣)، بۆیـە توێژینـەوەی زانسـتی و پراکتیکی بۆ زمان، لەوەش زمـانی ڕاگەیانـدن، پێویسـتە لـە زمـانی درکێنـراوەوە سەرچاوە بگرێت، بەڵام بەمەرجێك پابەندی یاسا و ڕێسای ئاستەکانی زمان بێت.

٢– جەختکردنەوەی زمانـەوانان لەسـەر زمـانی درکێنـراو، وای لێ کـردن کـە بڵێن بنچینەی زمانی ڕاگەیاندنی بیستراو و بینـراو پێویسـتە زمـانی درکێنـراو بێـت نەك زمانی نووسراوی خوێندراو (المکتوبة المقروئة)، هەریـەکێك لـە چـالاکی زمـانی درکێنراو و نووسراوی خوێندراو بواری گونجاو و لێوەشاوەی خۆی هەیە، چـالاکیی زمــانیی خوێنــدراوی بیســتراو لــە بــواری خوێندنــەوەی هەواڵــەکان، گوتــاری ڕۆژنامەکان، بڵاوکراوەکانی باری کەش و هەوا، خشـتەی فڕۆکـەوانی، دەرمانخانـە ئێشــکگرەکان پەســندە، بــەڵام پێویســتە بابەتــەکانی تــری پەخشــی ڕادیــۆ و تەلـەفیزۆنی بەشـێوەی ئاخـاوتن بێـت نـەك خوێندنـەوە، واتـە دەبـێ لـەزمانی درکێنـراوەوە سەرچـاوە بگرێـت نـەك زمـانی نووسـراوی خوێنـدراو، کـە ئەمـە بـۆ سەرنجڕاکێشانی وەرگرە (گوێگر)، بەمەبەستی دوورخستنەوەی لە وشکیی دەق .

بـەگوێرەی تێڕوانینــی زمانــەوانان وەرگــر ڕەگــەزێکی چــالاکە، کــاتیێ کــە گوێبیستی ئاخاوتن دەبێت، سوود لەو زانیارییـە وەردەگریێ کـە سـتراتیژییەتێکی دیاریکراو بۆ خۆی وێنا بکات و بەپێی ئەو سـتراتیژییەتە گوێبیسـتی ئـەو دەنـگ و پێکهاتە و واتایانە بێت، کە گونجاوە لەگەڵ سیستەمی تایبەت بەزمانەکـەی (نهـر، ١٩٨٨، ل٢٠). هـەروەها لـە زمـانی درکێنـراوی نێـوان نێـرەر و وەرگـر لـە هـەموو بوارەکـانی پێوەندیکردنـدا، کـە ڕاگەیانـدنیش بەشـێکە لێـی هـەبوونی زانیـاری و شـارەزایی هاوبـەش فاکتـەرێکی گرینگـە ئـەم زانیـاری و شـارەزاییە هاوبەشـە، پرۆسەی تێگەیشتنی پەیامی ڕاگەیاندن ئاسان دەکات، چونکە کێڵگـەی هاوبەشـی نێوان زمان و ڕاگەیانـدن لـە پێوەنـدیی نێـوان واژە و واتاکـەی کێڵگـەی واتاییـە، زمانــەوانان گرینگــی بەلایــەنی واتــا و واتاســازی دەدەن، بــەلام ڕاگەیاندنناســان گرینگی بـە چوارچـێوەی زانیـاری و شـارەزایی هاوبەشـی نێـوان نێـرەری پـەیام و وەرگر دەدەن، تاکو ڕاگەیاندن لەم چوارچێوە هاوبەشەدا دروست بێت و پەیامەکە نەکەوێتە دەرەوەی ئەم چوارچێوەیە، واژەش کۆڵکەی هاوبەشی ئـەم کێڵگەیەیـە، کە کێڵگەی واتایی نێوان زمان و ڕاگەیاندنە واتە خواسـتی هاوبەشـی زمانـەوانان و ڕاگەیاندنناسان لە پرۆسەی پێوەندیکردندا، کە ڕاگەیاندن بەشێکە لێی، گەیاندن و تێگەیاندنی پەیامە لە نێرەرەوە بۆ وەرگر بەچاکترین شێوە (جواد، ١٩٩٨، ل٤٧–٤٨)، بۆیە پێویستە زمانی درکێنراو لەم بوارەدا کورت و پوخت بێت و دووربێت لە درێژدادڕی و نەگوتنی بابەتی پێوەندیدار کە لەلای هەردوو (نێرەر و وەرگر) زانـراو و ئاشکرایە واتە ئابووریکردن لە ئاخاوتندا.

سەرەڕای ئەوەی کە زمانی درکێنراو شـێواز و بنـەمای دەنگـی و ئـاوازەیی و پێکهاتە و ڕێگای درکاندنی تایبەت بـەخۆی هەیـە و مادەیـەکی خـاوە و بەتـەواوی خۆش نـەکراوە، بـەلام زۆر بەجوولـە و هێزێکـی گـەورەوە پێکهاتـە و پێگەیشـتنی بیرۆکـە پیشـان دەدات، ئینجـا هۆکارێکـە ڕێگـای بیرکردنـەوەی ئاخێوەرمـان بـۆ دەگوازێتــەوە، هــەروەها چــۆنیەتی ڕیزبەنــدکردنی بیرۆکــەکان و بەسـتانەوەیان بەیەکەوە لەکاتی قسەکردندا، وێڕای زیادکردنی هەست و سـۆز، کـە دەبێتـە هـۆی کاریگەریی زیاتر بۆسەر گوێگر، بـەلام زمـانی خوێنـدراو بەپێچـەوانەوەیە، چـونکە خوێندنـەوە ڕەوتـی پێکهـاتنی بیرۆکـەو قۆناغـەکانیمان بـۆ ناگوێزێتـەوە، بـەهۆی

ئـەوەی لەسـەر پارچـە کاغـەزێك نووسـراوەتەوە، کاتێـك ئێمـە بەسـەلیقەوە قسـە دەکـەین، داهێنـانێکی نـوێ و گـەرم و گـوڕ دەهێنینـە ئـاراوە، بـەلاّم کـاتێ دەخوێنینەوە داهێنانێکی لەبەر کراو پێشکەش دەکەین .

لێـرەدا پـەیامی ڕاگەیەنـدراوی زارەکـی لـە ڕاگەیانـدنی بینـراودا کاریگـەریی گەورەی بەسەر هەست و سۆزی وەرگردا هەیە، هـەروەها بیسـتنی پـەیام لەلایـەن وەرگرەوە لەڕێگای هۆکـاری بینـراوەوە، کاریگـەریی پـەیام دوو هێنـدە دەبێـت، چـونکە لـە دەرگـای دوو هەسـتی مـرۆڤ دەدات. کـە ئـەوانیش هەسـتی بیسـتن و هەستی بینینە، بەپێچـەوانەی وەرگرتنـی پـەیام تـەنها لـەڕێگای بیسـتنەوە، بۆیـە پێویستە پەیامی ڕاگەیەندراو لـە ڕێگـای کـەناڵی بیسـتراوەوە، زمانەکـەی سـادە و سـاکارتر بێـت لـە زمـانی پەخشـکردن بـەهۆی تەلەفیزۆنـەوە، وێـڕای ئامـاژەکردن بەکەسایەتیی پێشکەشکار کە پێویستە کارامە بێـت لـە پێشکەشـکردن و شـێوازی دەربڕین و ئاوازەی دەنگی، کە هەموو ئەمانە فاکتەرن لە سەرکەوتنی پەیامەکـەی و کاریگەری بەسەر وەرگردا.

ج– لەکاتی بیستندا زمانی زارەکی زیاتر ئامادەبوونی هەیـە، بۆیـە پێویسـتە سەرچاوەی حوکم و یاسا بێت بـۆ زمـانی پەخشـی ڕاگەیانـدن، بـەوەی کـە زمـانی کۆکردنەوەی نێوان تایبەتییەکانی زمانی درکێنراو و زمانی نووسینە، ناکرێ زمانی نووسـین وابێـت، چـونکە زمـانی نووسـین بـەها و مەبەسـتی خـۆی لـە پـەیامی ڕاگەیاندندا لەدەست دەدات کاتێ کە بۆئاخاوتنی زارەکی دەگۆڕێ، بەهۆی ئەوەی ئەو خالاّنەی کە خوێنەر دەتوانێ لەکاتی وەرگرتنی پەیام بەهۆی هەستی چاوەوە تێیان بگات، لەکاتی وەرگرتنی بەهۆی هەستی بیسـتنەوە تێگەیشـتنی لـەلا گـران دەبێت، گوێگر ناتوانێ کۆنترۆڵی درێژەی ئاخاوتنی بیسـتراو بکـات، بەپێچـەوانەی ئەو خوێنەرەی کە کـۆنترۆڵی وەرگرتنـی ئاخـاوتنی خوێنـدراو دەکـات، بەتایبـەتی کاتێ ئەو شوێنانەی هەندێ گرانن بۆ تێگەیشـتن، لەسـەرخۆ دەیانخوێنێتـەوە یـان بەسەریاندا دەچێتەوە دووبارە دەیانخوێنێتەوە تاکو تێیان بگات.

د– ئێمە کاتێ دەمانەوێ هەندێ زانیاری بەهۆی زمانەوە پێشکەشی کەسـێك بکەین، پێویستە ئاگاداری ئەو شێوازەبین کە بۆ دروستکردنی هەنـدێ گۆڕانکـاریی پێویست دەیگرینەبەر، واتە پێویسـتە هـەوڵی گـۆڕینی خۆمـان بـدەین لـەو قاوغـە لاساییکەرەوەیەی کە زمان هیچ شتێك نییە، تەنها هۆکارێکە بۆ گۆڕینـەوەی بـیر و ڕا.

**ئەنجامەکان:**

١- خواستی سەرەکی و هاوبەشی زمانـەوانان و ڕاگەیاندنناسـان گەیانـدنی زانیاری و بیر و بۆچوون و تێگەیاندنی وەرگر (گوێگر)ە، کە لێرەدا گوزارشـتکردن یان دەربڕینی زمانیی لایەنێکی گرینگی پرۆسەی پێوەندیکردن یاخود ڕاگەیاندنە و لــە بەرانبەریشــدا تەواوکەرەکەیــەتی، کــە چــۆنیەتی وەرگــرتن و لێکدانــەوە و پێشخستنی زانیارییە.

٢- لە چوارچێوەی پێوەندیی نێوان زمـان و ڕاگەیانـدن، بـەبیر و بۆچـوونی ڕاگەیاندنناســان زمــان هۆکارێــك نییــە لــە هۆکارەکــانی پێوەنــدیکردن، بــەڵکو پێوەندیکردن ئەرکێکە لە ئەرکەکانی زمان.

٣- ئەرکی پێوەندیکرن بەلای زمانەوانانـەوە گـرینگترین ئـەرکی زمانـە، بـە هۆی ئـەوەی مـرۆڤ بوونەوەرێکـە حـەزی لـە پێوەندیکردنـە و جێبـەجێکردنی ئـەم ئەرکەش هاندەرێکی گرینگ بووە بۆ داهێنانی زمان لەلای مرۆڤەوە .

٤- ڕاگەیانـدن پرۆسـەیەکی جـێگیر و وەسـتاو نییـە ، بـەڵکو پرۆسـەیەکی دینـامیکی و بـە جووڵەیـە، زمـان لـەو چوارچـێوەیەدا شـوێنێکی تایبـەتی هەیـە و ئەرکێکی تایبەتیش جێبەجێ دەکات .

٥- بــەهۆی گــۆڕان و پێشــکەوتنی تەکنــەلۆجیای ڕاگەیانــدن، زمــانیش دووچاری کاریگەریی جۆراو جۆر بۆتەوە و پێویسـت دەکـات لەگـەڵ ئـەو گۆڕانـەدا بگونجێ.

٦- لەبەر ئەوەی زمانی ڕاگەیاندن شان بەشانی دیاردەکانی ژیانی ڕۆژانـەی خەڵك هـەنگاو دەنـێ، بۆیـە بـەکارهێنانی هەنـدێ وشـە و دەسـتەواژە، کـە بـەلای زمانەوانانەوە کـارێکی نـەخوازراوە یـان ناپەسـندە، بـەلأم بـەلای ڕاگەیاندنناسـان کـارێکی ئاسـاییە، چـونکە وای دەبیـنین، کـە نابێـت لـە کـاروانی پێشـکەوتنی کۆمەلأیـەتی و ڕۆشـنبیری و ئـابووری و ڕامیـاری و هونـەری نـوێ دوابکـەوێت، لەکاتێکدا وشە و زاراوە و مـوفرەداتی هزریـی ژیـانی مرۆڤایـەتی ڕوو لـە گـۆڕان و زیادبوونە .

بەهۆی هاوئاست نەبوونی زمان و ڕاگەیاندن و هەژمـوونی زیـاتری ڕاگەیانـدن، هەموو کاتێك پێوەنـدیی نێـوان زمـان و ڕاگەیانـدن هاوتـەریب نابێـت، واتـە شـان

بەشانی یەکتری ناڕۆن، بۆیە کاریگەری بۆسەر زمان زۆر بەهێز دەبێت و تایبەتمەندییەکانی زمان لە هەندێ باردا لاواز دەکات و زیانی پێدەگەینێ و هەندێ جاریش جوانیی زمان تێك دەدات، بۆیە کەم ڕوو دەدات، کە زمان خۆی بەسەر ڕاگەیاندندا بسەپێنێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە ڕاگەیاندن خۆی بەسەر زماندا دەسەپێنێت و دەیخاتە ژێر ڕکێفی خۆی و کاریگەری بەسەر پێکهاتەکانیدا دەبێت.

٧- ڕاگەیاندنناسان وای دەبینن ئەوەی پێویستە بایەخی پێ بدرێت بریتییە لە کاری زمانی لە ڕاپەڕاندنی ئەرکی پێوەندیکردنی کۆمەڵایەتی و دەروونی، هەر دەستێوەردانێك یان تێکدانێکی ئەم ئەرکە، دوورخستنەوەی زمانە لە ڕاستی و دروستی .

٨- ڕاگەیاندنناسان وای دەبینن ، کە بەبێ بوونی پێوەرێك کە سوودی هەبێت بۆ بڕیاردان لە هەموو ئان و ساتێکدا، دیاریکردنی هەڵە و ڕاستی لە ناو زماندا کارێکی ئەستەمە، چونکە ڕەگەزی کات و فاکتەرەکانی پێشکەوتن بڕیار لەسەر ئەم مەسەلەیە دەدەن ، کە بۆ سەردەمێك گونجاوە، بۆ سەردەمێکی تر نە گونجاوە .

٩- سەرنجی زمانەوانان دەربارەی زمانی ڕاگەیاندن، پێوەندیی پتەوی بە چالاکیی زمانەوە هەیە، کە زمانی ئاخاوتن و زمانی نووسینە. زمانەوانان لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکانیاندا بۆ زمانی ڕاگەیاندن، جەخت لەسەر زمانی ئاخاوتن دەکەن کە ئەم زمانە بنچینەی زمانی ڕاگەیاندنی بیستراو و بینراو بێت، نەك زمانی نووسراو (نووسراوی خوێندراو).

١٠- لە پرۆسەی پێوەندیکردندا، کە ڕاگەیاندنیش جۆرێکە لێی، وەرگر (گوێگر) ڕەگەزێکی گرینگ و چالاکە، کاتێ کە گوێبیستی ئاخاوتن دەبێت ستراتیژییەتێکی دیاریکراو بۆخۆی وێنا دەکات، بەگوێرەی ئەو ستراتیژییەتە گوێبیستی ئەو دەنگ و پێکهاتە و واتایانە دەبێت، کە لەگەڵ سیستەمی تایبەت بە زمانەکەیەوە گونجاوە.

## سەرچاوەکان:

### بە زمانی کوردی :

١. دزەیی، عبدالواحید موشیر، ڕەهەندی دەروونی لە بواری ڕاگەیاندندا، چاپی یەکەم، ٢٠٠٥ز، هەولێر.
٢. سابیر، ڕەفیق، بەستاندارکردنی زمانی کوردی و ئەلفوبێی کوردی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ،٢٠٠٧ز، سلێمانی .
٣. فتاح، محمد معروف، زمانەوانی، چاپخانەی حاجی هاشم، ٢٠١١ز، هەولێر.
٤. میدیا، سەرەتاییێکی زمانناسی، بەرگی یەکەم، ١٩٨٨ز، سلێمانی .
٥. ناوخۆش، سەلام، پوختەیەك دەربارەی زمانناسی، چاپخانەی چوارچرا، ٢٠٠٥ز، هەولێر.
٦. وەیس، غازی فتاح، فۆنەتیك، چاپخانەی ئەدیب، ١٩٨٤ز، بغداد .

### بە زمانی عەرەبی :

١. البكاء، محمد عبدالمطلب، لغة الاعلام بين الفصحى والعامية، مجلة الباحث الاعلامي، العدد الاول ، جامعة بغداد، ٢٠٠٤م.
٢. جواد، عبدالستار، اللغة الاعلامية، دراسة في صناعة النصوص الاعلامية وتحليلها، دار هلال للترجمة، ١٩٩٨م، الاردن.
٣. خرما ، نايف، اضواء على الدراسات اللغوية المعاصرة، ١٩٧٨م ، الكويت.
٤. خليل، محمود ومحمد منصور هيبة، انتاج اللغة الاعلامية في النصوص الاعلامية، مطبعة جامعة القاهرة ، ١٩٩٩م.
٥. الخولى، محمد علي ، معجم علم اللغة النظري، ١٩٩١م، لبنان.
٦. زكريا، ميشال، الالسنية، علم اللغة الحديث، المبادئ والاعلام، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، ١٩٨٣م، بيروت – لبنان.
٧. الشريف، سامي وأيمن منصور ندا، اللغة الاعلامية ، المفاهيم، الاسس، التطبيقات ، مركز جامعة القاهرة للتعليم المفتوح، ٢٠٠٤م، القاهرة.
٨. شرف، عبدالعزيز، اللغة الاعلامية ، دار الجيل، ١٩٩١م، بيروت .
٩. عبدالهادي، نبيل و آخرون، مهارات في اللغة والتفكير، دار المسيرة للنشر والتوزيع والطباعة، ٢٠٠٣م، الاردن.

١٠. عطية، محسن علي، مهارات الاتصال اللغوي وتعليمها، دار المناهج للنشر والتوزيع، ٢٠٠٨م، الاردن.
١١. عمايرة، حنان اسماعيل، التراكيب الاعلامية في اللغة الاعلامية ، دار وائل للنشر ، ٢٠٠٦م، الاردن .
١٢. فارع، شحدة، وآخرون، مقدمة في اللغويات المعاصرة، دار وائل للنشر ، الطبعة الثالثة، ٢٠٠٦م، الاردن.
١٣. كرم، جان جبران، مدخل الى لغة الاعلام ، دار الجيل للطباعة، ١٩٩٢م، بيروت
١٤. النعيمي، صفاء صبحي، لغة البرامج التلفزيونية، دراسة تحليلية في برامج القناة الفضائية المصرية، رسالة ماجستير مقدمة الى كلية الآداب، جامعة بغداد، ٢٠٠١م.
١٥. نهر، هادي، اللسانيات والاعلام التأثر والتأثير، مجلة التوثيق الاعلامي، العدد الثاني، مركز التوثيق الاعلامي لدول الخليج العربي، ١٩٩٨م، بغداد.
١٦. الهيتي، هادي نعمان، لغة الاعلام والنهضة القومية، مجلة المجمع العلمي، ١٩٩٧، بغداد.
١٧. الهيتي، هادي نعمان، اللغة في عملية الاتصال الجماهيري، دار السامر للطباعة، الطبعة الاولى،١٩٩٧م، بغداد.
١٨. الهيتي، هادي نعمان، ماذا يريد الاعلاميون من اللغويين؟ مجلة المعلم العربي، العدد الاول والثاني، وزارة التربية في الجمهورية العربية السورية، ٢٠٠١م، دمشق .

## ملخص البحث

اللّغة كظاهرة لها علاقة متينة بالإنسان وبيئته، وتكمن اهميتها في انها متممة لعلاقة الإنسان بعناصر بيئته وهي تمهد له السبيل للتعبير عن مشاعره وعواطفه ووعيه وايصالها الى الأفراد من حوله .

ان كلا من علمي اللّغة و علم الإعلام علمان مختلفان وميادين عملهما مختلفان ويتفرعان الى فروع مختلفة، وهذا ما يجعلهما يختلطان بالعديد من العلوم الأخرى، فمثلا هناك علاقات مابين علم اللّغة مع علم النفس وعلم الإجتماع والتربية والفيزياء والخ ...و نفس الحالة نجدها مع علم الإعلام أي ان كلا العلمين (اللّغة والإعلام ) يدخلان في علاقات مباشرة وغير مباشرة مع الكثير من العلوم الأخرى، وحين تصبح اللّغة مادة بحث مشتركة مابين العلمين المذكورين ستواجه بإشكالات اتفاق أو اختلاف في الرؤى والرغبة عند الباحثين .

اللّغة مادة و وسيلة اساسية ومهمة في مجال بحوث اللّسانيات وعلم اللّغة، عليه فان كافة التعاريف الواردة في متن هذا البحث تظهر حدود الأنشطة والفعاليات في ذلك المجال ، أما فيما يتعلق بعلم الإعلام، فان كل البحوث في هذا المجال تظهر وتؤكد وجود علاقة متينة ومتبادلة بينه وبين اللّغة .

ان هذا البحث هو بحث وصفي للغة كونها مادة مشتركة مابين رغبة ومطلب كلا من اللّغويين وعلماء اللّسانيات من جهة والإعلاميين ومنظّري الإعلام من جهة اخرى والهدف منه هو بيان رؤاهم وآراءهم حول هذا الموضوع على نطاق شامل وليس في حدود لغة معينة بذاتها، اي ان هذا البحث لا يتناول لغة الإعلام في حدود لغة معينة بذاتها ومع هذا فان البحث تطرق في بعض محاوره الى لغة الإعلام الكوردي آخذا بنظر الإعتبار عرض عدة ملاحظات عن الحالة الراهنة للغة الإعلام الكوردي في إطار مضمون البحث الرئيسي .

ان هذا البحث الموسوم بـ ( اللّغة مابين تطلعات اللّغويين و الإعلاميين ) يتكون من محورين اساسيين: اولهما يضم موضوعين وهما ( اللّغة وعلم اللّغة، اللّغة والإعلام) أما المحور الثاني فيضم هذه المواضيع ( أشكال اللّغة الإعلامية، اللّغويين ولغة الإعلام ). وفي ختام البحث استعرضنا نتائج البحث وادرجنا قائمة بالمصادر والمراجع الكوردية والعربية، ثم ملخصين للبحث باللّغتين العربية والأنجليزية .

## Abstract

Language, as a phenomenon, is related to human beings and their surroundings. It is essential in Human life, since it can be used as a means of communication among humans and the other beings in the setting and it helps in expressing the ideas and the emotions.

Linguistics and media studies are two different fields. Each has its own branches and scopes. They are affected and related to other disciplines in many ways. For example, linguistics is interrelated to other sciences like psychology, sociology, physics, etc. Media is also interrelated to sciences such as psychology, sociology, history, etc. so one can say that linguistics and media are also interrelated. Almost all sciences and scientists need language, they cannot do research without using language.

Many studies have long-established that media is related to linguistics in many ways; there is a vital connection between media and linguistics.

This study is a descriptive linguistics study. It tries to show the viewpoints of linguists and media scholars on the relationship between language and media in general. It also studies the language of Kurdish media and the state of that language in Kurdish media.

The study is entitled "Language between the Need of Linguists and Media Scholars". It consists of two sections. The first section includes two areas, language and linguistics, and language and media. The second section deals with forms of media language, and the scholars' views on media language.

At the end, the conclusions are provided, the references in Kurdish and Arabic are listed, and abstracts in each English and Arabic are given.

# بەراوردی نێوان زمانی نووسین و شێوەزاری مزووری باڵا

## ( ئاستی ڕێزمان / مۆرفۆلۆجی - بە نموونە )

**پەیمان حەسەن محەمەد سەلیم**
بەشی کوردی – کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەتی
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

### پێشەکی

ئەم توێژینەوەیە بەراوردی نێوان زمانی نووسین و شێوەزاری مزووری باڵایە، کە ئاستی (ڕێزمان / مۆرفۆلۆجی) بە نموونە وەرگیراوە، بەراوردی نێوانیان بە مەبەستی ستانداردکردنی وشەکانی زمانی کوردییە بە گشتی و نزیککردنەوەیان لە یەکترە.

ڕێبازی توێژینەوەکە ڕێبازی وەسفی بەراوردکارییە. لە پێشەکی و دوو بەش پێکهاتووە لەگەڵ ئەنجام و سەرچاوەکان. لە بەشی یەکەمدا: ئەزموونی بەستانداردکردنی وشەکانی زمانەکان باس کراون، کە لە ڕێگای نزیککردنەوەی وشەکانی دیالێکتەکانی زمانەکە و بەتایبەتی وشە هاوواتاکانیان.

هەبوونی وشەکانی دیالێکتەکان بە چەند شێوەیەك دەکرێت، بگوترێت کە ئەم زمانە دەوڵەمەندە لە بەکارهێنانی وشەی جۆراوجۆر. دەکرێت زمان بەپێی چینەکانی بەکارهێنەرانی وشەکانی زمان دەستنیشان بکرێت، یان بەپێی وشەکانی دیالێکتەکان و ناوچەکان، هەروەها بەگوێرەی چینی کۆمەڵایەتی دابەش ببێت، بەڵام لێرەدا وشەکانی دیالێکتەکان نزیکدەکرێنەوە بە مەبەستی ستانداردبوونی وشەکانی زمانی کوردی، نزیککردنەوەی چین و بەکارهێنەرانی زمانی کوردی لە ژێر زمانی پێوانەیی و ستانداردا. لەم توێژینەوەیەدا ئەزموونی زمانەکان دیاردەخات کە چۆن لە زمانی دیالێکتەکان بووینە بە زمانی پێوانەیی و ستاندارد، بەهۆی نزیککردنەوەی وشەکانی دیالێکت و شێوەزارەکان . لە بەشی دووەمدا: بە شێوەی پراکتیکی زمانی نووسین لەگەڵ شێوەزاری مزووری باڵا بەراورد کراوە لە

ئاستی (ڕێزمان – مۆرفۆلۆجی)یە، کە بەشەکانی ئاخاوتن و هەموو ئەو مۆرفیمە ڕێزمانییانەی کە لەگەڵ وشەکان بەکاردێت دەگرێتەوە بەتایبەتی لەگەڵ ئەم بەشە ئاخاوتنانە (ناو، ڕاناو، ئاوڵناو، چاوگ، ئاوڵکار، ئامراز، ژمارە).

## بەشی یەکەم
## بە ستانداردکردنی وشەکانی زمانی کوردی

ئەم بەشە لە ئەزموونی چەند زمانەوانێك پێکدێت، کە هەموویان جەخت لە بەکارهێنانی وشەکانی هەموو دیالێکتەکان دەکەنەوە بۆ زمانی ستاندارد، لێرەدا ئەزموونە پێشکەوتووەکان دیاری دەکەین بۆ پەیڕەوکردنی لە زمانی کوردیدا.

**یەکەم / وایلد:**

سیستەمێکی بەکارهێنا بۆ ئەوەی نووسینی زمانی ئینگلیزیی پێوانەیی بەرهەم بهێنێت لەناو چینەکانی کۆمەڵگادا، هەروەها وشەی کۆنی بەکاردەهێنا بۆ دروستکردنی لێکسیکێکی پێوانەیی و ستاندارد، دوو سەرچاوەی بەهێزی بەکاردەهێنا، کە ئەوانیش: کتێبێکی (مێژووی کۆنی زمانی ئینگلیزی_ ١٩١٤) بوو لەگەڵ کتێبی (مێژووی نوێی زمانی ئینگلیزی –١٩٢٠)، بە مەبەستی ئەوەی چینی ناوەڕاست و گشتی دەتوانن وشەکان بۆ لووتکەی هەرەمی کۆمەڵگا بەرزبکەنەوە. ئەمەش خاڵێکی سیستەمی و زۆر ڕێکخراوە بۆ بەرهەمهێنانی زمان. یەکەم کەس بوو، کە لێکسیکێك بۆ وشەکانی چینی کۆمەڵگا دروست بکات. (وایلد) جەختی لەسەر زمانی چینەکانی کۆمەڵگا و دیالێکتەکانی کۆمەڵگا دەکردەوە ( کولینج، ٤٨٩:١٩٩٩)، هەروەها سەرەتای نووسینی لێکسیك لە زمانی ئینگلیزی لە دەقەکانی (ولیم شکسپیر) وەرگیراوە، وەکو سەرچاوە بۆ نووسینی وشە لە لێکسیکدا. (هەمان سەرچاوەی پێشوو)، کەواتە لە زمانی کوردیش دەکرێت بۆ ئەوەی لێکسیکێکی پێوانەیی بەرهەم بهێنرێت، کە هەموو دیالێکتەکان بگرێتەوە، دەتوانرێ گرنگی بە وشە کۆن و نوێیەکانی بدرێت، وەکو سەرچاوە سوودی لێ وەربگیرێ، وەکو لای (وایلد)، لە زمانی ئینگلیزی ئەم پەیڕەوە هەبوو، چونکە زمان بەرەو زمانی گشتی دەبات، زمانی گشتیش نزیکە لە زمانی ستاندارد، هەروەکو زمانی ئەڵمانی، کە لە ڕێگای وەرگێڕانی کتێبی کۆنی ئاینی( تەورات)

زمانیان لە گشتییەوە بوو بە زمانی ستاندارد، کە ئەمەش لەلایەن (مارتن لۆسەر) بوو، کە کتێبەکەی لە زمانی دیالێکتێکی جرمەنی بۆ زمانی گشتیی نەتەوە فراوان کردبوو بۆ زمانی ستاندارد (دیکرو، سشایفر، ۱۲۸:۲۰۰۷) بەهەمان شێوە لە زمانی کوردی بەهۆی زمانی نووسین دەکرێت بە پێوەر دابنرێت، هەموو دیالێکتەکانی لەگەڵدا کۆ بکرێنەوە بەرەو زمانی گشتی و بەستاندارد بکرێت، وەکو لە بەشی دووەمی ئەم باسە، کە هەوڵێکە بۆ هەنگاوێکی گشتی و گشتگیر.

**دووەم/ بلۆمفیلد:**

یەکێك بوو لە بونیاتگەرەکانی قوتابخانەی ئەمریکی، کە جەختیان لە بەکارهێنانی دیالێکتەکان دەکردەوە، چونکە لە دیالێکتەکانی زماندا، ڕەسەنایەتی سروشتی زمان و یاسا زمانییەکانی زیاتر تێدایە، بۆیە گرنگە بۆ دیالێکتەکان بگەڕێینەوە، بۆ ئەوەی زمانێکی پێوانەیی و ستاندارد دروست بکەین، وشەی دیالێکتەکان بە تایبەتی گوندەکان زیاتر پاراوە (کولینج، ٤٨٩:١٩٩٩)، کەواتە دەتوانرێت لە زار و شێوەزار و دیالێکتەکان زمانی دەوڵەمەند و پاراو بەرهەم بهێنین . لە هەمان کاتدا زمانی ستاندارد و پێوانەیی. هەروەها لە ڕێگای ئەو توێژینەوانەی کە ئەنترۆپۆلۆجییەکان بۆ کلتووری کۆمەڵگا دەیانکرد، لەوانە (ساپیر، بواس، ماکس موللر)، کە جەختیان لەسەر زمانی کۆمەڵگا دەکردەوە، کە توێژینەوەیان لە سەر زمانی باکووری ئەمریکا دەکرد، ئەمە لەڕێگای زمانەوانە ئەمریکییەکان بوو، کە بۆ زۆربەی وڵاتەکان بەکار دەهات، بۆ ئەوەی زمانەکەیان بەرەو پێش بڕوات (کولنج، ٤٩٠:١٩٩٩). بوونی وشەی گشتی لە زماندا زمان بەرەو پاراوی و دەوڵەمەندی دەبات، بەمەش زمان بەردەوام لە پێشکەوتن و گۆڕاندا دەبێت. (لوسرکل، ١٠:٢٠٠٦).

**سێیەم/ جاك لوسیرکل:**

لەلای (لوسیرکل) وشەی گشتی بەکار دەهێنا بۆ دەوڵەمەندی و زیادبوونی وشە لە زماندا، ئەم وشانە زمانی بەرەو پاراوی دەبرد، کە لە گۆڤارەکانی ئەکادیمی و بەڕێوەبردن بەکاردەهاتن. زمان لەڕێگای ئەو چالاکییەوە لە گۆڤارەکانەوە گوێزرایەوە بۆ ناو کتێبەکان، واتە (**بەکارهێنانی وشەی جیاواز = بە**

**مانای هەمان وشە) = هاو واتا (مرادف)** (لوسیرکل، ٢٠٠٦:١٨)، لێرەدا دەکرێت بۆ هەر وشـەیەکی زمـان چـەند هاوواتاییێك لـە شـێوەزارەکان دروسـت بکرێـت، ئەمـە ڕێگایەك دەبێت بۆ بەرهەمهێنانی زمانی سـتاندارد و پـاراو و دەوڵەمەنـد وەکـو لـە بەشی پراکتیکی دیالێکتی سەروو و شێوەزاری مـزووری بـالاّ وشـەکان بـە شـێوەی هاوواتا بەراورد کراون . ئەم بەکارهێنانە جۆری وشە لـە زمـانی ئینگلیزیـدا هەیـە، وەکو هەندێ وشە لە ئینگلیزیی بەریتانیـدا هەیـە، هەنـدێ وشـەی تـر تایبـەتن بـە ئینگلیزیی ئەمریکی، بـەڵام لـە لایـەن هـەردووکیان وشـەکان بـەکاردێن هـەموو بـە ئینگلیزیـی سـتاندارد بـە شـێوەی هاوواتـا بـەکاردێن، ئەمـەش بەشـێوەیەکی زۆر پێوانەیی و ستاندارد ڕێکخراوە (جون لوینز، ٢٠٠٩: ٢٥١)، کەواتە بـە بـەکارهێنانی وشـەی هـەموو دیالێکتـەکان، "ئـەو کاتـە زمـان لـەخۆوە بـەرەو سـتاندارد بـوون دەچێت، بـەبێ هـەبوونی تیۆرێك بـە شـێوەیەکی پراکتیکـی و ئۆتۆمـاتیکی وەکـو زمانی ئینگلیزی"(کولنج، ١٩٩٩:٤٩١)، ئینجا بەکارهێنانی وشەکان لە نووسیندا لە ڕێگای چاپەمەنی کە داهێنانێکی هونەرییە هەموو کات پێکهاتـە سـەرەکییەکانی کۆدەکاتەوە و ڕێکیان دەخات، بە تایبەتی لایەنی زمانی بەشێوەیەکی تایبەتی لـە کۆمەڵگادا. کەواتە نووسین لە چاپەمەنی بەشـێوەیەکی گشـتی هـەموو کـات زمـان بـەرەو پـاراوی دەبـات بـەهۆی پێداچـوونەوە، هـەردوو هۆکـاری، نووسـین و بەرهەمەکـە، ئـەنجامی بـاش دەبێـت، چـونکە خوێنـەری باشـی دەبێـت (هـاریس، تولیب، ٢٠٠٤:١٤٣) ئەگەر لە چاپەمەنیدا زمان بەشێوەیەکی بـەردەوام هاوواتاکـان بەکاربهێنێت، کە هەموو پێکهاتـەی شـێوەزارەکانی تێدا بێـت. ئـەوا زمـان بـەرەو ستانداردبوون دەبـات، وەکـو زمـانی ئینگلیـزی کـە (کاکسـتن) یەکـەم کـەس بـوو لەڕێگای چاپەوە وەکو سەرەتایەك بۆ زمانی ئینگلیزی بەکارهێناوە زمانی بەرەو پاراوی و ستانداربوون برد (هەمان سەرچاوەی پێشوو)، کەواتە بۆ زمانی کوردیش بەهەمان شێوەیە، کە وشەکانی زمـان لـە دیالێکتەکانـدا کۆبکرێتـەوە بـە شـێوەی هاوواتا لە چاپدا بڵاوبکرێنەوە بەشێوەیەکی پاراو زمان بەرەو ستاندارد دەچێت.

### چوارەم/ سۆسێر:

پاشماوەکانی وشەی (المتبقي) بەکار دەهێنا بۆ وشـەکانی زمـان، واتـە هـەر وشەیەك دەتوانرێت چەند وشەی نوێتر بەرهەم بهێنێت، لە ڕێگای وشە هاوواتاکان،

وشـە دژ واتاکـان، ئەمانـە هـەمووی بـە هـۆی وشـەکانی یـەکتری دەناسـرێنەوە. (لوسـیرکل، ٢٣:٢٠٠٦) کەواتـە دەکرێـت لـە وشـەی دیالێکتـەکان کۆبکەینـەوە هەموویان پۆلێن بکەین لە چوارچێوەی وشە هاو واتاکان، وشە دژ واتاکان، ئەمانە هەموویان لە ژێر یـەك زمـانی سـتانداردی یـەکگرتوو دەناسـرێنەوە. هـەروەکو لـە قاموسی زمـانی ئینگلیزیـدا، کـە وشـەی قـورس بـە وشـەی ئاسـایی و ئاسـان لێـك دەدرێنەوە، ئەمەش شێوازێکی زیرەکانەیە بۆ شـێوازی ڕوون، هـەروەها ڕێگایەکـە زۆر بـەکاردێت بەشـێوەیەکی بـەربڵاو (کـولنج، ٦٧١:١٩٩٩)، زمـانی ئینگلیـزی زمانەکـەیان لـە ڕێگـای وشـەی دیالێکتـەکان ڕێزمانەکەشـیان ڕێکخسـت، زمـانی سـتانداردی دروسـت کـرد (جـون لـوینز، ٢٥٠:٢٠٠٩). بـەپێی ئـەزموون جەختکراوەتەوە، کە زمانی جۆراوجۆر هەموو کات هەبووە، ئەمەش ڕێگا خۆشکەر دەبێت بۆ بەرەوپێشچوونی زمان لە ڕێگای لێکۆڵینـەوە، نزیککردنـەوەی زمانـەکان لەیـەکتری (کـولینج، ٤٩٠:١٩٩٩). کەواتـە وشـەی شـێوەزارەکان دەکرێـت پـۆلی وشـەکە (دژ واتاکـان، وشـە فـرە واتاکـان، وشـە هـاو واتاکـان) بـەهۆی وشـەکانی شـێوەزارەکان شـیبکرێنەوە وشـەکان خۆیـان خۆیـان ڕاڤـە دەکـەن لەیـەك نزیـك دەبنەوە، دەبنە وشەکانی زمانی پێوانەیی و ستاندارد.

### پێنجەم/ هارالد هارمان:

بەکارهێنانی زمان لە بواری زانسـتدا دەسـەڵاتی بـەکارهێنانی زیـاتر دەبێـت، هەروەکو چۆن لە سـەدەی حەڤدەهـەم زمـانی فەرەنسـی و ئـەڵمانی یەکـەم زمـان بوون لە بواری زانستدا، هەرچـەندە زمـانی فەڕەنسـی تـا جـەنگی جیهـانی یەکـەم زمانی ئۆرستۆکراتی و بورجوازی بوو، بەڵام بەرامبەر بـەزمانی ئـەڵمانی کشـایەوە، کـە زمـانی ئـەڵمانی زمـانی زانسـت بـووە لـە پێشـتر بـووە، لـەو کاتـەوە زمانەکـە بەهاکەی هەر وەکو خۆیەتی بـەهۆی ئـەوەی زمـانی زانسـتە، لـە نیـوەی دووەمـی سەدەی نۆزدەهەم زمانی ئینگلیزی بە پێش کەوت بـەهۆی ئـەوەی زمـانی زانسـتە لەسەر ئاستی جیهاندا، لـە هـەموو بوارەکـانی زانسـتدا بەرامبـەر بـە هـەموو زمانـە ڕکابەرەکانی (هارالد هارمـان، ١٨١:٢٠٠٦). پێشـکەوتنی زمـان تـەنیا لەبـەر ئـەوە نییـە، کـە لـە بـواری زانسـت بـەکاردێت، جگـە لەمـە زمـانی ئینگلیـزی لـە ڕووی لێسکیکییەوە زۆر گرنگی بە زمانەکە دراوە، لە ئەنجامی کۆکردنـەوە و زیـادکردنی

و دەوڵەمەندکردنی لە لێکسیکدا بە شێوەیەکی ڕوون، کە لەزمانی ئینگلیزی، وشەی فەڕەنسییان بە زمانی ئینگلیزی وەردەگێڕا تاکو زمانەکەیان دەوڵەمەند بێت لە وشەی زانستیدا، هەروەها لە سەدەی شانزدەهەم وشەی زانستییان لە یۆنانی و لاتینی وەردەگێڕایە سەر زمانی ئینگلیزی، تاکو هەموو مێتۆدی زانستی لە زمانەکەیاندا هەبێت بە زمانی خۆیان (کولینج، ١٩٩٩:٦٧١)، زمان شتێکی گشتییە شەرعیەت و نفوسی خۆی لەڕێگای داهێنان و زانست زیاد دەکات، پاشان هێز و دەسەڵاتی لە لایەن دەسەڵاتی سیاسی تەمویل دەکرێت وەکو بابەتێکی ئەکادیمی تەواو ڕێکوپێك (جان جاك لوسیرکل، ٢٠٠٦:٦٨). کەواتە بۆ ئەوەی زمان پێشبکەوێت و بەکاربێت، دەبێت زۆر پێشکەوتوو بێت لە وشە، ئینجا ئەم زمانە لە بواری زانستدا بەکاربێت . بۆ بەرەو پێشچوونی زمانی کوردی وەکو زمانی ستاندارد، دەبێت بۆ شێوەزار و دیالێکتەکان و کۆمەڵگا بگەڕێینەوە تاکو زمانی ستاندارد دروست بێت، پێشبکەوێت و سەربکەوێت.

## بەشی دووەم
## ئاستی وشەسازی

### بەراوردی نێوان زمانی نووسین و شێوەزاری مزووری باڵا

ئەم بەشە، بەشەکانی ئاخاوتن دەگرێتەوە کە ئەمانەن:

**یەکەم / ناو:**

ئەو وشەیەیە کە ناوی گیاندارێك یان بێ گیانێك یان بیرێك یان کارێك دیاری دەکات وەك: پەپوولە، گوڵ، کۆتر (ئەورەحمانی حاجی مارف، ٢٠٠١:١٠٢) ناو لە شێوەزاری مزووری باڵا جیاوازە لە زمانی نووسین چونکە لەم شێوەزارەدا بەزۆری ناوەکان کۆتاییان بە (ك) دێت وەکو:

| زمانی نووسین | شێوەزاری مزووری باڵا |
|---|---|
| جۆڵانە | هێزوك |
| دەرگا | دەرك |

**جۆرەکانی ناو:**

**ناو بە دوو شێوە باس دەکرێت: ١. لەڕووی پێکهاتەوە. ٢. لەڕووی واتاوە:**

یەکەم: – ناو لەڕووی پێکهاتەوە دەکرێت بە دوو بەشەوە:

١. سادە ٢. ناسادە

**یەکەم/ ناوی سادە:**

ناوی سادە ئەو ناوەیە، کە فۆرمێکی سەربەخۆیان لە وشەیەکی سادە پێک هاتبێت (کۆری زانیاری کوردی، ٢٠١١ :١٣). ئەگەر ناوە سادەکان زمانی نووسین و شێوەزاری مزووری بالاّ بەراورد بکەین دەبینین پێکهاتەی ناوەکە زۆر گۆڕاوە .

| شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاّ | زمانی نووسین |
|---|---|
| زێر | ئاڵتوون |
| قوپك، گوپك | خونچە |
| پەلك | گەلاّ |
| شیان | توانا |
| پەیستك | پەیژە |
| بریسی | تریشقە |
| باهی | بادەم |
| پرچ | قژ |
| بەفر | سەهۆڵ |
| شە | شانە |
| ڕووندك | فرمێسك |
| کاهرك | قارچك |
| سێنیك | دەفر |
| بچم | سیما |
| لاوژە | گۆرانی |
| بەلوور | لەمپە |

| | |
|---|---|
| گلەیی | گازندە |
| منداڵ | بچیك |
| هەڵۆ | باز |
| چۆلەکە | چیچك |
| خۆڵ | ئاخ |
| پەپوولە | پەلپەلیسك |
| بازاڕ | باژێر |
| بیانی | بیهانی |
| جۆ | جە |
| ترێ | ترە |
| جگەرە | جەگارە |
| ڕووناکی | ڕووناهی |
| سوپا | سەپا |
| کەیبانو | کابانی |
| هەرمێ | هەرمیك |
| هەور | عەور |
| هەنجیر | هەشیر |

**دووەم/ ناوی داڕێژراو:**

ئەو ناوەیە کە لە فۆرمێکی سەربەخۆ و زیادەیەك پێکدێت، زیادەکەیان پێشگر یان پاشگرە، وەك ئەم نموونانەی خوارەوە.

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| ئاگردان | کوچك |
| چاکە | چاکی |
| دەوڵەمەند | زەنگین |
| سەرەتا | بەراکێ |

| | |
|---|---|
| زەردێنە | زەرك |
| ڕێچکە | شین پێ |
| هاورێ | شەریك |
| دەسرۆك | چەفیك |
| ملوانکە | ڕستك |
| دووانە | جەمك |
| سوورێژە | سوورك |
| هەڵووژە | حەلیك |
| مێرووله | مێریکە |
| کچێنی | کچینە |
| پووشوو | پیشە |
| جوانی | جانی |
| دۆستایەتی | دووستاتی |

**سێیەم / ناوی لێکدراو:**

ئەو ناوەیە کە وا بە لایەنی کەمەوە لە دوو وشەی واتادار بەهۆی ئامراز یان بێ ئامراز پێکدێت (کۆڕی زانیاری کوردی، ٢٠١١:١٥) وەك ئەم نموونانەی خوارەوە.

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاّ |
|---|---|
| دارو درەخت | داروبار |
| سەوزە گیا | گیا شینك |
| نیشتەجێ | ئاكنجی |
| دەستكێش | دەستەك |

**مۆرفیمە ڕێزمانییەکانی ناو:**

ئەو مۆرفیمە بەندانەن کە دەچنە سەر ناو ئەرکێکی ڕێزمانی دیاری دەکەن وەکو: (ناسراو، نەناسراو، کۆ) بەم شێوەی خوارەوە لە زمانی نووسین و شێوەزاری مزووری بالاّدا دەخرێنە ڕوو:

١. **ناوی تاك:** ئەو ناوەیە، كە تەنیا كەسێك یان تەنیا شتێك نیشان دەدات (ئەورەحمانی حاجی مارف، ٢٠٠١ : ١٤٠)

مۆرفیمی رێزمانی بۆ ناوی تاكی نەناسراو (ەك) (صادق بهاءالدین، ١٨١:١٩٧٨) وەردەگرێت كە جیاوازە لەگەڵ زمانی نووسین كە (ێك) وەردەگرێت.

گۆلەك __________گوڵێك (زمانی نووسین)، كوترەك ________ كۆترێك (زمانی نووسین)

٢. **ناوی كۆ:** ئەو ناوەیە كە چەند ناوێكی بێ ژمارە و بێ پێوان لە خۆ دەگرێت، لەم شێوە ئاخاوتنەدا نیشانەی ناوی كۆ (ان، ات، اێد) وەردەگرێت (جگرخوین، ١٧:١٩٦١) كە لە زمانی نووسین (ان) وەردەگرێت . لە شێوە ئاخاوتنی مزووری سێ پێكهاتەی هەیە كە جیاوازە لەزمانی نووسیندا هەیە. وەكو:

گولێد جان ______ گولانی جوان.

هەسپان ______ ئەسپان

دێهات ________ دیهات

٣. **ناوی ناسراو:** ئەو نیشانەیە كە بە دوای ناو یا ئاوڵناوە دەلكێنرێ، بۆ ئەوەی بكرێ بە ناسیاو، جێناوی نیشانەی (ئەڤ، ئەو ______ بۆ تاك )، (ئەڤان، ئەوان ____ بۆ كۆ )یە لە كرمانجی سەروو و شێوەزاری مزووری باڵا بۆ ناسراو كردنی ناو بەكاردێت (هەمان سەرچاوەی پێشوو:١٨) .

وەكو: من ئەڤ گول كری ____ من ئەو گوڵم كڕی

من ئەڤ گولێن هە كرین _____ من ئەو گوڵانەم كڕین .

هەروەها نیشانەی ناسیاوی لە شێوەزاری مزووری باڵادا (ی، یێ) وەردەگرێت، ئەگەر ناوەكە بە كونسنات كۆتایی هات (ی) وەردەگرێت، بەڵام ئەگەر بە بزوێن كۆتایی هات ئەوە (یێ) وەردەگرێت (صادق بهاء الدین، ٢٠٠:١٩٨٧) وەكو:

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| ڕەزەکە | ڕەزی |
| تەختەکە | تەختەیێ |
| زانایەکە | زانایێ |
| ئازایەکە | ئازای |

## دووەم/ ئاوڵناو:

ئاوڵناو وەك بەشە ئاخاوتنێك، واتای چۆنیەتی و خاسیەت و نیشانە ڕادەگەینێ لە ئاوڵناودا ئەم ڕاگەیاندنە چ لە بەرکارهێنانی ڕستەسازیدا و چ لە تایبەتی وشەسازی ڕوون و ئاشکرا بە دیاردەکەوێ. (ئەوڕەحمانی حاجی مارف، ۲۰۰۱ :۵۸) لە مەیدانی ڕستەسازیدا جیاوازی ئاوڵناو لەگەڵ ناودا، لەوەدایە کە بەر لە هەر شت بە بەردەوامی وەك دیارخەر بەکاردەبرێ، ئاوڵناو لە سروشتدا دیارخەری خاسیەتی ناوە. ئاوڵناو وەك ئەندامی دیی ڕستە کەم بەکاردەهێنرێت، بۆیە مەیدان و ئەرکی لە هی ناو کەمترە (هەمان سەرچاوەی پێشوو) ئاوڵناو لە شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا زۆر جیاوازە لە شێوەی نووسین، چەند وشەیەك نەبن لەشێوەی نووسین دەچن، ئەوانیش بەزۆری ئاوڵناوە سادەکانن وەك: باش، درێژ، سپی ..........هتد

## مۆرفیمە ڕێزمانییەکانی ئاوڵناو

ئەگەرچی ئاوڵناو دۆخ و جنس و ژمارەی نییە، بەلاًم خاوەنی خاسیەتی خۆیەتی، ئەویش بوونی پلەیە. (هەمان سەرچاوەی پێشوو)

١. پلەی چەسپیو: ئاوڵناوێکی سادەیە و هیچ نیشانەیێکی مۆرفۆلۆژی نییە (باش، چاك...........هتد)، شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا بەهەمان شێوە پلەی چەسپیوی هەیە کە ئاوڵناوێکی سادەیە وەکو نموونەکانی سەرەوە

٢. پلەی بەراورد: بۆ ڕۆنانی پلەی بەراورد دوو ڕێگەی سەرەکی هەیە لە شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵادا کە ئەوانیش ئەمانەن:

أ. ڕێگەی مۆرفۆلۆجی: ئەویش بە یارمەتی نیشانەی (تر)ە، دەخرێتە سەر ئاوڵناوی چەسپیو وەك: باشتر، چاکتر، باڵاتر ............ هتد

ب. ڕێگەی لێکسیکی: لەم شێوە ئاخاوتنە بە یارمەتی وشەی (پـتر، زێـدەتر، کێمتر، زوورتر ............هتد)، دروست دەبێت، کە لـە زمـانی نووسـین (کـەمتر، زیاتر، زۆرتر ) وەردەگرێت وەکو:

زێدە باشە ________ (باشتر) زیاتر باشە ________(زمانی نووسین)

٣. پلـەی بـاڵا: لـە شـێوەی ئاخـاوتنی مـزووری وەکـو کرمـانجی سـەروو بـە یارمـەتی وشـەی (ژ هـەمیا، ئـەژ هـەمیا ) دروسـت دەبێـت ( صـــادق بهـاء الـدین: ١٩٩٨: ٢٧٨)

ژهەمیا زیرەکتر ____________ زیرەکتر __________ (زمانی نووسین)

باش ______ باشتر ________ ژ هەمیا باشتر _______(زمانی نووسین)

**یەکەم/ ئاوڵناوی سادە:**

لە یەك وشەی سادە پێك هاتبێ (کۆڕی زانیاری کوردی، ٢٠١١: ١٥)

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| بەرز | بڵند |
| ئازا | مێرسەر، مێرخاس |
| پەیت | تێر |
| چالاك | زرگ |
| تۆخ | تێر |
| زۆر | گەلەك |
| سەخت | عاسێ |
| کپ | مات |
| کاڵ | تیت |
| چورچ | چرمسی |
| پاك | خاوین، تەمیز |
| گەورە | مەزن |
| نوێ | نی |
| لێڵ | شێڵی |

| | |
|---|---|
| مۆر | بنەوشی |
| پەمبە | پیازی |
| بچووك | بچیك |
| پیس | چەپەڵ |
| کۆن | کەون |
| سپڵە | سفڵە |
| بەد | سپڵە |
| ئاسان | سەناهی |
| باریك | زەراو |

## دووەم/ئاوەڵناوی ناسادە:

لە وشەیەك و زیادەیەك یان لە دوو وشەی واتادار پێکهاتبێ (کۆڕی زانیاری کوردی، ٢٠١١:٧١) لێرەدا ئاوەڵناوی داڕێژراو و لێکدراو وەرگیراوە.

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاّ |
|---|---|
| بالاّبەرز | بەژن بڵند |
| پیاوانە | مێرین |
| پاك و خاوێن | پاقژو تەمیس |
| درۆزن | درهێن |
| قەدباریك | بەژن زەراو |
| زۆر بڵێ | پرئاخاوتن |
| بەگوور | ژگوور |
| شەرانی | شەرۆکی |
| سپیلکە | سپیلکوك |
| بێ کەلك | بێ مفا |
| بەختەوەر | خۆش بەخت |
| شاخاوی | چیایی |
| پێشەکی | بەرایی |

| | |
|---|---|
| بەرین | فرە |
| سەرۆ | سەریی |
| خواروو | خواری |
| خێڵەکی | عەشایری |
| وردیلە | هیرکووک |
| نادیار | نەدیهار |
| قەد باریك | بەژن زەراو، بەژن زەراڤ |

**سێیەم: ڕاناو**

ئەو وشەیەیە کە جێی ناو دەگرێتەوە لە بری ئەو بەکاردێت بۆ ئەوەی لە ڕستەدا دووبارە نەکرێتەوە. (کۆڕی زانیاری کوردی، ٢٠١١:٢٨)

**یەکەم / ڕاناوی سەربەخۆ:** ئەویش وەکو کرمانجی ژووروو دوو جۆری هەیە:

أ: دەستەی ئاسایی: ئەم دەستەیە دەچێتە سەر کاری داهاتووی تێپەڕ و تێنەپەڕ و کاری ڕابردووی تێنەپەڕ (وریا عمر ئەمین، ٢٠٠٩:٦١)

| شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاٚ | | | زمانی نووسین | | |
|---|---|---|---|---|---|
| کەس | ژمارە | ڕاناو | کەس | ژمارە | ڕاناو |
| تاك | یەکەم | ئەز | تاك | یەکەم | من |
| تاك | دووەم | تو | تاك | دووەم | تۆ |
| تاك | سێیەم | ئەو | تاك | سێیەم | ئەو |
| کۆ | یەکەم | ئەم | کۆ | یەکەم | ئێمە |
| کۆ | دووەم | هنگ | کۆ | دووەم | ئێوە |
| کۆ | سێیەم | ئەوان (وان) | کۆ | سێیەم | ئەوان |

بۆ نموونە:

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاٚ |
|---|---|
| من هاتم | ئەز هاتم |
| تۆ هاتی | تو هاتی |

| | |
|---|---|
| ئەو هات | ئەو هات |
| ئێمە هاتین | ئەم هاتین |
| ئێوە هاتن | هنگ هاتن |
| ئەوان هاتن | ئەوان هاتن |

ب. دەستەی خاوەنی: ئەم دەستەیە دەچێتە سەر کاری ڕابردووی تێپەڕ، لەم حاڵەتەدا کارەکە ڕاناو وەرناگرێت (وریا عمر ئەمین، ٢٠٠٩:٦٠) دەچێتە سەر ناو بۆ بەرکارەکە.

| شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالا | | | زمانی نووسین | | |
|---|---|---|---|---|---|
| کەس | ژمارە | ڕاناو | کەس | ژمارە | ڕاناو |
| تاك | یەکەم | من | تاك | یەکەم | من |
| تاك | دووەم | تە | تاك | دووەم | تۆ |
| تاك | سێیەم | و (ی، ێ، ە) | تاك | سێیەم | ئەو |
| کۆ | یەکەم | مە | کۆ | یەکەم | ئێمە |
| کۆ | دووەم | هنگو | کۆ | دووەم | ئێوە |
| کۆ | سێیەم | (وان) | کۆ | سێیەم | ئەوان |

بۆ نموونە:

| شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالا | زمانی نووسین |
|---|---|
| من نان خار | من نانم خوارد |
| تە نان خار | تۆ نانت خوارد |
| وە نان خار | ئەو نانی خوارد |
| مە نان خار | ئێمە نانمان خوارد |
| هنگو نان خار | ئێوە نانتان خوارد |
| وان نان خار | ئەوان نانیان خوارد |

هەروەها لە فرێزدا دەوری دیارخەر دەبینێ وەکو:

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| گولی من | گولا من |
| گولی تۆ | گولا تە |
| گولی ئەو | گولا وە |
| گوڵی ئێمە | گولا مە |
| گوڵی ئێوە | گولا هنگو |
| گوڵی ئەوان | گولا وان |

**دووەم/ ڕاناوی لکاو:**

لە شێوە ئاخاوتنی مزووری باڵادا ڕاناوی لکاو لەگەڵ دەستەی ئاسایی بەکاردێ، لەگەڵ کاری ڕانەبردووی تێپەڕ و تێنەپەڕ بەکاردێت، بەڵام کاری ڕابردووی تێپەڕ تەنیا ڕاناوی سەربەخۆی دەستەی خاوەنی لەگەڵ بەکاردێ .
تەنیا یەك جۆر ڕاناوی لکاو هەیە:

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| یەکەمی تاك | م |
| دووەمی تاك | ی |
| سێیەمی تاك | ٠، (ێ، ێت)، (ا، ات) |
| یەکەمی کۆ | ین |
| دووەمی کۆ | ن |
| سێیەمی کۆ | ن |

بۆ نموونە:

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| من دێم | ئەز دێ هێم |
| تۆ دێیت | تو دێ هێی |
| ئەو دێت | ئەو دێ هێت |

| | |
|---|---|
| ئێمە دێین | ئەم دێ هێین |
| ئێوە دێن | هنگ دێ هێن |
| ئەوان دێن | ئەوان دێن |

## سێیەم / ڕاناوی خۆیی:

ئەم ڕاناوەیە لە وشەی (خۆ) و ڕاناوی کەسی لکاوی (م – مان، ت – تان، ی – یان) دروست دەبێت بۆ تەوکید بەکاردێت (کۆری زانیاری کورد، ٢٠١١:٥٥) لەبەر ئەوەی لە شێوە ئاخاوتنی مزووری بالاّ ڕاناوی لکاوی دەستەی خاوەنی نییە، بۆیە ڕاناوی خۆی جیاوازە لە شێوەی نووسین، لە دەستەی ئاسایی ڕاناوی سەربەخۆ لەگەڵ ئامرازی پەیوەندی (ب) لەگەڵ ڕاناوی خۆی (خۆ) ئەگەر کارەکە داهاتووی تێپەڕ و تێنەپەڕ بێت، بەلاّم ئەگەر کارەکە ڕابردووی تێپەڕ بێ ئەوا دەستەی خاوەنی لەگەڵدا دەبێ: لەکاری ڕابردووی تێنەپەڕ:

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاّ |
|---|---|
| خۆم چووم | ئەز ب خو چووم |
| خۆت چووی | تو ب خو چووی |
| خۆی چوو | ئەو ب خو چوو |
| خۆمان چووین | ئەم ب خو چووین |
| خۆتان چوون | هنگ ب خو چوون |
| خۆیان چوون | ئەوان ب خو چوون |

لەکاری ڕانەبردووی تێنەپەڕ:

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاّ |
|---|---|
| خۆم دەچم | ئەز دێ ب خو چم |
| خۆت دەچی | توو دێ ب خو چی |
| خۆی دەچێت | ئەو دێ ب خو چیت |
| خۆمان دەچین | ئەم دێ ب خو چین |
| خۆتان دەچن | هنگ دێ ب خو چن |
| خۆیان دەچن | ئەوان دێ ب خۆ چن |

لە کاری ڕابردووی تێپەڕ:

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاّ |
|---|---|
| خۆم نووسیم | من ب خو نڤیسی |
| خۆت نووسیت | تە ب خو نڤیسی |
| خۆی نووسی | وە ب خو نڤیسی |
| خۆمان نووسیمان | مە ب خو نڤیسی |
| خۆتان نووسیتان | هنگو ب خو نڤیسی |

**چوارەم: ئاوڵکار:**

وەك بەشێکی سەربەخۆی ئاخاوتن لەسەر بناغەی خاسیەتی وشەسازی و ئەرکی ڕستەسازی و واتاناسییەوە جیا دەکرێتەوە. ئاوڵکار خاسیەتی ڕوودان کە (کارەکە دەری دەبڕی)، خاسیەتی خاسیەت کە (ئاوڵناو دەگەیەنێ)، خاسیەتی بارودۆخ، (کە ئاوڵکار نیشانی دەدا) دیاری دەکا.

ئاوڵکار چۆنیەتی یان ڕادەی ڕوودان یان ڕادەی چۆنیەتی شتێك یان بارودۆخی جیاوازی ڕوودانی کارێك: (شوێن، کات، هۆ، مەبەست، ڕادەگەیەنێ) (ئەوڕەحمانی حاجی مارف. ٢٠٠١: ٣٠) ئەمانەش چەند جۆرێکن:

**یەکەم/ ئاوڵکاری کات:** کاتی بەجێهێنانی کارێك دیاری دەکات، (هەمان سەرچاوەی پێشوو) لە شێوەزاری مزووری بالاّ زۆر گۆڕاوە لە ڕووی وشەسازییەکەیەوە.

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاّ |
|---|---|
| ئێستا | نووکە |
| ئەمڕۆ | ئەوروو |
| بەیانی | سپێدێ |
| بەم زووانە | وازیانە |
| جاران | جارا |
| هەمیشە | هەمەجا |

| | |
|---|---|
| هەندێ جار | هەندەجا |
| لەمەولا | نووکەپاشەوە |
| کەی | کەنگی |
| لەمەوبەر | پێش نووکە |
| دوێنێ | دەهی |
| جاران | هەرجا |
| دەمێکە | ئەژمێژینە |

**دووەم/ ئاوڵکاری شوێن:** شوێنی ڕوودانی کارەکە دیاری دەکات.

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵآ |
|---|---|
| لەنێوان | ناو بەینا |
| لەلای | ڕەخی |
| لەوبەر | وی بەری |
| جێگا | جە |
| کن | نك |
| لێرەوە | وێروە |

**سێیەم/ ئاوڵکاری چۆنیەتی:** واتای چۆنیەتی ڕوودان یان دەلالەت نیشان دەدا.

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵآ |
|---|---|
| لەپڕ | نەهنگارە |
| بەپەلە | لەزوبەز |
| بەگوڕ | ژگوور |
| هێمن | هێدی |

**چوارەم/ ئاوڵکاری چەندێتی:**

چەندەیەتی ڕوودان، ڕادەی توندی ڕوودان، ئەندازەی چەندەتی دیاری دەکات.

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| پڕ | تەشی |
| گەلێك | گەلەك |
| تۆزەك | هیرکووکەك |
| کەمێك | پیچك |

## پێنجەم: ئامراز

ڕواڵەتی سەربەخۆی هەیە، بەڵام واتای لە تەك وشەی تردا دەردەکەوێت، دەوری لە دارشتنی ڕستەدا دەردەکەوێت، واتە بەشەکانی ڕستە بەیەکەوە دەبەستێتەوە و پێوەندیی ناوەکییان بەیەکەوە دروست دەکات (کۆڕی زانیاری کورد، ٢٠١١:٢٥٨)

لە شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵادا ئامرازەکان بەزۆری گۆڕانی فۆنیمیان بەسەردا دێت ئامرازیش چەند جۆرێکی هەیە لەوانە:

**یەکەم /ئامرازی پەیوەندی:** بۆ دەرخستنی ناوێ، یا ڕاناوێ، یا ئاوڵناوی بەکار هێنراوە لەتەك وشەکانی تری ڕستەدا (هەمان سەرچاوەی پێشوو).

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| لە | ل |
| بە | ب |
| بۆ | بوو |

دووەم/ ئامرازی لێکدەر:

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| و | ئوو |
| شی | ژی |
| ئەگینا | ئەگەنە |
| کە | کو |

**سێیەم/ ئامرازی گەیێنەر:**

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاَ |
|---|---|
| هەرکە | هەکە |
| مەگەر | ئەگە |
| بەڵکو | بەلکی |

**چوارەم/ ئامرازی خۆزگە:**

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالاَ |
|---|---|
| خۆزگە | خوزی |
| ئادەی | کادێ |
| ئاخۆ | مانێ |
| بەڵکو | بەلکی |
| بێجگەلە | بێجگل |

**شەشەم/ چاوگ:**

ئەو وشەیەیە کە واتای ڕوودان دەگەیەنێ بێئەوەی ئاماژە بە کات، کەس، ژمارە بکات. هەموو چاوگێك لەزمانی کوردیدا بە فۆنیمی (ن) کۆتایی دێت پێی دەوترێت (ن)ی چاوگ، چاوگەکانیش پێنج جۆرن بەپێی فۆنیمەکانی پێش (ن) کە ناونراون کە ئەم فۆنیمانەش بریتین لە (ا، ت، د، و، ی) (کۆڕی زانیاری کورد، ٢٢٢:٢٠١١)

١. چاوگە ئەلفییەکان .
٢. چاوگە تائییەکان .
٣. چاوگە دالییەکان .
٤. چاوگە واوییەکان.
٥. چاوگە یائییەکان.

چاوگ ئەگەرچی پێکهاتن و تایبەتیی خۆی هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا سەربە فۆرمە گەردان نەکراوەکانی کارە، واتای ڕوودان دەگەینێ بێ ئەوەی ئاماژە بە کات یان کەس یان ژمارە بکات.

کەواتــە لــەم بارەیــەوە چــاوگ وەك نــاوی واتــایی وایــە، هەمیشــە چــاوگ پەیوەنـدی بـە کـارەوە هەیـە بـەهۆی بـوونی بەڵگـەی وشەسـازی و ڕستەسـازی دەستنیشان دەکرێت. لەبارەی ڕستەسازییەوە چـاوگ دەتـوانێ ببێ بـە ئەنـدامی سەرەکیی ڕستە وەك بکەر و بـەرکاری ڕسـتەش دەردەکـەوێ، هـەروەها لـە ڕووی وشەسازیشەوە تایبەتی چاوگ لەوەدا دەردەکەوێت کە وەك ناوی ئاسایی دەتوانێ نیشانەی ناسیاوی، نەناسیاوی کۆ وەربگرێت.

لـە شـێوەزاری مـزووری بـاڵادا چـاوگە سـادەکان زۆربـەیان لـە چـاوگەکانی شێوەی نووسین دەچن، وەك هـاتن، چـوون.... هتـد، بـەڵام ئەوانـەی کـە لـە دوو بەش پێکهاتوون یان بەگشتی نادەسەن زیاتر گۆڕانی مۆرفۆلۆجییان بەسەردا دێت وەك:

پەلەکردن _ لەزکرن، یارمەتیدان ___ هاریکرن... هتد

## جۆرەکانی چاوگ:

### ١. چاوگە ئەلفییەکان:

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| ئاوگیران | پەنگیان |
| لکان | پێوە نووسیان |
| داگیرسان | هلکرن |
| لێ گەڕان | لێ گەڕیان |
| وەستان | ڕاوستیان |
| هێنان | ئینان |
| شکان | شکستن |
| شڵەقان | شلقیان |
| کێڵان | کێلان |
| هەژان | هەژیان |
| پیشاندان | نیشاندان |
| نەخشان | نەخشین |

| | |
|---|---|
| هەڵگەڕان | هەڵگەڕیان |
| هەڵسان | هستان |
| گەڕان | گەڕیان |
| شێلان | شێلین |
| سووتان | سووتن |
| خشان | خشیان |
| پێوان | پیوان |
| پسان | بزدیان |
| ڕژان | ڕژیان |
| کوتان | قوتان |
| خوران | خوریان |
| کوڵان | کەڵاندن |

### ٢. چاوگە تائییەکان:

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| کەوتن | کەتن |
| ڕشتن | ڕێتن |
| هێشتن | هێلان |
| نشتن | نیهیشتن |
| گەیشتن | گەهشتن |
| خستن | ئێخستن |
| هاویشتن | هاوێتن |
| فرۆشتن | فرۆتن |
| ڕستن | ڕێستن |
| ئاژووتن | هاژووتن |
| ئاخاوتن | ئاخوتن |
| خواستن | خاستن |
| بزاوتن | بزاوتن |

### ٣. چاوگی واوی

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| گروون | گرووتن |
| سوون | هسین |
| دروون | درین |
| بوون | بین |
| جوون | جین |
| فەرموون | فەرمین |

### ٤. چاوگی دالی

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| ڕژاندن | ڕێتن |
| سپاردن | هسپارتن |
| بژاردن | بشارتن |
| هەڵکردن | هلکرن |
| ژماردن | ئەژمارتن |

### ٥. چاوگە یائییەکان:

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری باڵا |
|---|---|
| پشکنین | لێنوورین |
| بینین | دیتن |
| پۆشین | پووشین |
| تاشین | تراشین |
| تەقین | پەقین |
| کۆکین | کووخین |
| کۆلین | کولان |

| | |
|---|---|
| سم ین | سمتین |
| توانین | شیان |
| چنین | چەنین |
| حەپین | حەفین |
| نۆشین | نووشین |
| گوشین | گیهیشین |
| پۆشین | نخاوتن |
| گرژین | ئالۆزین |
| گۆرین | گووهڕین |

**حەوتەم/ ژمارە:**

لەم شێوەزارە ژمارەکان زۆر جیاوازن لە ڕووی پێکهاتەی وشەسازییەوە.

| زمانی نووسین | شێوەی ئاخاوتنی مزووری بالآ |
|---|---|
| یەك | ئێك |
| چوار | چار |
| حەوت | حەفت |
| نۆ | نه |
| دە | ده |

## ئەنجام

١. بەکارهێنانی وشەی دیالێکتەکان و بەراوردکردنیان لە لێکسیکدا زمانی کوردی دەوڵەمەند دەکات لە وشە و واتادا.

٢. وەرگێڕانی وشەی شێوەزارەکان، زمان نزیک دەکاتەوە، توانای بەرهەمهێنانی وشە و زاراوەی نوێ زیاتر دەبێت.

٣. بە وەرگێڕان و بەکارهێنان زۆر وشەی هاوواتا دروست دەبێ، دەبێتە هۆی دەوڵەمەندیی زمانەکە، بۆیە ئاخێوەری کوردی سەلیقەی بەکارهێنانی زمانێکی ستاندارد و هاوبەشی لەلای دروست دەبێت.

٤. ئاخێوەری زمانی کوردی ئەندازیاری بەکارهێنانی وشەی جوان و باش لەلای دروست دەبێت، چونکە کەرستەی وشەی لەلای دەوڵەمەند دەبێت، بۆیە بەکارهێنانی باش و زیاتری لەلای دروست دەبێت.

٥. زمان وەکو بەکارهێنان لای ئاخێوەران وەکو دەستوور بواری فراوانتر و گشتگیرتر دەبێت.

٦. وشەکانی شێوەزاری مزووری باڵا لە هەموو بەشەکانی ئاخاوتن وشەی هاوواتای لەگەڵ زمانی نووسین هەیە، کە ئەمە زمان دەڵەمەند دەکات، بەڵام لە چاوگدا زۆر لەیەك نزیکن، واتە وشەکە بەتەواوی نەگۆڕاوە، ئەمەش بەڵگەیە کە لەڕووی ڕێزمانی زۆر لەیەك نزیکن، یەك سەرچاوەی زمانن، بەڵام لە وشەکانی تر دەڵەمەندن. کەواتە ئەمە زمان لەیەك جیا ناکاتەوە بەڵکو زمان دەوڵەمەند دەکات بۆ یەك بنچینەی زمانی کوردی ستاندارد و پێوانەیی.

٧. بەکارهێنانی وشەی دیالێکتەکان بە گشتی زمان بەرەو داهێنان و دەوڵەمەندی دەبات.

٨. ئەو سیستەمەی کە لای وایلد بەکاردەهات لێکسیکی بەرەو داهێنان دەبرد، لای بلۆمفیلد وشەی شێوەزارەکان بەکاردەهات، بەهۆی هەردووکیان وشەی هاوواتا دروست دەکرێت .

## سەرچاوەکان:

**أ. سەرچاوەکان بەکوردی:**


١. ئەورەحمانی حاجی مارف، (٢٠٠١) ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم – وشەسازی، بەشی (١ –٥)، ناو، جێناو، ئاوڵناو، ئاوڵکردار، کردار، ژمارە و ئاوڵکردار، چاپخانەی سلێمانی.

٢. جگەرخوێن، (١٩٦١)، اواو دەستورا زمانی کوردی، چاپخانەی بەغداد.

٣. صادق بهاالدین، (١٩٩٨)، (ڕێزمانا کوردی )، چاپا یەکی، چاپخانەی بەغداد.

٤. کۆری زانیاری کوردی، (٢٠١١)، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، چاپی دووەم، چاپخانەی ئاراس.

٥. وریا عومەر ئەمین، (٢٠٠٩)، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، چاپی دووەم، چاپخانەی ئاراس.


**ب. سەرچاوەکان بە عەرەبی:**


٦. اوزالد دیکرو، جان ماري سشایفر، (٢٠٠٧)، **القاموس الموسوعي الجدید لعلوم اللسان،** ترجمة د. منذر عیاش، الطبعة الثانیة، الناشر: المرکز الثقافي العربي، الدار البیضاء – المغرب.

٧. جون لوینز، (٢٠٠٩)، **اللغة و اللغویات**، ترجمة: (محمد العناني)، دار جریر للنشر والتوزیع.

٨.روي هاریس، تولبت جي تیلر (٢٠٠٤)، **اعلام الفکر اللغوي (التقلید الغربي من سقراط الی سوسیر)** ترجمة احمد شاکر الکلابي، الجزء الاول، توزیع دار اویا للطباعة والنشر.

٩. جاك لوسیرکل، (٢٠٠٦) **عنف اللغة**، ترجمة محمد بدوي، مرکز دراسات الوحدة العربیة، الطبعة الثانیة.

١٠. ن .ی. کولنج (١٩٩٩)، **الموسوعة اللغویة**، جامعة مانشستر، المجلد الاول، ترجمة محي الدین حمیدي، عبدالله الحمدان، کلیة اللغات و الترجمة – جامعة الملك سعود، المملکة العربیة السعودیة.

١١. ن .ی. کولنج (١٩٩٩)، **الموسوعة اللغویة**، جامعة مانشستر، المجلد الثاني، ترجمة محي الدین حمیدي، عبدالله الحمدان، کلیة اللغات و الترجمة – جامعة الملك سعود، المملکة العربیة السعودیة.

١٢. ن .ی. کولنج (١٩٩٩)، **الموسوعة اللغویة**، جامعة مانشستر، المجلد الثالث، ترجمة محي الدین حمیدي، عبدالله الحمدان، کلیة اللغات و الترجمة – جامعة الملك سعود، الملکة العربیة السعودیة.

١٣. هارلد هارمان (٢٠١١)، **تاریخ اللغات و مستقبلها**، ترجمة محمد توفیق البجیرمي، دار الکتاب العربي، بیروت – لبنان.

## ملخص البحث

## مقارنه بين اللغة الرسمية ( مكتوبة ) ولهجة مزووری بالا

البحث يقارن اللغة الرسمية مع لهجة مزووری بالا، يدور البحث على توحيد وتقرب كلمات اللغة حتى نستطيع ان نكون اللغة المعيارية، يشمل اللهجات من كل مناطق كوردستان كي يستطيع المتكلمين ان يستعملها بشكل أعطباتي، ان يكون اللغة معيارية.

**البحث مكون من فصلين، مع استنتاج ومصادر**

الفصل الاول: يبحث عن تجارب لغوية، من النظريات اللغوية حيث يتكثر الكلمات ويتجددها من كل اللهجات مثلا نظرية (لوسيركل، سوسير) . يتكلم عن تجارب اللغات من حيث الرجوع الى المجتمع عند ( بلومفيلد، انتروثولوجيين)، مع استعمال الكتب الجديدة وتاريخه للغة لتغنية قواميس اللغة من كلمات اللهجات بشكل عام وشامل.

الفصل الثاني: يقارن اللغة المكتوبة ولهجة (مزووری بالا) على مستوى مورفولوجيا، حيث اخذت اجزاء كلام المقارنة، على مستوى مورفيمات و كلمات . لقد قورنت كلمات لكي تتقرب من بعضها ونوسع مجال القواميس للهجات الكوردية ونسلك الطريق الى لغة معيارية، يتضمن كلمات كل اللهجات من اشكالها المختلفه ومعانيها موحدة (مرادفات) من كل لهجات اللغة الكردية.

## Abstract

The research compares formal written languages and Mzory dialect from a morphological point of view. It is divided into two parts along with an introduction and conclusion.

The first part presents some famous experience by world Linguistics like (Lusercal, Saucer) who stated that ‘we can take word for all dialects by synonymous in this way they close all , and make standard languages for that’; and some others resort to society such as(Bloomfield, anthropology).

At the second part there is a comparison between the two dialects and take all the words in both dialects as the synonymous.

At the end of the research the two dialects will be close to each other and make standard vocabulary which are different in form, but similar in meaning.

# هەڵبەستی (لە سرووشی نەورۆزەوە)ی (بدر شاكر السياب)

پ. د. وريا عومەر ئەمين
ئەندامی كارای ئەكاديميای كوردی

(من وحي النيروز — لە سرووشی نەورۆزەوە) هەڵبەستێكی دانسقەی نايابی دەگمەنی ونی نەبيسراوی شاعيری مەزن ، پێشڕەو و سەركردەی نوێكاری لە شيعری عەرەبيی هاوچەرخدا (بەدر شاكر السياب)ە، لە ژمارە ١٩ ی ساڵی يەكەمی ڕۆژنامەی (السلام)ی ٢٤ی ئازاری ١٩٤٨دا بڵاو كراوەتەوە. نەكەوتۆتە هيچ يەكێ لە ديوانەكانيەوەو هەر ئەوجارە بڵاوبۆتەوە. (٢٧) دێرە.

لەم هەڵبەستەدا دەردەكەوێ كە سەياب دۆستێك و پاڵپشتێكی دڵسۆزی كورد بووە. هەڵگری ئاڵا و بيرێكی مرۆڤايەتيی پتەو بووە. شايانە و پێويستە بايەخێكی تايبەتی بدرێتێ. واش پێشنياز دەكەم، وەك جەواهری، خەڵات بكرێ. لە چيمەنەكانی شارەكانی كوردستاندا پەيكەری بۆ بكرێ شەقامی بەناو بكرێ[*] .

### من وحي النيروز

بدر شاكر السياب

طيف تحدى به البارود والنار
ما حاك طاغ وما استبناه جبار

ذكرى من الثورة الحمراء وشحها..
بالنور والقانئ المسفوك ، آذار

مرت على القمة البيضاء صاهرة
عنها الجليد، فملء السفح انهار

في كل نهر ترى ظلا تحف به
اشباح (كاوا) ويزهو حولها الغار

يا شعب (كاوا) سل الحداد كيف هوى
صرح على الساعد المفتول ينهار

وكيف أهوت على الطاغي يد نفضت
عنها الغبار وكيف انقضّ ثوار

والجاعل (الكير) يوم الهول مشعلة
تنصبّ منه على الآفاق انوار

قف عند (شيرين) واهتف ربما نطقت
وحدثتك بما تشتاق احجار

وربما ارتجت الاصداء وانفجرت..
قيثارة في يد الراعي ومزمار!

والفارس الثائر المغوار هل بقيت
من خيله الصافنات البلق آثار

تكاد تسمع في الآفاق صيحته
كأنها في سماء الحق اعصار

مرت على الظلم فاهتزت دعائمه
وجلجلت فهي للباغين انذار

وساء مستعمرا ان يستفيق على     اصدائها ، جائع في الحقل منهار
وان يهبّ الى الاغلال يحطمها     شعب، وتنشقّ عن عينيه استار
كم ايتم البغى من طفل وسار على     بيت هوى، جحفل للبغى جرار
واستؤسر الجائع العريان واغتصبت     عذراؤه واستبيح الحقل والدار
وشردت في صحارى الثلج افئدة     من فوقها اعظم تدمى واطمار
وكشرّ السجن عن نابيه ، وارتفعت     حمر المشانق يغذوهنّ جزّار
شيرين، يا جبل الاحرار، ماغفلت     عن حقها الضائع المسلوب احرار
كاوه كيعرب... مظلوم يمد يدا     الى اخيه . فما ان يهدر الثار
والمستغلان في سهل وفي جبل     يدميهما بالسياط الحمر غدّار..
سالت دماؤهما في السوط فامتزجت     فلن يفرقها بالدّس اشرار!
واغمد الظلم في الصدرين مخلبه     فجمعت بالدم الجرحين اظفار
ووحد الجوع عزم الجائعين على     ان يوقدوها.. والا تخمد النار
وكدس العرى اجساد العراة على     درب النور قد افضى بمن ساروا
وقرّب القيد من شعبين شدّهما     ووجهت من خطى الشعبين افكار
يا فرحة العيد ما في العيد من مرح     حتى تحرّر من محتلها الدار

(*) بەدر شاكر ئەلسەیاب (١٩٢٥ – ١٩٦٤)

پێشڕەو و سەرکردەی نوێکاری لە شیعری عەرەبیی هاوچەرخدا. لەگەڵ عەبدولوەهاب بەیاتی و نازك ئەلملائكە یەکەم شاعیر بوو شیعری نوێی سەربەستی لە ئەدەبی عەرەبیدا داهێنا. لە لادێی (جیکۆر)ی باشووری شاری (بەسرە) لە ساڵی ١٩٢٥ لە بنەماڵەیێکی هەژار لە دایك بووە.

– ١٩٤٣ ئامادەییی تەواو کرد.

– ١٩٥٦ لەگەڵ (اقبال طه عبدالجليل) هاوسەرگیریی کرد.

هەر لە منالییەوە لەبەر هەژاری و دەسکورتی تووشی دەردی کەمخوێنی بووە. لە گەنجییدا دووچاری دەردی سیل بووە . ئەم بارودۆخە نالەبارەی تەندروستی بووبووە هۆی ئەوەی یەکجار تەنباریك و لاواز و بێهێز بێ.

– ١٩٤٣ چۆتە بەغداد و لە پەیمانگای مامۆستایانی بەرز (دار المعلمين العالي) لە بەشی ئینگلیزی خوێندوویەتی و بەکەلۆریۆسی وەرگرتووە. لەوێدا بلّند حەیدەری و سلێمان ئەلعیسا و نازك ئەلملائكە دەناسێ . بوو بە ئەندامی حیزبی شیوعی و بە سەرۆکی یەکیەتیی قوتابیان هەڵبژێررا.

لە ساڵانی ١٩٤٤ و ١٩٤٥ بە پشتگیریی ڕاگری كۆلێجەكە (مەتی عەقراوی) گرووپێ دامەزرێنرا بەناوی (أخوان عبقر — برایانی بلیمەت). سەیاب یێكێ بوو لە ئەندامەكانی.

لە ١٩٤٦/١/٨ لە ئەنجامی چالاكیی لە حیزبی شیوعیدا دەس لە خوێندن كێشێنرا.

لە ١٩٤٨دا لە قوتابخانەی ئامادەیی ڕەمادی بە مامۆستای زمانی ئینگلیزی دامەزرێنرا. پاشان بە فەرمانبەر گوێزرایە بەڕێوەبەرایەتیی داراییيە هاوردەكان. هەر لەم ساڵەدا بوو كەوتە داوی خۆشەویستیی شاعیر (لميعة عباس عمارة) بەڵام لەبەر باری نالەباری نەگەیشتن بە یەك.

لە ١٩٤٩/١/٢٥ دەس لە كار كێشێنرا و دە ساڵ قەدەغە كرا لە وانەوتنەوە و هەر ئەوساڵ گیرا و خرایە بەندیخانەوە. دوای ئەمە كاری لە كۆمپانیای خورمای عیراقی و كۆمپانیای نەوتی بەسرە كرد. پاشان گەڕایەوە بەغداد و لە كۆمپانیای ڕێوبان قیرتاوكردن بوو بە فەرمانبەر.

لە ١٩٥٣ ڕایكردە ئێران بە كەشتییەكی چارۆگەدار لەوێوە بە پاسپۆرتێكی ساختە بە ناوی (عەلی ئارتنك) ڕووی كردە كوێت. ئەم گەشتەی لە شیعرێكدا بەناوی (ڕاكردن) باس دەكات. لە كوێت لە كۆمپانیایەكی كارەبایی بوو بە فەرمانبەر.

لە ١٩٥٤ گۆڤاری (الآداب)ی كوێتی پشتگیریی كرد و شیعرەكانی بڵاوكردەوە.

دوای چەن مانگێك گەڕایەوە بەغداد لە بەڕێوەبەرایەتیی هاوردە و هەناردن دامەزرێنرا.

— لە ١٩٥٧ پەیوەندیی لەگەڵ (گۆڤاری شعر)ی لبنانی كرد ..لەگەڵ ئەدۆنیس و ئەنەسی ئەلحاج بوون بە نووسەری . پەیوەندیی لەگەڵ گۆڤاری (الآداب)ی كوێتی پچڕاند.

— ١٩٥٩ بە فەرمانێكی وەزاری بۆ سێ ساڵ دەس لە كار كێشێنرا.

— ١٩٦٠ چووە بەیرووت بۆ بڵاوكردنەوەی شیعرەكانی .. پاداشتی باشترین كۆمەڵە شیعری بردەوە، بە كۆشیعری ( انشودة المطر— سروودی باران). هەر ئەو ساڵە گەڕایەوە بەغداد و لە مصلحة الموانی دامەزرا.

— ١٩٦١ داوەتنامەی بۆ هات بۆ بەشداریكردن لە (كۆنگرەی ئەدەبی هاوچەرخ) لە ڕۆما. هەر لەم كاتەدا بوو باری تەندروستیی ڕووی كردە تێكچوون و لە پێ كەوت.

– ١٩٦٢ گەڕایەوە بەیرووت.

– ١٨ ی نیسانی ١٩٦٢ خرایە نەخۆشخانەی زانکۆی ئەمەریکی. هاوڕێکانی یارمەتیی داراییيان دا بە تایبەتی شاعیر يوسف الخال.

دوای ئەمە (ڕێکخراوی جیهانیی سەربەستیی ڕۆشنبیری) یارمەتیی ساڵێکی بۆ دابین کرد و مۆڵەتی بۆ ڕەخساند بۆ خوێندنی دکتۆرا. چووە لەندەن بۆ چارە و ویستی لە زانکۆی ئۆکسفۆرد بخوێنێ و بۆی ڕێك نەکەوت. پرۆفیسۆر ئەلبرت حۆڕانی ڕەزامەندیی بۆ لە (زانکۆی دەرەم) ی باکووری ئینکلتەرا دەسگیرکرد. لە دەرەم زۆری نەخایاند. وازی هێنا و لە ١٥ ی ئازاری ١٩٦٣ڕووی کردە پاریس.

دوای دە ڕۆژ ، لە ٢٣ی ئازاری هەمان ساڵدا بە جاریێ باری تەندروستیی رووی لە لێژی کرد و لەسەر کورسیی پزیشکی گەڕایەوە عیراق.

لە ٤ی نیسانی ١٩٦٣ بۆ جارێکی تر ، بۆ سێ ساڵ، دەستی لە کار کێشێنرایەوە. بوو بە پەیامنێری گۆڤاری (حوار).

لە ١١ی تەممووزی ١٩٦٣ گەڕایەوە سەر کار.

لە ٩ی شوباتی ١٩٦٤ کەوتەوە نەخۆشخانە.

لە ٦ی تەممووزی ١٩٦٤برایە کوێت و خرایە نەخۆشخانەی میری .. و لە ٢٤ /١٢/١٩٦٤ لە تەمەنی ٣٩ ساڵیدا ، لە هەڕەتی گەنجیدا ، کۆچی دوایی کرد.

سەرباری ئەو ژیانە کارەساتاوییە سەختە دژوارە و تەمەن کورتییەی .. سەیاب بەرهەمێکی زۆر و بە پیت و ڕەسەنی پێشکەش بە بیر و خۆشەویستی و مرۆڤایەتی کرد.

**کارە بڵاوکراوەکانی:**

**١ – دیوان و کۆمەڵە شیعرییەکانی:**

١ – **أزهار ذابلة** - مطبعة الكرنك بالفجالة– القاهرة– ط ١– ١٩٤٧.

٢ – **أساطير** - منشورات دار البيان– مطبعة الغرى الحديثة – النجف –ط١-.

٣ – **حفار القبور** - مطبعة الزهراء – بغداد – ط ١– ١٩٥٢.

٤ – **المومس العمياء** - مطبعة دار المعرفة – بغداد – ط ١– ١٩٥٤.

٥ – **الأسلحة والأطفال** - مطبعة الرابطة– بغداد– ط ١– ١٩٥٤.

٦ – **أنشودة المطر** - دار مجلة شعر– بيروت – ط ١– ١٩٦٠.

٧ – **المعبد الغريق** - دار العلم للملايين – بيروت– ط ١– ١٩٦٢.

٨ – **منزل الأقنان** - دار العلم للملايين – بيروت – ط ١– ١٩٦٣.

٩ – **أزهار وأساطير** - دار مكتبة الحياة – بيروت– ث ١– د. ت.

١٠ – **شناشيل ابنة الجلبى** - دار الطليعة – بيروت – ط ١– ١٩٦٤.
١١ – **إقبال** - دار الطليعة – بيروت – ط ١– ١٩٦٥.
١٢ – **إقبال وشناشيل ابنة الجلبى** - دار الطليعة– بيروت– ط ١– ١٩٦٥.
١٣ – **قيثارة الريح** - وزارة الأعلام العراقية– بغداد– ط ١– ١٩٧١.
١٤ – **أعاصير** - وزارة الأعلام العراقية – بغداد– ط ١– ١٩٧٢.
١٥ – **الهدايا** - دار العودة بالاشتراك مع دار الكتاب العربى–بيروت–ط ١–١٩٧٤.
١٦ – **البواكير** - دار العودة بالاشتراك مع دار الكتاب العربى– بيروت– ط ١– ١٩٧٤.
١٧ – **فجر السلام** - دار العودة بالاشتراك مع دار الكتاب العربى– بيروت– ط ١– ١٩٧٤.

٢ – **وەرگێڕان:**

١ – **ثلاثة قرون من الأدب** – مجموعة مؤلفين، دار مكتبة الحياة– بيروت– جزآن، الأول بدون تاريخ، والثاني ١٩٦٦.

٢ – **الشاعر والمخترع والكولونيل**، مسرحية من فصل واحد لبيتر أوستينوف، جريدة الأسبوع– بغداد– العدد ٢٣– ١٩٥٣.

٣ – **وەرگێڕانی شیعری:**

١ – **عيون إلزا أو الحب والحرب** : عن أراغون – مطبعة السلام – بغداد– بدون تاريخ.
٢ – **قصائد عن العصر الذرى** : عن ايدث ستويل– دون مكان للنشر ودون تاريخ.
٣ – **قصائد مختارة من الشعر العالمى الحديث** : دون مكان للنشر ودون تاريخ.
٤ – **قصائد من ناظم حكمت** : مجلة العالم العربى، بغداد – ١٩٥١.
٥ – **قصائد من ناظم حكمت** : مجلة العالم العربي، بغداد – ١٩٥١.

**سەرچاوەکان:**

– إحسان عباس (١٩٦٩) بدر شاكر السياب – بيروت.
– بدر شاكر السياب (١٩٤٨) من وحي النيروز. جريدة دار السلام . ع ١٩. السنة الاولى. بغداد
– عبدالجبار داود البصري (١٩٦٦) بدر شاكر السياب، رائد الشعر الحر – بغداد.
– عيسى بلاطة (١٩٧١) بدر شاكر السياب – بيروت.

## ملخص البحث

**قصيدة (من وحي النيروز) لـ... بدر شاكر السياب**

(من وحي النيروز) قصيدة نادرة ومجهولة للشاعر الكبير رائد الحركة الشعرية الحديثة في الادب العربي بدر شاكر السياب (١٩٢٦ – ١٩٦٤) نشرتها جريدة (السلام) في العدد ١٩ السنة الاولى ٢٤ آذار ١٩٤٨. لاتحويها أي من دواوينه.

من خلال هذه القصيدة يتبين بان السياب كان متعاطفا والى درجة كبيرة مع الشعب الكوردي وقضيتهم العادلة.

## Abstract

Inspired by Nawroz..A poem by. Badir Shakir Alsayyab

Badr Shakir al-Sayyab (1925 – 1964) was one of the greatest poets in Arabic literature, whose experiments helped to change the course of modern Arabic poetry. At the end of the 1940s he launched the free verse movement and gave it credibility with the many fine poems he published in the fifties. He revolutionized all the elements of the poem and wrote highly involved political and social poetry, along with many personal poems.

(Inspired by Nawroz) is one of his rare unknown poems . It was published only once in ( Al –Salam) newspaper No 19 1st Year, 24 March1948. It proves that Sayyab was sympathetic with Kurdish people and supported their gust cause.

# لێکەوتەکانی زیندان
# لە ڕۆمانی (ژانی گەل)ی "ئیبراهیم ئەحمەد"دا

**پ.د.هیمداد حسین**
کۆلیژی پەروەردە _
زانکۆی سەلاحەددین– هەولێر

**د.کارزان موحسین قادر بەگ**
کۆلیژی پەروەردەی شەقلاوە _
زانکۆی سەلاحەددین– هەولێر

## پێشەکی:

بێگومان چەمکی زینـدان و تێگەیشـتن و دنیـا بینیمـان بـۆی شـتێکی نـوێ و تـازە بابـەت نییـە، لێـرە و لـەوێ و کـەم تـا زۆر ئـەدەبیاتی هـەموو گـەلانی دنیـا نەیانتوانیوە خۆیان لە چەمك و بابەتێکی ئاوا هەستیاری لەم شێوەیە دوورە پەرێز بگـرن، چـونکە ڕاسـتەوخۆ پێوەنـدە بـە ژیـانی مرۆڤەکانـەوە ، بـوونی زینـدان بـە تایبـەت و بـە دیـاریکراوی لـە ژێـر حـوکمی دەسـەڵاتێکی سـتەمکارانەدا هێڵێکـی جیاکەرەوەیـە لـەنێوان ئـەدگار و خەسـڵەتە مرۆڤایـەتی و نامرۆڤایەتییەکانـەوە، مەبەستیشـمان لەمـە زیـاتر ئەوەیـە، کـە بڵـێین لـەژێر زەبروزەنگـی دەسـەڵاتێکی ستەمکارانەدا کۆمەڵێك مرۆڤ دێنە ئاراوە کە بە تەنیا بە ناو مرۆڤن ئەگەرنا هەرگیز ئەدگار و خەسڵەتێکی جوان و چاکی مرۆڤانەیان تێدانییە و کەوتوونەتـە دەرەوەی چوارچێوەی مرۆڤایەتییەوە، گەرەکیانە بە هۆی ئەم ئەدگار و خەسـڵەتە ناشـیرین و خراپانەی نامرۆڤایەتییان بە هۆی زیندانەوە بێت، یاخود بە هـەر هۆیـەکی دی چ مانایەك نەهێڵنەوە بـۆ مرۆڤبـوون و مرۆڤایـەتی، بـەڵام ئـەدیبان مانایـەکی دی بـە زینـدان دەدەن و لـە قەڵایـەکی سـتەمکارانەوە دەیکـەن بـە قەڵایـەکی بـەرگری و بەرەنگاربوونەوەی چەوساوە و خەباتکار و شۆڕشگێڕان. کاتێك باس لـە زینـدان و زینـدانییان دەکـەین، زۆر ئەسـتەمە بتـوانین کۆمـەڵێك پرسـیار وەڵامبدەینـەوە، خەریکبوونمان پێیانەوە دەمانخاتە نێو گێژاوێکی گفتوگۆی نەپساوە و نەبڕاوەوە. نموونەی پرسیارەکانیش وەك ئەمانەن: کێ زیندانی دروستکرد؟ یەکەمین زیندانیی کێ بوو؟ یەکەم زیندان و زیندانیی لە کوێی ئـەم گێتییـە فراوانـەدا بـووە؟ کـەی و

چۆن و لەبەر چی یەکەم زیندان دروستکرا؟ ئایا هەر خودی مرۆڤەکان زیندانیی دەکرێن؟ یاخود بیر و بیرۆکە و بەرهەمەکانیشیان زیندانیی دەکرێن؟ سەرەتای سەرهەڵدانی زیندانیکردنی بیر و بەرهەمەکانی مرۆڤ بە گشتی و بە تایبەت داهێنەران بۆ چ قۆناغێکی مێژوویی دەگەڕێتەوە؟ ئەم پرسیارانە و پرسیارگەلێکی دی ناتوانرێت بە وردی لەلایەن لێکۆڵەرانەوە وەڵامیان بدرێتەوە .

**گرنگی و بایەخی ئەم لێکۆڵینەوە**، لەوەدایە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت زیندان وەك چەمکێك و وەك پرسێکی گرنگ، کە ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە پرسەکانی نەتەوەی کوردەوە. لە نێو ڕەخنەی کوردیدا بواری بۆ فەراهەم نەکراوە، گەر ئەم بیر و بۆچوونەشمان وردتر بکەینەوە نەتوانراوە چۆنیەتی مەزراندنی چەمکی زیندان و لێکەوتەکانی لە نێو ژانرێکی گرنگی وەك ڕۆماندا، کە بە ژانری سەردەم ناوزەد دەکرێت بخرێتە بەرباس و لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی لەسەر ئەنجام بدرێت.

ئەو لێکۆڵینەوە و توێژینەوانەی کراون زیاتر تیشکیان خستۆتە سەر ئەدەبیاتی بەرگری و بەرەنگاربوونەوە، ئەویش لە چوارچێوەی ژانری شیعردان و بەس، نەتوانراوە درك بە پەیوەندیی نێوان زیندان و ژانری ڕۆمان بکەن بە تایبەتی، بە شێوەیەکی گشتی پەیوەندیی نێوان زیندان و هونەرەکانی گێڕانەوە بکەنە بەرنامەی کارەکانیان، هۆکارەکەی ئەمەش بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە کە دەقی ئەدەبی کوردی لە ژانری کورتە چیرۆك و چیرۆك و ڕۆمان هەژارە و دەوڵەمەند نییە، بەڵکو دەتوانین بۆ ئەمە دوو هۆکار دەستنیشان بکەین، یەکێکیان پەیوەستە بە باڵادەستیی ژانری شیعر تا سالانی پەنجای سەدەی ڕابردوو و، بواری ڕەخنە و ڕەخنەگری کوردیش هەر بەم ژانرەوە سەرقاڵ بووە و نەپرژاوەتە سەر ژانرەکانی تری ئەدەب، ئەویتریان هەر پەیوەستە بە خاڵەکەی پێشووەوە، لێکۆڵەر و توێژەر و وتارنووس و ڕەخنەگران هەر درکیان بەوە کردووە هەر شاعیر زیندانی دەکرێت و هەر ئەویش دەتوانێت بەرهەمێك بنووسێت، کە وەك پێویست گوزارشت لەم شوێنکاتەدا بکات. ئەوەی ماوەتەوە ئەوەیە گەر ڕۆمانی "ژانی گەل" بە یەکەمین ڕۆمانی کوردی لە باشووری کوردستاندا دابنێین، کە گەلێك لە توێژەر و لێکۆڵەران جەختی لەسەر دەکەنەوە، ئەوە ئەو ڕۆمانە بەرهەمێکە

دەکەوێتە نێو چوارچێوەی ئەدەبی بەرەنگاری و زیندانەوە، لەمەشەوە بۆمان بە دیاردەکەوێت، دەرکەوتنی ڕۆمانی کوردی بە هەناسەیەکی نەتەوەیی کوردانەوە نووسراوەتەوە، ئەو هەناسە نەتەوەییەش بێگومان پێویستی بە گیانێکی بەرگری و بەرەنگاربوونەوە هەیە. کەواتە ڕۆمانی "ژانی گەل" ڕۆمانێکە گوزارشت لە ژانی گەلانی چەوساوە دەکات و گەلی کوردیش یەکێکە لەوانە.

**سنوور و میتۆدی لێکۆڵینەوەکە**، سنوورەکەی لە چوارچێوەی ڕۆمانی "ژانی گەل" دایە و بۆتە کەرەستەی سەرەکی لێکۆڵینەوەکە و پراکتیزەکردنی. هەروەها پشتبەستن بە میتۆدی (تیۆری – وەسفی – شیکاری) لێکۆڵینەوەکە ئەنجامدراوە بنیادی لێکۆڵینەوەکە، لە پێشەکی و دوو پاژ و ئەنجام و سەرچاوەکان پێکهاتووە.

پاژی یەکەم لە دوو تەوەر پێکهاتووە، لە تەوەری یەکەمدا چەمکی زیندان و زیندانیی و لە تەوەری دووەمیشدا کاریگەری زیندان بەسەر ئەدیبان و ڕەنگدانەوەی لە دەقەکانیاندا تیشکیان خراوەتەسەر و باسیان لێوە کراوە. پاژی دووەمیش دوو تەوەر لە خۆ دەگرێت، تەوەری یەکەم زیندان وەك دام و دەزگایەکی سیاسی و سەربازی و سیخوڕی سەرکوتگەرا لە پێناو مانەوەی دەسەڵاتێکی ستەمکارانە و دەمکوتکردنی ئەدیبان، بە تیۆری خراوەتە بەرباس و خواس، لە تەوەری دووەمیشدا زیندان و لێکەوتەکانی لە ڕۆمانی (ژانی گەل)ی "ئیبراهیم ئەحمەد" دا بە پراکتیکی خراوەتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوەکە، دواتر ئەنجامەکان لە چەند خاڵێکدا خراونەتە ڕوو، ئینجا سەرچاوەکان.

## چەمکی زیندان و زیندانیی:

زیندان وەك شوێنکاتێکی دژ و نائاشنای مرۆڤ، پانتاییەکی فراوانی داگیر کردووە و پەیوەستە بە گەلێك بواری ژیانەوە، بەکارهێنانی چەمکی زیندان لە هەر بوارێك لە بوارەکانی ژیاندا، دەرووی کۆمەڵێك بابەت و بیرۆکە بە ڕووی خۆیدا واڵا دەکات و هەر توێژەر و لێکۆڵەرێکیش کاتێك دەپەرژێتە سەر ئەم چەمکە و دەیەوێت لە گۆشەنیگا جیاجیاکانی پسپۆڕییەکەیەوە لێی بڕوانێت. بۆ نموونە چەمکی زیندان لە بواری داڕشتن و دانانی یاسا و دادوەریدا کۆمەڵێك یاسا و ڕێسا

بۆ خۆی کەمەندکێش دەکات و لە بواری ئەدەبیشدا دەشێت لە زۆر ژانری جیاجیای ئەدەبدا دەرکەوێت و هەر ژانرێك بەپێی سنوور و تێگەیشتن و ئایدیا و دنیابینیی نووسەرەکەی بچێتە قووڵایی ئەم چەمکەوەو هەموو کونجە تاریك و نووتەکەکانی زیندان شەنوکەو بکات. هەروەها دەبینین چەمکی زیندان لە بواری کۆمەڵایەتی و سەربازی و سیاسیشدا زۆر لە یەکتر جیاوازن، کاتێك چالاکێکی بواری کۆمەڵایەتی لە زیندان دەڕوانێت وەك شوێنێکی چاکسازیی بەشێك لە مرۆڤەکان لێی ورد دەبێتەوە و پێیوایە دەکرێت مرۆڤەکان هەڵە بکەن و لە ڕێی ئەم هەڵانەوە کۆمەڵێك دەرز و پەند وەربگرن و بە گوڕ و تین و هەناسەیەکی نوێوە، سەرلەنوێ بچنە نێو چین و توێژەکانی کۆمەڵەوە، کەچی چالاکێکی بواری سەربازی و سیاسەت ئەو کاتەی لە چەمکی زیندان دەکۆڵێتەوە وا هەستیکردووە زۆربەی زۆری مرۆڤەکان گوناهبار و تاوانبارن، بۆیە وا پێویست دەکات ڕووبەڕووی توندترین سزا و ترسناکترین ترس و تۆقاندن بکرێنەوە، ئەم حاڵەتەش کاتێك دەگاتە چڵەپۆپە، کە بزانێت بەرامبەرەکەی یەکێکە وەك ئەو بیر ناکاتەوە، وەك ئەو نادوێت و وەك ئەو ناجووڵێتەوە. زۆربەی بەندی و زیندانییانی نەتەوەیەکی ژێردەستەی وەکو ئێمە هەر لە یەکەم چرکەساتی دەستبەسەرکردن و گیرانیان، ترساندن و تۆقاندنیان لە نێو دڵ و دەروونی خۆیاندا تووڕداوە و کردوویانەتە کۆت و بەندێك بۆ دەستدرێژیی بەدفەڕی داگیرکەران و دوژمنانی وڵات. بۆیە (ترس، بەهێزترین دوژمنی عەقڵە، ترس و عەقڵ گەوهەری ژیانی مرۆڤن، بەڵام پەیوەندیی نێوانیان تەواو نا هاوسەنگە، هەندێك کەڕەت عەقڵ ترس لەنێودەبات، بەڵام هەمیشە ترس، عەقڵ داخراو و قەپات دەکات)[1]. کەواتە ڕاستە ترس و عەقڵ بەشێکن لە بوونی مرۆڤەکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە بەرامبەر یەکتردا شەڕێکی قورسی دەستەویەخە دەکەن. مرۆڤێك سەرتاپای ژیانی ترس بێت بێگومان مرۆڤێکی نائاساییە و عەقڵی لە دەستداوە و ترس وایلێکردووە خۆی لەنێوان (هەبوو و نەبوو)دا ببینێتەوە و بەرامبەرەکەشی هەر چەندە خراپ بێت و بیەوێت و مەبەستی بێت لە ئەم (هەبوو و نەبوو)ەی ئەم بدات، کەچی ئەم هەر هەستی پێناکات و وەك دەڵێن: (مێشیش میوانی نەبێت) وایە. ئەوەی پەیوەست بێت بە زیندان و زیندانیی ئازادیخواز، ئەوا بێگومان ترس و عەقڵ هەر لە شەڕ و ململانێی

یەکتردا دەمێننەوە. بۆ نموونە چی وایکردووە زیندان دروست بکرێت؟ بە دیاریکراوی لەنێو ئەم زیندانەشدا زیندانییەکی ئازادیخواز ژیان بگوزەرێنێت، لە وەڵامدا دەڵێین ترسێك پاڵی بە عەقڵەوە ناوە و بە سەریدا زاڵە بۆ ئەوەی زیندانییانی ئازادیخواز کۆت و بەند بکرێن، ئەم ترسەش گوزارشتە لە دەسەڵاتدار و فەرماندارانی سەر زیندانییەکان، یاخود ئەوانەی خاوەندارێتی زیندانەکە دەکەن دەگرێتەوە، لە بەرامبەر ئەمەشدا عەقڵێك بوونی هەیە و جێگەی بە ترس و ترسێنەرەکان لێژ کردووە و وەلای ناون و خۆی لە ترس داماڵیوە، ئەمانەش گوزارشتن لە زیندانییانی ئازادیخوازی ئەو وڵات و نەتەوەیە. زیندانەکان ئەو کاتە زیاتر جمەیان دێت و پڕ دەکرێن لە خەڵکی بێگوناه، کە خۆپیشاندان و راپەڕین و شۆڕش کڵپە بسەنێت بە ڕووی دەسەڵاتێکی نادادپەروەر و پاوانخواز و بە هیچ شێوەیەك ئەم دەسەڵاتە واهەست نەکات، کە ئەمانەی لە ژێر دەسەڵاتیدان مرۆڤن و زۆربەی ئەم مرۆڤانەش بە دوژمنی خۆی بزانێت و هەمیشە لە بیری ئەوە دابێت ئەمانە لە بۆسەدان بۆ ئەوەی کودەتا بە سەر دەسەڵاتدا بکەن. بێگومان ئەوەی لە دۆخێکی ئاوادا دەست بە سەر دەبێت و دەگیرێت حوکمی قورسی بە سەردا دەسەپێنن و بە زیندانیی سیاسی لە قەڵەمی دەدەن، دەیخەنە پاڵ پارت و بزووتنەوەیەکی سیاسییەوە، بۆیە دەکرێت بڵێین: (ڕەتکردنەوەی ستەم و زۆرداری بە هەموو شێوە جیاجیاکانی لەلایەن جەماوەرەوە، لە بەرزترین ئاستدا خۆی لە هەڵگیرساندنی شۆڕشدا دەبینێتەوە، لە نزمترینیشیاندا وەدیارکەوتنی دەستەبژێرێکە، ئەمانە دەیانەوێت لە ڕێی ڕەخنەگرتن و نووسینی وتارێك، چامەیەك، ڕۆمانێك، چیرۆکێك، یاخود شانۆیەك ئەم ستەم و زۆردارییە ڕەت بکەنەوە کە تەنگی بە هەمووان هەڵچنیوە).[٢] بەشێکی ئەم بیر و بۆچوونە ڕاستە و ڕەنگدانەوەی واقعە، چونکە جەماوەر لە بەرزترین ئاستی هەڵچوون و تووڕەیی لە دەسەڵاتدا ناچارە شۆڕش هەڵگیرسێنێت. زۆرێك لە (بەندیخانە و زیندانەکان هیچ کاتێك پەیوەست نەبووینە بەو یاسا و ڕێسایانەی کە داکۆکی لە مافی بەندی و زیندانییەکان دەکەن، لەهەمان کاتدا هیچ لە پێشێلکارییەکان بۆ چاودێرانی بێلایەن ڕوون نەبووینە، بە حوکمی ئەوەی بەرپرس و بەڕێوەبەرانی بەندیخانە و زیندانەکان وێنەی جوانییان بۆ ئەم چەشنە واقعە سازاندووە.)[٣] واتە لە

زیندانەکان و بە تایبەت ئەو زیندانییانەی سیاسیین ئەرکی قورس و گرانیان بە سەردا سەپاندوون و ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر دەدرێن و لە ژێر هەڕەشەی مردندان، کەچی هیچ مافێکیان پێڕەوا نابینرێت. چەندین نووسەری جیهانی بەشێك لە ژیانیان، یاخود وێستگەیەکی گرنگ لە تەمەنیان لە بەندیخانە و زیندانەکاندا بەسەربردووە ، ئەمە لەلای ئەوان وەك بڵێی لە دیاردەی تێپەڕاندووە و بۆتە ڕۆتینێکی ژیان و گوزەرانیان، بێگومان کە قسەیەکی وا دەخەینەڕوو بۆ نووسەرانی کوردیش دروستە، بگرە تۆمەتی گەورەی ناڕاستیشیان بۆ هەڵبەستراوە ، واتە (ڕازینەبوون و قایلنەبوون بە حوکمی ستەم و ستەمکاران و، جاڕدان بۆ یەکسانی و دادپەروەری، ڕەتکردنەوەی ڕیسوایی و سووکایەتیپێکردن جۆرێکە لە پارێزگاریکردن لە بوون و پاراستنی شکۆی دەروونی.)[٤] بەم پێودانگەوە بێت نووسەرانی هەر نەتەوەیەك لە ڕێی بەرهەمە ئەدەبی و هزرییەکانیانەوە ئایدیا و دەربڕینی جیاجیا دەخەنە ڕوو، کە دەشێت دژ و ناکۆك بن بە چۆنیەتی و چەندێتی بیرکردنەوەی تەسکی دەسەڵاتدارانی ستەمکار. دەکرێت لە چەمکی زیندان و زیندانیی سیاسییەوە، لە هەر دوو چەمکی (خۆشەویستی) و (مردن) وە بڕوانین و پەیوەندیی نێوانیان دیاربخەین، بۆ نموونە چی وایکردووە زیندانییان بە چاونەترسی و بوێرییەوە لە مردن بڕوانن، وەك کەسانی تر لێی نەترسن؟ یاخود زیندانییان جەنگاوەرێکن هەمیشە لە کێبڕکێ و ململانێ و جەنگن لەگەڵ (ژیان) و (مردن)دا، لە پێناوی ئەوەی هاونیشتمانییان و نیشتمانەکەیان لەگەڵ (ژیان) دا ڕێ بکەن و گەرداوی (مردن) چۆکیان پێدانەدات. بێگومان ئەم پرسیارانە و چەندین پرسیاری تر لەمەڕ (مردن) زەمینەسازی بۆ ئەوە دەکەن، کە چەمکی (خۆشەویستی) خۆی بخزێنێتە نێو پرسیارەکانەوە، ببێتە وەڵامێکی دروست و چاوەڕوانکراو بۆیان، چونکە زیندانییان بە هۆی هەڵبژاردنی مردنەوە خۆشەویستی فێردەبن و لە ڕێی خۆشەویستیشەوە هەرگیز سڵ لە مردن ناکەنەوە، مردنێك لە پێناوی نیشتمان ، زیندانییان لە ڕێی ئەم خۆشەویستییەوە دەیانەوێت پەیامێك بگەیەنن، چارەنووسێك لە چاوەڕوانییاندایە پێویستە بە چاوتیژییەوە بۆی بچن و ماف و ئەرکەکانیان بێ کەم و کوڕی بەجێبهێنن. بۆیە زیندانییەك دەشێت بپرسێت: (هاتین و ڕۆیشتین، بۆچی

نەمانزانی ئەم کەسانەمان خۆشدەوێت و یەکێکی تر نا؟ لەبەرچی ئەم ڕۆژگارانـە و ڕۆژگارێکی تر نا؟ لەبەرچی ئێستا؟ لەبەرچی لێرە؟ لەبەرچی ئێمە و خـەڵکانی تـر نا؟ چونکە (خۆشەویستی) و (مردن) هـەردووکیان بـە یەکـەوە هـەموو ئـەدەبیاتی جیهانی تێر و پڕ دەکەن ، لە دەرەوەی خۆشەویستی و مردندا هیچ ئەدەبێك نییـە شیاوی ئەوە بێت بنووسرێت.)(٥)

دەکرێت لەم ڕووەوە بۆ جێگیرکردنی حوکمی گەل ، نووسەران پێشـەنگ بن. گومانی تێدانییە زۆربـەی مرۆڤـەکان هیواخـوازن (گۆڕانکـاری و چاکسـازی لـە پێنـاوی باشـترکردنی بـارودۆخێکی نـا دیموکراسـییەوە بـۆ دیموکراسـی هـەوڵ و تێکۆشـان بـدەن و، لای هەنـدێکیان ئـەم هـەوڵ و تێکۆشـانە خـۆی لـە لووتکـەی قوربانیدان و خۆبەختکردندا دەبینێتـەوە.)(٦) شـتێکی بەڵگەنەویسـتە ئەوانـەی بـە هۆی بیروباوەڕەکانیان زیندانی دەکرێن ڕووبەڕووی توندوتیژترین ئازار دەکرێنەوە، کەسانی قوربانیدەرن و مەرگخوازن لە پێناوی چەسپاندنی حوکمێکی دادپەروەر و یەکسان .

## ڕەنگدانەوەی زیندان لە دەقی ئەدەبیدا :

نووسەران وەك توێژێکی دیار و کاریگەری کۆمەڵ، ئـەرك و پـەیام و ئامـانجی تایبـەتیی خۆیـان هەیـە و لـە ڕێـی دەقـە ئەدەبییەکانـەوە، وەرگـر دەتوانێـت خوێندنەوە و لێکدانەوە و ڕاڤە بۆ دەقەکانیان بکات و دنیابینی و هەڵوێستیان لـە نێـو دەقەکانیانـدا بدۆزێتـەوە، بێگومـان نووسـەران بـە هـۆی پێشکەشـکردنی دەقەکانیان دەتوانن پێگەی خۆیان قایمتر بکەن و ببنە داینەمۆی کایە ڕۆشـنبیری و مەعریفییـەکان، نووسـەران بوونـەوەرێکن ئەسـتەمە بتـوانن بێـدەنگ بـن، دەقـەکانیان دەبێتـە مینبـەرێك بـۆ ئـەوەی لـەو مینبـەرەوە لـە کەسـانی قسـە لەسەرکراو ببنە کەسانی قسەکەر، هەروەها لە هەمان مینبەرەوە دەبنە ڕەخنـەگر و ڕەخنەکانیان سنوورێکی دیاریکراویـان بـۆ نییـە و ڕەخنـەکانیان هـەموو پنـت و لایەن و ئایدیۆلۆژیا و گرووپ و دەستەیەك تەی دەکات، بۆیە ئەگەر نووسەران ئەم چـەند تایبەتمەندییانـە و چـەند تایبەتمەندییـەکی تریـان هـەبێت ئـەوا بێگومـان دەسەڵات بە سەرچاوەی سەرئێشە و ئاریشەیان دادەنێت و بـە تونـدترین شـێوە و

شێواز ڕووبەڕوویان دەوەستێتەوە، یەکێکیش لەم ڕێگایانە توند و بەندکردنی ئەدیبانە لە کونجی تاریکی زیندانەکان، بەڵام ئایا ئەدیبان بە گرتنەبەری ڕێوشوێنێکی لەم شێوەیە لە بیر و بۆچوون و ئایدیا و تێزەکانیان پاشگەز و پەشیمان دەبنەوە؟ یاخود زیندانەکان دەبنە هۆکارێك بۆ ئەوەی ئەدیبان بە گوڕ و تینێکی ترەوە بێنە مەیدانەکەوە؟ یان خامەکانیان ڕژدتر و شێلگیرانەتر داکۆکی لە هەق و مافە ڕەواکان بکەن؟ بێگومان زۆربەی ئەدیبان بژاردەی دووەم هەڵدەبژێرن و مەبەستیانە ئەم بیرکرنەوە و تێگەیشتن و هۆشیارییەی ئەمان شۆڕبێتەوە بۆ نێو هەموو چین و توێژ و گرووپەکانی کۆمەڵ، هەموو ئەمانەش بەهۆی دەق و بەرهەمەکانی نووسینی ئەوانەوە دەبێت . کەواتە لێرەدا (دەقی ئەدەبی) بلێین و نەڵێین گوزارشتە لە (دەسەڵاتێکی نەرم ، یاخود هێزێکی نەرمی کاریگەر) کە بەرامبەر دەسەڵاتی فەرمانبەدەست و بەرپرسانی سیاسی و سەربازی دەوەستێتەوە، کە هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدان ئەدیبان ڕاپێچی زیندان بکەن، یا هەر لە دەرەوەدا کەش و هەوا و هەناسەیەکی زیندانئاسایانە بۆ ئەدیبان بە ڕادان بدەن ، بۆیە ئەستەمە بتوانین لە سەرتاسەری دونیا ئەدیبێك بدۆزینەوە لە ڕێی دەقە ئەدەبییەکەیەوە تیشکی نەخستبێتە سەر یەکێك لەم دوو زیندانانەی، کە باسمانکردن. بۆ نموونە ئەدیبێك زیندانیی کرابێت ئەوا دەکرێت دەقەکانی بەم شێوەیە دابەشبکەین قۆناغی پێش زیندان ، قۆناغی زیندان ، گەر ئازاد بکرێت لە زینداندا گیان لە دەست نەدات قۆناغی پاش زیندان، لە هەموو ئەم قۆناغانەدا کەم و زۆر هەست بە ململانێ و جەنگی ئەدیبان و دەسەڵاتداران دەکرێت، گەر دەسەڵاتداران لە ڕێی یاسا و بڕیارەکانیان ڕووبەڕووی ئەدیبان بوەستنەوە، ئەوا ئەدیبان لە ڕێی بیرۆکە و دەقەکانیان لە بەرامبەر دەسەڵاتداراندا دەوەستنەوە. کاتێك ئەدیبێك دەخرێتە زیندانەوە، بە شێوەیەك لە شێوەکان و بە هەر جۆرێك بێت داوای چاکسازی و گۆڕانکاری لە بارودۆخێکدا کردووە بۆیە دووچاری ئەم سزا قورسە بۆتەوە. (گۆڕانکاری بە مانای سادە و ساکارییەکی توند و بەهێز لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر، یاخود لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر، دەلالەتی بارودۆخ گۆڕینەوەکە بەرەو چاکی و باشییە، نەوەك ڕووەو نەنگی و خراپی، واتە بە ئاڕاستەیەکی ئەرێنی و پەسەند و مانای پێشکەوتن بە دەستەوە بدات بە

مەبەسـتی پێگەیشـتن و تـەواوکردن.)[٧] لـە کاتێکـدا ئـەدیبێك دەیـەوێت ڕۆڵـی پێشەنگانەی خۆی ببینێت لە (گۆڕانکاری و چاکسازی) جا لە هەر بوار و بابەتێکدا بێت، زۆرجار دەشێت ئەو گۆڕانکاری و چاکسـازییە لـە ئێسـتادا لـە ڕێـی دەقێکـی ئەدەبییەوە، بە سـەر ئـەودا بـە خراپـە دەشـکێتەوە و بـە شـێوەیەکی کـاتی لێـی زەرەرمەند دەبێت، کەچی هەمان ئـەم گۆڕانکـاری و چاکسـازییەی ئـەو بـۆ کـۆڕ و کۆمەڵان بە چاکە دەشکێتەوە. کاتێك ئەدیبێك بەرهەمێکی ئـەدەبی لەمـەڕ زینـدان دەنووسـێ دەیـەوێت لـە ڕێـی ئـەم بەرهەمـەوە بیرۆکـەی خـودی خـۆی لـە بـارەی زیندانەوە ئاشکرا بکات و کاریگەری و دەرهاویشتە و لێکەوتە و جێکەوتـەکانی وە دیاربخات و تیشکیان بخاتەسەر، بۆ ئەوەی کارایی و کارامەیی خۆشی لەم ڕووەوە بسەلمێنێت بە هۆی سۆزێکی گەرمی بەکوڵەوە ئەم بیر و بیرۆکانەی خۆی بارگاوی دەکات و شوێنەواری  لە سـەر هەست و نەستی خوێنـەران جێدەهێڵێت، کەواتـە زینـدان (هۆکارێکـە بـۆ ئـەوەی ئـەدیب بتوانێـت بیرۆکـە و سـۆز بـە یـەکترەوە ببەستێتەوە و دواتر بۆ خوێنەرانی بگوازێتەوە.)[٨]

لێرەدا دەتوانین نووسـەر، بـە پـەیامنێر، بێـژەر، یـا پێشکەشـکارێکی هـەرە سەرکەوتوو بچوێنین، کە لەسەروبەندی خستنەڕوو و پیشاندانی بابەتێکدا بیسـەر، یان بینەر بە تەواوەتی متووی بابەتەکە دەکات و دەیخزێنێتە نێو یەکە بە یەکـەی وشە و ڕستە و دەربڕینەکانییەوە، بە شێوەیەکی ئاوا کەسەکە وا هەسـت دەکـات، کـە خـۆی لـە نێـو واقعەکەدایـە و کارەکتـەر و ئەکتـەری سـەرەکی ڕووداوی بابەتەکەیە. نابێتە مایەی درێـژدادڕی گـەر بڵـێین زینـدان و هاوشـێوەکانی زینـدان دەبنـە پاڵنـەرێك بـۆ ئـەوەی ئـەدیب هەسـتەکانی هەسـتیارتر و کراوەتـر خۆیـان بنوێنن، هێندەی دی خەیاڵی بەرزە فڕانەی خۆی ئـازاد بکـات و سـەرەڕای کـۆت و بەندەکانی زیندان بیر و بیرۆکەکانی سەربەستانەتر خۆیان بنوێنن. (ئـەدیبان گـەر بـۆ ماوەیـەکی زۆر کـورت و دیـاریکراویش هـەر چـۆنێك بێـت دەیانـەوێت ژیـانێکی تەنیایی هەڵبژێرن، زیندانیش جۆرێکە لەو ژیانە تەنیاییەی کـە ئـەوان هیواخـوازی ئەوەن، بۆیە زیندان دەبێتە پاڵنەرێك بۆ ئەوەی ئەدیبان لە ڕێی بەرهەمەکانیانەوە داهێنانەکانیان ئاشـکرا بکـەن، بێگومـان لـە دۆخێکـی ئاواشـدا شـوێنکات ڕۆڵێکـی بەرچاو دەگێڕێت لە خسـتنەوەی ئـەم داهێنـان و داهێنانانـە، چـونکە ئـەدیب لـەو

کاتەدایە کە بە تەنیایی ژیان دەگوزەرێنێت، هەروەها لەو شوێنەشدایە دیسانەوە بە تەنیایی ژیان دەگوزەرێنێت.) [9] لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت مەرج نییە لە هەموو حاڵەتێکدا زیندان ببێتە مایەی ئەوەی بە تەواوەتی تەنگ بە ئەدیبان هەڵبچنێت، بەڵکو ئەم حاڵەتە گەلێ جار ئاوەژوو دەبێتەوە و زیندان دەبێتە شوێنکاتێك بۆ ئەوەی پاڵەوانەکەی (ئەدیب) لەوێوە ئیلهام وەربگرێت و خاڵێکی وەرچەرخانە بۆ ئەوەی کەسایەتی خۆیی و بەرهەمەکانی بە شکۆمەندانەترەوە بە دیاربکەون، بۆیە زیندان لە ژیانی ئەدیباندا نابێتە وێستگەیەکی وەستان و پشوودان و گەڕانەوە بۆ خاڵی سفر، بەڵکو زیندان دەبێتە وێستگەیەك بۆ ئەوەی بە کردەیی بەر لە ئاستەنگ و لەمپەرەکان بگرێت و لەوێوە هەنگاوی جددییانەتر بهاوێت، کە لە سوودی هەمووەکیدا تەواوبێت. کەواتە (دابڕانی ئەدیب لە هەندێك کایەی ژیاندا بە هۆی زیندان و زیندانیکردنییەوە ڕێگرییەك نییە بۆ ئەوەی لە بەهرە و کارە ئەدەبییەکاندا دایبڕێت، بەڵکو بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار، زیندان هۆکارێکە کە گەنجینەی بیری ئەدیب زەنگینتر دەکات، ئەو ئەزموونە تاڵەی کە لە واقعی زینداندا چەشتوویەتی تەگەرەیەك نییە بۆ ئەوەی نەتوانێت کۆمەڵێك ئاوات بۆ ئێستا و داهاتوو هەڵبچنێت و، هەروەها جیهانێکی تایبەت، دوور لە زیندان و مەینەتییەکانی بەهۆی خودەوە بۆ خود بسازێنێت.) [10] بێگومان ئەم خودەش، خودەکانی تر لە ڕێی بەرهەمی ئەدەبییەوە بارگاوی دەکات و هێز و گڕ و تینیان پێدەبەخشێت. بە شێوەیەکی گشتی ئێمەی مرۆڤ کاتێك کە باس لە زینداندا دەکەین یەکسەر بیر و زەینمان بۆ ئەوە دەچێت، کە زیندان تەنیا گوزارشتکردنە لە (شوێنێك) و بێجگە لەمە هیچ مانا و مەدلوولی تر هەڵناگرێت و وەرناگرێت، بەڵام زۆر ئەستەمە کە باس لە (شوێنێك) دەکەین، (کات) لەو شوێنەدا پشتگوێ بخەین و دایببڕین، چونکە ڕاگرتنی (کات) مەحاڵە و گەر بیری ئەوە بکەین (کات)مان ڕاگرتووە ئەمە بەو مانایە دێت، کە ئێمەی مرۆڤ خۆمان ڕاگیراوین و بوونمان نییە، بەڵام ئاشکرایە بوونەوەرەکان بە گشتی و مرۆڤیش بە دیاریکراوی لە نێو ئەو بوونەوەرانەدا، هەریەکەیان بە چەشن و شێوەیەك (کات)ی بەسەردا ڕەتدەبێت. بۆیە دەتوانین بڵێین زیندان سەبارەت بە ئەدیبان ئەو شوێنکاتەیە لە زۆرترین حاڵەتدا لە کەسێتییەوە دەیانکات بە کەسایەتی، ئەدیب (لە نێو چوارچێوەی

تەسك و داخراوی زینداندا، دەبێتە کەسایەتییەك کە شتی نوێی لێ سەوز دەبێت، بۆ ئەم مەبەستەش (کات) هۆکارە بۆ ئەوەی بەهرەکەی لە شوێنێکی ئاوادا زیاتر هەستی پێبکرێت.)[11] کەواتە وەك چۆن ئەدیب، جا لە هەر ژانرێکی ئەدەبی بێت (شوێنکات)ە جیاوازەکان دەمەزرێنێت و گەمەی هونەرییان پێدەکات و دواتر لە بەرژەوەندیی ناواخن و دەراخنی دەقدا بەرجەستەیان دەکات، ئەوە ئاواش شوێنکاتە جیاوازەکانی تەمەن و قۆناغەکانی ژیانی ئەدیبان کاریگەرییان بەسەریانەوە دەبێت و پێیانەوە مەحکوم دەبن. زیندان بۆ مرۆڤەکان بە شێوەیەکی گشتی بریتییە لە قەدەغەکردنی زۆرترین شت و بابەت لە زیندانییان، ئەو کاتەی ئەدیبێکیش پەلکێشی زیندانەکان دەکرێت ، کۆت و بەندی سەر قەدەغەکراوەکانی ئەمانە مەحکەم و توندترە، ئەمەش هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە نووسەران خاوەن سەرمایەیەکی هزری و مەعریفین و ئەم سەرمایەی ئەمان هەر لە دەست و مستیاندا نییە، بەڵکو لە عەقڵ و بیر و بیرکردنەوە و دنیابینییەکانیاندایە، سەرمایەیەکە بە هیچ شێوەیەك دەسەڵاتێکی ستەمکارانە ئامادە نییە مامەڵە و ئاڵوگۆڕی لەگەڵدا بکات، بۆیە دەسەڵات تا بۆی بکرێت دەیخاتە ژێر زۆرترین فشارەوە و یاساغی دەکات. (ژمارەی قەدەغەکراوەکانی نێو زیندان بێشومارن ، لە بەراییترین بڕیاردانەدا قەدەغەکردنی هۆ و ئامرازەکانی نووسین و خوێندنەوەیە و، نابێت زیندانی ئاڵوگۆڕی نووسین بکات لە نێوان خۆی و زیندانییەکی تر، یاخود خۆی و خزم و کەسوکار و دۆست و برادەرانی، گەر لە حاڵەتێکیش ڕێ بە نووسین درا ئەوا نابێت ئەم نووسینە هیچ وردەکارییەکی تێدابێت بە تایبەت ئەوانەی پەیوەندییان بە نێو زیندانەوە هەیە، ئەمەش خۆی لە نووسینی نامەیەکی سڵاو و سڵاوکاری و هەواڵ پرسین دەبینێتەوە.)[12] بێگومان ئەمە ئەستەمە بتوانرێت لە لایەن ئەدیبێکەوە مایەی قەبووڵکردن و ڕازیبوون بێت، دەشێت ئەدیب بە دیوارە بەرز و ئەستوورەکانی زیندان و ئەشکەنجە و ئازارەکانی و پاسەوانێتی جەللادەکانی قایل بێت، بەڵام ناشێت خۆی بە دوور بگرێت لە کردەی نووسین و دانانی بەرهەمی ئەدەبی و هزری، بۆیە ئەدیب لە چوارچێوەی زینداندا بۆ ئەوەی ئەم قەدەغەکراوانە تێپەڕێنێت، دەبێت پلانێك دابنێت بۆ تێکشکاندنی قەدەغەکراوەکان و دەست بە

قەدەغەشکێنی دەکات، مەرجیش نییە ئەم قەدەغەشکێنییە لە ڕێی نووسینەوە ئەنجام بدرێت، بەڵکو ئەمجارە ئەدەبی زارەکی (کە مەبەستمان هەر ئەدەبە نووسینەکییەکەیە) بۆ ئەدەبی زارەکی وەرگێڕدراوە دەبینێتەوە، کە ئەمەش خۆی لە وتار و گوتار و خوێندنەوەی چامەیەك و ئاڵوگۆڕی بیر و ڕا و بۆچوونەکانی نێوان ئەدیب و زیندانییەکانی تردا دەنوێنێت. ئەدیب (بوونەوەرێکە بە هۆی هەستیارییەکەیەوە هەر هەست بە خودی خۆی ناکات، بەڵکو بە ئاسانی دەتوانێت هەست بە دەوروبەرەکەشی بکات، بۆیە ویژدانەکەشی خود تێدەپەڕێنێت و لە ویژدانێکی دەستە جەمعی دەچێت و هەر چەندە زیندان داخراو بێت، ویژدانەکەی ئەو کراوەتر خۆی دەنوێنێت.)[١٣] کەواتە ئەدیب ئەو بەرهەمەی، کە دەینووسێت، بەرهەمێك نییە هەموو گوزارشت بێت لە ویژدانی خودیی، بەڵکو بە هۆی ئەم ویژدانە خودییەی خۆیەوە شوێنپێی ویژدانەکانی تریش هەڵدەگرێت و لە دەقدا بەرجەستەیان دەکات، بەمەش هەر ویژدانی خۆی لە ڕێی نووسینی ئەو دەقەوە ئاسوودە ناکات و ئاسوودەیی بە ئەوانی دیکەش دەبەخشێت، ئەوکاتەی ئەدیب دەقێك دەنووسێت لە زیندان، یاخود دوای ئازادبوونی لە زینداندا بە دوای ئەوەدا دەگەڕێت، کە ئومێد و هیوا و ئاواتەکانی خۆی و دەوروبەرەکەی بگەشێنێتەوە، لە کاتێکدا بەرپرسان و بنیاتنەرانی زیندان هەموو هەوڵێکیان بۆ ئەوە چڕکردۆتەوە، کە هەرچی ئومێد و ئاواتی مرۆڤە ئازادیخوازەکان هەیە زیندەبەچاڵی بکەن و لە گۆڕی بنێن.

لەوەتەی مرۆڤ بوونی هەبووە هەوڵ و تێکۆشان بۆتە بەشێك لە ژیانی ئەم بوونەوەرە، خەمی هەرە گەورەی مرۆڤ لەوەدایە، کە لە لایەن هاوتوخم و هاوچەشنەکەی خۆی ستەم و زۆرداری لێبکرێت و بچەوسێنرێتەوە، لە مرۆڤ کەمتر لێی بڕوانرێت و مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت . ئەدیب لە زینداندا کەشێکی ئاوا سەخت و دژواری بۆ هەڵدەبژێرن بۆ ئەوەی (تووشی جووتکارەکتەری بکەن و، بە شێوەیەك شپرزە و پەشۆکاو و تێکشکاو بێت کە هەموو شتەکانی ژیانی لەدەست چووبێت، بەڵام ئەمە بۆ ئەو لە خەوێك دەچێت کە زوو بەزوویی لە خەوەکەدا ڕابچڵەکێت و ئاگاداری بوویێتەوە و کار بۆ گەیاندنەوەی هیواکانی لە ڕابردوو و ئێستادا بکات و خۆ ئامادەکردن بۆ ئەگەرەکانی داهاتوو دەبێت بە بەشێك لە

کارەکانی.)[١٤] ئەدیب لە زیندانیشدا بێت، بەڵام پشت ئەستوورە بە جەماوەر و گەلەکەی کە شانازی پێدەکەن، ئەویش بۆ ئەوان مایەی شانازییە، بەشێك لە ئەدیبان بە هۆی داکۆکیی بەردەوامیان لە مافە زەوتکراوەکانی مرۆڤ و مرۆڤایەتی سنووری وڵاتەکەیان دەبڕن و دەبنە دیاردەیەکی جیهانی، لەبەرئەوەی هەر مرۆڤێکی ستەملێکراو لە کوێی ئەم دنیایە بێت ئەوان لەوێن و دەنگی مەزڵوومانەی ئەو بەرز دەکەنەوە.

## زیندان و دەسەڵات و نووسەر:

گەر لە دەقێکی ئەدەبی بە وردی بڕوانین، دەبینین نووسەرەکەی لە ئاگاییدا بێت، یان لە بێ ئاگاییدا لە کۆمەڵێك دەرگای بوار و بابەتە جۆربەجۆرەکانی ژیانی داوە و هەر لە ڕێی ئەم دەرگایانەشەوە چەندین پەنجەرە و ڕوانگەی بۆ وەرگرانی دەقەکەی بە ڤالایی هێشتۆتەوە، بۆ نموونە کاتێك ئەدیبێك بیرۆکە و بابەتەکەی لە چوارچێوەی زینداندا دەخولێتەوە ناچارە بچێتە نێو فەزای سیاسییەوە و گورزە تیشکەکانی ئاڕاستەی ئەم فەزایە بکات، ئەوکاتەی دەچێتە نێو دنیای سیاسەتەوە و بە هۆی شاڕێیەکانی ئەم دنیایەوە خۆی دەخزێنێتە سەر ڕێگە و تووڵە ڕێگەکانی فەزای کۆمەڵایەتی و ئابووری و مێژوویی و فەرهەنگییەوە و، هەریەکەیان بەپێی پێویستییان لووتی لێیان دەژەنێت. کەواتە بە درێژایی مێژووی ئەدەبیاتی جیهان لە دەستپێکییەوە تا وەکو ئەمڕۆ لە ئەمڕۆشەوە تا کۆتایی ئەستەمە بتوانین دەقێك بدۆزینەوە لای لە چەندین بوار و بابەت و فەزای جیاجیای ژیانی مرۆڤەکان نەکردبێتەوە بە خەستی لەسەر یەکێك و دووان جەختی نەکردبێتەوە. ئەدیب هەر خۆی زیندانی ناکرێ، بەڵکو بەرهەمە ئەدەبی و هزرییەکانیشی زیندانی دەکرێن و دەبنە تابۆی ڕۆشنبیری و مەعریفی و بە هۆی قەدەغەکردن و کۆکردنەوە و سووتاندن و لەناوبردنیان، وەك نووسەرەکانیان دەکوژرێن و تیرۆر دەکرێن. (ئەدیبان ویژدان و ئیرادەی گەلانی ستەمدیدە بەرجەستە دەکەن و، خاوەن هەڵوێستن و بەرهەمەکانیان کاریگەریی ڕاستەوخۆ دەکەنە سەر جەماوەر و بەشداریکەر و هەڵگیرسێنەری شۆڕشەکانن بۆیە هەردەم تووشی زیندان و ئازاردان و ڕاگوێزان و دوورخستنەوە و لانە گومکران دەبنەوە، هەندێك جاریش

دەسەڵاتداران پەنا بۆ بڕین و کوشتنیان دەبەن بۆ ئەوەی لە کورسییەکەیان بمێننەوە و بیپارێزن.) [١٥] بێگومان دەسەڵاتێك بەم شێوەیە مامەڵە لەگەڵ ئەدیب و مرۆڤانی ئازادیخواز بکات، بە هەڵەدا چووە ئەگەر بیر لەوە بکاتەوە و پێیوابێت بەهۆی بڕین و کوشتن و تیرۆرکردنی ئەمانەوە ناڕەزایەتییەکان بڕەوێنێتەوە و دەنگی سەربەستخوازان خامۆش بکات، چونکە ئەمانە گەر بەم شێوەیەش لەنێوبران بۆ یەکجارەکی گیان لە دەستنادەن، لەبەرئەوەی گیانی ئەمان لە نێو بەرهەم و دەقەکانیاندایە و بەرهەم و دەقەکانیشیان لە نێو ببەن گیانی ئەمان هاوڕا و هاوڕاز و هاوڕێی گیانی جەماوەرە ستەمدیدەکەن . دەکرێت لێرەدا پرسیارێك خۆی قووت بکاتەوە ئەویش ئەوەیە ئایا شۆڕش و شۆڕشگێڕان هۆکارێکن بۆ ئەوەی زیندانەکان دروست بکرێن و زیندانییەکان تێیدا ئازار بچێژن؟ یاخود زیندان و زیندانییەکان هەڵگیرسێنەری بڵێسەی شۆڕشەکان و تاودانی گیانی شۆڕشگێڕانن؟ بێگومان وەڵامدانەوەی پرسیارێکی لەم شێوەیە و بەم دوو ئاراستەیە کارێکی هێندە ئاسان و ساکار نییە، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەم شۆڕشەکان و ، هەمیش زیندانەکان نەبنە مایەی ئەوەی بێ ئومێدی و بێهیوایی و بێ ئیرادەیی و بێهێزی ڕوو لە کۆڕ و کۆمەڵان و دەستە و چین و توێژەکانی کۆمەڵگە بکات و، بەر بە خۆری ئازادی و سەربەستی نەگیرێت و شۆڕشەکان و زیندانەکانیش ببنە هەڵگری تۆ و ماکی گۆڕانکاری و چاکسازیی ڕیشەیی. (شۆڕش هاوڕێیەکی هەمیشەیی بڕین و کوشتن و خوێنبەربوون نییە، بەڵکو ماناکانی فراوانە زۆر لەمانە زیاتر هەڵدەگرن، شۆڕش لە بنەڕەتدا بەر لەوەی کردەی شەڕوشۆڕ بێت، کردەیەکی ئاشتییە، شۆڕش ئەو کاتە دەبێتە یاخیبوونێکی چەکدارانەی بێ سێ و دوو کە شەڕانگێزەکان بە توندوتیژترین شێواز ڕووبەڕووی مرۆڤەکان ببنەوە، ئەمانەش بە مەبەستی بەرگری و خۆپاراستن و مانەوەە و کۆتاییهێنان بە بیری شەڕانگێزیان لە بەرامبەریان بوەستنەوە.) [١٦] کەواتە یەکێك لە مەبەست و ئامانجە هەرە دیار و گرنگەکانی شۆڕش گەڕانە بە دوای ناسنامەی ڕاستەقینەی مرۆڤەکان، کە خۆی لە سەروەری و ئازادی و مافە ڕەواکانی مرۆڤدا دەبینێتەوە، ئەم ناسنامە ڕاستەقینەیە لەلایەن بەشێك لە مرۆڤەکان شێوێنراوە و بگرە زۆرجار بە ئەنقەست ونیان کردوون و بۆ ئەوەی زۆرێك لە مرۆڤەکان لە تایبەتمەندیی

مرۆڤایەتی دابماڵن و دەیانەوێت بەرگ و گیانی دیلێتی و بەندێتی بکەن بە بەریاندا و پەیوەندییەکی پارسەنگ لە نێوان مرۆڤەکاندا بسازێنن. ئەدیبی سەرکەوتوو هیچ دەسەڵات و ڕژێمێکی سیاسیی ستەمکارانە ناتوانێت ملکەچی بکات و چۆکی پێدا بدات، لەبەرئەوەی ئەو کار لەسەر جێگرەوە (ئەلتەرناتیڤ)ە گونجاوەکان دەکات بۆ لەدەستچوونی هەر شتێك و کارێك جێگرەوەی گونجاو دەخاتە شوێنییەوە (ئەگەر ئەدیب شکستی خوارد لە هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵگە و، نەیتوانی لە دەوروبەرەکەی خۆیدا ڕۆڵی فریادڕەس و چاوساغێك بگێڕێت و، زەنگی ئاگادارکردنەوەی بۆ کەسانی خراپ و بەد لێنەدا و نەیتوانی پەیام و بیرۆکەکانی بە سەرکەوتوویی بگەیەنێت، ئەوا بێگومان دەسەڵات لە دوای دەبێت بۆ ئەوەی بە یەکجارەکی کۆتایی پێبێنێت، ئەگەرنا بەزەیی پێدا دێتەوە لە باشترین بارودۆخیدا لە زیندان کۆت و بەندی دەکات و دەیخاتە تاریکترین کونجییەوە.)[17] بێگومان ئەوەی لێرەدا تیشکی خراوەتەسەر و باسی کراوە ئەدیبێکی شکستخواردوو و کەم ئەزموون و کەم بڕستە و هەتا ئێستا نەتوانێت متمانە بە خودی خۆی بکات، ئەدی چۆن ئەوانی تر دەتوانن متمانەی پێبکەن، هەروەها نەیتوانیوە لە ڕێی کار و بەرهەمەکانییەوە هێزێك، دەسەڵاتێك، فشارێك دروست بکات بۆ ئەوەی تاڵاوی شکست بە دوژمن و نەیارە سەرسەختەکانی خۆی و گەلەکەی نۆش بکات و بێترس و سڵەمینەوە لە بەرامبەریاندا ڕابوەستێت . دەسەڵاتدارانی ستەمکار بە حوکمی ئەوەی دەسەڵاتێکی ڕەهایان بۆ خۆیان بە ڕادان داوە و ئەم دەسەڵاتەش لە چەندین هێزی دەمکوتکەر و سەرکوتکەری زەبروزەنگ و ئاسانئاسا پێکدێن، بۆیە تا توانایان هەبێت و دەسەڵاتیان بڕ بکات لووت دەژەننە هەموو شت و بوار و کایە جیاوازەکانی ژیانی مرۆڤەکانەوە، دەستی تێوەردەدەن و دەستکارییان دەکەن تەنیا لە پێناوی ئەوەی لەسەر ڕێڕەوی خۆیان لابرێن و بکەونە ناو چەوت و چەوێڵییەوە و ئاوا تێکیبدەن پاککردنەوە و ڕاستکردنەوە و چاککردنەوەی تا ڕادەیەکی زۆر قورس و تاقەتپڕووکێن بێت، بۆ نموونە دەسەڵاتی سیاسی لەڕێی ئەو سیاسەتەی کە خۆی دایڕشتووە و مەبەستییەتی بوار و کایە کۆمەڵایەتی و مەعریفی و کولتووری و ئابووریی تەنانەت شتە کەسییەکانیش بە سیاسی بکات و ئەم بوار و کایە جیاوازانە بە سەربەخۆی خۆیان نەنوێنن، سەر بە دنیای سیاسەت

و سیاسییەكان بن و جیاوازییەكانیان كاڵ و سووك بكرێنەوە لە سیاسەت و بەرژەوەندیی چەند سیاسییەكی ستەمكارانە، كە لە دواجاردا دەبنە داهێنەری زیندانەكان و پرۆسەكانی بڕین و كوشتن و تاڵانكردن تۆخ و چڕ بكەنەوە، بۆیە دەكرێت لەم ڕووەوە ئەدیبان ڕۆڵی پێشەنگ و ڕێبەرێك ببینن بۆ ئەوەی (ئازادییە زەوتكراوەكان بسێننەوە و ستەم و زۆردارییەكانی دەسەڵاتێكی قۆرخكار كۆتایی پێبێنن، بێگومان بارودۆخێكی ئاواش یەكتربڕینی ستەم و زۆردارییە سیاسی و كۆمەڵایەتییەكانن، كە ڕاستەوخۆ مرۆڤەكان زامدار دەكەن و لە سەربەستی دایاندەماڵن.) (١٨) لێرەدا ئامانجی دەسەڵاتێكی چەوسێنەر بە ئاشكرا هەستی پێدەكرێت، كە بە چاكی دركی بەوە كردووە تەنیا شێواندن و تێكدانی بوار و كایەیەكی ژیان بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤەكان بە دەست بوار و كایەكانی تر گیر بخۆن و بناڵن و ژیان بە گیانەڵایی ببەنەسەر و هەموو كووچە و كۆڵانێكی شار و ناوچەیەكی وڵاتیان لێبكەن بە زیندانستان و جەنگەڵستان. ناخۆشی و مەینەتییەكانی زیندان بەشێوەیەكی تر ئەدیبان بە جۆش دێنێت و بەرهەمەكانیان بە سەنگێكی قورسترەوە خۆیان دەخزێننە نێو تەرازووی خوێنەرەكانیانەوە، كەواتە زیندان چەند ناخۆش و سەخت و پڕ مەینەت و كارەسات بێت زیندانییانی ئەدیب لە توانایاندایە بەچەشنێكی تر مامەڵەی لەگەڵدا بكەن. (زیندان لە ئامرازێكی بكوژ دەچێت لە دەستی بەشێك لە دەسەڵاتداراندایە، بەكاری دێنن بۆ ئەوەی زیاتر و بە ڕەهایی جڵەوی دەسەڵات بگرنە دەست و مانەوەی كورسییەكەیان مسۆگەر بكەن. مەرج نییە ئەم ئامرازە بكوژە ڕاستەوخۆ و بە خێرایی مرۆڤەكان بكوژێت، بەڵكو دووچاری مەرگێكیان بكاتەوە بۆ ئەوەی بە كاوەخۆیی گیان لە دەست بدەن، نەوەك هیوای مەرگێكی لە ناكاو بخوازن، بەڵام ئەدیبان هەڵگیرسێنەری ڕووناكین و بە هیچ كلۆجێك ناخوازن لە زینداندا گیان لە دەستدان ببێتە جێگرەوەی ئاوات و ئومێد و هیواكانیان، گەر بخرێنە نێو ئاگرە بڵێسەدارەكانیشەوە گیانیان لە باتی بۆسۆ ، گڕ و ڕووناكی بۆ دەوروبەرەكەی دەردەكات.) (١٩) گەر نەختێك لەم بیر و بۆچوونە وردبینەوە، دەبینین خاوەن بەرهەمە هزری و ئەدەبییەكان گەر بە هۆی زیندان و ئاگر و ئاسن و ، دڕندانەترین شێواز دەسەڵات بیانكوژێت و تیرۆریان بكات، ئەوا لە نێو دڵی میللەتەكەیان بە

جاویدانی دەمێننەوە و سەرچاوەی ئەم جاویدانییەی ئەوانیش بەرهەمەکانیانن . کاتێك ئەدیبێك لەسەر باس و خواس و بابەتی زیندان و زیندانییان دەگیرسێتەوە و لە بەرهەمەکەی ڕەنگڕێژی دەکات، مەرج نییە ئەو ئەدیبەی کە بەرهەمەکە دەنووسێت وا پێویست بکات و چارەی نییە تەنها دەبێت لە نێو زینداندا بێت ئینجا بەرهەمەکەی لێ وەردەگیرێت و پەسەند دەکرێت، چونکە لە زیندانی دەسەلاتدارە ستەمکارەکان کۆمەڵێك کۆت و بەندی سەرباری تر هەن و جا چ بە یاسا لاستیکییەکان بێت، یاخود هەڕەمەکی بێت لە زیندانییان یاساغ دەکەن و، بە تایبەت ئەو زیندانییانەی کە مەبەستیانە زیندان بکەنە وێستگەیەکی تری بیرکردنەوە و ئەم بیرکردنەوەیەش وەربگێڕنە سەر نووسین، هەر بۆیە ( لە زینداندا بابەتگەلێك لە نووسەر و ڕۆشنبیران یاساغ دەکرێن، بۆیان نییە لە بارەی ژیاننامەی خۆیان و هاوڕێکانیان بنووسن، بیر و بۆچوونە خودییەکان نابێت دەرببڕێن، دەبێت فەرماندارانی زیندان ڕێ بدەن کە لێدوان بۆ ئەوانە بدەن کە خۆیان مەبەستیانە، گەر زیندانییەکان ویستیان لێدوان بدەن، بە هیچ شێوەیەك نابێت باسی ئەو گۆڕانکاری و چاکسازییانە بکرێن کە لە زینداندا پێویستە ئەنجام بدرێن.) [٢٠] کەواتە دەسەلاتداران بە گشتی و دەسەلاتدار و فەرمانبەدەستانی زیندان هەرگیز نایانەوێت نووسەر و ڕۆشنبیر و ئەدیبان لەو ڕۆتینانە ڕزگاریان بێت کە تەنگی بە ئەمان و بە گشت تاکی چین و توێژەکانی کۆمەڵگە هەڵچنیوە، بەڵکو دەبێت بە هەر هۆکارێك بێت ئەوان خۆیان لەم ڕۆتینانە ڕزگاربکەن و هیوایەکی نوێ بە ژیان ببەخشنەوە . ئەو دەسەلاتدارانەی دەیانەوێت بە ڕەهایی حوکمی وڵات بکەن هەمیشە کار لە سەر هێزە ڕەقەکان لە ئاگر و ئاسن و چەك و تەقەمەنی و کوشتن و بڕین و تیرۆرکردن....هتد دەکەن و، نەیانتوانیوە یا ناتوانن قورسایی و سەنگی هێزە نەرمەکان لە قەڵەم و نووسین و بیرکردنەوە و بەرهەمە ئەدەبی و هزرییەکان ....هتد هەڵسەنگێنن و بەهای پێویستیان بۆ دابنێن، چونکە لە ئەستەم ئەستەمترە وڵاتێك دەسەلاتی بە سەرکەوتوویی تاقیبکاتەوە گەر نەیتوانی پەی بە هاوسەنگیی ئەو هێزانە ببات و یەکێکیان بەسەر ئەوی تریان بە چاکتر و پەسەندتر بزانێت. بۆ نموونە ئەو هێزەی لە قەڵەمی ئەدیبێك، یاخود خاوەن هزرێکدایە هەرچەندە بە قەبارە گەر بەراورد بکەین لەگەڵ هێزی

دەسەڵاتداران لە چەك و تفاق و پیاوانی دەست و پێوەندیان و بەندیخانە و زیندانەکان لە گەردێك بچووکترە، بەڵام ئەم هێزە بە بچووکییەکەی پێوانە ناکرێت و بە کاریگەری و کارتێکردنەکەی و شوێنەوارەکەی پێوانە دەکرێت کەواتە (ئەدیب و نووسەران دەیانەوێت پەیامێك ئاڕاستەی دەسەڵات بکەن و، لەوە ئاگاداری بکەنەوە و هۆشداری پێبدەن کە وڵات پێویستی بە خاوەن پێنووسان و خاوەن شمشێران هەیە و، ئەو هێزەی لە پێنووسەکاندایە هیچی کەمتر نییە لەو هێزەی کە لە شمشێرەکاندایە و، بەڵکو زیاترە و هەر وڵاتێك ئەم دوو هێزەی هەبێت دەتوانێت بە ئاسانی لەسەر پێیەکانی بوەستێت و پێگەی خۆی قایم بکات.) (٢١)

لە چوارچێوەی ئەم بیر و بۆچوونەدا دەکرێت چەند پرسیارێك ئاڕاستەی قەڵەمبەدەست و شمشێر بەدەستان بکرێنەوە، ئەدیبێك ڕۆژێك لە ڕۆژان لە خۆی پرسیوە بۆچی دەنووسێت؟ لە بەرامبەردا شمشێر بازێك ئەوەی بە بیردا هاتووە بۆچی ئەم شمشێرەی بە دەستە؟ ئەدیبێك بۆ کێ دەنووسێ؟ و شمشێر بە دەستێك بۆ کێ شمشێری هەڵگرتووە؟ ئەدیبێك لە پێناوی چی و کەی دەنووسێت؟ و شمشێر بازێك دەزانێت لە پێناوی چی ئەم شمشێرەی لە دەستە و کەی ئاڕاستەی بەرامبەرەکەی دەکات؟ ئەوەی ئەدیبێك دەینووسێت هەر حەز و ئارەزوویەکە و دەیەوێت دڵی خۆی ڕازی بکات و دڵنەوایی خۆی بداتەوە، یاخود نووسین بە دەر لە حەز و ئارەزوو و دڵڕازیکردن کردەیەکی مەبەست و ئامانجدارە؟ و شمشێربازەکان تەنیا بۆ ڕازیکردنی دڵی کەمینەیەکی دیاریکراو لە دەسەڵاتداران شمشێر ڕادەوەشێنن، یاخود ئەم شمشێربازی و شمشێر بە دەستییەی ئەمان داکۆکیکردنە لە ئامانجێکی پیرۆزیی نەتەوەیی؟ ئەم پرسیارانە و پرسیارگەلێکی تر نەخشە ڕێگەی بەرپرسیارێتی و ڕۆڵ و ئەرك و کاریگەریی هێزی قەڵەمبەدەستان و شمشێر بە دەستان ڕوون دەکەنەوە. زیندان لە لای دەسەڵاتدارانەوە لە تاقیگەیەك دەکات، کە پێویستە مرۆڤە فرە هەستیارەکان ببرێنە ئەم تاقیگەیە و تاقیبکرێنەوە و پشکنینیان بۆ بکرێت، لە کاتێکدا لای هەمووان ئاشکرایە ئەم تاقیگەیە زۆر ترسناکە و تاقیکردنەوە و پشکنینەکانی گەلێك سەخت و دژوارن، بۆیە مەرج نییە ئەو ئەدیب و نووسەر و ڕۆشنبیرانەی بەم پرۆسەیە تێپەڕدەبن هەموویان بە بێوەیی و سەرکەوتوویی دەربچن، چونکە

زیندانییان ڕووبەڕووی توندترین هێز و زۆرترین فشاری دەسەڵاتداران دەکرێنەوە و لە ئەنجامیشدا هەیانە ناتوانێت تا سەر بەرگەی ئەم هەموو ئازار و ناخۆشی و مەینەتی و کارەساتە یەك بە دوای یەکانەی زیندان بگرێت و ناچارە دەست لە ماف و هەقی خۆی هەڵبگرێت و دانیش بە ناهەقییەکانی دەسەڵاتداران بێنێت. (دەسەڵاتداران دەیانەوێت بە هەر هۆیەك بێت وا لە نووسەر و ئەدیبان بگەیەنن کە تەنیا یەك دەسەڵات بوونی هەیە ئەویش دەسەڵاتی ڕەهای ئەوانە، پێویستە ئەوانیش ببنە پەیڕەوکاری ئەو دەسەڵاتە و، دان بە ڕەوایەتی (شەرعیەتپێدان) ئەو دەسەڵاتە بنێن و لە ڕێی بەرهەمەکانیانەوە دووپات و چەندپاتی بکەنەوە.)[٢٢] کەواتە دەسەڵاتداران هەر بەمە ڕازی نین دەستەبژێرانی کۆمەڵگە لە نووسەر و ئەدیب و ڕۆشنبیر و هزرمەندان دان بە بوونیان بنێن جا لە سەر هەق بن، یاخود ناهەقی، بەڵکو دەبێت ئەم ڕازیبوونەوەی ئەوان بە دیکۆمێنت و ئەرگیۆمێنت بکرێن بە هۆی بەرهەمەکانیانەوە و، ببنە مانفێستی چەند دەسەڵاتدارێکی دیاریکراوی مرۆڤکوژ و بیرکوژ . پێچەوانەی ئەوانەی باسمانکرد و خستمانە ڕوو دەشێت لێرە و لەوێ چەندین نووسەر و ئەدیب و ڕۆشنبیر بوونیان هەبێت هێڵی هزر و، دید و بۆچوون و بیرکردنەوەکانیان هاوتەریب بێت لەگەڵ دەسەڵاتداران، ئەو گوتارە سیاسی و سەربازییانەی کە دەسەڵاتداران ئاراستەی خەڵکی دەکەن لە سەر هەمان ئاواز ئەوان لە ڕێی ژانرێکی تری ئەدەبییەوە ئاراستەی دەکەن، بێگومان نووسەر و ئەدیب و ڕۆشنبیرێکیش بەم شێوەیە توتیئاسا بێت نەك لەلایەن دەسەڵاتێکی ستەمکارەوە لێی نادرێت و زیندانی ناکرێت، بەڵکو خەڵات دەکرێت و ئەو لە خەڵکانی تر دەدات و زیندانییان دەکات، لەبەرئەوەی خۆی دەسەڵاتدارە و بەشێکە لەم دەسەڵاتە. بۆیە (هەندێك جار ئەدیبان ڕۆڵی شایەرێك دەگێڕن و بەرهەمە ئەدەبییەکانیان هەرزانفرۆش دەکەن و بەرهەمەکانیشیان لە فرۆشگەیەکی گەڕۆك دەچێت لە بەرامبەر فرۆشتنی بەرهەمەکانیان چەند قرووشێکیان دێتە دەست. ئەم چەشنە ستایش و پیاهەڵدانەی ئەدیبان بە سەر شان و باڵی دەسەڵاتداران بۆتە خوو و سروشتێك ناتوانن وازی لێ بهێنن و پابەندبوونە بە دەسەڵات و لە هەمان کاتدا ئەم ستایش و پیاهەڵدانە مایەی نوێکردنەوەی بەڵێن و پەیمان و وەفان بۆ دەسەڵات و دەسەڵاتداران.) [٢٣] بێگومان

ئـەدیبێك ئەمـە بیرکردنـەوە و تێزەکـانی بێـت، ئـەوا ئـەو ئەدیبـە فرچـکی بـە پاشـکۆیەتی گرتـووە و هـەرگیزا و هـەرگیز ناتوانێـت دەسـت لـەم پاشـکۆیەتییەی خۆی هەڵبگرێت و لە زۆرترین هەوڵیشدا دەبێت بۆ ئەوەی ئەوانی تـریش بکـات بـە پاشکۆ وەك خۆی لێیان بکات. هەر بۆیە ئەو ئەدیبانەی پاشکۆی دەسەلاتن (وەکو کەلوپـەلێکی جوانکـاری و کەرەسـتەی ئارایشـت لـە دیـوانی مـیر و بنەماڵـە دەسەلاتدارەکان دادەندرێن و بەکاردەهێندرێن و، زیـاتر کاریـان ئـەوەبوو گـەواهی بدەن لە سـەر کارەکـانی ئـەمان، لێـرەدا مـەرج نـەبوو ئـەدیب لـە لایـەنی پـووڵ و دارایییـەوە سـوودمەند بێـت و داوای پلـە و پایـە لـە دەسـەلاتداران بکـات، بـەڵکو هەموو حەز و ئارەزوویـەکی، هیـوا و خۆزگـەکانی ئـەوە بـووە دەسـەلاتەکە ڕێـز و خۆشەویسـتییەکی بـۆ ئەدەبەکـەی ئـەو هـەبێت و بـە چـاوێکی بـەرزەوە لێـی بڕوانێت.)[٢٤] بەم پێودانگە بێت ئەم ئەدیبانە لـەجیاتی ئـەوەی ڕاسپاردەی کـۆڕ و کۆمەلان و چین و توێژەکانی کۆمەڵگـە لەبەرچـاو بگـرن، ڕاسـپاردەی دەسـەلات و پیـاوانی دەسـەلات لەبەرچـاو دەگـرن و لایـان وایـە گـەر دەسـەلات نـرخ و بـەهای بەرهەمەکانیان دیاری بکات ئەوا بەرهەمەکانی ئەوان دەبنە ڕەسەن و لە دەلاقـەی کتێبخانـــەکان بەرهەمـــەکانیان گۆشـــەگیر نابێـــت و گـــەر دیـــد و بۆچـــوون و بیرکردنەوەکانی ئەم ئەدیبانە بنبۆشیش بن مادامـەکێ دەسـەلات دەسـتی بەسـەر داهێناون و پشتگیری کردوون بەرهەمی دەگمـەن و نایـابن، بێگومـان ئـەدیبێکیش ئەمە بیرکردنەوەی دروستی ئەو بێت بەرهەمەکەی زۆر مـەودا کـورت دەبێـت و لـە توانایدا نابێت لە نێوان قۆناغە جیاوازەکانی مێژوودا لە نێوان ئێسـتا و ڕابـردوو و ئێسـتا و داهـاتوودا دەستاودەسـت بکـات و زۆرتـرین تەمـەنی ئـەم بەرهەمـە گـەر هەشـیبێت بەسـتراوەتەوە بـە مـاوەی حـوکمڕانیی ئـەو دەسـەلاتدارەوە کـە بەرهەمەکەی پەسن کردووە.

## زیندان و لێکەوتەکانی لە ڕۆمانی "ژانی گەل"ی ئیبراهیم ئەحمەد دا

"د. کەمال فوئاد" لە (پێشەکی)ی چاپی ڕۆمانی (ژانی گەل)دا ژیانی "ئیبراهیم ئەحمەد" لە ڕووی ئەدەبی و سیاسی و ڕۆشنبیری و شۆڕشگێڕی و ڕۆژنامەنووسییەوە خستۆتە ڕوو. بەم شێوەیە وەسفی ڕۆماننووس دەکا: (نووسەر سەرەتای ژیانی ئەدەبی وەکو ڕۆمانتیکێکی شۆڕشگێڕ دەست پێ ئەکا:

**لە بەرچاوی بەد لە ترسی بەدکار**
**دڵ خۆم ئەکەمە گۆڕی یادگار**
**بە گریانی وشك بە ناڵەی بێ دەنگ**
**دێنمە لەرزین تەختی کردگار**

بەڵام لە دواییدا لە سەر ڕێبازی ڕیالیزم ئەگیرسێتەوە.)[٢٥] گەر لەم وەسفەی "د. کەمال فوئاد" وردبینەوە، وەسفەکەشی دەوڵەمەندە و پشتڕاستی کردۆتەوە بە دوو دێڕە شیعری " ئیبراهیم ئەحمەد"، کە لە ساڵی ١٩٣٣ لە (یادگاری لاوان)دا بڵاوی کردۆتەوە، ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە ڕۆماننووس نەك هەر ڕۆمانتیکێکی شۆڕشگێڕە، بەڵکو ڕیالیزمێکی شۆڕشگێڕ و ناسیۆنالیستیشە، بە تایبەت کاتێك بەرهەمێکی وەك ئەمەی "ژانی گەل" دەنووسێت. هەروەها بیرکردنەوە و دنیابینیی ڕۆماننووس لەم دوو دێڕە شیعرەی سەرەوە، کە ئاماژەی پێکرا ئەوەمان پێدەڵێت: کە کەسێك لە بەرچاوی بەد و لە بەر ترسی بەدکاران، دڵی خۆی بکاتە گۆڕی یادگار، کە لێرەدا دەکرێت بڵێین (زیندان) مەدلولێکە بۆ (گۆڕ)، دەبێت هەر زووش بڕیاری ئەوەی دابێت، کە بەرهەمێك بنووسێت گوزارشت بێت لە ئەدەبی زیندان، نەخاسمە ئەو کەسە کە لە پێشتردا ئاماژەمان پێدا کەسێك بێت، سەر بە دنیای ئەدەبی و سیاسی و ڕۆشنبیری و شۆڕشگێڕی و ڕۆژنامەنووسی بێت، بێگومان ئەم جۆرە کەسانە، کە بەم چەشنە دەژین و ئاوا بیر دەکەنەوە، هیچ چارەیان نییە بێجگە لەوەی وێستگەیەك، یاخود چەند وێستگەیەکی ژیانیان لە زیندان و گرتووخانەکان بەرنەسەر و چاوەڕێی زەحمەتی و ئازار و مەرگخوازی بن . هەروەك لە پێشەکییەکەی "د. کەمال فوئاد"دا هاتووە (لەساڵی ١٩٤٩ لە ڕێگادا بەرەو بەندیخانە، کە ساڵ و نیوێکی تیا بەسەر بردووە (دوا تیری کەوان)ی وتووە، کە تیایدا هێرشەکانی حکومەتی ئەو سەردەمەی بە

لنگەفرتێی سەرەمەرگ داناوە و موژدەی نزیکبوونەوەی ڕۆژی سەرکەوتنی بە سەر ڕژێمی پاشایەتی و نۆکەرانی ئیمپریالیزمدا بە گەل گەیاندووە.) [٢٦] کەواتە دەتوانین ئەنجامێکی گرنگ هەڵێنجێنین ئەویش ئەوەیە خاوەنی ڕۆمانی (ژانی گەل) ئەدیب و نووسەرێکە بەر لەوەی ببێت بە ڕۆماننووس و بەشێکی زۆری ڕۆمانەکە بۆ (زیندان و زیندانییان) تەرخان بکات ، کەسایەتییەکە دنیای تاریك و نووتەکی زیندانی تاقیکردۆتەوە و ئەم ئەزموونە ناخۆش و تاڵ و قورسەی تێپەڕاندووە، بۆیە ئاساییە گەر بڵێین ڕۆماننووس توانیویەتی سەرکەوتوو بێت لەوەی، کە نموونەیەکی جوانی بەرهەمی ئەدەبی بەرەنگاری و زیندانی و شۆڕشگێڕی پێشکەش بە ئێمە بکات. هەروەها دەتوانین بڵێین ڕۆمانی "ژانی گەل" ڕۆمانێکە هێڵە گشتییەکانی ژیاننامەی خودیی "ئیبراهیم ئەحمەد"ی تێدا بەرجەستەیە، بەشێکی ئەم ژیاننامە خودییەش لە کارەکتەری سەرەکی ڕۆمانەکە، کە (جوامێر)ە ڕەنگی داوەتەوە. هەموو ئەمانە تیشکی زۆر ڕۆشنن بۆ ئەوەی بڵێین ڕۆمانی "ژانی گەل" بەشێکی گرنگی ئەدەبی زیندانیی کوردی پێکدێنێت. ڕۆماننووس هەر لە یەکەمین لاپەڕەی دەقەکەیدا سەرنجی خوێنەر بۆ ساڵانی پڕ ئازاری نێو زینداندا ڕادەکێشێت. (.....**تا بە ڕێکەوت لە هەڵتەکاندنێکی توندی ئوتمۆبیلەکەدا، لە ئاوێنەی بەردەمی لێخوڕەکەدا، چارەیەکی بەدی کرد. گورج و دووچاوی کاڵی مەنگ سەرنجیان قۆستەوە کە لە هەموو ئەندامێکی کەی، کەمتر ساڵانی زیندانی کاریان تێی کردبوو)** (ژانی گەل، ل٨).

بێگومان ئەمەش دەستپێکێکی گونجاو و لەبارە بۆ ئەوەی خوێنەر خۆی تەیار بکات ، بۆ چوونە نێو قووڵایی ڕووداوەکانەوە و لە نێو ڕووداوەکانیشدا بە دیاریکراوی ئەو ڕووداوانەی پێوەندییان بە زیندانەوە هەیە ، چونکە (دەسپێك گرنگترین بەشی دەقە، کە وا لە خوێنەر بکات سەرنجی بۆ لای دەقەکە ڕابکێشێت و ناچار بە خوێندنەوەی بکات، بۆیە گرنگیی دەسپێك لێرەوە سەرچاوە دەگرێت، کە لە پاش ناونیشانەوە دەبێتە دووەم ڕاوکەری خوێنەر وەرگر بۆ لای تێکستەکە.) [٢٧] لە ڕۆمانی (ژانی گەل)دا زنجیرەیی کات تێکشکێندراوە واتە گەر چیرۆك و بەرهەمە ئەدەبییە پەخشانئامێزەکانی ئەدەبی کوردی، پێش ئەم بەرهەمە، بە شێوەی (سەرەتا، ناوەند، کۆتایی) ڕایی کرابێت، گێڕانەوە و

ڕووداوەکان ئاوا پێشکەشکرابن، ئەوا لەم ڕۆمانەدا ئەمە بەرچاو ناکەوێت، چونکە (کۆتایی) گێڕانەوە و ڕووداوەکان لە (سەرەتا)دا بە خوێنەر ئاشنا دەبن، بەمەش خوێنەر وا بە ئاسانی ناتوانێت پێشبینیی چۆنیەتی و چەندێتی ڕووداوەکان بکات. بۆ نموونە (جوامێر)ی کارەکتەری زیندانیکراو ئەوکاتە زیاتر ئاشنای دەبین، کە لە زینداندا ئازاد کراوە و خەریکی ئەو ڕۆتین و ڕێوشوێن و میکانیزمانەیە، کە پێویستە هەر زیندانییەك بە ئەنجامی بگەیەنێت بەر لە ئازادبوونی بە ماوەیەکی کەمی دیاریکراو، **(لە بەردەمی دایەرەی ئاسایش دابەزین، بردیانە ژووریٚ پاش سەعاتێ ڕاگرتنی ناخۆشی پڕ بێزاری، پەنجەمۆر و چەند وێنەیەکیان وەرگرت، ناونیشان و کار و ناوی چەند ناسیاو و خزمێکی نزیکیان لێ پرسی و نووسی و دەستەبەریان کرد کە نابێ بە هیچ جۆرێ شوێنی دانیشتنی خۆی بگۆڕێ بە بێ ئەوەی پێشەکی ئاگاداری ئەوان بکا، ئەوسا بەڕەڵڵایان کرد).** (ژانی گەل، ل١٨) لە زیندانەوە بۆ دام و دەزگای ئاسایش، ئەمە تێڕوانینی ڕۆماننووسە لەمەڕ زیندانی، چونکە بەشێکی زۆری زیندانییەکان بە تایبەت ئەوانەی زیندانیی سیاسیین، لە دوای ئازادبوونیشیان بە چەشنێك لە چەشنەکان لە زیندانییەکی بەردەوامدان . (جوامێر)ی زیندانیی، ماوەیەکی دوور و درێژ لە چوارچێوەی بەندیخانەدا ژیان دەگوزەرێنێت، کە ئەم ماوە دوور و درێژە خۆی لە دە ساڵدا دەبینێتەوە، بێگومان ئەم ماوەیەش بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤێك لە زۆر ڕووەوە تێکبشکێنرێت و ئینجا جارێکی تر بێتەوە نێو کۆمەڵ. **(...چاوێکی گێڕا بە دەوروپشتی خۆیا، یەکەم جار دوای دە ساڵ خۆی دییەوە بە تەنیا بە سەربەستی ئەڕوا بێ ئەوەی کەلەپچەی لە دەستا بێ و یاساوڵێ بە سونگییەوە لە پشتییەوە بێ پڕ بە سییەکانی هەوای پاکی هەڵمژی. زەردەخەنەیەکی تەنك، بۆ چاوتروکانێ، چارەی ترش و تاڵی ڕووناك کردەوە.)** (ژانی گەل، ل١٨) دەشێت ڕێك ئەم دیمەنە پێچەوانە بکەینەوە کاتێك کەسێك لە زینداندا ژیان بەسەر دەبات، تەنانەت خەوبینین بە ئازادی و سەربەستییەوە مەحاڵە، کەلەپچەکانی ئاوا بەندی کردوون بوونەتە بەشێك لە جەستەی شەکەت و پڕ ئازاری . لە نێو زیندانی و گرتووخاندا، دیاردەیەك باوە ئەویش بریتییە لە نامە و نامەکاری، کە بەم هۆیەوە زیندانییان دەتوانن پێوەندی بە دەوروبەرەکەیانەوە بکەن، لەوانەی لە دەرەوەی زینداندان، هەروەها

نامە و نامەکاری زیندانییان بەشێکی کەم لە ئازار و مەینەتییەکانیان کەم دەکات، هەر بە قەبارەی ئەم بەشە کەمەش دەتوانن گوزارشت لە هەست و نەست و سۆزی دابڕاویان بکەن. کەواتە دەتوانین بڵێین یەکێك لە هۆکارەکانی وەدیارکەوتنی ئەدەبی نامەنووسی و چەکەرەکردنی ژانرێکی ئەدەبی وەك نامەنووسیی زیندان و زیندانییانن، گەر نامە و نامەکاری لە ئێستای زیندانییاندا هۆکارێك بۆ پێوەندیسازی، ئەوا لە داهاتوودا نامە دەستنووسەکان دەبنە یاد و یادگاری و بیرەوەری **(خۆت ئەزانی کە مانگی جارێك لە بەندیخانە ماوەیان ئەدایین نامە بنێرین بۆ کەسوکارمان. منیش لە نووسراوی سەری مانگ بۆم نووسیبوویت کەوا لەم مانگەدا ڕزگارم ئەبێ، ئیتر بە تەواویش نەمئەزانی بۆ کوێ و کەی ئەمنێرن تا ئاگادارتان بکەم)** (ژانی گەل، ل١٢٢). لێرەدا زیندانییان لە ماوەی مانگێکدا تەنها یەك کەڕەت بۆیان هەیە گوزارشت لە خود بکەن و پەیامێك ئاڕاستەی بەرامبەرەکانیان بکەن، تەنیا هۆکاریش بۆ ئەمە بریتییە لە نووسینی نامەیەك و بەس، چونکە ئامانجەکانی نامە بریتییە لە (ئاشنایی و لێك حاڵیبوون و ناسیاوی و دۆستایەتی و خۆشەویستیی نێوان مرۆڤ و مرۆڤ، مرۆڤ و بەرامبەرەکانی و گواستنەوەی بیر و ڕا و ئایدیا و ئەندێشە و بۆچوون و زانیاری، کە دەکرێ سەرجەم ئەو چەمکانە لە (پەیام)دا چڕ بکەینەوە، کەواتە یەکێ لە ئامانجەکانی (نامە) گەیاندنی پەیامە.)[٢٨] بۆیە جێی خۆیەتی بڵێین پێوەندییەکی بە تین هەیە لە نێوان ئەدەبی زیندانی و ئەدەبی نامە نووسی، ئەم پێوەندییەش کاتێك دەگاتە چڵە پۆپە کە زیندانیکراو و گیراو کەسێکی خوێندەوار و ڕۆشنبیر بێت، ئەگینا مەرج نییە ئەم پێوەندییە بسازێت . لە زیندانەکاندا، دەشێت هەندێك شت و دیاردە و بابەت و ڕەفتار....هتد بە بەراورد بە ژیانی ئاسایی ئاوەژوو ببنەوە، بێگومان ئەم ئاوەژووبوونەوەش بە خواستی زیندانییەکە نییە، بەڵکو جەللاد و میر غەزەبەکان ئەم. جۆرە ژیانە بۆ کەسەکان هەڵدەبژێرن. بۆ نموونە وەك لە پێشتردا ئاماژەمان پێدا (جوامێر) وەك مرۆڤێك و بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی زۆر ئەستەمە بە تاقی تەنیا و لە ژوورێك ژیان بگوزەرێنێت، کەچی کاتێك دێتە سەر ئەوەی هەڵسێت بە ئەنجامدانی کردەی خۆشوشتن، ئەوا نابێت بە تەنیا بچێتە گەرماوەکە خۆی بشوات، بەڵکو دەبێت لەگەڵ دوو کەسی تر بچن لە گەرماوە کەلاوەکەی

زینداندا خۆیان بشۆن، و ئەم خۆشوشتنەی هەرسێکیشیان لە پێنج خولەك زیاتر نەخایەنێت، لە کاتێکدا هەموو ئامرازەکانی گەرماوەکە تەنیا بۆ کەسێك دانراون. **(دوو سێ قوتوو ئاوی گەرمیان تێکرد و کەوتنە خۆشتن. لە یەك کاتا ئاو بکەن بە خۆیانا کردیان بە نۆرە تا دووانیان کەفەکەیان لەسەریان کردەوە.... ئەمانە لەم حاڵەدا بوون، هێشتان دەستیان لە لەشیان نەدابوو کەوا بۆنی چڵك و ئارەقیان پیاوی گێژ ئەکرد، لە پڕکابرای یاساوڵ بە خۆی و قامچییەکەیەوە کردی بە ژوورا و شیڕانی بە سەریانا: ئەوە چییە هێشتا لێ نەبوونەوە.... کابرای یاساوڵ دایە قاقای پێکەنین بە قەمچی و شەق و پاڵەپەستۆ هەرسێکیانی پێش خۆی دا بۆ ژووری سارد! ڕوانییان سێ بەدبەختی تر خۆیان ڕووت کردۆتەوە بە دڵی خۆش و ڕووی گەشەوە چاوەڕوانی خۆشتن ئەکەن)** (ژانی گەل، ل٣٢) . لە زینداندا مرۆڤەکان هەم ئازاری جەستەیی و، هەمیش ئازاری ڕۆحی دەدرێن ، بۆیە فەرماندار و بەرپرسانی زیندان کار لە سەر ئەوە دەکەن هەر شتێك ئازار و ژانی تێدا بێت بە سەر زیندانییەکان تاقیدەکەنەوە، لە هەمان کاتدا لێپرسراوانی زیندان و بەشێك لە دەست و پێوەندەکانیان وەك سادیزمێك ڕەفتار دەکەن و چێژێکی ئێجگار زۆر لەوە دەبینن ئازاری بەرامبەرەکەیان بدەن و، لە ڕێی ئاکار و هەڵسوکەوتە نابەجێیەکانیان زیندانییان لە هەموو ڕوویەکەوە گیرۆدە بکەن. **(....پێنج پێنج وەکو مەڕ لە ناو حەوشەدا مۆڵیان ئەکردن لە بەردەمی ژووری فەرمانداری زیندانەکە، هەروەکو ئێستەش هاوڕێکانی مۆڵ کراون و بە چیچکانەوە دانیشێنراون. هەی چە کافر بابێکن! جاری وا هەیە سەعاتێك زیاتر ئەو خەڵکە بەو چەشنە ئەهێڵنەوە بە بێ ئەوەی یەکێ بوێرێ بار بگۆڕێ. وای بە حاڵی ئەو کلۆڵەی پێی شل ئەبێ، دەست ئەخاتەسەر یا دائەنیشێ، مەردیانێکی چەتەوڵ بە قەمچی دای ئەگرن، بگرە کوێت یەشێ!)** (ژانی گەل، ل٣٣). ڕۆماننووس ڕێك وشەی (مۆڵکردن)ی بەکارهێناوە، بێگومان ئەمەش لە نێو ئاژەڵداران وەك زاراوەیەك بەکاردەهێنرێت، کە بە واتای شوێنی پشوودانی گاڕان، یاخود ئەو جێگەیەی کە گا و گۆڵ لە یەکتر نزیکدەبنەوە کەواتە زیندان شوێنێکە بۆ ئەوەی مرۆڤەکان دابماڵدرێن لە بەهایە جوانەکانی مرۆڤایەتی، و کۆی ئەم بەهایانەیان لێ بسەندرێتەوە و، وەك ئاژەڵێك ڕەفتاریان لەگەڵدا بکرێت و بە ئاژەڵبکرێن . هەندێك

جار وا ڕێکدەکەوێت دەسەڵاتی داگیرکاری کاتێك کەسێك، یاخود کەسایەتییەکی سیاسی و شۆڕشگێڕ و خەباتگێڕێك لە زینداندا ئازاد دەکات چەند ئامانج و مەبەستێکی گڵاوی خۆی تێدایە، دەیەوێت لە ڕێی بۆشکردنی شوێنی زیندانییەك، شوێن بۆ چەندین زیندانیی تر خۆش بکات. بۆیە باروودۆخێکی ئاوا (جوامێر) هەمیشە دەخاتە گومان و دڵەڕاوکێوە و پێیوایە بۆ ئەوە ئازاد بووە تا خەڵکانی تر لە ڕێی ئەمەوە زیندانی بکرێن. (**...زۆرجار دێت بە بیرما کە منیان بۆیە وا سووك و ئاسان هێناوەتەوە ئێرە و لێرەش بێ چاودێرییەکی پێویست بەرەڵڵایان کردووم بۆ ئەوەی بمکەن بە تەڵە و بە خەیاڵی خۆیان خەڵکی سەر بە شۆڕشم پێ بگرن!**) (ژانی گەل، ل٦٥) . لێرە و لەوێ لە ئێستادا و لەو سەردەمانەی دواییدا، زاراوەی (بەندیخانە) و زاراوەی (چاکسازی) وەك هاومانای یەکتر بەکاردێن، بەمەش ئەو ناخۆشی و ناسۆری و ناجۆرییانەی کە لە نێو زاراوەکانی (زیندان و گرتووخانە و بەندیخانە) بوونیان هەیە بەهۆی بەکارهێنانی زاراوەی (چاکسازی) لایەنە نەرێنییەکانی ئەم شوێنە سووکتر و کاڵتر خۆیان دەنوێنن، دەشێت زیندان، بۆ زۆربەی زیندانییان بە خاڵی وەرچەرخان دابنرێت، بەڵام ئەمانە هەرگیز بە دی ناکرێت لە زیندانێك، کە دەسەڵاتێکی داگیرکاری سەرپەرشتی بکات و بەڕێوەی ببات، چونکە زیندانی ئەم چەشنە زۆردارانە سادەترین و بچووکترین پێداویستی ژیانی تێدا نابینرێت، ئینجا چ جای ئەوە دەکات لە زیندانەوە بۆ چاکسازی بگۆڕدرێن. (**ئەوەی ڕاستی بێت بەندیخانە نە ژیانی تیایە وە نە ڕابواردن....تەنیا ڕۆژ کوشتن و ساڵ ناشتنی تیایە و بەس. ڕەنگە هەندێ پیاوچاك و دڵپاك لایان وابێت بەندیخانە باشکردنخانەیە. تاوانباری تیا پاك ئەبێتەوە ڕەوشتی خوار و بیری چەوتی تیا ڕاست ئەکرێتەوە! بەڵام ئەوی من دیم هەر بە تەواوی پێچەوانەی ئەمەیە و ئەوانەی بەندیخانەشیان بە دەستە لام وایە هەر بۆ تۆقاندن و ئازاردانی خەڵك دایان ناوە، ...کەوا هەر لەو ڕۆژەوە بەندی تیا ئەدرێتە دەستیان نیازیان ئەوەیە بە هەموو جۆرێك کەڕامەتی بپلیشێننەوە و گیانی بپەستنەوە بۆ ئەوەی هەتاهەتایە هەر سەرشۆڕ و ملکەچ بێت**) (ژانی گەل، ل٦٨). بێگومان گەر مەدلوولەکانی (زیندان) لە چوارچێوەی (چاکسازیی)دابن، بە هەموو پێودانگێك زیندانیی کەسێکە گوناه و کەتن و تاوانێکی ئەنجامداوە، بۆیە دەبێت لە ڕێی ئەم

دامەزراوەیەوە هەوڵی ئەوەی لەگەڵدا بدرێت بۆ ئەوەی ببێت بە کەسێکی ئاسایی و چاکەخواز. ناخۆشی و ئازارەکانی زیندانییان ئەوەندە بە سوێ و کاریگەرە کە هاوتای ئەم ناخۆشی و ئازار چەشتنە لە هیچ پنتێکی ژیان هەستی پێناکرێت، مەگەر لە زیندان و بەندیخانەکانی ستەمکاران نەبێت. بە چەشنێك زیندانیکراو لە ڕێی پاشماوەکانی خۆیەوە ڕووبەڕووی ئازارێکی سەخت و گران دەبێتەوە.(.. **لە جێی خۆم هەڵترووشکاوم، تەڕایی زۆری بۆ هێنام . لێرەدا بۆ یەکەم جار هات بە بیرما کە ئەبێ ئەو تەنەکەیەی پێم بەری کەوت میزی تیا بووبێت، چونکە بۆن میزێکی پیس لە ژوورەکە ئەهات. ئەوەندە قێزم هاتەوە وەختە بوو بڕشێمەوە)** (ژانی گەل، ل١٠٥). زیندانییەك لە ڕێی پاشماوەی زیندانییەکانی تر ئازار دەدرێت، یاخود هەر ئەو زیندانییە بە هۆی پاشماوەی خۆیەوە ئازار دەچێژێت بە چەشنێك نازانێت ئەو پاشماوە و پیساییەی، کە تەنگی پێهەڵچنیوە لە نێو هەناویدا بیهێڵێتەوە، یان خۆی لێ ڕزگار بکات . (جوامێر)ی زیندانییکراو، کاتێك داوای پێخەف و چرایەك دەکات لە پاسەوانی بەندیخانەکە، ئەوا نەك ئەمانەی بۆ ناهێنرێت، بەڵکو پاسەوانەکە سووکایەتیشی پێدەکات، بە تەوس و گاڵتەجاڕییەوە پێیدەڵێت: (**–بەڵێ! ئەی چۆن هەر ئێستە کچێکی جوانیشت بۆ نەهێنن لەو خوشکانەی بە ناوی نیشتمانپەروەری و ئازادیخوازییەوە ئابڕوویان ئەبەن!)** (ژانی گەل، ل١٠٦). داگیرکەران و خاوەنی زیندانە تاریك و نووتەك و ئەنگوستە چاوەکان، پێیانوایە نیشتمانپەروەر و ئازادیخواز و خەباتگێڕ و شۆڕشگێڕانی ڕاستەقینە هەر خەریکی ئەوەن ئافرەت بێنن و ببەن و بە ناوی نیشتمانپەروەری و ئازادیخوازی دەستدرێژییان بکەنە سەر و ئابڕوویان ببەن، لە کاتێکدا ئەوان باش دەزانن لە مەیدانی هەوڵ و تێکۆشان و خەبات و قوربانیدان هیچ جیاوازییەك بەدی ناکرێت لە نێوان ئافرەت و پیاواندا . ئەو خواردنەوە و خواردنەی بە زیندانیی و بەندکراوان دەدرێت، لەباتی ئەوەی تێنوویێتییان پێبشکێنێت و تێریان بکات ئەوا بە هۆی خراپی و نادروستییانەوە تێنووتر و برسیتریان دەکات. **(نەمزانی چێشتەکە چییە، نەختێ دەستم تیا گێڕا بە نیسکێنە یا ماشێنەی تێ گەیشتم، کەوچکێکم برد بۆ دەمم، هێشتا لێم نەچەشتبوو بۆن نەوتێکی لێ ئەهات پیاوی کاس ئەکرد)** (ژانی گەل، ل١٠٦). لێرەدا (نەوت) هەمان

ئەرکی سووتانی هەیە، بەس جیاوازییەکەی لەوەدایە لـە جێـی ئـەوەی ئـەم نەوتـە ڕووناکی و گەرمی ببەخشێت و، بکرێتە نێو ئامرازی ڕووناککەرەوە و گەرمکـەرەوە ، کەچی دەکرێتە نێو جەستە و گیـانی مرۆڤـەوە بێگومـان گـڕ لـە دڵ و دەروون و جەسـتەی زیندانییەکـە هەڵدەسـتێنێت . هێنـدە گومـان و سـیخوڕی و شـۆفاری بەسـەربەندی و زینـدانییان دەکرێـت، تـا وای لێـدێت لـە نێـو خۆیانـدا بەنـدی و زینــدانییان بکەونــە گومانــەوە هــەر یــەکێکی هاتــە لایــان کــە لــە ســەرەتادا نەشیانبینیوە و ناشیناسن بە شۆفاری لە قەڵەم بدەن. **(شەو بوو چراکەم کز کردو لە پڕ دەرگاکە کرایەوە و زەلامێکیان هاویشتە ژوورەوە وتیان: ئەوەش هاودەنگ بۆ خۆتان ڕابوێرن.**

**وتم هاویشتیانە ژوورەوە نەك هەر لەبەرئەوەی پاڵیان پێوەنا، لەبەرئەوەش کە وەك پەلاس کەوتە زەوی، چراکەم هەڵکردەوە لـە کـابرای هـاودەنگم چـوومە پێش ، گوێم لە مشەمشی بوو زانیم کە نەمردووە، بە بیرما هات ئەمە جاسـووس نەبێت بە فێڵ هێنابیانەتە لام بۆ ئەوەی قسەم لێ دەربهێنێ)** (ژانی گـەل، ل١١٠). وا هەست دەکرێت گومـان بـاڵی کێشـابێت بـە سـەر دڵ و دەروون و بیرکردنـەوە و ڕەفتـاری زینـدانییان، تەنانـەت لـە هـاودەنگ و هاوخەباتیشـیان گومـانی خـراپ دەکەن، و کەوتوونەتە دۆخێکی ئەوهاوە و باوەڕێکی ئاوایان لە لا دروست بووە کە بەرد و دار و دیوار گـوێی بـۆ قسـە و ئاخاوتنـەکانی ئـەوان ڕادێـراوە و شـۆفاری و هەواڵگری بەسـەریانەوە دەکـەن. دوژمنـان و داگیرکـەران کاتێـك خـاکی میللـەتێك داگیر دەکەن و تەنگ بە خەڵکەکەی هەڵدەچـنن، زینـدان و بەندیخانـەکان دەبێتـە شوێنکاتێکی سـەخت و دژوار بـۆ ئـەوەی خەباتکـەر و شۆڕشـگێڕانی تێـدا گومنـاو بکەن و لە خەڵك و کەس و کاریان بشارنەوە و شـوێنبزریان بکـەن. **(....ئەوانـەی هێنرابوون بۆ ژوورەکەی ئێمە، پـیرۆت و بـاوەیس و مـەریوان، سـێ سـەرکردەی قارەمانی پارتین. دڕندە جانەوەرەکان حوکمی هەڵواسینیان داون، ئێستەش بەم شەوە هێناویانن بۆ ئەو زیندانە کە لە سەرێکەوە لە کۆمەڵانی خەڵك بیانشارنەوە و لە سەرێکی کەشـەوە لـە شـوێنێکی قـایمی نهێنیـدا بەنـدیان بکـەن. تـا ڕۆژی هەڵواسینیان)** (ژانی گەل، ل١١٤). ئەوەی سەرکردەی خەباتکەر و شۆڕشگێڕان بێت کاتێـك دەستبەسـەر دەکرێـت و دواتـر بـۆ هەمیشـە لـە زیندانـدا دەهێڵدرێتـەوە،

دوژمنان و داگیرکەرانی وڵات و نەتەوە دڵیان هەر بەمە ئاو ناخواتەوە، بەڵکو تا ئەو سەرکردە خەباتکەر و شۆڕشگێڕانە لە زیندانە ئەنگوستەچاوەکان و سەختەکان لە سێدارە نەدەن واز ناهێنن، دەیانەوێت لە ڕێی هەڵواسین و لە سێدارەدانی سەرکردەکان کۆتایی بە ڕاپەڕینەکان بهێنن و گڕ و کڵپەی شۆڕش خامۆش بکەن و دایبمرکێننەوە. (جوامێر) و هاوڕێکانی زیندان و دەرهاویشتە هەرە خراپەکانی زیندان دەبێتە بەشیان، کەچی لەولاوە خەڵکانێك لە ڕێی شۆفاری و سیخوڕی و ماستاوچێتی و مەراییکەرییەوە پلە و پۆست وەردەگرن لە کاتێکدا نەخوێندەوارن بە هیچ شێوەیەك شایەنی ئەوەنین ئەم شوێنە هەستیارانە بە پلە و پۆستەکانی ئەمان پڕ بکرێنەوە، سەرەڕای ئەمانەش دەکرێت ئەم جۆرە کەسانە لە سەر حسێبی شەرەف و ناموسی خاوخێزانیان، یاخود کەسانی تر لەم شوێنانەدا خۆیان قایمتربکەن **(سەیرە! ژنەکەی و ئەڵێ مەجید ئێستە مودیری بانقە. تێ ناگەم لە کاتێکا ماڵ نییە یەکێکی گیراو یا کوژراو یا هەڵاتوو نەبێ، نەخوێندەوارێکی وەکو مەجیدی خزمم چۆن ئەکرێت بە مودیری بانق؟ بێگومان جاسوو‌ییان بۆ ئەکات. ئەی چی! هەر ئەبێ وابێت! وەسمان کەوا هێشتا هەر سێبەری بزە مانادارەکە بە سەر لێویەوە مابوو، سەری داخست و دیسانەوە هیچ قسەی نەکرد. جوامێر بە سەرسوڕمانێکەوە وتی:**

**— ئەوە چیتە هیچ قسە ناکەیت، بزانم دەمت بوو بە تەڵەی تەقیو، چییە، لە بەر جاسووسی نەکراوە بە مودیری بانق، ها؟ وەسمان زۆر لە سەرخۆ وتی: — نەو! — ئەی لەبەرچی؟ کەواتە ئەیزانیت.**

**— لەبەر گەوادی، قوربان! ئەم قسەیەی وەکو تێسکەی تفەنگ هاویشت و لێی دا ڕۆیشت.**

**کە جوامێر کەوتە ڕێ بەرەو ماڵی پوورە خەجاوی هەر سەری با ئەدا. لە پاشا بە ڕقێکەوە تفێکی کردە ئەرزەکە و وتی: — کەریمی هاوڕێی بەندیخانەم بە درۆی نەبوو کە هەمیشە ئەیوت: (ئەمڕۆ ڕۆژی گەوادە...!)** (ژانی گەل، ل١٢٩، ١٣٠). بەندی و زیندانییان، دوای ئازادبوونیشیان لە زیندانی داگیرکەران هەمیشە گیر دەخۆن بەو ڕۆژگارەی، کە بە ناخۆشی و ئازاردان بەسەریانبردوون، نەهامەتی و بەدبەختی و کڵۆڵی دیسانەوە دوای ئازادبوونیش ژیانیان لێ داگیر دەکات وەك

دەڵێن: (بەردێك لە ئاسمان بەردەبێتەوە بە سەری ئەوان دەکەوێت). لە هەمووی بە ئازارتر و بە سوێتر زیندانییەك دوای چەندین ساڵ ژیان بەسەربردن لە کونجە تاریکەکانی بەندیخانە کاتێك ڕزگاری دەبێت لە چنگی داگیرکەران و بە مەبەستی سۆراغی ماڵ و منداڵەکانی ڕێیەکی دوور دەگرێتەبەر، لەلایەن شۆڕشگێڕان بە شۆفار و خۆفرۆش لە قەڵەمدەدرێت و ، گومانی ئەوەی لێدەکەن نۆکەرێکی داگیرکەربێت و ئامانجی ئەوە بێت هەواڵگری بە سەر شۆڕشگێڕانەوە بکات، بۆیە شۆڕشگێڕانیش هەڕەشەی کوشتنی لێدەکەن **(هیچ مانای نییە گوێ بگرین لەم قسە قۆڕانە. ئێستە لای من هیچ گومانی تیا نەما کە ئەم کابرایە جاسووسە. ئەڵێن کورد بدوێنە شەرعی خۆی ئەکات! ئەڵێ بەندی بووم تازە بەردراوم، بۆیە بەردراوە کە جاسووسی بۆ میری بکات. ئەگینا چ بەندییەکی خۆنەفرۆشی نیشتمانی هەیە دوای دە ساڵ زیندان میری بیهێنێتەوە بۆ ئێرە، بۆ ناو جەرگەی شۆڕش! یاڵڵا دەی ئەیبەن بیبەن و ئەیکوژن بیکوژن).** (ژانی گەل، ل١٥١).

لە دواجاردا (جوامێر)ی نێو زیندانەکانی داگیرکەر دوای ئازادبوونیشی زیندان و بەندیخانە دەبێت بە بەشی، بۆیە ئەمجارەیان لەلایەن شۆڕشگێڕانەوە دەگیرێت و زیندان و بەندیخانەکانی شۆڕشگێڕانیش بەسەردەکاتەوە و تاقیدەکاتەوە، وا خەریکە دادگایی بکەن و لێکۆڵینەوە و توێژینەوەشی لەگەڵ ئەنجامبدەن **(....تۆ پێم بڵێ کەی پرسیارم لێ ئەکەن و ڕزگارم ئەکەن؟ بەشکو بچم هەواڵێکی ئەو منداڵەم بزانم. خێرتان ئەگات لە ڕێ ی خودادا خۆ ئێوە کوردن! کوڕەکە بەبێ ئەوەی نقە بکات چووە دەرەوە و دەرگاکەی لە پشت خۆیەوە داخستەوە. جوامێر خەنجەرت لێ بدایە خوێنی لێ نەئەهات. کەچی ئەوەندەی پێ نەچوو کوڕەکە گەڕایەوە هەروا لە دەرگاوە پێی وت:**

**– پرسیم ئەڵێن دوو ڕۆژی تر لێکۆڵەرەوە دێت بە تایبەتی بۆ مەسەلەی تۆ، ئەگەر ئەو نەهات تۆ ئەنێرین بۆ لای)** (ژانی گەل، ل١٥٤). (جوامێر)ی کارەکتەری سەرەکیی ڕۆمانی (ژانی گەل) بۆتە مرۆڤێك هیچ بستێکی ئەم زەمینەی دنیا پان و بەرینە لە خۆی ناگرێت، تەنیا و تەنیا زیندانەکان نەبێت، جا ئەو زیندانەی کە ئەوی تێدا بەند دەکرێت دژی ڕەوتی ئەو بێت، یاخود لەگەڵ ڕەوتی ئەو دا بێت. دەشێت بڵێین: ئەمە گوزارشتە لە مرۆڤی کورد، یا لە نەتەوەی کورد کە بە

درێــژایی قۆناغــەکانی مێــژوو ئــازار و چەرمەســەری زۆری بینیــوە و بــەردەوام داگیرکەران ڕووبـەڕووی چارەنووسـێکی سـەخت و ڕەشـیانکردۆتەوە، هەمیشـە لـە هەوڵی ئەوەدا بووینە بە هیچ شێوەیەك بـەخت و تـاڵعی یـاوەری نـەبێت و، بـەرەو هەڵدێری بەرن و لە هیچ شوێنکاتێکدا نەگیرسێتەوە و بێئـۆقرەیی ببێتـە بەشـێکی زۆر لە ژیانی. زیندانییەکان دوای بەندکردنیان لە لایەن دەسـەڵاتی داگیرکەرانـەوە کۆمەڵێك شتیشیان لـی ّزەوت دەکرێـت و دەسـتی بەسـەر دادەگیرێـت و لـە لایـەن میرییەوە گلدەدرێنەوە. سەرەڕای لە کۆمـەڵێك مـافی مەعنـەوی بێبـەش دەکـرێن، لەگەڵ ئەوەشدا مافە ماددییەکانیشان لێدەسەنرێتەوە. **(بەیانی کە جوامێر چـووە بنج و بناوانی مەسەلەی جیّ خانووەکەی بۆی دەرکەوت ئەو حیجـزەی خراوەتـە سەری لانەبراوە هێشتا. ئەویش بە بێدەنگ ئەرز و حاڵێکی دا بە کاربەدەستان تیا نووسی، کەوا لەبەرئەوەی ماوەی زیندانیکردنی تـەواو کـردووە داوا ئـەکات کـە حیجز لە سەر شوێن خانووەکەی لابرێت بە تایبەت کە ئەیەوێت بیفرۆشێت و لەم شــارە بگوێزێتــەوە بــۆ یــەکیّ لــە شــارەکانی خــوارووی وڵات، وە داوای لــە کاربەدەستان کرد کە ئەوان بە ئارەزووی خۆیان شوێنەکەشی بۆ دیـاری بکـەن)** (ژانی گەل، ل١٧٣). تەنانەت زیندانییەکان مافی ئەوەیان نییە بە ویست و بژاردەی خۆیـان ڕووبـەرێکی دیـاریکراوی بچـووکی وڵاتەکەشـیان بـۆ گوزەرانـدنی ژیانیـان هەڵبــژێرن، مەگــەر بــە ڕەزامەنــدی دام و دەزگاکــانی شــۆفاری و هــەوالگری و ئاسایشییەکانی داگیرکەران نەبێت . زیندانییانی سیاسی، یاخود ئەو زیندانییانـەی کە تۆمەتی سیاسییان بـۆ هەڵدەبەسـترێت و لـە تـەك ئەمەشـدا کۆمـەڵێك تۆمـەتی تریان دەخەنە پاڵیان، لە سەروبەندی گیران و بەندکردنیان بۆ ماوەیەکی نادیار لـە لایەن فەرماندارانی زیندانەوە دیتن و دیدار و چاوپێکەوتنیان لێقەدەغە دەکرێـت و ، هیچ کەس بۆی نییە بیانبینێت و سۆراغیان بپرسێت، لەمەش خراپتر هـیچ کـەس نازانێت شوێنی زیندانەکەیان دەکەوێتە کوێی قەڵای سەختی داگیرکەرانـەوە. **(کـە تۆ گیرایت کەس نەیزانی لە کوێیت وچیت بەسەرهاتووە. لە پاش شـەش حـەوت مانگێك هەوڵ و تەقەلا و تکا توانیمان شوێن و بەندیخانەکەت بدۆزینەوە، ئەویش بە یارمەتی خزمێکی دووری دایکی داراوە کە لەو شارە قۆمیسەر بوو کە تۆی لیّ گیرابوویت. نەك هەر تۆشمان لە پاشملە پـیّ ناسـاند و دەسـتەبەر بـوو کـە هـەر**

**چۆنێك بێت نامەیەکمانت بگەیەنێتیٚ، چونکە ئەوسا قەدەغەبوو ماوەی کەسیان نە ئەدا پەیوەندیتان پێوە بکات)** (ژانی گەل، ل١٨٢). لە بارودۆخێکی ئاوادا هەر زیندانییەکە ئازارێکی سەخت و قورس نادرێت، بەڵکو خزم و کەسوکارەکەی و دەوروبەرەکەشی بەم هۆیەوە ئازار دەچێژن. زیندانییان بە هۆی ئەوەی هەر لە دنیای داخراوی نێو زیندان ژیان دەگوزەرێنن و بێئاگا و بێهەواڵن لە دنیای کراوەی دەرەوەی زیندان، گەلیٚ جار لە لایەن خزم و کەس و دۆست و خۆشەویستانیان قسەی ناڕاستیان بۆ دەنێرن ، بە واتایەکی تر زیندانییان لە لایەن کەسانی تری دەرەوەی زیندانەوە درۆی سپییان لەگەڵدا دەکرێت کە هیوا و ئاواتی گەورەی لە سەر هەڵبچنن ئەمەش بەو مەبەستەی لە شوێنێکی وێرانەی وەك زیندان زێتر ناخۆشی و ئازار و ئێش نەچێژن و، هەر هیچ نەبێت بۆ ماوەیەکی کاتیش بێت ئەم درۆ سپییانە گیان بە بەریاندا بکات و، ورە بەرنەدەن و خۆڕاگریی زیاتر بنوێنن. **(کە هاتمە سەر نامە نووسین سەرم سوڕما چیت بۆ بنووسم؟ چ دڵخۆشییەکت بدەمەوە؟ چی هەیە پێت بڵێم و شێت و هارت نەکات؟... هات بە بیرما لەو شەوەزەنگەی ژیانت مۆمیٚ داگیرسێنم ترووسکایی بخاتە تاریکستانی زیندانەکەتەوە، هیوایەکت بدەمە دەست بە درێژایی ساڵانی بەندیخانە کاوێژی پێوە بکەیت و خەوی پێوە ببینیت، هیوایەك بۆی بمێنی و خۆتی بۆ هەڵگری. دامنا ئەوەت بۆ بنووسم کە نووسیم (کاڵیٚ کوڕێکی جوانی ئێسك سووکی بووە ناومان ناوە هیوا) ئەمە سەرەتای درۆکەم یان درۆی یەکەمم بوو)** (ژانی گەل، ل١٨٢). ئەم جۆرە درۆیە و چەندین درۆی تری سپی لەگەڵ زیندانییان دەکرێت، بەڵام ئەمانە چارەسەری یەکجارەکی حاڵی زیندانی ناکەن، بەڵکو ئەم درۆیە سپییانە لە داو و دەرمانێکی ئازارشکێنی کاتی دەچن . بۆ نموونە (جوامێر) ی زیندانیی لە ماوەی دە ساڵی مانەوەی لە زینداندا هەر بە خێزانەکەی (کاڵیٚ) و منداڵە هەر نەبووەکەی (هیوا)، چرکە و خولەك و کاتژمێری پێکەوە ناوە و، شەو ڕۆژی لیٚ بووەتەوە، لە کاتێکدا ئەمانە ماڵئاوایی یەکجارەکیان کردووە و ئەمیش وێڵە بە دوای ئەم ماڵئاواییەوە. کاتێك خێزانەکەی (جوامێر)ی زیندانیکراو ژانی منداڵبوون دەیگرێت، وا ڕێککەوتووە ئەوەی گەلیش ژانی گرتووە بۆ ئەوەی هیوا و ئازادی بەر بگرێت و خۆپیشاندان و ڕاپەڕین سەرلەبەری شاری تەنیوەتەوە، بۆیە

چـــارەڕەش و شـــوومیی (جـــوامێر) لەوەدایـــە دەکەوێتـــە نێـــو ئـــاپۆڕەی خۆپیشاندەرانەوە، ئەم بۆچی هاتووە؟ تووشی چی بووە؟ ئەو بە دوای کورتترین و ئاسانترین ڕێگەدا دەگەڕێت بۆ ئەوەی مامانێك بهێنێـت خێزانەکـەی نەجاتبـدات، کەچی ژانی گەل و ژانی خێزانەکەی لە دڵیدا دەبێتـە خـەم و کەسـەرێکی گـەورە، داگیرکەران نە دەهێڵن گەل هیوا و ئازادی و سەربەسـتییەکی لـەم ژانـەدا بووبێـت، نە دەشهێڵن خێزانەکەی هیوایەکی ببێت، چونکە (جوامێر) لەم چرکە ساتە ناسـك و هەستیار و پڕ لە سۆز و کوڵە بە گوللەیەکی وێڵی داگیرکەران دەپێکرێت و دواتـر برینـــدار دەبێـــت و ئینجـــا بـــە برینـــداری بـــۆ ژووره تاریکـــەکانی لێکۆڵینـــەوە و توێژینـــەوەی دام و دەزگـــا شـــۆفارییەکانی داگیرکـــەر دەبردرێـــت و، حوکمـــدان و حوکمکردنی بۆ ماوەی دە ساڵ لە یەکێك لە قەڵا سەخت و دژوارەکانی دوژمنـان و داگیرکەران دەبێت بە بەشی ژیانی. **(بەڵێ کاکە جوامێر کاڵێ مرد، بەڵام بـە سـەر منداڵەوە، خۆی و کوڕەکەی هـەر ئـەو ڕۆژە مـردن کـە تـۆی تیـا برینـدار کرایـت. بێگومـان گوناهکـاری گـەورە و سـەبەبکاریش لـە مردنیانـا ئـەو دوژمنـە زۆردارە خوێنخۆرەیە کە تۆی بە ناهەقی ناگوناه بریندار و حەپس کرد و ئەوانی بەو حاڵە هێشتەوە و هاتوچۆی تیا قەدەغە کرد).** (ژانـی گـەل، ١٨٣ دوا لاپـەڕە). بێگومـان گیان و جەستەی هەموو هاونیشتمانییانی نیشتمانێك بـە یـەکترەوە شـەتەکدراوە، پێکانی یەکێکیان زیان بە ئـەوانی تـر دەگەیـەنێت و، بـە شـێوەیەك لـە شـێوەکان دەیانپێکێت جا ئەم پێکانە دەستە جەمعییـە ڕاسـتەوخۆ بێـت، یـان ناڕاسـتەوخۆ، زووبێـت، یـاخود درەنـگ، کـاری خـۆی دەکـات و لێکەوتـە و جێکەوتـەی خـراپ ئەنجامەکەی دەبێت. بۆ نموونە سەرەڕای ئەوەی (جـوامێر) بۆتـە نیـوە مـرۆڤ بـە هۆی برینداربوون و ئازار و ناسۆرییەکانی زیندان و دواتر چـاودێریکردنی لـە لایـەن دوژمنانەوە، خێزانە دوو گیانەکەشی ، گیانی (کاڵێ)ی خێزانی و گیانی کوڕەکـەی (هیوا) هەر نەبوو، دەبنـە قوربـانی سـتەم و زۆرداری و دڵڕەقیـی لـە ڕادەبـەدەری نامرۆڤانەی داگیرکەران. بۆیە جێی خۆیەتی بڵێین ژانی دایکێـك ئەوەنـدە قوربـانی گەرەك بێت، ئاخۆ دەبێت ژانی گەلێکی هەمیشە چەوساوە چـەند کـەڕەت بـە قـەد ژانی ئەم دایکە قوربانی پێویست بێت.

**ئەنجام**

• بە شێوەیەکی گشتی لە ڕابردوودا، کە چەمکی زیندان و زیندانییان باسیان لێوەکراوە لەلایەن لێکۆڵەر و ڕەخنەگرانەوە ئەم دوو چەمکە تەنیا بە چەمکی (شوێن)ەوە پەیوەستیان کردوون ، وەك پێویست بە چەمکی (کات)ەوە پەیوەستیان نەکردووە، کەچی هەم (زیندان) و هەمیش (زیندانیی) بەشوێنکاتەوە شەتەکدراون.

• کە باس لە بەرهەمی ئەدەبیی زیندان دەکرێت مەرج نییە ئەم بەرهەمە ئەدەبییە تەنیا لە نێو زیندانەکاندا نووسرابن و ئەدیبەکەش دەبێت ئەم ئەزموونەی دیبێت و ئەم قۆناغەی بڕیبێت، بەڵکو هەندێك جار بەرهەمە ئەدەبییەکە ئەو کاتە بەرهەم دەهێندرێت، کە ئەدیبەکە لە زینداندا ڕزگاری بووە و لە قۆناغی دوای زیندان بەرهەمەکە دەنووسێت، کاتێك ئەدیبێکیش زیندانی نەکرابێت ئەمەی ئەوە ناگەیەنێت، کە ئەم ئەدیبە ناتوانێت خۆی لە قەرەی بابەتێکی ئاوادا بدات، بەڵکو ئەمە شتێکی خودییە و دەوەستێتە سەر توانا و بڕستی ئەدیبەکە کە چۆن دەتوانێت دەست و پەنجە لەگەڵ بابەتە جیاوازەکان نەرم بکات و لە بەرهەمەکەی بیمەزرێنێت و ڕەنگی پێبداتەوە.

• زیندان شوێنکاتێکە گوزارشت لە هەموو ناخۆشی و ناسۆری و نەهامەتی و نائومێدی و ئازارەکانی ژیانی مرۆڤ دەکەن بە واتایەکی تر هەموو سەختی و دژوارییەکان لە ژیانی زیندانییاندا چڕ دەکرێنەوە، بەڵام بەشێکی زۆری ئەدیبان لە توانایاندایە ئەم بارودۆخە تەواو نەرێیە، بە بارودۆخێکی ئەرێنی بگۆڕن و زیندان بکەنە خاڵی وەرچەرخان و هەستانەوە و سەرکەوتن هەم بۆ خۆیان و هەم بۆ نەتەوەکەیان.

• ئەو ئەدیبانەی کە لە بارەی زیندانەوە بەرهەمیان هەیە، کەم تا زۆر ڕۆڵی گرنگ و پڕ بایەخیان لە هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵگەی کوردی بینیوە، ئەو واقعە تاڵەی کە مرۆڤی کورد چەشتوویەتی لە سەر دەستی داگیرکەر و ڕژێمە یەك بە دوای یەکەکانی عێراق، کە مرۆڤی کوردی هەمیشە گیرۆدەی جەور و ستەم و زۆرداری کردووە.

● نووسەرانی کورد کاتێك بابەتی زیندان دەکەنە چەقی بەرهەمەکانیان و، تێڕوانین و بیرکردنەوەکانیان، ئەوا بۆ ئەوەی زێدەتر ئامانجەکان بپێکن و بە ڕوون و ڕەوانی گوزارشت لە خۆیان و نەتەوەکەیان بکەن، پەنایان بۆ ڕیالیزم بردووە و بێجگە لەم قوتابخانە ئەدەبییە پەنایان بۆ هیچ قوتابخانە و ڕێبازێکی دیی ئەدەبی نەبردووە، بێگومان ئەمەش زیاتر پەیوەستە بە سروشتی بابەتێکی پڕ هەستیاری وەك زیندان، کە سەرودەری لەگەڵ کۆمەڵێك بابەت و بواری دیی ڕیالیستی هەیە.

● کە باس لە زیندان دەکرێت، دەبێت هاوکات باس لە دەسەڵاتیش بکرێت، بەتایبەت دەسەڵاتێکی ستەمکارانەی پاوانخواز کە هیچ ڕووبەر و پانتاییەك ناهێڵێتەوە بۆ ئازادی ڕادەبرین و ئازادیی مرۆڤەکان ...هتد، بۆیە نە زیندان بێ دەسەڵاتێك دەبێت و نەدەسەڵاتێکیش بێ زیندان دەبێت، ئەم دەسەڵات و زیندانەش ترس و تۆقان و توندوتیژی و سزا بەسەر مرۆڤە بێگوناهەکاندا دەبەخشنەوە.

● ئەو مرۆڤەی لە پێناو ئامانجێکی بوێرانە زیندانیی دەکرێت، یاخود هەڵوێستێکی بە ئەمەکانەی لە پێناو نەتەوەکەی نواندووە، بە هەموو مانا و پێوەرێك کەسێکی قوربانیدەرە و دەست لە ملانێی مەرگ دەکات و گەلێ جاریش لە پێناو هێنانەدی ئامانجەکانی و نواندنی هەڵوێستە مرۆڤایەتییەکانی شەهید دەبێت.

● زیندانییان لە هەموو ڕوویەکەوە ئابلۆوقە دەدرێن و زۆربەی شتەکانیان لێ قەدەغە دەکرێت، بۆیە دەرچوون لە بارودۆخێکی ئاوادا زۆر ئەستەمە، بەڵام زیندانییان بۆ ئەوەی ئەم بارودۆخە ترسناکە تێپەڕێنن پێویستە پێبەپێ ئابلۆوقەکان بشکێنن و جێگرەوەیەك بۆ قەدەغەکراوەکان بدۆزنەوە.

● بە وردی لە ڕۆمانی "ژانی گەل"دا بڕوانین، دەبینین ڕۆماننووس توانیویەتی زۆر سەرکەوتووانە مەسەلەی زیندان و پرسی زیندانییان بەرجەستە بکات ، هەر لە سەرەتای دەستپێکی بەرهەمەکەیدا توانیویەتی دەرگایەکی گەورە لەم بارەیەوە بە ڕووی خوێنەر و ڕەخنەگراندا بکاتەوە.

● گەر ڕۆمانی "ژانی گەل" وەك یەکەمین ڕۆمانی کوردی سەیر بکەین دەتوانین لەم ڕۆمانەدا لە ڕووی ناواخن و بابەتەوە ئەم بەرهەمە بخەینە

چوارچێوەی ئەدەبی بەرگری و بەرەنگاربوونەوە و زیندانەوە، خودی ڕۆماننووسیش یەکێکە لە زیندانییانی سیاسی و دوای قۆناغی زیندانیکردن بە تێپەڕبوونی نزیکەی چارێکە سەدەیەك ئەم بەرهەمەی نووسیوە.

● ڕۆماننووس بەهۆی کاری سیاسی و ڕۆژنامەنووسی و خەباتگێڕی و شۆڕشگێڕییەوە ، خودی خۆی یەکێکە لە زیندانییان و ، بەدیاریکراویش زیندانیی سیاسی بووە .

● ئەو بەرهەمە ئەدەبییانەی لەبارەی زیندان و زیندانییانەوە نووسراون، گەلێکیان ڕەنگدانەوەی ژیانی خودی نووسەرانن ، بەمەش دەتوانین بڵێین بەرهەمی ئەدەبی بابەتی زیندان و زیندانییان بە چەشنێك لە چەشنەکان گوزارشتن لە ژیاننامەی خودیی .

● لەپاڵ بەرهەمە ئەدەبییەکانی بابەتی زیندان و زیندانییان ، بەرهەمی ئەدەبی نامەنووسی بوونیان هەیە ، بۆیە جێی خۆیەتی بڵێین شوێنکاتی زیندان خاڵێکی یەکتربڕە لەنێوان ئەو بەرهەمانەی لەبارەی زیندان و زیندانییانەوە نووسراون ، ئەو بەرهەمە ئەدەبییانەی دەچنە خانەی ئەدەبی نامە نووسییەوە .

**پەراوێزەکان:**

(١) هجوم علـى العقـل، آل جـور، د.نشـوى مـاهر كـرم الله، مؤسسـة العبيكـان و كلمـة، السعودية، ٢٠٠٩، ص٤٣.

(٢) الثورة والأدب، عطية سليمان عيسى، مطبعة المعرفة، مصر، ١٩٩٠، ص٢٦.

(٣) الحرب العالمية الأولى، نيل. م.هايمان، ترجمة حسن عويضة، هيئة أبو ظبي للسياحة والثقافة، مصر، ٢٠١٢، ص٢١٥.

(٤) الالتزام في الشعر العربي، أحمد أبو حاقة، دار العلم للملايـين، بـيروت، لبنـان، ١٩٨٩، ص٣٩٦.

(٥) لـذة القـراءة في أدب الروايـة، أيمـن الغزالـي، دار نينـوى للدراسـات والنشـر والتوزيـع، دمشق، سوريا، ٢٠٠١، ص١٩.

(٦) موسوعة العلوم السياسية، اسماعيل صبري وآخرون، جامعة الكويت، الكويت، ١٩٩٤، ص٤٧.

(٧) قطار التقدم، أ.د.عبدالكريم بكار، مؤسسة الإسلام اليـوم، الريـاض، المملكـة العربيـة السعودية، ٢٠١٢، ص٩.

(٨) أصول النقد الادبي، أحمد الشايب، مكتبة النهضة المصرية، الطبعـة الثامنـة، ١٩٩١، ص٢٤٢.

(٩) الأسس النفسية للابداع الفني في الشعر الخاصـة، الطبعـة الخامسـة، مؤسسـة الاقـلام، مصر، ٢٠٠٩، ص٢٤.

(١٠) في النقـد الادبـي، شـوقي ضـيف، دار المعـارف، القـاهرة، مكتبـة الدراسـات الادبيـة، ١٩٨٩، ص١٤٦.

(١١) الزمن في الادب، هانزمير هوف، ترجمة السـعد زروق، مؤسسـة سـجل العـرب، ١٩٧٢، ص٢٣.

(١٢) سيكولوجية أسير العرب، جان كازانوف، ترجمة عدنان سبحي وخليل شطا، سوريا، ١٩٨٣، ص٣٧.

(١٣) في النقد الادبي، د.إيليا الحاوي، دار الكتاب اللبناني، بيروت، لبنان، ١٩٩٠، ص٢٣.

(١٤) النقد والدراسة الادبية، حلمي مرزوق، دار النهضة العربية، بـيروت — لبنـان، ١٩٨٢، ص٥٩.

(١٥) في قضايا الشعر العربي المعاصر، محمود أمين وآخرون، ، تونس، ١٩٨٨، ص١٤٤.

(١٦) أسئلة الثورة، د.سـلمان العـودة، مركـز نمـاء للبحـوث والدراسـات، بـيروت، لبنـان، ٢٠١٢، ص٣٦.

(١٧) أالحبسيات في الشعر العربي، سكينة قدورة، جامعة منثوري، قستنطينة، الجزائر، ٢٠٠٦، ص٥.
(١٨) الصوت والصدى في القصة السورية الحديثة، عصمت الرياض، دار الطبعة، بيروت — لبنان، ٢٠٠١، ص٢٤.
(١٩) قضايا الشعر العربي المعاصر، ريتا عوض، المنظمة العربية للتربية والثقافة والعلوم، تونس، ١٩٨٨، ص١٤٢.
(٢٠) سنة الاولى سجن، مصطفى أمين، دار النشر اليوم، القاهرة، مصر، ٢٠٠٣، ص٢٤.
(٢١) شعر الاسر والسجن، بسيم عبدالعظيم عبدالقادر ابراهيم، مكتبة الخانجي، القاهرة، ١٩٩٥، ص١٢٨.
(٢٢) السلطة الثقافية والسلطة السياسية، علي أو مليل، بيروت، ١٩٩٨، ص٤٢.
(٢٣) أدب السياسة وسياسة الادب، سوزان بينكني شيتكيفيتس، ت: حسن البنا عزالدين والمؤلفة، ص١٣٩.
(٢٤) تاريخ الادب الاندلسي عصر الطوائف والمرابطين، احسان عباس، ط٩، دار الثقافة، بيروت، ١٩٩٢ ، ص٧١.
(٢٥) ژانی گەل، ئیبراهیم ئەحمەد، چ٥ ، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠، ل٥ ، ٦.
(٢٦) س.پ: ل٦.
(٢٧) دەستپێك لە چیرۆکی کوردیدا، ئارام سدیق، یانەی قەڵەم، سلێمانی، ٢٠١٢، ل٣١.
(٢٨) وتارناسی، سالار عوسمان، چاپخانەی دار المعرفة، بیروت ، لبنان، ٢٠٠٩، ل١٢٥.

## خلاصة البحث

ليس السجن عبارة عن جدران صلبة ومكان مغلق يجبر النزيل على عدم التحرك ويوقف نشاطاته ويعزله عن الواقع الخارجي فحسب، بل قد يصبح مدرسة لتربية النزلاء اجتماعياً ونفسياً وسياسياً وفكرياً، ويعدهم لمرحلة مهمة أخرى في تاريخ حياتهم سواء بعد اخلاء سبيلهم أو قبله.

وإلى جانب ذلك فإن للسجن مشاركة فعَّالة في انتاج ابداعات أدبية رصينة، فاستشعاراً بأهمية الأدوار الفاعلة للسجن في الحياة الخاصة والعامة وللوقوف على السمات التي يتميز بها أدب السجون في الرواية الكوردية، اخترنا هذا البحث تحت عنوان: ( تمظهرات السجن في رواية مخاض الشعب لابراهيم أحمد) إذ تحدثنا فيه عن مفهوم السجن والسجناء، تأثيرات السجن على الأدباء وانعكاسه في نصوصهم، السجن كمؤسسة سياسية وعسكرية وتجسسية مستبدة واستخدامها من أجل بقاء السلطات الجائرة والتنكيل بالأدباء. وأخيراً تناولنا السجن وتمظهراته في رواية مخاض الشعب بصورة تطبيقية.

## Abstract

Prison does not always mean staying behind bars. And prisoners cannot free themselves from mental and other activities as prison can be an educational place. It can also be the turning point of prisoner's life. On the other hand, prison plays a significant role in producing literary texts that may have a lasting impression on human thoughts.

This study entitled "prison implications in Agony of Nation's Ibrahim Ahmad novel" consists of two sections and four parts. It embraces: concept of prison and prisoners, the impact of prison on the literati and its reflection on their texts. The study also highlights how prison can become a political, military and spying place for the sake of maintaining an oppressive regime to silence the literati. Following this, prison and its implications in Agony and Nation novel will be practically presented.

# ڕەوتی گۆڕانکاریی قاڵب و ناوەڕۆك لە شیعری حاجی قادری کۆیی - دا

عەبدولخالق یەعقووبی

بەشی کوردۆلۆجی- زانکۆی سابیس

**پێشەکی:**

زۆربەی شـاعیرانی قوتابخـانەی شـیعریی بابـان، بە ڕێبەرایەتیـی نـالی، ئاوڕێکی جیددیان لە باسوخواسی نیشتمانپەروەرانە و شۆڕشگێڕانە نەدایەوە، و چەمکـی نیشـتمان و سـەرنجدان بە لایەنـی مێژووییـی گەلـی کـورد و دۆخـی سیاسـیی کوردسـتان لە جیهـانی شـیعریی ئەوانـدا جـێگە و پێگەیەکـی ئەوتـۆی نەبوو. لەم نێوانەدا و وەک یەک لە ئەندامانی بەرەی دووهەمـی شـاعیرانی ئەم قوتابخـانەیە "حـاجی قـادری کـۆیی" (١٨١٥؟-١٨٩٧) تـوانی ببێـتە خـاڵێکی وەرسووڕانی بەرچاو، و ئاراستەی شیعریی خۆی لە تەغەزول و دووپاتکردنەوەی تـێم و نـاوەڕۆکە ئاسـایی و ئاشـناکانی شـیعری کلاسـیکی کـوردی، کە خـۆی بەشێکی زۆری لە شیعری کلاسیکی فارسی وەرگیرابوون، گۆڕی و ڕووی هێنـایە ئەو ناوەڕۆک و بابەتانەی کە ڕاستەوخۆ و ناڕاسـتەوخۆ پەیوەنـدییان بە گرفتـی کورد وەکو گەلێکی ژێردەست و بە بندەستی ڕاهاتووی شایانی ڕەخـنە لێگیـران بوو.

بەڵام ئەم ئاراسـتەیە لە شـیعری حـاجی قـادردا لە کتـوپڕ و بە بـێ هـۆی مێژوویی و کولتووری نەهاتە ئاراوە. لێکترازانی یەکجارەکیی شیرازەی دەسەڵاتی میرنشـینیی کـوردی و دەسـتپێکردنی ڕەوتـی مۆدێرنیزاسـیۆن و پیشەسـازیی ڕۆژاوایی و دواکەوتوویی کولتووریی گەلی کورد ڕاچەنینێکی هزرییان لە حـاجی-دا بەدی هێنـا و وایـان لـێ کـرد شـیعری خـۆی بکـاتە بـانگەوازی هەسـت و هەڵوێستە نیشتمانپەروەرانەکەی. شیعری حاجی ڕەوتێکی گۆڕانکـاریی قـاڵبی و مانایی سـێ قۆنـاغەی بـڕی تـا دواجـار شۆڕشـگێڕی و نیشـتمانپەروەری ببێـتە

نـاوەڕۆكی سـەرەكیی زۆربەی شـیعرەكانی. بەم جـۆرە حـاجی ڕێگـای خـۆی لە زۆربەی شـاعیرانی تـری كلاسیكنووسـی قوتابخـانەی بابـان جیـا كـردەوە. ئەم ڕەوتە لە شیعری حاجی قادردا لە نووسینی شـیعری دڵـداری لە قـاڵبی غەزەلـدا دەسـتپێدەكات و لە ڕێگـای هـۆنینەوەی شـیعری مەیـلەو نیشـتمانپەروەرانە لە قـاڵبی قەسـیدەدا بەردەوام دەبێـت و بە گونجانـدنی هـزری شۆڕشـگێڕانە و ڕەخنەگرانە لە قاڵبی مەسنەوی یان جـووت سـەروادا كۆتـایی پـێ دێـت. خـاڵی شایانی سـەرنج لە ڕەوتـی چەنـدان ساڵەی ئەم گۆڕانكارییـانەدا ئەوەیە كە ئەم هەوراز و نشێوانە لە قاڵب و قسە یان فۆرم و فیكری حاجیـدا تـاو و تەئسـیری ئەو گـۆڕانە گەورەیەی ژیـانی ئەوی پێـوە دیـارە كە تێیـدا كوردسـتانی بەجـێ هێشت و ژیانی دوورودرێژی غـوربەتی هەڵبـژارد. لەم وتـارەدا هەوڵ دەدرێـت لە ڕێگـای پشتبەسـتن بە دەقـی شـیعرەكانی حـاجی و لە سـەر دەسـتی میتـۆدی لێكدانەوەی ناوەڕۆك (content analysis) و تەتەڵەكردنی بنەبـاس یـان مـۆتیفە (motif explanation) شـیعرییەكان بـاس لەم سـێ قۆنـاغە و نیسـبەتی نێـوان قاڵب و ناوەڕۆكیان بكرێت.

### قۆناغی یەكەم: غەزەل:

دیوانی حاجی بیست غەزەلی تێدایە و زۆربەی ئەو غەزەلانە لە باری زمان، داڕشتن، مۆتیف، و نـاوەڕۆكەوە لاسـاییكردنەوەی ئەزمـوونی شـیعری كلاسـیكی پـێش خۆیـانن، بە كـوردی و فارسـییەوە، و چ تـازەگەری و تازەكـارییەكی ئەوتۆیان تێدا نابینرێـت. وێدەچێت بەشـێكی بەرچـاوی ئەو غەزەلانە ئەزمـوونی سەردەمی گەنجـی و ژیـانی بەر لە غـوربەتی حـاجی بـن. ئەو بەشـە كەمەی تـر (دەورووبەری شـەش غەزەل)، كە پاشـتر بە نمـوونە باسـیان دەكەیـن، چەنـد غەزەلێكن كە تەجرەبەی ژیانی غوربەت و پوختەیی شـاعیرانەیان پێـوە دیـارە، و پێدەچێت ئەزموونی ئەو ساڵانە بن كە حاجی ماوەیەک بووە كوردستانی جـێ هێشـتووە و لە غـوربەت گیرسـاوەتەوە و لە حـاڵەتی لاوی و خـاوی هـاتووەتە دەرێ و زمان و هزری گەیشتوونە.

با سەرەتا لە گۆشەنیگای لێکدانەوەی مۆتیفی شیعرییەوە چاو لە غەزەلەکانی نووسراو لە کوردستان و سەردەمی گەنجیی دیوانی حاجی بکەین. ئەگەر وشەی "کورد"، وەک هێمایەک بۆ لایەنی نیشتمانپەروەرانە به هەموو لقەکانییەوە، واتە "کوردستان، کوردانە، کوردی، ئەکراد، کرمانج، کرمانجی"، وەک مۆتیفی سەرەکیی شیعری حاجی وەربگرین، دەبینین ئەم مۆتیفە لە سەرلەبەری غەزەلەکانی سەروبەندی ژیانی کوردستانی حاجیدا تەنیا یەک جار بە کار دەبرێت؛ ئەویش لەم بەیتە شیعرییەی غەزەلی "تا بڵێی فەرقی هەیە:"

**لە نوقووشی غەزەلم چین و خەتا داماون**
**کێ دەڵێ ئەمتیعەیی کوردە کەڵاش و کەپەنک**

دیوانی حاجی، ل ٧٧.

خاڵی سەرنجڕاکێش لێرەدا ئەوەیە کە وشەی "کورد" لەم غەزەلەدا هەڵگری چ بار و بوارێکی نیشتمانپەروەرانە نییە و پتر ئاماژە بۆ داب و دەستوور و کولتووری کوردە تا لایەنی سیاسی و شۆڕشگێڕانە. ئەم خاڵە بە تایبەتی پتر روون دەبێتەوە ئەگەر خوێنەر سەرنج بداتە دێڕە شیعرەکانی پێش و پاش ئەم بەیتە، و مانای وشەی "کورد" لە زەمینەی ئەم سێ بەیتە و سەرتاپای غەزەلەکەدا لێکبداتەوە:

**ئەی مەهی چاردە سەیری مەهی دوو هەفتە بکە**
**وەک منی دابنێ چاوی من و تۆ ناگەنە یەک**
**لە نوقووشی غەزەلم چین و خەتا داماون**
**کێ دەڵێ ئەمتیعەیی کوردە کەڵاش و کەپەنک**
**بۆ تەماشای بەلەک و زەندی سپی و چاوی بەڵەک**
**نیشتووە لەم دەرە عاشق وەک حاجی لەک لەک**

دیوانی حاجی، ل ٧٦-٧٧.

خاڵی دووهەم لە سەر ئەو غەزەلانەی کە مۆرکی سەردەمی گەنجی و ژیانی کوردستانیی حاجییان پێوە دیارە تەقلیدی بوونی زمان و ناوەڕۆکیانە، بە

تایبەتی لاساییکردنەوە و کەوتنە ژێر تاو و تەئسیری پێشەنگی قوتابخانەی بابان، واتە نالی. ئەم قسەیە پتر و وردتر وەڕاست دەگەڕێت ئەگەر بزانین کە حاجی لە نێو ئەو (١٤) غەزەلەی کە بە ڕای من شیعری قۆناغی لاوی و ژیانی فەقێیەتیی نێو کوردستانن نیزیکەی (١٠) جار ئاماژەی ڕاستەوخۆ بە ناو و شیعری نالی دەکات و زۆربەی جار پەسندیان دەکات و پێیاندا هەڵدەڵێت. بۆ نموونە، سەرنج بگرنە ئەم دێڕە شیعرانە لە چەند غەزەلێکیدا:

**نالی و خاکی بەبە، حاجی و کۆیە بە مەسەل**
**عەینی حافیز و شیرازە، کەلیم و هەمەدان**

دیوانی حاجی، ل ٩٣.

**سولەیمانێکە نالی، خاوەنی دیوان و فەرمانە**
**نییە کەس بێتە مەیدانی مەگەر حاجی خودئاسایە**

دیوانی حاجی، ل ١٣٢.

**بە تەزمین فەردەکی نالی دەهێنم تا ڕەفیقانم**
**بزانن فەرقمان زۆرە خەزەف قەت وەک گوهەر نابێ**

دیوانی حاجی، ل ١٧٧.

بە کورتی دەکرێت بگوترێت نالی لەو (١٦) غەزەلەی کە بەر لە ژیانی غوربەتی نووسیونی چ داهێنانێکی شایانی سەرنج و تایبەت بە هزر و زمانی خۆی بەدی نەهێناوە و نەک هەر لە فیکر و فەزای نشتمانپەروەرانە بە دوور بووە، بەڵکو زۆر لە ژێر کاریگەرێتیی شاعیرانی پێش خۆیشی بووە. حاجی لە وێستگەی یەکەمی ئەم قۆناغە، واتە قۆناغی شیعر نووسین لە قاڵبی غەزەلدا، پتر درێژەپێدەری ڕێگا و ڕێبازی کەڵە شاعیرانی لە چەشنی نالی و کوردی و سالم بووە و لە داهێنانی زمان و جیهانبینیی شاعیرانەدا لەوانی تێنەپەڕاندووە و سنووری ئەوانی نەبەزاندووە.

ئەم قۆناغە وێستگەی دووهەمیشی هەیە و ئەویش ئەو شەش شیعرەن، هەر لە قاڵبی غەزەلدا، کە وێدەچێت لە ژیانی ئاوارەیی و غوربەتیی حاجیدا

نووسرابن. ئەم چەند غەزەلە لە باری زمان و جیهانبینیی شیعرییەوە لەو (١٤) غەزەلەی کە باسمان کردن جیاوازن، بە جۆرێک کە خوێنەرەوە هەست دەکات حاجی لەم غەزەلانەدا هەوڵ دەدات رێگایەک، هەر چەند بچووک و تەنگەبەر، بۆ هەڵوێستی نیشتمانپەروەرانە و هزری شۆڕشگێڕانە خۆش بکات. بە وتەیەکی تر، حاجی لەم شەش غەزەلەدا خەریکە مەشقی هەڵاتن لە تەغەزولی شاعیرانەی تاکەکەسی و روو هێنانە تێفکرینی نیشتمانپەروەرانەی نەتەوەیی دەکات. بۆ نموونە، لە غەزەلی "جەبەرووتی کە شکا"، ل ٦٤-٦٥، لە لایەکەوە زمان و هزری حاجی لەو حاڵەتە لاساییکردنەوەیە رووتەی غەزەلەکانی سەردەمی ژیانی کوردستانی دەرباز بووە، و لە لایەکی تریشەوە ئاماژە شیعرییەکان زێتر روویان لە مرۆڤە، وەک کەسێکی غەریب لەم جیهانەدا، نەک مەعشووقێکی رۆمانسیی شیعری تەغەزولی تەقلیدی. بە وتەیەکی تر، لەم غەزەلانەدا لایەنی فەلسەفی و هزری بە سەر لایەنی رۆمانسی و عیشقیدا زاڵە، و وێدەچێت حاجی لەم شیعرانەدا تەجرەبەی عیشقی شەخسی جێ دەهێڵێت و بەرەو ئەزموونی عەقڵی جەمعی دەڕوات :

**جەبەرووتی کە شکا دڵ لە حوزووری مەلەکووت**
**هاتە ئەم عالەمی ناسووتە غەریبێکی نەسووت**
**ناحەقە شەکوە لە بێ عەهدی و بێ پەروایی**
**کەی وەفایێکی ئەدا کردووە؟ سەد دەفعە زمووت**
**هەرچی لەو لاوە نەیێ من لەوێ نایناسمەوە**
**ئەوی ناسیوتە مەئموورە بە ئەمری جەبەرووت**
**نانی خۆی تاکوو بە تەندووری گەرم پێوە نەدا**
**ناڕوا حاجی ئەگەر چاوی دەرێنن بە بزووت**

دیوانی حاجی، ل ٦٤-٦٥.

خاڵی دووهەم ئەوەیە کە مۆتیفی "کورد"، بە هەموو لق و پۆپەکانییەوە، لەم غەزەلانەی قۆناغی ژیانی غەریبایەتیی حاجیدا تەنیا دوو جار، ئەویش لە دوابەیتی غەزەلی "زەمانە"دا، ل ١١٨، دووپات دەبێتەوە:

**لە کوردان غەیری "حاجی" و "شێخی خانی"**
**ئەساسی نەزمی کوردی دانەناوە**

دیوانی حاجی، ل ١١٨.

بەڵام مۆتیفی "غوربەت" یان "غەریب" چوار جار لەم شەش غەزەلەدا دووپات دەبنەوە و هەمووشیان هەڵبەت لە زەمینەیەکی مەیلەو وەتەنخوازی و نیشتمانپەروەرانەدا. بۆ پتر روونکردنەوەی جیاوازیی نێوان ئەو دوو جۆر غەزەلەی دوو قۆناغی جیای ژیانی حاجی، دەکرێت بەراوردێک بکرێت لە نێوان دیدی حاجی بۆ "زوڵف"، کە مۆتیفێکی باوی غەزەلی شیعری کلاسیکییە، لەو دوو جۆر غەزەلەی گۆریندا: غەزەلی تافی گەنجی و ژیانی کوردستان و غەزەلی سەردەمی پوختەیی و ئەزموونی غەریبایەتی. لە غەزەلی "بەستەیی زوڵفی نیگارێکم"دا، ل ٤٩-٥٠، کە غەزەلی سەردەمی ژیانی کوردستانیی حاجییە (لە بەیتی چوارەمدا، حاجی باسی فەقێ بوونی خۆی دەکات )، و لەم دێڕەدا:

**بەستەیی زوڵفی نیگارێکم ڕەسەن بازی دەکا**
**سەففی موژگانی لە تابووری سوپای غازی دەکا**

دیوانی حاجی، ل ٤٩.

لەم بەیتە شیعرەدا "زوڵف" بە شێوەیەکی زۆر ئاسایی وەسف دەکرێت. لە لایەکەوە، هیچ تایبەتمەندییەکی جوانیناسانە بە زوڵف نادرێت و زوڵف تەنیا پاژێکە لە جەستەی یارێک کە خەریکی ڕەسەنبازییە؛ لە لایەکی ترەوە، ئەوەی دەبێتە ناوەندی سەرنجی ئەم دێڕە نەک زوڵفی یار، بەڵکو خودی یارە و تایبەتمەندیی بوێری (ڕەسەنبازی) و دلێرییەکەی (هاوشێوە بوونی سەففی موژگانی لە تابووری سوپای غازی). پوختەی قسە ئەوەیە "زوڵف" لەم غەزەلەدا دەورێکی جوانیناسانەی ئەوتۆ ناگێڕێت، و حاجی نەیتوانیوە فۆرم و واتا و کارکردێکی نوێ، لانیکەم لە بازنەی شیعری کلاسیکیدا، بەم مۆتیفە ببەخشێت.

بەڵام لە غەزەلـی "بە قسـەی بـێ سـەروپا تـاڵی مەکە"، ل ٦٢-٦٣، کە غەزەلی سەردەمی پوختەیی و گەیشتوویی هزر و زمانی حاجییە لە هەندەران (لە دوادێڕدا حاجی باسی نەچوونەوەی بۆ وڵات و باس نەکردن لە غوربەتی خۆی دەکات)، مۆتیفی "زوڵف" بەم شێوەیە بە کار دێت:

**زوڵفی سەد دەفعە گوتی: خانە خەراب رووی مەدەرێ!**

**حەیفە بەربادی مەکە شانی من و شەوکەتی خۆت**

دیوانی حاجی، ل ٦٣.

لەم بەیتەدا کۆمەڵێک جوانکاریی دەربڕینی زۆر ورد و شاعیرانە لە سەر "زوڵف" کراوە کە سەلمێنەری ئەوەن حاجی لەم قۆناغەی شاعیریی خۆیدا بە دیدێکی جوانیناسانەوە لەم مۆتیفە باوەی شیعری کلاسیکی روانیوە و بە کاری هـانیوە. یەکەم، لەم بەیتەدا، "زوڵـف" کەسـایەتیی پـێ دەدرێـت (جوانکـاریی تشـخیص× یـان (personification) و دەبێـتە ناوەنـدی سـەرنجی دەق. دووهەم، "زوڵـف" نەک هەر خـاوەنی کەسـایەتییە، بەڵکـو دێـتە دەنـگ و ڕەخنەگـرانە دەدوێت و لەم ڕێگەیەوە ناسنامەی سـەربەخۆ و تـایبەتیی خـۆی دەسـەلمێنێت. سێهەم، حاجی زۆر زمانبازانە توانیویەتی دەسـتەواژەی "شـان و شـەوکەت"، بە شێوەی لەف و نەشر، بە سەر "زوڵف" و دەنگە شیعرییەکەدا ببەشێتەوە (شان هەم بە واتـای ڕێـز و حـورمەت، هەمـیش ئەو شـوێنەی زوڵـف بە سـەریدا بـڵاو دەبێتەوە).

هەر چۆنێک بێت، ئەوەی لێرەدا خاڵی ناوەندیی باسوخواسـی ئەم وتـارەیە ئەوەیە کە حـاجی لە قۆنـاغی نووسـینی شـیعر لە قـاڵبی غەزەلـدا، بە هەر دوو جـۆری ئامـاژە پێکـراو، هزرێکـی نیشـتمانپەروەرانە و هەسـتێکی شۆڕشـگێڕانەی ئەوتۆی نەبووە کە بخوازێت لەو ڕێـگەیەوە جیهـانی شـیعریی خـۆی لە جیهـانی شیعریی شاعیرانی پـێش خـۆی جوداواز بکـات و شـەقڵێکی تـایبەتی فیکـری و فۆرمی بە بەرهەمی خۆی بـدات. بەڵام، وەک پێشـتر سـووکە ئامـاژەیەکم پێـدا، وێـدەچێت لە هەنـدێک شـوێنی ئەو شـەش غەزەلەی کە لە دیـاری غـوربەت نووسـیونی سـووکە لەنگەرێـک لە سـەر هەسـتی وەتەنخـوازی و غوربەتنشـینی

دەگرێت و وردە وردە ڕێگە بۆ جیهانێکی نوێی هەست و هزری شاعیرانەی خۆی خـــۆش دەکـــات. بـــۆ نمـــوونە، هەر لە دوا دێـــڕی ئەم غەزەلەی بەرباســـی سەرەوەماندا دەنگی شیعری روو لە حاجی دەکات و پێی دەڵێت:

**بۆچی یارانی وەتەن دڵ دەشکێنی "حاجی"؟**

**زاهیرەن ناچیەوە تۆ باسی مەکە غوربەتی خۆت**

دیوانی حاجی، ل ٦٣.

لەم دێـڕە شـیعرەدا، "یـارانی وەتەن" و "غـوربەت" دوو نیشـانەی گرینگـی وەرسـووڕانی هـزری و زمـانیی حـاجین لە هەمـبەر روانـین و راڤەی بـۆ "یـار" و "غـــوربەت؛ واتە لێـــرەدا، بە پـــێچەوانەی ئەو غەزەلانەی کە لە نێـــو وڵاتـــدا نووسـینی، یـار چیتـر بـۆ حـاجی بریتـی نیـیە لە دڵـدار، مەعشـووق، یـان خۆشەویســـت، بە تـــایبەت لە رەگەزە مێـــیەکەی، بەڵکـــو پتـــر ئەو کەســـانە دەگرێتەوە کە عیشقی نیشتمانیان لە دڵدایە و پاڵپشتی کێشە نەتەوەییەکانن. بە هەمـان پێودانـگ، غـوربەت لەم شـیعرەدا بریتـی نیـیە لە دووریـی حـاجی لە شوێنی ژیانی دڵداری جیهانی تەغەزول ئاسای، بەڵکو نەگەڕانەوەی بۆ نیشتمان بە ئەنقەست و بەپێی ویست و خواستێکی ناچاری و ناگوزیری.

ئەگەرچـــی ئەم داگەڕانە ڕێـــژەییەی حـــاجی بـــۆ لای وەتەنگەرایـــی و نیشتمانخوازی هەر لە قاڵبی غەزەلدا بووە، بەڵام بە هۆی تایبەتمەندیی غەزەلی کلاسیک کە دەرەتانێکی ئەوتـۆ بە هـزر و تێفکرین و باسـی دەرەوەی عیشـق و دڵداری نادات نەیتوانیوە لەوە زیاتر غەزەل بکـاتە ئەو بەسـتێنەی کە نـاوەڕۆکی هزری نیشتمانپەروەرانە و شۆڕشگێڕانەی تێدا بخاتەگەڕ. حاجی بـۆ وەدیهێنـانی ئەم مەبەستە رووی کردووەتە قاڵبی قەسیدە.

### قۆناغی دووهەم: قەسیدە:

سـەرلەبەری دیـوانی حـاجی قـادر شـەش قەسـیدەی تێـدایە، و وێـدەچێت حـاجی لەم شـەش قەسـیدەیەدا ڕێگـای خـۆی بە یەکجـاری لە قـاڵبی غەزەلـی تەقلیدی و ئەو نـاوەڕۆکەی کە لەگەڵ ئەم قـاڵبەدا دەگونجێـت، واتە تەغەزول و

باسوخواسی دڵداری و خەون و خولیای ئاشقانەی تاکەکەسی، جیا کردبێتەوە و ئاراستەیەکی نوێی گرتبێتە بەر، کە بریتییە لە وەسفی وەتەن و خۆشەویستی بۆ خاک و رزگاریی وڵات، و بە گشتی نیشتمانپەروەری.

بە رای من، وازهێنان لە غەزەل و هەڵبژاردنی قەسیدە لە رەوتی گۆڕانکاریی قاڵب و ناوەڕۆکی شیعری حاجی-دا ئاکامی وازهێنان لە لاساییکردنەوەی هزر و پێکهاتەی شیعریی شاعیرانی قوتابخانەی بابانە، بە تایبەتی نالی. دەکرێت قۆناغی نووسینی قەسیدە لە شیعری حاجیدا ناو بنێین "قۆناغی گواستنەوە بەرەو گوتاری نیشتمانپەروەری و شۆڕشگێڕی". ئەگەر لە روانگەی مۆتیفی شیعرییەوە لەم باسەمان بڕوانین، دەبینین ژمارەی دووپاتبوونەوەی مۆتیفی "کورد"، بە هەموو لقەکانییەوە و بە مانای نیشتمانپەروەرانەی ئەم وشەیەوە، لەم شەش قەسیدەیەدا (٢٣) جارە و ئەمە سەلمێنەری ئەو خاڵەیە کە ئەم گوتارە تا چەندە قووڵ و پتەو لە هزر و پێکهاتە و زمانی شیعریی حاجیدا رەگی داکوتاوە.

هەڵبەت پێویستە ئەم خاڵە مێژووییە وە بیر خوێنەرەوە بهێنینەوە کە لە نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەم و لە نێو گەڕیانی شیعریی ئەوکاتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە گشتی و لە نێو شیعری کلاسیکیی کوردیدا بە تایبەتی گوتاری نیشتمانپەروەری و شۆڕشگێڕیی نەتەوەیی گوتارێکی تازەبابەت و شەقڵ نەشکاو بوو و هەر بۆیە حاجی نەیدەتوانی ئەم گوتارە نوێیە لە نێو قاڵبی تەقلیدیی غەزەلی کلاسیکدا جێ بکاتەوە. کە واتە هەڵبژاردنی قاڵبی قەسیدە لە لایەن حاجییەوە، بە رای من، هەڵبژاردنێکی ناچارەکییە، چ وەک قاڵبی شیعری کلاسیکی، چ وەک پێداویستیی ناوەڕۆک و بابەت.

ئەم قۆناغە پاش مانەوەی چەندساڵی حاجی لە ژیانی غوربەتی ئیستامبوڵ-دا دەست پێدەکات و دەتوانین بڵێین هەر شەش قەسیدەی حاجی بەرهەمی ژیانی تاراوگەیی و غەریبیی ئەون. بۆ نموونە، لە قەسیدەی "گوتم بە بەختی خەواڵوو"دا، ل ٣٨-٤٧، حاجی هەر چەندە تا رادەیەکی کەموزۆر بەرهەست هێشتا هەر بە زمانی تەقلیدیی شیعری کلاسیکی نەوەیەکی پێش خۆی وەسفی وەتەن و وێنای دیمەنەکانی نیشتمان دەکات، بەڵام راستەوخۆ

پەسندی زمانی کوردی دەکات و لە هەمان کاتیشدا بە دیدێکی ڕەخنەگرانەوە سەیری پەیوەندیی نێوان زمانی کوردی و کورد، وەک گەلی خودانی ئەو زمانە، دەکات. خاڵی گرینگتر ئەوەیە کە حاجی شان و شەوکەتی زمانی کوردی لەگەڵ زمانی فارسیدا بەراورد دەکات و ڕەخنە لەو کەسانە دەگرێت کە زمانی کوردی لە بنجوبناوانەوە بە کەمتر لە زمانی فارسی دەزانن و تانەکە لە سەر خاوەنی زمانەکە، کە کورد بێت، هەڵدەگرن. حاجی لەم قەسیدەیەدا سەرەتای گوتاری ڕەخنەگرانەی خۆی لە هەمبەر میللەتەکەیدا دەخاتە گەڕ، و ئەم حاڵەتە لە زۆربەی قەسیدەکاندا بەرهەست و بەرچاوە:

**شەبیهی جۆڵە کە ڕازی نەبێ بە سەردڕی خۆی**
**مەڵێن فەساحەتی کوردی بە فارسی ناگات**
**بەلاغەتێکی هەیە هیچ زوبانێ نایگاتێ**
**لە بێ تەعەسسوبی کوردانە بێ ڕەواج و بەها**

دیوانی حاجی، ل ٤٦.

لە قەسیدەی "خاکی جەزیر و بۆتان"، ل ٩٣-١٠٠ گوتاری ڕەخنەگرانەی حاجی لە هەمبەر کورد لە حاڵەتی مەترسی لە سەر زمانی کوردی هەڵدەکشێت بۆ حاڵەتی هەڕەشە لە سەر خاکی کوردستان و دەسەڵاتی میری کوردی، و لە ڕەهەندی کولتوورییەوە بەرەو ڕەهەندێکی سیاسی دەڕوات :

**خاکی جەزیر و بۆتان، یەعنی وڵاتی کوردان**
**سەد حەیف و سەد مخابن دەیکەن بە ئەرمەنستان**
**وا ڕێگەتان دەبەسترێ عێلاتی جاف و بڵباس**
**گەر مردوون لە گەرمێن مەمنووعە بچنە کوێستان**
..........................................
..........................................
**کوا والیی سەنەندوج، بەگزادەیی ڕەواندوز**
**کوا حاکمانی بابان، میری جزیر و بۆتان؟!**
**"حاجی" کەسێکە بێکەس بۆ ئێوە قوڕ دەپێوێ**
**گوێی لێ گرن زەریفە، ناگرن بەڵا لە خۆتان**

دیوانی حاجی، ل ٩٣–١٠٠.

هەر لەم قەسیدەیەدا سەرەداوێک لە گوتاری دژە کۆنەپەرستیی ئایینی و دینداریی خەڵک هەڵخەڵەتێنانەی تاقمێکی ئەوکاتی کۆمەڵی کوردەواریی لە چەشنی شێخ لە ناوەرۆکی شیعری حاجی-دا دەردەکەوێت :

**پاڕانەوە و تەوەککول لەم عەسرە پارە ناکا**
**تیرە دوعایی جەوشەن، پەیکانە حیرزی مەیدان**
.........................................
.........................................
**هەر شێخێ کەوتە شوێنی یەک دوو کەسی رەش و رووت**
**خەڵکی بە موور دەزانێ، خۆی حەزرەتی سولەیمان**

دیوانی حاجی، ل ٩٧.

هەر لەم قەسیدەیەدا حاجی باس لە کۆمەڵێک وڵات و ناوچەی جیا جیای جیهان و بە تایبەتی ئەورووپا دەکات، کە بوونەتە دەوڵەت و قەوارەی سیاسیی سەربەخۆیان پێک هێناوە، و دواتر ئاماژە بەوە دەکات کە هۆکارەکانی ئەو سەربەخۆییە چین :

**بنواڕە سەعی و غیرەت ئێستا لە دەوڵەتی رۆم**
**خۆیان خەزێنەدارن، خۆیان تەبیب و سوڵتان**

**هەر دوێنێ ئەهلی "سوودان" هەستانە پێ وەکوو شێر**
**ئێستێکە موستەقیللن مەحسوودی کوللی ئەدیان**

**"بولغار" و "سیرب" و "یۆنان"، هەم "ئەرمەن" و "قەرەتاغ"**
**هەر پێنجیان بە تەعداد نابن بە قەددی بابان**

**هەر ئێکە موستەقیللن، کوللێکی دەوڵەتێکن**
**ساحێبی جەیش و رایەت، ئەرکانی حەرب و مەیدان**

**هەم حەقییانە ئەرمەن، غیرەت کەشی یەکترن**
**وەک ئێمە نین لەگەڵ یەک دەعوا بکەن بە شیران**

**بۆ فەننی حەرب و سەنعەت، بۆ زەبت و رەبتی  میللەت**
**دەینێرنە ئەورووپا گەورە و بچووکی خۆیان**

دیوانی حاجی، ل ٩٩.

پوختەی باسی ئەم بەشە ئەوەیە کە حاجی ناوەڕۆکی لەم چەشنەی، کە بە تەواوەتی لە ناوەڕۆکی غەزەلەکانی جیاوازە، لە قالبی قەسیدەدا گونجاندووە و ئەمەش پاژێکە لە رەوتی ئەو گۆڕانکارییەی کە لە زمان و پێکهاتە و جیهانبینی و هزری شیعری حاجیدا هاتووەتە ئاراوە. کە واتە، حاجی دەستبەرداری قاڵبی غەزەل بووە، لە بەر ئەوەی دەستبەرداری تەغەزول و تێڕوانینی عیشقی ئاسمانی و رۆمانسی بووە و رووی کردووەتە خوێندنەوەی واقیعەکانی کۆمەڵگا و نەتەوەکەی، و هەر بۆیە لە قۆناغی دووهەمی گۆڕانکاریی قاڵب و ناوەڕۆکی شیعرەکانیدا لە دەلاقەی قەسیدەوە پەیامی شاعیرانەی خۆی بە گوێی بەردەنگانی دەگەیەنێت. کە واتە، قەسیدەکانی حاجی لە سەروبەندی ژیانی تاراوگەنشینی و غەریبایەتیی ئەستەمبۆڵ-دا نووسراون و یەکەم وێستگەی فۆرمی و فیکری بوونە لە وەرسووڕانی جیهانبینیی حاجی لە "تەغەزولەوە" بەرەو "تەفەکور"، لە ئیمان بە عیشقی تەقلیدی و دڵداریی رۆمانسییانە بەرەو باوەڕی نیشتمانپەرستی و وەتەنخوازی. حاجی لە هەمان کاتدا رەخنە لە میللەتی خۆی و بارودۆخی بەردەست دەگرێت و شان بە شانی ئەوەش هاندانیان بۆ دەربازکردنی خۆیان لەو دۆخە و هەوڵدان و هیممەتکردن بۆ دروستکردنی کیانێکی نەتەوەیی بە گشتی و دەوڵەتێکی کوردی بە تایبەت. بۆ ئەم مەبەستە دوا قاڵبی شیعری کە تێیدا حاجی هزری نیشتمانپەروەری و باوەڕی شۆڕشگێڕیی خۆی دەگەیەنێتە چڵەپۆپە قاڵبی مەسنەوی یان هەمان جووت سەروایە.

### قۆناغی سێهەم: مەسنەوی (جووت سەروا) :

لە شیعری کلاسیکیدا تایبەتمەندیی قاڵبی جووت سەروا لەوەدایە، کە بۆی هەیە هزر و پەیامی شاعیر بە پشوودرێژی (قاڵبی جووت سەروا وەک غەزەل و

قەسیدە نییە کە ژمارەی بەیتەکان دیاریکراو بێت) و بێ دڵەڕاوکەی دۆزینەوەی سەروا (بە پێچەوانەی غەزەل و قەسیدە، لە جووت سەروادا هەر بەیتەو سەروای خۆی هەیە) لە خۆیدا بگونجێنێت. حاجی لە دوا قۆناغی ڕەوتی گۆڕانکاریی جیهانی شیعرەکانیدا قاڵبی جووت سەروای بە کار هێناوە و بە دڵنیاییەوە دەکرێت بگوترێت هەموو جووت سەرواکانی دیوانەکەی بەرهەمی ژیانی تاراوگەنشینی و دواساڵانی ژیانی ئەون. ئەگەر بخوازین بۆ سەلماندنی ئەم قسەیە پشت بە شیعری خودی حاجی ببەستین، دەکرێت ئاماژە بۆ بەیتێک لە جووت سەروای "ئودەبا چاکە"، (ل١٨٨-١٩٦) بکەین، کە تێیدا باسی "بورجی ئیفل"ی پاریس کراوە :

**دەخیل شێخ و مێخ مەبن ئەبەدا**
**هیچ کەسێ رزقی هیچ کەسێ نادا**

**ئەی خەریکی رمووز و ناز و نیاز**
**ئەورووپا فەننی گەیوەتە ئیعجاز**

**قوللەیی "ئیفل"ی لە ئەفلاکە**
**عەکسی ئەو گەردشی لە ژێر خاکە**

دیوانی حاجی، ل ١٨٩.

وەک زۆربەی تۆژەران باسیان کردووە حاجی دەبێت ساڵی ١٨٩٧ کۆچی دوایی کردبێت؛ سازکردنی بورجی بەناوبانگی ئیفل-یش چەند ساڵێکی خایاند و ساڵی ١٨٨٩ کۆتایی پێ هات. کە واتە، ئەم بورجە دەبێت ٨ ساڵ پێش مردنی حاجی دروست کرابێت، و ئەمە نیشاندەری ئەوەیە کە حاجی لە دواساڵانی ژیانی و لە سەردەمانی تاراوگەنشینیدا باسی ئەم بورجە لە جووت سەروای "ئودەبا چاکە"دا کردووە .

جووت سەرواکانی حاجی دەستپێکی بزووتنەوەی شیعری شۆڕشگێڕانەی کوردین: شۆڕشی دژی دوژمنانی گەل، شۆڕشی دژی کۆنەپەرستیی ئایینی، شۆڕشی زەقکردنەوەی دروشمی نەتەوەیی و سیاسی، شۆڕشی هزری

ڕەخنەگرانە بە نیسبەت کۆمەڵگای کوردی. حاجی شۆڕش بە هەموو ئەو مانایانەی گۆڕین دەکاتە ناوەڕۆکی سەرەکیی شیعرەکانی دواساڵانی تەمەنی خۆی و بۆ ئەم مەبەستەش قاڵبی جووت سەروا هەڵدەبژێرێت. ئەم شیعرانە شیعری وریاکردنەوەن، و وریاکردنەوەش پێویستی بە قاڵبێکی سووک و سانا و خۆبەدەستەوەدەر و ئاشکراکەر و لەهەرادەر هەیە، واتە قاڵبێکی لە چەشنی جووت سەروا .

ئەو تایبەتمەندییەی کە شێوازی تێڕوانین و بیرۆکەکانی حاجی لە جووت سەرواکانیدا لە چاو قەسیدەکانی جیا دەکاتەوە تۆختر کردنی ڕەخنە و تانەکانێتی لە گەلی خۆی، و ئەم جار نەک بە پارێزەوە، بەڵکو ڕاستەخۆ و بێ سڵەمینەوە و بە زمانێکی زبر و تیژ ڕمی ڕەخنەی بە زگی گوتارە باو و بەبرەوەکانی سەردەمی خۆیدا دەکات و هەڵیان دەوەشێنێتەوە. بۆ نموونە، لە هەمان جووت سەروای "ئودەبا چاکە"دا، ل ١٨٨-١٩٦ حاجی، بە پێچەوانەی قەناعەتی باوی سەردەمی خۆی، پێی وا نییە کورد بە ئیدراک بن، یان قەومێکی شێر سیفەت بن (ئەو دەڵێ "قەومی تۆ هەموو مارن"):

**کێ دەڵێ کوردەکان بە ئیدراکن**
**بەسە ئەم نەقسە گوێ لە من ناکەن**

**لە قسەی ساغی من خەلەل دەگرن**
**واهیمەی شێخەکان لە دڵ دەگرن**

.
.

**عیشقبازی و هەوایی دەروێشی**
**میللەتی خستە فەقر و بێ ئیشی**

.
.

**ئەو کەسەی دەوڵەمەندێکی چاکە**
**بەندەیی ڕۆمیانی ناپاکە**

.
.

**لێی گەڕێ قەومی تۆ هەموو مارن**
**دز و حیز و پیاوکوژ و هارن**
.
.
**بە قسەی چاکە دەستیان دەگرم**
**تەرکی ناکەم بە لۆمە تا دەمرم**

دیوانی حاجی، ل ١٨٨-١٩٦.

حاجی لە سۆنگەی ئەوەی ژیانی ئەستەمبۆڵ دید و تێڕوانینێکی نوێی پێ بەخشیوە تەنانەت کەلامی دینیی باو بە شێوەیەکی تایبەت بە خۆی راڤە دەکات و دژی ئەو باوەڕانە رادەوەستێتەوە کە پیرۆز و جێگیر کراون و لە هەمان کاتدا دژی بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ و پێشکەوتنی کۆمەڵن بە کار هاتوون. نموونەی خوارەوە بەڵگەی ئەم بۆچوونەیە:

**بۆچی فەرموویەتی نەبیی ئەمین:**
"اطلبوا علمكم ولو بالصين

**نێر و مێ لەم حەدیسە فەرقی نییە**
**گەر مەلا نەهیی فەرموو دینی نییە**

دیوانی حاجی، ل ١٨٩-١٩٠.

لەم جووت سەروایەدا حاجی نەک هەر رەخنەگری توندوتیژی هەندێک بنەما تیۆریکەکانی دیانەتی تەقلیدیی سەردەمی خۆیەتی، لە چەشنی تەفسیری زۆرینەی مەلاکانی ئەو سەردەم، و تەنانەت سەردەمی ئێمەش، بۆ ئەو حەدیسەی گۆرین، بەڵکو دژ بە زۆربەی هەرە زۆری ئەو پراکتیک و کردە دینی و بە ناو دینییانە رادەوەستێتەوە کە، بە باوەڕی ئەو، سەرچاوەی سستی و نوشوستیی کۆمەڵگان، وەک لەم نموونانەی خوارەوەدا بە راشکاوی ئەم پەیامە رادەگەیەنرێت:

**خانەقا و شێخ و تەکیەکان یەکسەر**
**پێم بڵێن نەفعیان چییە ئاخەر**

**غەیری تەعلیمی تەنبەڵی کردن**
**جەمعی ئەملاک و خەزنە کۆکردن**

**دەفعەیەک ئیمتیحانیان ناکەن**
**تێبگەن زەهرە یانە تریاکن**

دیوانی حاجی، ل ١٨٨.

ئەگەر لە گۆشەنیگای دووپاتبوونەوەی مۆتیفی "کورد"، بە هەموو لقەکانییەوە، لە جووت سەرواکانی شیعری حاجی بڕوانین، دەبینین ئەم مۆتیفە (٤٥) جار لەم جووت سەروایانەدا، کە ژمارەیان دەگاتە (١٨) جووت سەروا، بە کار هاتووە و بێگومان هەمووشیان لە پاش زەمینەیەکی نیشتمانپەروەرانە و نەتەوەخوازانەدا کەڵکیان لێ وەرگیراوە. ئەم ژمارە زۆرەی مۆتیفی کورد، کە دوو هێندەی هەمان مۆتیفە لە قەسیدەکانیدا، ئەوە دەسەلمێنێت کە ناوەڕۆکی نیشتمانخوازی و شۆڕشگێڕانە لە شیعری حاجیدا گەیشتووەتە ئەوپەڕی خۆی. کە واتە، حاجی بۆ گەیاندنی پەیامی خۆی بە ڕاشکاوانەترین شێوە و دروشماویترین حاڵەت ڕووی کردووەتە قاڵبی جووت سەروا .

لە لایەکی ترەوە حاجی لە جووت سەرواکانیدا لە ژێر ڕکێفی کاریگەرێتیی شاعیرانی پێشەنگی قوتابخانەی بابان ڕزگاری هاتووە و ، بە پێچەوانەی غەزەلەکانی، ئاماژەی زۆر و زەق بە ناوەکانیان ناکات. بۆ نموونە، لە هەموو جووت سەرواکانیدا تەنیا چەند جارێکی کەم ناوی نالی دەهێنێت، ئەویش ئەو کاتەی کە لە پەنا ناوی شاعیرانی تر باسی نالی–ش وەک یەک لە شاعیرانی کورد دەکات، وەک لە شیعری "شەهسەواری بەلاغەتی کوردان"، ل ٢١٧–٢٢٦:

**شەهسەواری بەلاغەتی کوردان**
**یەککەتازی فەساحەتی "بابان"**

**مستەفا تەخەللوسی "کوردی"**
**غەزەلی کردە بەربوتی کوردی**

**ناوی "ساحێبقران"ی خاسی ئەوە**
**چونکە لەم عەرسە ئەسپی ئەو بەدەوە**

**ئەو کە نۆشی شەرابەکی تاڵی**
**"نالی" لەو عەسرەدا بووە تاڵی**

**"نالی" ئوستادەکی گەلێ چا بوو**
**خزری ئابی حەیاتی مەعنا بوو**

دیوانی حاجی، ل ٢١٧.

وێدەچێت لێرەشدا حاجی پتر مەبەستی پاراستنی لایەنی نەتەوەیی و نیشتمانیی مەسەلەکە بووبێت، و لە رێگای ریزکردنی ناوی شاعیرانی کورد خواستوویەتی میللەتەکەی میراتی ئەدەب و زمانی خۆی لە بیر نەکات و بیپارێزێت، وەک چۆن لە جووت سەروای "لە مەیدانی بەهارا"دا، (ل ٢٤٧-٢٥٢) دەڵێت:

**وەکو بیستوومە ئەی یاری نکوپەی**
**لە تەئریخی جەم و ئەسکەندەر و کەی**

**بە شیر و خامە دەوڵەت پایەدارە**
**ئەمن خامەم هەیە، شیر نادیارە**

دیوانی حاجی، ل ٢٥١.

دوایین خاڵی شایانی باسکردن دەربارەی جووت سەرواکانی حاجی ئەوەیە کە حاجی نەک هەر رەخنە لە گوتاری دینداریی تەقلیدی دەگرێت، کە وەک پێشتر ئاماژەمان پێ کرد بە باوەڕی ئەو رەگوڕیشەی هەموو دواکەوتنەکانی کۆمەڵگای کوردییە ، بەڵکو گوتاری دینی بە شێوەیەک دەهێنێتە ئاراوە کە

شـان بە شـانی گوتـاری نیشـتمانپەروەرانە لە پێنـاوی وریـاکردنەوەی خەڵکـی کوردسـتاندا بکەوێتە گەڕ. نمـوونەی دیـاری ئەم شـێوە هەڵسـوکەوتەی حـاجی لەگەڵ ئەم دوو گوتـارە لە کـورتە جـووت سـەروای "یـا ئیلاهـی"دا، ل ١٩٦، دەبینرێت:

**یا ئیلاهی بە ئایەتی مونزەل**
**بە چوار یاری ئەحمەدی مورسەل**

**بێ نەوایانی موڵکی کوردوستان**
**هەر لە گاوانی تا دەگاتە شوان**

**لە خەوی جەهل و مەستی و غەفڵەت**
**بە خەبەر بێن بە نەغمەیی ڕەحمەت**

**پاکی دەرچن لە کاری نابەمەحەل**
**ڕۆمی ڕافرێنن بۆ دەری ئەسفەل**

**"حاجی"یە شیعرەکانی وەک کاوە**
**ڕۆژێ دەبینن درەفشی هەڵداوە**

دیوانی حاجی، ل ١٩٦.

لەم شـیعرەدا دەبینـین کۆمەڵێـک نیشـانەی گوتـاری دینـداری لە چەشـنی "ئـایەتی مـونزەل"، ئەحـمەدی مورسـەل"، "نەغمەیـی ڕەحـمەت"، و "دەری ئەسفەل" دەست دەخەنە نێو دەستی هەندێک هێمای گوتـاری نیشـتمانپەروەریی وەک "مـوڵکی کوردوسـتان" و "درەفشـی کـاوە" بە مەبەسـتی زەقکـردنەوەی پەیـامی شۆڕشـگێڕانەی حـاجی کە "بە خەبەرهـاتنی بـێ نەوایـانە لە خەوی غەفڵەت" و "ڕافراندنی ڕۆمی" یە لە خاکی کوردستان.

بە کورتی، دەتوانین بڵێـین حـاجی قـادر تـۆخترین و زەقتـرین هەڵوێسـتی نیشتمانپەروەرانە و شۆڕشگێڕانەی خۆی لە قاڵبی جووت سـەروادا گونجانـدووە. هۆکاری ئەم زەقبێژییەش لە جووت سـەرواکانیدا دەگەڕێتەوە بـۆ، لە لایەکەوە،

تێگەیشتن لە گرینگیی گوتاری نیشتمانپەروەرانە بۆ ڕزگاریی گەلی ژێردەستی خۆی ، واتە کورد، و لە لایەکی ترەوە، قووڵ و چڕبوونەوەی ئەزموونی غەریبایەتیی دواساڵانی تەمەنی و هاوکات تەشەنە سەندنی عیشقی وڵات و ئەڤینی ئەو خەڵکەی لێیان دوور بووە، وەک چۆن لەم چەند دێڕەی جووت سەروای "لە مەیدانی بەهارا"، (ل ٢٤٧-٢٥٢)، ئەم خاڵانە دەردەکەون:

**مەکەن مەنعم هەموو ڕاستە مەقالەم**
**بە بورهان و حەدیسی فەخری عالەم**

**وەتەن مەحبووبەیەکە حوجرەئارای**
**نیشانەی دین و ئیمانە تەمەنناى**

**لە "ئادەم" بگرە تا دەورانی ئێستا**
**یەکێکە حاجی لەو خەڵکە هەڵستا**

**کە غەمخواری بکا بۆ میللەتی خۆی**
**لە بەینی گەورەکان و شێخی بێ پۆی**

**زەمانە تووشی دەرد و غوربەتی کرد**
**غەمی کۆیێ پەرێشانی هەمووی کرد**

دیوانی حاجی، ل ٢٥٠.

**ئەنجام**

لەم وتارەدا باس لە سێ قۆناغی ڕەوتی گۆڕانکاریی قاڵب و ناوەڕۆک لە شیعری حاجی قادری کۆیی-دا کرا. قۆناغی یەکەم ئەو قۆناغەیە کە حاجی هێشتا کوردستانی جێ نەهێشتووە و غەزەل دەکات بە قاڵبی سەرەکیی شیعرەکانی، و هەر بەم پێیەش، ناوەڕۆکی شیعری ئەم قۆناغەی تەغەزول و دلّداری و باسی مەعشووق و زوڵف و قەد و باڵای یارە. لەم قۆناغەدا حاجی پتر لاساییکەرەوەی شیعری شاعیرانی پێشڕەوی قوتابخانەی بابانە و بابەتی کوردایەتی چ پێگە و جێگەیەکی نییە. قۆناغی دووهەم قۆناغی نووسینە لە قاڵبی قەسیدەدا کە تێیدا حاجی وردە وردە ڕوو دەکاتە بابەتی نەتەوەیی و پەسندکردنی خاک و چیا و چۆڵی نیشتمانەکەی. حاجی لەم قۆناغەدا کوردستانی جێ هێشتووە و قەسیدەکانی حاجی لە ئەزموونی ژیانی غەریبایەتیی ئەستەمبۆڵ-دا نووسراون. لەم قۆناغەدا حاجی تەفەکور و عەقڵی نەتەوەیی جێنشینی تەغەزول و عیشقی تاکەکەسی دەکات و مۆتیفی کورد بە فراوانی بە کار دەهێنێت. لە دوا قۆناغدا، واتە قۆناغی سێهەم، حاجی لە قاڵبی جووت سەروا کەڵک وەردەگرێت و زەقترین هەڵوێستگەلی سیاسی و نیشتمانپەروەرانەی لە دووتوێی ئەم قاڵبەدا دەگونجێنێت. جووت سەرواکانی حاجی ئاکامی ئەزموونێکی دووردرێژی ژیانی ئاوارەیی و تاراوگەنشینیی دواساڵانی تەمەنێتی. مۆتیفی "کورد" لەم قۆناغەدا زێترین ڕێژەی بەکارهێنانی هەیە و شیعر لەم قالبەدا زۆر جار ڕێڕەوی پەیامی ڕاشکاوانە دەگرێت.

سەرچاوەكان:

١- سەردار حەمید میران، كەریم موستەفا شارەزا (١٣٩٠) دیوانی حاجی قادری كۆیی. سنە: بڵاوكردنەوەی كوردستان.

٢- كەمال غەمبار (٢٠٠٨) بەرەو جیهانی شیعریی چەند شاعیرێک. هەولێر: دەزگای ئاراس.

3- Culler, Jonathan (2011) Literary Theory: A Very Short Introduction, 2nd ed. Oxford: University Press.

4- Perrine, Laurence (1993) Literature: Structure, Sound, Sense. New York: Harcourt.

5- Brooks, Cleanth (2004) "Irony as a Principle of structure", in Critical Theory since Plato, 3rd ed., H. Adams. Belmont: Wadsworth Publishing Company.

٦- پاینده، حسین (١٣٩٠) گفتمان نقد: مقالاتی در نقد ادبی. تهران: انتشارات نیلوفر.

## ملخص البحث

يحاول هذا المقال اثبات ان اشعار الشاعر حاجي قادر كويي قطعت ثلاث مراحل مختلفة من حيث الشكل والمضمون، المرحلة الاولى هي المرحلة التي استفاد منها الشاعر من شعر الغزل ويكتب عن العلاقات العاطفية والغزل، وفي المرحلة الثانية يجعل الشاعر من القصيدة شكلا جديدا لشعره ويبني في داخله الروح الوطنية والثورية، اما المرحلة الثالثة والاخيرة وهي مرحلة الشعر المثنوي التي عرف به الشاعر حاجي قادر كويي في الشعر الوطني والنقد الثوري بالنسبة لوطنه وشعبه. من المؤكد كان للمراحل الثلاث تأثيراً كبيراً على التغييرات التي حصلت في طبيعة اشعار الشاعر كويي ومكان تواجده وطبيعة حياة الشاعر، وغدا بعد الشاعر عن الوطن والاستقرار في اسطنبول سبباً في تغيير فلسفته تجاه الحياة والوطن.



## Abstract

This paper shows how Haji Qadir Koyi’s poetry has experienced three different stages in case of form and content. In the first stage, Haji has used “Gazal” (sonnet) in which romantic relations are depicted. The second stage is the stage where Haji leaves “Gazal” and uses “Qasida” (long descriptive poem) to express his nationalistic feelings. The last stage, in which Haji explores another form of poetry named “Masnavi”, enhances nationalism as a political ideology and the only way of Kurdistan liberation. The paper shows that how these stages go hand in hand with changes of Haji’s thought and worldview regarding his life and la

# جووڵانەوەی چەکداریی هۆزی هەمەوەند
# ساڵی ١٩٠٨ - ١٩٠٩
## توێژینەوەیەکی بەڵگەنامەیی

**د. حەسەن کەریم جاف**
خانەنشین

**فەرهاد عەبدولعەزیز محەمەدئەمین**
کۆلێژی ئەدەبیات –
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**پێشەکی:**

پاش رووخانی میرنشینیی بابان و گەڕانەوەی دەسەڵاتی ناوەندی عوسمانی، هەمەوەندەکان یەك لەو هۆزانە بوون کە دژ بەو بڕیارە هاتوونەتە دەنگ و، ئەو راپەڕینەی کە لەژێر سەرکردایەتی عەزیز بەگی باباندا لە ساڵی ١٨٥١ز. دەستیان پێکردووە، بەدرێژایی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم و ساڵەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم دەستبەرداری نەبوون و نەیانهێشتووە خامۆش ببێتەوە.

یەك لە راپەڕینە هەرە کاریگەرەکانی هەمەوەندەکان، کە وەك درێژکراوەی جووڵانەوە و یاخیبوونەکانی پێشوویان بەرپایان کردووە. بریتییە لەو جووڵانەوە چەکدارییەی کە ساڵی ١٩٠٨ز. دژ بە کودەتای تورکە لاوەکان و جاڕدانی مەشرووتییەت بەهەمان شێوەی زۆر لە نەتەوە و هۆز و هەرێم و ناوچەکانی تری ناو چوارچێوەی سنووری قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی بەرپایانکردووە. ئەم جووڵانەوە چەکدارییەی هەمەوەندەکان گرنگییەکەی لەوەدایە کە هەم لەڕووی ماوەوە جووڵانەوەیەکی چەکداریی درێژخایەن بووەو بۆ ماوەی نزیکەی دوو ساڵ بەردەوامی هەبووە. هەم لەڕووی چالاکی و جموجۆڵی چەکداریشەوە ئەوەندە کاریگەر بووە، بەجۆرێك کە عوسمانییەکان ناچاربوون بۆ دامرکاندنەوە و زاڵبوون بەسەریدا داوای رێکەوتن و هاوکاری لە دەوڵەتی ئێران بکەن و، پێکەوە بە دووقۆڵی کار لەسەر پەلاماردان و سەرکوتکردنی بکەن.

لەم توێژینەوەیەدا هەوڵدراوە رێبازەکانی توێژینەوەی زانستی پەیڕەو بکرێت، لەسەر بنەمای پشتبەستن بە بەڵگەنامە و نووسراوی رەسمیی تایبەت

بەبابەتەکــە و، شــیکردنەوە و تێڕامــان لــە زانیارییــەکانیان و تەماشــاکردنیان بەچاوێکی رەخنەگرانەی زانستییانەوە، لەگەڵ رەچاوکردنی بێلایەنی لە داڕشـتن و بەیانکردنی زانیارییەکاندا.

ئـەم توێژینەوەیـە پێشـەکی و سـێ تـەوەری سـەرەکی و ئـەنجامێکی لـەخۆ گرتــووە، تــەوەری یەکــەم ، بــۆ باســکردنی قۆنــاغی یەکــەمی جووڵانەوەکــە تــەرخانکراوە و لــەو چوارچــێوەیەدا ســەرباری کورتەباســێك لەســەر ناســاندنی هەمەوەنـدەکان و هـەروەها بـەیانکردنی هۆکارەکـانی بـەرپابوونی جووڵانەوەکـە، باس لە وردەکاریی رووداوەکانی قۆناغی یەکەمی جووڵانەوەکەش کراوە. تـەوەری دووەمیش، بۆ شیکردنەوەی ئەو هەوڵانە تەرخانکراوە کـە هەریـەك لـە دەوڵـەتانی ئێـران و عوسمـانی خسـتوویانەتە گـەڕ لـەپێناو سـەرکوتکردنی جووڵانەوەکـەدا. هەرچـی تـەوەری سێیەمیشـە، بـۆ باسـکردنی قۆنـاغی دووەمـی جووڵانەوەکـە تەرخانکراوە و باس لەو ئاستەنگانە کراوە کە لەلایەن عوسمانییەکانەوە خراوەتـە بـەردەم هەمەوەنـدەکان، کـە ئـەوەش هۆکـار بـووە بـۆ دووبـارە یاخیبوونـەوەی هەمەوەندەکان و ناچارکردنیان بـەوەی کـە سـەرلەنوێ رووبکەنـەوە سـنوورەکانی ئێـران، تــا ئەوکاتــەی کــە لەئەنجامــدا عوسمانییــەکان ناچــار مــاون لەبــەردەم بەردەوامیی خەباتی هەمەوەندەکانـدا دان بەشکسـتی خۆیانـدا بنـێن و لێبـووردنی گشتی بـۆ سـوارەکانیان دەربکـەن و رێگـەیان پـێ بـدەن جـارێکی تـر بگەڕێنـەوە ناوچەکانی خۆیان.

بـەو هۆیـەوە کـە پریشـکی ئـەم جووڵانەوەیـە لەهـەمان کاتـدا بـەر هـەردوو دەوڵەتی ئێران و عوسمانی کەوتووە. ئەمـە کـارێکی کـردووە کـە لـەناو ئەرشـیفی بەڵگەنامەکانی هەردوو وڵاتدا ژمارەیەکی زۆر بەڵگەنامەی تایبەت بەو جووڵانەوەیە بوونیان هەبێت، کە تایبەت کراون بەرووداوەکانی جووڵانەوەکـە و ئـەو هاوکـاری و هەماهەنگییـەی کـە لـەنێوان ئـەو دوو دەوڵەتـەدا هاتۆتـە ئـاراوە بـۆ لێـدانی ئـەو جووڵانەوەیــە. ئــەو بەڵگانــە هەرچــەندە بــەگیانی ناحەزانــە و دوژمنکارانــەوە نووسراون، بەڵام لەهـەمان کاتـدا گەنجینەیـەکی دەوڵەمەنـدن و پـڕن لـە زانیـاریی تازەو شاراوە دەربارەی جووڵانەوەکە. جا گرفتی گەورەی بەردەم هـەر توێـژەرێك بـەدەر لەچـۆنیەتی دەستخسـتنی ئـەو بەڵگانـە، بریتییـە لەچـۆنیەتی وەرگێڕانـی

بەڵگەکان. بەتایبەت کە ئەو بەڵگانە لەکاتی خۆیاندا لەپێناوی نووسینەوە و تۆمارکردنی مێژوودا نەنووسراونەتەوە، بەڵکو زۆربەیان برووسکە و نامەی سەربازین و کۆمەڵێك وشە و هێمایان لەخۆ گرتووە کە تێگەیشتنیان کارێکی ئاسان نییە. هەروەها هەریەك لەو بەڵگانە بەزمانی سەردەمەکەی خۆیان نووسراونەتەوە، کە لەچاو ئێستادا ئەو زمانانە گۆڕانکاریی زۆریان بەسەردا هاتووە، بەجۆرێك کە قسەکەرانی خودی ئەو زمانە هەروا بەئاسانی ناتوانن لێیان تێبگەن، چ جای کەسانێکی بێگانە کە ئەو زمانانە زمانی یەکەمی قسەکردنی خۆیان نییە. سەرباری هەموو ئەمانەش بەتایبەت بەڵگەنامەکانی ناو ئەرشیفی دەوڵەتی ئێران زۆربەیان بەشێوە ڕێنووسێك نووسراونەتەوە کە نەك وەرگێڕانیان تەنانەت خوێندنەوەشیان کارێکی زۆر گرانە بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی کە شارەزایی زۆر باشیان لە شێوازە جیاوازەکانی ڕێنووسەکاندا نییە.

هەموو ئەوانەی باسکران دیارترین ئەو گرفتانە بوون کە هاتوونەتە بەردەم ئامادەکردنی ئەم توێژینەوەیە، بەڵام سەرباری هەموو ئەمانەش توانراوە ژمارەیەکی باش بەڵگەنامەی ناو ئەرشیفەکانی هەردوو دەوڵەتی ئێران و عوسمانی بەردەست بخرێن و سوودیان لێ وەربگیرێت و بکرێن بەسەرچاوە بۆ ئامادەکردنی ئەم توێژینەوەیە.

## تەوەری یەکەم:
## قۆناغی یەکەمی جووڵانەوەکە

### هەمەوەندەکان (ناساندن):

هەمەوەندەکان بەڕەچەڵەك دەچنەوە سەر هۆزی (ئەحمەدوەند)ی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، لە کۆتایی نیوەی یەکەم و سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم و لەو ماوەیەدا کە نادرشا و دوای ئەویش کەریم خانی زەند تیایدا فەرمانڕەوا بوونە بەسەر ئێرانەوە، ئەو وڵاتەیان بەجێ هێشتووە و روویان لە سنوورەکانی دەوڵەتی عوسمانی کردووە. ماوەی دوای مردنی نادرشا، کە ماوەیەك بووە تیایدا ئاژاوەو پشێوی زۆر سەریان هەڵداوە و چەندین سەرکردەی سەربازی لە گۆڕەپانی سیاسیی ئێراندا پەیدا بوون کە هەوڵی دەستبەسەردا گرتنی حوکمی ئەو وڵاتەیان داوە و بۆ گەیشتن بەو مەبەستە هەوڵیان داوە سوود

لە هێز و توانای هۆزەکانی نیشتەجێی ئێران وەربگرن و بەخواییشت بێت یان بە زۆر ناچاریان بکەن کە شەڕیان بۆ بکەن و تێکەڵ بەهێزەکانیان بن، کەریم خانی زەند (١٧٥٠ – ١٧٧٩) یەك لەو سەرکردانەی سەر گۆڕەپانی سیاسیی ئێران بووە کە زۆر لە هۆزە کوردییەکانی ناچارکردووە دوای بکەون و شەڕی بۆ بکەن، کە ئەحمەدوەندیی کوردی نیشتەجێی قەڵەمڕەوی کرماشان یەکێك لەو هۆزانە بووە کە (کەریم خان) ناچاری کردوون لەگەڵیدا بچن بۆ شیراز[1]. ئەمەش هۆکاری سەرەکی جیابوونەوەو لێکترازانی ئەحمەدوەندەکان بووە و ئەو بەشەی هۆزەکە کە نەیانویستووە ئەو داوایەی (کەریم خان) جێبەجێ بکەن، لەژێر فەرماندەیی (خوامراد) ناوێکدا لە هۆزەکەیان دابڕان و لەترسی سزادانیان لەلایەن (کەریم خان)ەوە، روویان لە ناوچە سنوورییەکان کردووە. سەرەتا چوونەتە ناوچەی بانە و ماوەیەك لای (شێخ رەزای هەنگەژاڵ) گیرساونەتەوە[2]. سەبارەت بەمێژووی هاتنیشیان، خاوەنی دانراوی (سیاحت نامەء حدود) مێژووی ئەو هاتنەی بەساڵەکانی ١١٨٠ یا ١١٩٠ك. (١٧٦٦/١٧٧٦ز.) دەسنیشان کردووە[3].

هەمەوەندەکان لە ناوچەی بانە وەکو هۆزێکی نوێ دەرکەوتوون و تێکەڵاو بەکۆنفیدراسیۆنی هۆزی جاف بوون و بەو هۆیەشەوە روویان لە ناوچەی شارەزوور کردووە[4] دواتریش چوونەتە ناوچەی قەرەداغ و[5] چەند گوندێکی ئەو مەڵبەندەیان بۆ خۆیان داگیرکردووە و تیایدا ژیاون[6].

سەبارەت بەناوچەی بازیانیش لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا. ناوچەیەك بووە کە هەمەوەندەکان لە چوارچێوەی کۆچ و ڕەوی خۆیاندا، شانبەشانی هۆزەکانی ناو ئێلاتی غەوارە روویان تێ کردووە. بەتێپەڕبوونی کات ئەو ناوچەیە بووە بەشوێنی نیشتەجێی نەك بەتەنها هەر هەمەوەندەکان، بەڵکو زیاتر لە هۆزێکی ناو کۆنفیدراسیۆنی ئێلاتی غەوارە و هەریەك لە هۆزەکانی (کافرۆشی و مەنمی و شینکی ... تاد)، شانبەشانی هەمەوەندەکان هەمان ئەو ناوچەیەیان کردووە بەشوێن و مەڵبەندی نیشتەجێبوون بۆ خۆیان. بەڵام هەمەوەندەکان کە هەمیشە بەهێرشکردنە سەر دراوسێکانیان ناسراوبوون[7]، توانیویانە زۆربەی هۆزەکانی ئەو ناوچەیە لەوانە (مەنمی، کافرۆشی، پیریادی ... تاد)، ژێر دەستە بکەن و جێ پێی خۆیان لە ناوچەکانی (بازیان و چەم چەماڵ)دا

بکەنەوە و هەژموونی دەسەڵاتی خۆیان بەسەر ئەو هۆزانە و بەسەر ناوچەکەدا بسەپێنن[٨]. ناوچەکانی نێوان لە باکوورەوە شوانی بازیان و چیای تۆکمە، لە باشوورەوە چەمی باسەرە و لەرۆژهەڵاتەوە زنجیرەی تاسڵووجە، لە رۆژئاواشەوە قەرەحەسەن و شوانی خاسە، بکەن بەسنوور بۆخۆیان[٩].

## هۆکارەکانی بەرپابوونی جووڵانەوەکە:

أ- یەك لە جووڵانەوە چەکدارییە هەرە دیارەکان کە پاش چەند ساڵێك لە خامۆشی و بێدەنگی، هەمەوەندەکان لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٠٨ز. بەرپایان کردووە. ئەو جووڵانەوەیە بووە کە سوارەکانی هۆزەکە لەچوارچێوەی راپەرین و نارەزایی هۆزەکان و شار و ناوچەکانی کوردستان، دژ بەکودەتای تورکە لاوەکان و جاردانی مەشرووتیەت لە (٢٣ تەمموزی ١٩٠٨ز.)، دەستیان پێکردووە[١٠]، دواتریش دژ بە کوژرانی (شێخ سەعیدی حەفید)[١١]، درێژەیان پێداوەو لەسەری بەردەوام بوون.

ب- لە سەرەتای بەرپابوونی جووڵانەوەکەدا، هەمەوەندەکان توانیویانە پشێوییەکی زۆر بەتایبەت لە ناوچەکانی سلێمانی و دەوروبەریدا دروست بکەن. کە دەکرێت نارەزایی هەمەوەندەکان لەهاتنە سەر حوکمی تورکە لاوەکان و. ئەو سیاسەتی توندوتیژییەی کە کاربەدەستە تورکەکانی دەسەڵاتی نوێ سەبارەت بەهۆزەکان پەیرەویان کردووە کە دیارترینیان بریتی بووە لە سیاسەتی هەڵوەشاندنەوەی تیپەکانی سوارەی حەمیدی لە مانگی (ئەیلوولی ساڵی ١٩٠٨ز.). واتە بەکەمتر لەدوو مانگ لەپاش هاتنە سەر حوکمیان، بەدیارترینی ئەو هۆکارانە لەقەڵەم بدرێن کە رۆڵیان هەبووە لە هاندانی هەمەوەندەکان و هۆزەکانی تری کوردستان بۆ بەرپاکردنی جووڵانەوەکانیان. بابەت و شێوازی کۆکردنەوەی باج و داهات لەلایەن کاربەدەستانی دەسەڵاتی نوێوە هۆکارێکی تری پشت هەڵگیرسانی جووڵانەوەکەی هەمەوەندەکان بووە، چونکە ئەندامانی ئەو هۆزە لەماوەکانی پێشووتردا مەگەر بەدەگمەن ئەگینا نەچوونە ژێرباری داواکارییە داراییەکانی حکومەتی عوسمانییەوە، کەچی تورکە لاوەکان هەر لەگەڵ گەیشتنیان بە دەسەڵات و لە ساڵی یەکەمی فەرمانرەواییانەوە کەوتوونەتە گرتنەبەری شێوازی

جۆراوجۆر بۆ ناچارکردنی خەڵکی، تاکو مل بدەن بۆ کۆکردنەوەی باج و پابەندە داراییەکانی سەریان. ئەندامانی هۆزی هەمەوەند یەك لەو خەڵکانە بوون کە لەهەمان ساڵی هاتنە سەر حوکمی تورکە لاوەکاندا ناچارکراون بەوەی باج بدەن و باجیان لێ کۆکراوەتەوە[١٢]. بەڵام عوسمانییەکان هەمیشە ئۆباڵی جموجۆڵی هەمەوەندەکانیان خستۆتە ئەستۆی بەرەی شێخانی سلێمانی و، بەتایبەت (شێخ سەعیدی حەفید)یان بەدەستی شاراوەی پشتەوەی تەواوی کردەوەکانی سوارەکانی ئەو هۆزە زانیوە[١٣].

کاربەدەستە تورکەکانی ناوچەکە، کە خۆیان لە شێخ سەعید بەبیانوو بوون. بابەتی هاندانی هەمەوەندەکانیشیان کردۆتە خاڵێکی تر، تاکو زیاترو زیاتر ئەو کەسایەتییەی پێ تاوانبار بکەن و بەهۆیەوە بڕوا بەکاربەدەستانی باڵای وڵاتەکەیان بهێنن، تا خۆی و خانەوادەکەی و دەستوپێوەندەکانی لە سلێمانی دوور بخەنەوە. ئاکامیش وەك ئەوەی کە ئەو کاربەدەستانەی تورك پلانیان بۆ دارشتووە، شێخ سەعید بۆ موسڵ دوورخراوەتەوە و، هەر لەو شارەش لە رووداوێکی تەمومژاویدا، خۆی و شێخ ئەحمەدی کوڕی و کۆمەڵێك لە دەستوپێوەندەکانی لەناو براون[١٤].

بەڵام بەپێچەوانەی خواستی کاربەدەستانی ناوچەکەوە، دوورخستنەوە و کوشتنی شێخ سەعید، نەك نەبووەتە هۆی کۆتاییهاتنی جووڵانەوەی هەمەوەندەکان، بەڵکو ئەو رووداوە دەنگدانەوەیەکی گەورەی وەهای لای زۆربەی هۆزەکانی ناوچەکە و دەروێش و لایەنگرانی بنەماڵەی شێخانی سلێمانیدا دروستکردووە، کە تەواوی ئەوانی دژ بەو کارەساتە هێناوەتە دەنگ و، وای لێکردوون کە راپەڕین بەرپا بکەن[١٥]. سەبارەت بە هەمەوەندەکان، رووداوی کوژرانی شێخ سەعید هانی داون ئەو جووڵانەوەیەی کە لەماوەکانی پێشتردا دەستیان پێکردبوو، دوای ئەو رووداوە فراوانتری بکەن.

### رووداوەکانی جووڵانەوەکە:

سوارەکانی ئەو هۆزە بەحوکمی ئەوەی کە خەڵکی سلێمانی و کاربەدەستە حکومییەکانی ئەو شارەیان بەهۆکاری دوورخستنەوە و کوشتنی شێخ سەعید

زانیوە. لێرە بەدواوە زۆربەی هەڕەشـە و پـەلامارەکانی خۆیـان ئاراسـتەی شـاری سلێمانی کردووە و، ئابڵووقەیەکی توندیان خسـتۆتە سـەری و، تـەواوی ڕێگاکـانی چوون بۆ ئەو شارەیان داخستووە[١٦]، بەجۆرێك کە هیچ کاروانێك نەیتوانیوە بەبێ پارێزگاریی ژمارەیەکی زۆر لە سەرباز بەو ڕێگایانـەدا تێپـەڕێت و خـۆی بگەیەنێتـە سـلێمانی، تەنانـەت زۆرجـار هاوکـاری و پارێزگـاریی سـەربازەکانیش لـە توانایـدا نـەبووە درز بخاتــە ئابڵووقــەی هەمەوەندەکانــەوە و، کاروانــەکان بــە ســەلامەتی بگەیەنێتە سلێمانی. هەر لەو ماوەیەدا لە چەندین هەوڵی جیـاوازدا عوسمانییـەکان هەوڵیان داوە ئابڵووقەی هەمەوەندەکان ببڕن و خۆیان بگەیەننـە سـلێمانی، بـەڵام بۆیان نەکراوە. یـەکێك لـەو هەوڵانـەیان بریتـی بـووە لـە ڕەوانـەکردنی کـاروانێکی گەورە لـە (هـاوینی سـاڵی ١٩٠٩ز.) کـە لەلایـەن بـەتالیۆنێکی تـەواو لـە سـەربازی عوسمانییەوە پارێزگاری کراوە، بەڵام سوارە هەمەوەندەکان توانیویانە ڕێگری لەو کاروانە بکەن و پەلاماری بدەن. لەو پەلامارەدا سەرەڕای کوشتنی (١٢) سـەربازی عوسمانی و، بریندارکردنی ژمارەیەك سەربازی تر لە هەمان کاتـدا هەمەوەنـدەکان توانیویانــە دەسـت بەسـەر کاروانەکەشـدا بگـرن، تـەواوی سـەربازەکانی هـاوڕێی کاروانەکـەش چـەك بکـەن. کـە ئەمـەش هۆکـارێکی یارمەتیـدەری بـاش بـووە بـۆ سوارەکانی ئەو هۆزە تاوەکو بـبن بـە خـاوەنی ژمارەیـەکی زۆر لـە چـەکی جـۆری ماوزەڕ و خۆیانی پێ پڕ چەك بکەن[١٧].

هەر لـەو ماوەیـەدا سـوارە هەمەوەنـدەکان بـە هاوکـاریی سـوارەکانی هـۆزی شوان و سۆفیەوەندەکان پەلاماری کاروانێکی (٢٥٠) سـەربازی عوسمانییـان داوە، کە بەنیاز بـووە بـۆ ڕێگـرتن لەڕاپـەڕینی خـەڵك، چـەك بگوازێتـەوە بـۆ نـاو شـاری سلێمانی. لە ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی چارەك سەعاتیدا پاش ئەوەی دوو ئەفسـەر و چــەند ســەربازێکیان لــێ کوشــتوون، بــاقی ئەنــدامانی تــری کاروانەکەشــیان دەسگیرکردووە[١٨].

بـــەردەوامیی ئابڵووقـــەی هەمەوەنـــدەکان لەســـەر شـــاری ســـلێمانی، مەترسییەکانی سەر ئەو شارەی بـەجۆرێك زیـادکردووە، کـە والیـی موسـڵی ناچـار کـردووە داوا لـە (تۆفیـق پاشـا)ی موتەسـەڕیفی ئـەو شـارە بکـات هەرچـی زووە شارەکە بەجێ بهێڵێت و خۆی بگەیەنێتە شاری کەرکووك، بەڵام تەنانەت کەژاوەی

کاروانی هێزە پاسەوانەکانی موتەسەڕیفی سلێمانیش، نەیانتوانیوە بەبێ کێشە و دوور لەپەلاماری سوارەکانی هەمەوەند ئەو ڕێگایە ببڕن، بەڵکو ئەوانیش کەوتوونەتە بۆسەی ئەو سوارانەوە و، پاش ئەوەی گورزێکی گەورەیان بەرکەوتووە، تەواوی چەك و شمەکەکانیشیان بەتاڵانی کەوتۆتە دەست هەمەوەندەکان، موتەسەڕیفی سلێمانیش پاش ئەوەی تەواوی شمەك و کەلوپەلەکانی بەتاڵان براون، بەپەلەپرووزکێ توانیویەتی خۆی دەرباز بکات و بگەڕێتەوە بۆ شاری سلێمانی[١٩]. ئەمەش وایکردووە کە تۆفیق پاشا جارێکی تر بیر لە دەرچوون لە سلێمانی نەکاتەوە، تا ئەوکاتەی کە لە چەم چەماڵەوە هێزێکی سەربازی (٣٠٠) کەسی چوونەتە سلێمانی و، لەگەڵ خۆیاندا ئەویان دەرباز کردووە و گەیاندوویانەتە چەم چەماڵ[٢٠].

دوای خۆی لەپێناو دوورگرتنی شاری سلێمانی لە هەر هێرش و پەلامارێکی هەمەوەندەکان، (تۆفیق پاشا)، جڵەوی ئیدارەی شارەکەی بە (مەحموود پاشا)[٢١]ی سەرۆکی هۆزی جاف سپاردووە[٢٢]. بەئومێدی ئەوەی شەڕەکە لەشەڕی نێوان خۆیان و هەمەوەندەکانەوە، بگۆڕێ بەشەڕی جاف و هەمەوەندەکان و ئەوەی بەخۆی و هێزەکانی نەکرا بەجافەکان و سوارەکانی ئەو هۆزە ئەنجامی بدات.

بەردەوامیی جووڵانەوەکەی هەمەوەندەکان و سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکانی سوارەکانی ئەو هۆزە لەو ماوەیەدا لەئاستێکدا بووە، کە بووەتە جێگەی سەرنجی دەوڵەتێکی گەورەی وەکو دەوڵەتی بەریتانیا و نوێنەرایەتی ئەو دەوڵەتە لە ولایەتەکانی بەغداد و موسڵ، لەپێناو لەنزیکەوە ئاگاداربوون لە ڕووداوەکانی جووڵانەوەکە، جێگری کونسوڵی ئینگلیز لە ولایەتی موسڵ (ئێدوارد ویلکی) سەرباری ڕێگری و ناڕەزاییەکانی کاربەدەستانی حکومەتی عوسمانی لە ناوچەکە، لەمانگی تەموزی ساڵی ١٣٢٥ ڕۆمی (١٩٠٩ز.)دا سەردانێکی مەیدانیی ناوچەی هەمەوەندەکانی کردووە[٢٣].

## تەوەری دووەم:
## هەوڵی دەوڵەتانی ئێران و عوسمانی بۆ سەرکوتکردنی جووڵانەوەکە

### هەوڵەکانی عوسمانییەکان بۆ سەرکوتکردنی جووڵانەوەکە:

خراپیی بارودۆخی سلێمانی و، بەردەوامی مەترسییەکانی هەمەوەندەکان و، هەروەها گوشارە بەردەوامەکانی بازرگانەکانی کەرکوك و بەغداد و موسڵ، تێکڕا کارێکیان کردووە عوسمانییەکان بڕیاری ڕەوانەکردنی هێز بۆ سەر هەمەوەندەکان و شکاندنی ئابلۆوقەی سەر شاری سلێمانی دەربکەن. پێشەنگی هێزی عوسمانییەکان لە مانگی تەمموزی ١٣٢٥ی ڕۆمی (١٩٠٩ز.)، لە کەرکوك دەرچوون و دەستیان بەپێشڕەوی کردووە، بەڵام تاکو کۆتایی ئەو مانگە ئەوسا توانیویانە بەشێك لە ڕێگای نێوان کەرکوك و سلێمانی بکەنەوە و هێڵی برووسکە (خط البرق)ی سەر ئەو ڕێگایە کە لەلایەن هەمەوەندەکانەوە تێك درابوو چاك بکەنەوە[٢٤].

گەر سەرنج بدرێتە بڕیاری ڕەوانەکردنی هێز بۆ سەر هەمەوەندەکان، تێبینی ئەوە دەکرێت کە ئەو بڕیارە بڕیارێکی درەنگ وەخت بووە، چونکە ماوەی نێوان دەستپێکردنی جووڵانەوەکانی هەمەوەندەکان و بڕیاری ڕەوانەکردنی هێز لەلایەن عوسمانییەکانەوە زیاتر لە هەشت مانگیان لە نێواندا بووە. هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە گەڕاوەتەوە کە تورکە لاوەکان نەیانویستووە لە سەرەتای هاتنە سەر حوکمیانەوە، خۆیان تێکەڵ بەگێژاوی شەڕی هۆزە کوردییەکان لەوانە هەمەوەندەکان بکەن. بەتایبەت وەك پێشتر ئاماژەی پێدرا، دوای کوژرانی (شێخ سەعید) نەك بەتەنها هەر هەمەوەندەکان، بەڵکو زۆربەی خەڵك و هۆزەکانی ناوچەکە ڕاپەڕیبوون و دژ بەو کردەوەیەی تورکە لاوەکان هاتبوونە دەنگ و دەستیان دابووە چەك. بۆیە عوسمانییەکان مەبەستیان بووە بە گفتوگۆ و لە ڕێی بڕینی بیانووی ئەو هۆزانەوە، کارێك بکەن تا ئەو هۆزانە کۆتایی بەناڕەزایی و جووڵانەوەکانیان بهێنن. لەو پێناوەشدا (ڕەشید پاشا)ی والیی نوێی ولایەتی موسڵ پاش تێپەڕبوونی تەنها یەك ڕۆژ بەسەر دەستبەکاربوونیدا، سەردانی سلێمانی کردووە و لەگەڵ خۆیدا (شێخ مەحموودی کوڕی شێخ سەعیدی حەفید)، کە یەکێك بووە لە ڕزگاربووانی ڕووداوەکەی موسڵ، لەگەڵ خۆیدا هێناوەتەوە بۆ

سلێمانی و، هەروەها بەڵێنیشی داوە لێکۆڵینەوەی ورد لە ڕووداوەکە بکات[٢٥]. لە لێکۆڵینەوەکەشدا والیی موسڵ کە خۆی سەرپەرشتی کردووە، لەپێناو ڕازیکردنی دڵی بنەماڵەی شێخانی سلێمانی و لایەنگرانی ئەو بنەماڵەیەدا، زۆر بەئاشکرا بەلای بنەماڵەی شێخاندا دایتاشیوە و، تەواوی تاوانی دوورخستنەوە و ئاوارەبوونی (شێخ سەعید)ی خستۆتە ئەستۆی بازرگانەکانی شاری سلێمانی[٢٦]. بەڵام وەك دەردەکەوێت هەموو ئەو هەنگاوانەی والیی موسڵ نەیتوانیوە بڕوا، بەتایبەت بەهەمەوەندەکان بهێنێت تاکو دەست لە جووڵانەوەکانیان هەڵبگرن، بۆیە دەکرێ بوترێت ئەوەی لە سەرچاوەکاندا باسکراوە سەبارەت بەکاریگەریی کوژرانی (شێخ سەعیدی حەفید) لەسەر بەرپابوونی جوولانەوەی هەمەوەندەکان، هەموو هۆکاری پشت بەرپابوونی ئەو جووڵانەوەیە نەبووە. بەڵکو لەپاڵ ئەو هۆکارەدا، وەك پێشتر ئاماژەی پێدرا هۆکاری تریش بوونیان هەبووە.

سووربوونی هەمەوەندەکان لەسەر بەردەوامیدان بە جووڵانەوەکانیان، هیچ هەڵبژاردەیەکی لە بەردەم عوسمانییەکان نەهێشتۆتەوە تەنها ئەوە نەبێت کە پەنا بۆ بەکارهێنانی هێز بەرن. بۆ ئەو مەبەستەش هێزێکی (٣٥٠) سەربازیی عوسمانی لە کەرکووکەوە جووڵەی پێکراوە. هێزەکە سەرەتا لە چەم چەماڵ مۆڵیان خواردووە. بەڵام پێش ئەوەی هیچ ئۆپەراسیۆنێك ئەنجام بدەن، لە شەوێکدا هێرشیان کراوەتە سەر و گورزێکی گەورەی لێ وەشێنراوە[٢٧]. ئەو گورزە کە (٢٧) سەربازی عوسمانی تێدا کوژراوە [٢٨]، کارێکی کردووە ئەو هێزە تا ماوەیەکی زۆر هەر لە چەم چەماڵ بمێننەوە و تا ئەوکاتەی کە ژمارەیان بۆ (٨) هەزار سەرباز بەرز نەکراوەتەوە، زاتی ئەوەیان نەکردووە بەرەو سلێمانی پێشڕەوی بکەن[٢٩].

درێژەکێشانی مانەوەی ئەو هێزانە لە چەم چەماڵ و، بەردەوامی نائارامیی ناوچەکە و، پەککەوتنی هەموو جۆرە هاتوچۆ و جمووجوڵێکی ئاسایی و بازرگانی لەو هەرێمەدا، بێزاریی زۆری خەڵکی ناوچەکە و بەتایبەت بازرگانەکانی ناوچەکەی بەدوای خۆیدا هێناوەو، کارێکی کردووە زۆربەی بازرگانەکانی شاری سلێمانی بکەونە کۆکردنەوەی خۆیان و ئامادەسازی بۆ کۆچکردن بۆ وڵاتی فارس[٣٠].

هەر لەو ماوەیەدا بەرامبەر بە بەردەوامی نائارامیی ناوچەکە بازرگانەکانی شاری کەرکووکیش هاتوونەتە دەنگ و، یاداشتێکیان ئاراستەی کاربەدەستانی

دەوڵەت کردووە و، تیایدا داوایان کردووە پەلە بکرێت لەپرۆسەی راوەدوونانی هەمەوەندەکان و لەوە زیاتر پرۆسەکە دوا نەخرێت، ئەمەو نارەزاییەکانی بازرگانانی شارەکانی بەغداد و موسڵ و سلێمانیش، لەلایەکی ترەوە[٣١]. تێکرا وایان لە (شەوکەت پاشا)ی والیی بەغداد کردووە بڕیاری هێرشکردن بۆ سەر ناوچەی هەمەوەند دەربکات، لەبەر رۆشنایی ئەو بڕیارەشدا هێزەکانی ناو چەم چەماڵ لە کۆتایی مانگی ئابی ساڵی ١٩٠٩ز.دا، بەرەو ناوچەی بازیان جووڵەیان پێکراوە[٣٢].

پاش گەیشتنی هەواڵی جووڵەپێکردنی هێزەکانی چەم چەماڵ، هەمەوەندەکان بڕیاریان داوە بەرگری نەکەن، بەڵکو کشاونەتەوە بۆ ناوچە سنوورییەکانی نێوان دەوڵەتانی ئێران و عوسمانی. سەربازە عوسمانییەکانیش، پاش گەیشتنیان بەناوچەی هەمەوەندەکان تەواوی گوندەکانی ئەو هۆزەیان بە چۆڵی بینیوە، ئەوسا بەناچاری لەپێناو داپۆشینی شکستەکانی خۆیاندا، بەشێك لە هێزەکانیان رەوانەی سەر ناوچەکانی هۆزی شوان کردووە و، داخی دڵی خۆیان بەگوندەکانی ئەو هۆزە رشتووە[٣٣]. بەشەکەی تری ئەو هێزانەش لە پێناو پەلاماردان و راوەدوونانی هەمەوەندەکاندا، درێژەیان بەپێشڕەوییەکانی خۆیان داوەو، بە هاوکاری زۆرێك لە هۆزە کوردییەکانی ناوچەکە و، لەژێر فەرماندەیی دوو سەرکردەی تورکدا بەناوەکانی (محەمەد بەگ و مەزهەر بەگ)، کەوتوونەتە سۆراخی سوارەکانی هەمەوەند، بەڵام ئەو هێزانە نەك نەیانتوانیوە گورزی سەربازی ئاراستەی سوارەکانی هەمەوەند بکەن، بەڵکو لە چەندین جێگەدا کەوتوونەتە بۆسەی ئەو سوارانەوە و، گورزی گەورەی سەربازییان بەرکەوتووە[٣٤].

ئەم بارودۆخە بەم شێوەیە درێژەی کێشاوە تا ئەو کاتەی سەرۆکەکانی هەمەوەند توانیویانە لای (مستەفا خان)[٣٥]ی سەرۆکی هۆزی جافەکانی جوانرۆ، پەناگەیەك بۆ خۆیان و ئەندامانی هۆزەکەیان بدۆزنەوە. ئەوکات لە مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٠٩ز.دا بەیەکجاری خاکی دەوڵەتی عوسمانییان بەجێ هێشتووە و، داخلی سنوورەکانی ئێران بوون و چوونەتە ناوچەی جوانرۆ بۆ لای (مستەفا خان)[٣٦].

**ڕێکەوتنی دووقۆڵیی دەوڵەتانی ئێران و عوسمانی بۆ لێدانی هەمەوەندەکان:**

چوونی هەمەوەندەکان بۆ لای مستەفا خان، نەبووەتە هۆی کۆتاییهاتنی پەلامارە چەکدارییەکانی ئەو هۆزە بۆ سەر بنکە و بارەگاکانی دەوڵەتی عوسمانی. بەڵکو هەر لە مانگی یەکەمی چوونیانەوە، بەهاوکاریی هێزەکانی ئەو سەرۆکە کوردە و، بەتایبەت بەسوود وەرگرتن لە پشتیوانیی (فەتاح بەگ)ی برای مستەفا خان، هەڵمەتەکانی خۆیان بۆسەر دامودەزگا و بنکە و بارەگاکانی دەوڵەتی عوسمانی دەستپێکردۆتەوە و دەستپێکی ئەو پەلامارانەشیان تاڵانکردنی کاروانێك بووە لە ناوچەی (بانەبۆر)، لەناو قووڵایی خاکی عوسمانیدا[٣٧].

شیاوی باسە هەڵمەت و پەلامارەکانی سوارەکانی هەمەوەند لەو ماوەیەدا نەك بە تەنها هەر عوسمانییەکان، بەڵکو لە زۆر بۆنەدا تەنانەت دامودەزگاکانی دەوڵەتی ئێرانیشیان کردووە بە ئامانج[٣٨]. ئەمەش وای لەکاربەدەستانی ئەو دوو دەوڵەتە کردووە، بەرژەوەندیی خۆیان لەوەدا ببیننەوە کە هاوکاری و هەماهەنگی لەگەڵ یەکتریدا بکەن، بۆ کۆتاییهێنانی یەکجارەکی بە مەترسییەکانی هۆزی هەمەوەند لە ناوچە سنوورییەکانی نێوانیاندا[٣٩]. بۆ ئەو مەبەستە باڵیۆزی ئێران لە بەغداد، لە مانگی سەفەری ساڵی ١٣٢٧ك. (شوباتی ١٩٠٩ز.)دا، سەردانی والیی بەغدادی کردووە و پێکەوە قسەیان لەسەر هەماهەنگیی نێوان هەردوولا کردووە بۆ کۆتاییهێنان بە مەترسیی هەمەوەندەکان و سەرکوتکردنی جووڵانەوەکانیان[٤٠]. سەرەنجام هەردوولا ڕێکەوتوون لەسەر ئەوەی کە والیی بەغداد هێزێك بە فەرماندەیی (محەمەد فازڵ پاشای داغستانی)، بەمەبەستی لێدانی هەمەوەندەکان ڕەوانەی ناوچە سنوورییەکانی نێوان هەردوو وڵات بکات، لەولاشەوە ئێرانییەکان بە هاوکاریی داود خانی کەڵهوڕ (سەردار موزەفەر)ی سنووورداری کرماشان و هۆزە کوردییەکانی تری سەر سنوور، هێزێکی هاوشێوە پێکەوە بنێن و بۆ هەمان مەبەستی پەلاماردانی هەمەوەندەکان ساز و ئامادەی بکەن[٤١].

دواتریش لەڕێی نانەوەی کێشە و دوژمنایەتییەوە لە نێوان کەلهوڕەکان لەلایەك و سەنجاوی جافەکانی جوانرۆ لەلایەکی ترەوە. ئێرانییەکان توانیویانە داود خان و زۆر لە هۆزە کوردییەکانی تری ئەو ناوچەیە، پەلکێشی ناو

ململانێکانی خۆیان و مستەفا خان و هەمەوەندەکان بکەن و، ئەو شەڕەی بە خۆیان نەکراوە، بەسوارەکانی کەڵهوڕ و هۆزە کوردییەکانی تری ناوچەکە ئەنجامی بدەن. سەرئەنجام بە هۆی هاوکاریی ئێرانییەکانەوە، شەڕەکە بە سەرکەوتنی کەلهوڕەکان و، کوژرانی (مستەفا خان)و شکستی هێزەکەی کۆتایی هاتووە[٤٢].

هەمەوەندەکانیش بەهۆی ئەنجامەکانی ئەو شەڕەوە هیچ پەناگەیەکیان بۆ نەماوەتەوە و سەرلەنوێ ئاوارەی ناوچە سنوورییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی ئێران و عوسمانی بوونەتەوە و بۆ ماوەی چەند مانگێك بەو شێوەیە بە هەڵواسراوی ماونەتەوە[٤٣]، ئەمەش بەشێکی زۆر لە هەمەوەندەکانی ناچارکردووە بەنهێنی و دوور لە چاوی سیخوڕ و چاودێریی سەربازە عوسمانییەکان بگەڕێنەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان لە بازیان و چەم چەماڵ و، لەناو گوندەکانی خۆیان و، لەناو مسکێنەکانی هۆزەکەیاندا، بۆ ماوەیەك خۆیان حەشار بدەن. بەڵام هەوڵە بەردەوامەکانی سەربازە عوسمانییەکان بۆ بەدوادا گەڕان و دەسگیرکردنی هەمەوەندەکان، ئاکام کارێکیان کردووە کە ژمارەیەك لە سوارەکانی ئەو هۆزە لە بێزاریدا خۆیان بدەن بەدەست سەربازە عوسمانییەکانەوە، ژمارەیەکی تریشیان بەر هەڵمەتی بەدوادا گەڕانی ئەو سەربازانە کەوتوون و دەسگیر کراون و. لەسەر بڕیاری سەرۆك وەزیرانی عوسمانی، دادگای عورفیی سەربازی بۆ ئەو هەمەوەندە دەسگیرکراوانە پێکهێنراوە[٤٤]، کە لەناویاندا وەك دەردەکەوێت ژن و منداڵ و کەسانی بێ دیفاعیش بوونیان هەبووە[٤٥]، بە مەبەستی دادگاییکردنیان رەوانەی شارەکانی موسڵ و سلێمانی کراون[٤٦].

سەبارەت بەدەسگیرکراوە هەمەوەندەکان، کاربەدەستانی عوسمانی بەمەبەستی چاوترساندنی خەڵکی ناوچەکە ژمارەیەك لەوانیان بەسزای لە سێدارەدان سزا داوە، کە هەر یەك لە (نالە پێیان "نادر کوڕی قادر"، کەریم کوڕی مروەت کوڕی ساڵح ناسراو بە "بەهزاد"). دیارترینی ئەو کەسانەی هەمەوەندەکان بوون کە سزای لە سێدارەدانیان بۆ دەرچووە و[٤٧]، لەماوەکانی دواتردا سزاکەیان بەسەردا جێبەجێ کراوە و لەبەر دەرکی سەرای سلێمانی کراون بە پەتی سێدارەدا و خنکێنراون[٤٨]. بەشێکی تریش لە هەمەوەندەکان کە هەریەك لە (خاتر کوڕی مەحموود، خدر کوڕی مەحموود "خلە پەزە")، دیارترینیان بوون، دادگا سزای پازدە ساڵ زیندانی و ئەنجامدانی کاری قورسی بەسەریاندا سەپاندووە[٤٩].

## تەوەری سێیەم:
## قۆناغی دووەمی جووڵانەوەکە

### هەمەوەندەکان و بەردەوامیدان بە جووڵانەوەکەیان:

ئەو کوشتوبڕ و رەشبگیرییەی کە عوسمانییەکان دەرهەق بە هەمەوەندەکان ئەنجامیان داوە، لەلایەك و سپاردنی ئەرکی قائمقامێتی و بەڕێوەبردنی قەزای بازیان و وڵاتی هەمەوەندەکان بەپشدەرییەکان لەلایەکی ترەوە، کارێکی کردووە کە ئەندامانی هۆزی هەمەوەند سەرلەنوێ جووڵانەوەی چەکداری لەدژی عوسمانییەکان بەرز بکەنەوە، جووڵانەوەی چەکداری ئەمجارەی هەمەوەندەکان بۆ ماوەی چەند مانگێکی تر درێژەی کێشاوە و، لە چەندین بۆنەدا هەڵمەتیان بردۆتە سەر ناوەندی قەزای بازیان و هەروەها گوندەکانی سەر بەو مەڵبەندە[٥٠].

شیاوی باسە جووڵانەوەی چەکداریی ئەمجارەی هەمەوەندەکان لەلایەن شێخانی سلێمانییەوە بەسەرۆکایەتی (شێخ مەحموود)، زۆر بەگەرمی پشتیوانی لێکراوە، ئەو هاوکاری و پشتیوانی لێکردنەش بەشێکی پەیوەندی بەو پشتگوێ خستنەوە هەبووە کە عوسمانییەکان دەرهەق بە بنەماڵەی شێخانی سلێمانی پەیڕەویان کردووە و. بەشەکەی تریشی پەیوەندی بەو زوڵم و ستەمە زۆرەوە هەبووە کە عوسمانییەکان دەرهەق بە هەمەوەندەکان لەو ماوەیەدا ئەنجامیان داوە، بەجۆرێك کە لە ماوەکانی تردا وێنەی نەبووە و مایەی ناڕەزایی نەك بەتەنها هەر شێخانی سلێمانی، بەڵکو مایەی ناڕەزایی زۆربەی خەڵکی ناوچەکە بووە[٥١].

جووڵانەوەی چەکداریی سەرلەنوێی هەمەوەندەکان عوسمانییەکانی ناچارکردووە جارێکی تر پەنا بۆ بەکارهێنانی هێز بەرنەوە، بۆ ئەو مەبەستەش لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٠٩ز.دا سەرەتای هێرشەکانی خۆیان بۆ سەر هەمەوەندەکان دەستپێکردۆتەوە، ئەو هێزەی عوسمانییەکان وەك لە راپۆرتێکی ئینگلیزەکاندا بەدیار دەکەوێت کە لەمانگی ئازاری ساڵی ١٩١٠ز.دا بەرزیان کردۆتەوە، تاکو کاتی بەرزکردنەوەی ئەو راپۆرتەش لە هەڵمەتبردن بۆ سەر پێگەی هەمەوەندەکان هەر بەردەوام بوون، بەڵام نەیانتوانیوە هیچ دەرئەنجامێکی ئەوتۆ بۆ خۆیان بەدەست بخەن کە جێگەی دڵخۆشی بێت بۆ خۆیان و بۆ وڵاتەکەیان[٥٢]. بەڵکو بەرگری ئەمجارەی هەمەوەندەکان تاکو مانگی ئایاری ساڵی

۱۹۱۰ز.، هەر درێژەی کێشاوە، لەو مانگە بەدواوە ئەوسا هەمەوەندەکان و (شێخ مەحموودی حەفید) ناچارکراون کە کۆڵ بدەن و روو لە سنوورەکانی ئێران بکەن[٥٣].

## چوونی سەرلەنوێی هەمەوەندەکان بۆ سنوورەکانی ئێران:

پاش شکستی جوولانەوەکەیان لە مانگی ئایاری سالی ۱۹۱۰ز. دا، هەمەوەندەکان جارێکی تر ئاوارەی سنوورەکانی ئێران بوونەتەوە، سەرەتا چوونەتە مەریوان و، دواتر پەنایان بۆ ناوچەی هەورامان بردووە و، لای هەورامییەکانی ئێران جێگەیان بۆ کراوەتەوە[٥٤].

جێگیربوونی هەمەوەندەکان لە سنوورەکانی ئێران، بیانووی داوە بەدەستی عوسمانییەکانەوە تا بەهەمان شێوەی جارەکانی پێشووتر خۆیان لە سنوورەکان بەتایبەت سنوورە کێشە لەسەرەکان نزیك بخەنەوە و بکەونەوە هەولی داواکردنەوەی سوارەکانی ئەو هۆزە لە حکومەتی ئێران و هەولی دروستکردنی گوشار لەسەر کاربەدەستانی ئەو دەولەتە تاکو هاوکارییان بکەن لە لێدان و دەرکردنی هەمەوەندەکان لەخاکی ولاتەکەیان. یا ئەوەتا رێگەیان بدەن تاکو بچنە ناو خاکی ئێرانەوە و، لەناو سنوورەکانی ئەو ولاتەدا ئۆپەراسیۆنی سەربازی لەدژی هەمەوەندەکان ئەنجام بدەن و خۆیان واتەنی مەترسییەکانی ئەو هۆزە لەسەر دامودەزگا و سنوورەکانی دەولەتی عوسمانی بنەبڕ بکەن[٥٥]. هەموو ئەوەشیان لەپێناوی ئەوەدا بووە تاکو جێی پێیەك بۆخۆیان و هێزەکانیان لەو ناوچە کێشە لەسەرانەدا بدۆزنەوە. ئەمجارەیان وەك ئەوەی کە ئێرانییەکان لە نیازی عوسمانییەکان گەیشتبن، بەوەی کە نیازیان دروستکردنی ئاژاوە بووە لە سنوورەکانی ئێران و، لەو پێناوەشدا بەبیانووی تەمێکردنی هەمەوەندەکانەوە، ویستوویانە زەمینەسازی بکەن بۆ راکێشانی هۆزەکانی سەر سنوور بەلای دەولەتەکەیاندا[٥٦]. بۆیە کاربەدەستانی وەزارەتی ناوخۆی ئێران بە هەموو شێوەیەك دژ بە بیرۆکەی هاوکاری و هەماهەنگی لەگەل عوسمانییەکان وەستاونەتەوە و. لەرێی وەزارەتی دەرەوەی ولاتەکەیانەوە کاربەدەستە عوسمانییەکانیان لەوە ئاگادار کردۆتەوە کە پێویستە لێرە بەدواوە خۆیان رێگری بکەن لە هاتنی هەمەوەندەکان بۆ سنوورەکانی ئێران، تاکو سالانە کێشەی ئەو

هۆزە بۆ سنووردارەکانی هەردوولا دووبارە نەبێتەوە[٥٧]. هەروەها ئەوەیان بە عوسمانییەکان راگەیاندووە کە هێزەکانی ئێران خۆیان ئەرکی راوەدوونانی هەمەوەندەکان لە سنوورەکانی وڵاتەکەیان دەگرنە ئەستۆ و پێویستییان بە هاوکاریی هێزەکانی عوسمانی نییە و، هەموو هاوکارییەکی ئەوان رەتدەکەنەوە[٥٨].

هاوکاری نەکردنی ئەمجارەی ئێرانییەکان، وای لە هێزەکانی عوسمانی کردووە و کە نەتوانن وەکو پێویست پرۆسەی راوەدوونان و تەمێکردنی هەمەوەندەکان بە کۆتا بگەینن، هەر ئەمەش نازم پاشا (١٩١٠–١٩١١ز.)ی والیی ئەوکاتی ولایەتی بەغدادی ناچار کردووە دان بەشکست و کەم توانایی هێزەکانی ولایەتەکەیدا بنێت[٥٩]. و پەنا بۆ رێکەوتن و ئاشتەوایی لەگەڵ هەمەوەندەکان بەرێت و لێبووردنی گشتی بۆ سوارەکانی ئەو هۆزە دەربکات[٦٠].

لەژێر کاریگەریی ئەو بڕیارەدا، هەمەوەندەکان جارێکی تر گەڕاونەتەوە ناو سنوورەکانی دەوڵەتی عوسمانی و کۆمەڵ کۆمەڵ خۆیان تەسلیم بە هێزەکانی عوسمانی کردۆتەوە و رێگەیان پێدراوە بگەڕێنەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان[٦١].

بەڵام ئەو سەردەمی ئاشتەواییەی نێوان هەمەوەندەکان و دەوڵەتی عوسمانی و راحەت دانیشتنی سوارەکانی ئەو هۆزە، زۆر درێژەی نەکێشاوە و هەر لەگەڵ هاتنی تورکە لاوەکان و سەرکەوتنی کودەتاکەیاندا ئەو ماوەیە کۆتایی پێ هاتووە و، پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی تەواو پێچەوانەی سیاسەتەکانی سوڵتان (عەبدولحەمیدی دووەم) لەلایەن سەرانی تورکە لاوەکانەوە، کارێکی کردووە کە سەرلەنوێ هەمەوەندەکان جووڵانەوە چەکدارییەکانی خۆیان دەست پێبکەنەوە و، بەگوێرەی سەرچاوەکان هەتاکو ساڵی ١٩١٤ز. و هەڵگیرسانی شەڕی جیهانی یەکەمیش ئەو جووڵانەوەیەی هەمەوەندەکان هەر درێژەی هەبووە[٦٢].

**ئەنجام :**

**یەکەم/** سەرکەوتنی کودەتای تورکە لاوەکان لە ( ٢٣ی تەمموزی ١٩٠٨ز.)، زنجیرەیەك راپەڕین و دەنگی ناڕەزایی نەتەوە و هەرێمە جیاوازەکانی ناو قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بەدوای خۆیدا هێناوە. کوردەکان یەك لەو نەتەوانەی ناو دەوڵەتی عوسمانی بوون، کە زۆرترین دەنگی ناڕەزاییان لێ بەرز بووەتەوە و. زۆربەی زۆری هۆزە کوردییەکان دژ بە رووداوی هاتنە سەرحوکمی تورکە لاوەکان راپەڕینیان بەرپا کردووە.

هەمەوەندەکان یەك لەو هۆزە کوردییانە بوون کە بەماوەیەکی کەم دوای سەرکەوتنی کودەتای تورکە لاوەکان و بەدیاریکراوی لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٠٨ز. دا، جووڵانەوە چەکدارییەکەی خۆیان دەستپێکردووە و کێشە و پشێوییەکی زۆریان بۆ هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە ناوچەکانی نێوان کەرکووك و سلێمانیدا دروستکردووە.

**دووەم/** هەرچەندە لەلای زۆر لە مێژوونووسان ئەم جووڵانەوە چەکدارییەی هەمەوەندەکان وا ناسێنراوە، کە دژ بەرووداوی کوشتنی (شێخ سەعید حەفید) بەرپا کراوە. بەڵام لەڕاستیدا هەمەوەندەکان بەماوەیەکی زۆر پێش ئەو رووداوە راپەڕیون و، بەماوەیەکی زۆر دوای خامۆشبوونەوەی دەرهاویشتە و دەنگوباسەکانی ئەو رووداوەش، جووڵانەوەکەی ئەوان هەر درێژەی هەبووە و خامۆش نەبووەتەوە. راستە کوژرانی شێخ سەعید کارێکی کردووە کە جووڵانەوەکەی هەمەوەندەکان بۆ ماوەیەك گەرموگوڕیی زیاتر بەخۆوە ببینێت و بکەوێتە هاوشانی ئەو شەپۆلی ناڕەزایی و توندوتیژییانەی کە دوای رووداوی کوژرانی شێخ سەعید، هۆزەکانی کەرکووك و سلێمانی بەرپایانکردووە. بەڵام بەحوکمی ئەوەی کە جووڵانەوەی چەکداریی هەمەوەندەکان هۆکار و مەبەستی تری لەپشتەوە بووە، کە دیارترینیان بریتی بووە لە داواکردنی حوکمڕانیی ناوچەکانی خۆیان و بابەتی کۆکردنەوەی باج لە ئەندامانی هۆزەکەیان. وەك ئاماژەمان پێدا دوای خامۆشبوونەوەی دەرهاویشتەکانی رووداوی کوژرانی شێخ سەعیدیش، بڵێسەی چالاکییە چەکدارییەکانی ئەو هۆزە هەر درێژەی هەبووە و لە کڵپەسەندنی بەردەوامدا بووە.

**سێیەم**/ جووڵانەوەی چەکداریی هەمەوەندەکان هاوکات بووە لەگەڵ دووبارە سەرهەڵدانەوەی ناکۆکییە سنوورییەکان و هەروەها گفتوگۆ سنوورییەکانی نێوانی دەوڵـەتانی ئێـران و عوسمانیـدا. بۆیـە عوسمانییـەکان جووڵانـەوەی چـەکداریی هەمەوەنـدەکانیان بـە دەرفـەت زانیـوە تـاکو لـەڕێی ناچـارکردنی ئەنـدامانی ئـەو هۆزەوە بۆ هەڵاتن بۆ سنوورەکانی ئێران، کارێك بکەن کە بوونی خۆیان بەتایبـەت لەو ناوچە سنوورییانەدا کە لە نێوان هەردوولادا کێشەی لەسەر بـووە زیـاتر بکـەن و، بەبیانووی تەمێکردنی هەمەوەندەکانەوە، هەم دەستیان بەو ناوچـانە بگـات و، هەم پەیوەندی لەگەڵ هۆزەکـانی نیشـتەجێی ئـەو ناوچـانە دروسـت بکـەن، تـاکو مەیلیان بەلای دەوڵەتی عوسمانیدا رابکێشـن و، وایـان لـێ بکـەن داوای هاتنـەپاڵ دەوڵەتی عوسمانی بکەن.

**پەراوێزەکان:**

(١) جان. ئار. پێری، کەریم خانی زەند مێژووی ئێران لەنێوان ساڵانی ١٧٤٧–١٧٧٩، و: (سەلاحەددین ئاشتی)، چاپخانەی شڤان، سلێمانی – ٢٠٠٥، ل٤٨٢.

(٢) عەلائەددین سەججادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چ١، انتشارات کردستان، سنه – ١٣٨٩، ل٥٦٨.

(٣) عباس العزاوي، عشائر العراق، ج ١و٢، مكتبة الحضارات، بيروت – د . ت، ص٢٦٣.

(٤) د. سەعد بەشیر ئەسکەندەر، سەرهەڵدان و رووخانی سیستەمی میرنشینی لە کوردستان، و: (جەوهەر کرمانج)، چ٢، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی – ٢٠٠٩، ل١٣ ؛ ميرزا احمد الهامى و درويش قلى كرندى، فتحنامه حسام الملك بانضمام محاربات ملك نيازخان و جوانمير هماوند، باهتمام: (محمد على سلطانى)، تهران – ١٣٨٤هتاوى، ص١٥.

(٥) مەیجەر سۆن، سلێمانی ناوچەیەك لەکوردستان، و: (مینە (محەمەد ئەمین حسین)، چ١، چاپخانەی مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی – ٢٠٠٧، ل١٣٤؛ علي سيدو الگوراني، من عمان الى العمادية أو جولة في كردستان الجنوبية، مطبعة دار اراس للطباعة والنشر، ط٢، اربيل – ٢٠١٢، ص٣٩؛ حەیدەر عەزیز خەسرەو، بحر الانساب بگزادەی هموند، ١٩٢٨ – (دەستنووس)، ل٨.

(6) J. Baillie Fraser, Travels in Koordistan and Mesopotamia, vol.1, London -1840, p167.

(٧) خورشيد باشا، رحلة الحدود بين الدولة العثمانية وايران، ت: (مصطفى زهران)، ط١، القاهرة – ٢٠٠٨، ص٣٠١–٣٠٢.

(8) Ely Banister Soane, Notes on the Tribes of Southern Kurdistan, Government Press, 1918, P.12.

دائرة الحاكم المدني، ملاحظات عن عشائر كردستان الجنوبية (بين الزاب الكبير و ديالى)، ت: (فؤاد حمه خورشيد)، بغداد – ١٩٧٩، ، ص٦٧.

(9) Ely Banister Soane, op. cit, P.12.

(١٠) ئازاد هیدایەت دەڵۆ، چەند بەڵگەنامەیەکی مێژوویی، و: (مستەفا نەریمان)، ب١، گۆڤاری رامان، ژمارە ( ٦٧)، کانوونی دووەمی ٢٠٠٢، بەڵگەنامەی ژمارە ( ٤ )، ل٢٣١؛ علي سيدو الگوراني، من عمان الى العمادية أو جولة في كردستان الجنوبية، مطبعة دار اراس للطباعة والنشر، ط٢، اربيل – ٢٠١٢، ص١٠٤؛ م. س. لازاریف، کێشەی کورد ١٨٩٦ – ١٩١٧، و: ( دکتۆر کاوس قەفتان )، ب١، مطبعة الحافظ، بغداد – ١٩٨٩، ل٢٣١.

(١١) شیخ سەعید کوڕی شێخ محەمەد و کوڕەزای کاك ئەحمەدی شێخ بووە. بەڵام لەدوای کۆچی دوایی کاك ئەحمەد لەناو بنەماڵەی شێخاندا ئەو لە هەمووان زیاتر ناوبانگی

دەرکردووە و بووە بە شوێنگرەوەی باپیری. شێخ سەعید تەنانەت لەو سەردەمەشدا کە باپیریشی لەژیاندا بووە کەسێکی دیار و لێهاتوو و باوەڕپێکراوی باپیری بووە و، هەر ئەمەش وایکردووە کە شەرەفی فەرماندەییکردنی ئەو هێزەی پێ ببەخشێت کە بەناوی غەزای کافرانەوە لە ناوچەکە کۆی کردووەتەوە و ناردوویەتی بۆ شەڕی رووسەکان لە ساڵی ١٨٧٧– ١٨٧٨ز. کە ئەمەش هۆکارێکی یارمەتیدەری زۆر باش بووە بۆ ناوبانگ پەیداکردنی شێخ سەعید و نزیککەوتنەوەی لە دەسەلاتدارانی عوسمانی. بڕوانە (م. ر. هاوار، شێخ مەحموودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، ب١، لەندەن – ١٩٩٠، ل١٣٥–١٣٦).

(١٢) کاکەڕەشید شەوقی، بەسەرهاتووی کاکەڕەشید شەوقی، ئامادەکردنی: ( سدیق ساڵح )، چ١، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی – ٢٠٠٣، ل٨٨.

(١٣) دار الكتب والوثائق العراقية، ملفات وزارة الخارجية، رقم ( ٣٤٠٧/ ٣٠٦ )، موضوع/ العشائر في كردستان الجنوبية، رقم الوثيقة ( ٢٦ )، ص٢٩٨؛ عبدالرحمن ادريس صالح البياتي، الشيخ محمود الحفيد البرزنجي والنفوذ البريطاني في كردستان العراق حتى عام ١٩٢٥، ط٢، مطبعة شڤان، السليمانية – ٢٠٠٧، ص٦٠–٦١.

(١٤) شێخ سەعید پاش ئەوەی دوورخراوەتەوە بۆ موسڵ، رۆژێك (شێخ مەحموود و شێخ ئەحمەد) کوڕانی شێخ سەعید، لەناو بازاڕی موسڵدا لەگەڵ ئافرەتێکدا دەبێ بەکێشەیان، ئەمە دەبێتە هۆی نیگەرانیی خەڵکی موسڵ و دەرفەتێکی باشیش بۆ تورکە لاوەکان تاکو بەهۆیەوە (شێخ سەعید) لەناوبەرن، لە ئاکامی ئەو رووداوەدا دانیشتوانی موسڵ پەلامار دەبەنە سەر ئەو خانووەی کە شێخ سەعیدی تێدا نیشتەجێ کراوە، لەو پەلامارەدا کە لە رۆژانی (٥ و٦)ی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٠٩ز. دا روویداوە، شێخ سەعید و کۆمەڵێکی زۆر لە دەستوپێوەندەکانی کوژراون. بڕوانە (خالد مەحمود کەریم، دەوڵەتی عوسمانی و عەشیرەتە کوردەکان لە کوردستانی باشوور ١٨٦٩–١٩١٤، بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران، سلێمانی–٢٠١٢، ل٢٧٧–٢٨٠)؛ عەبدولمونعیم غولامی، سێ قوربانییەکە، و: (ئیحسان ئیروانی)، چ١، بڵاوکراوەی ئاراس، هەولێر – ٢٠٠٤، ل٢٦–٢٧.

(١٥) فەرهاد عەبدولعەزیز محەمەد ئەمین، ناوچەی چەم چەماڵ لە نێوان ساڵانی هەردوو شەڕی جیهانیدا ١٩١٨– ١٩٣٩، توێژینەوەیەك سەبارەت بەبارودۆخی کۆمەڵایەتی و رامیاری و رووناکبیری، چ١، چاپخانەی زینە، کەرکوك – ٢٠١٣، ل٩٥–٩٦.

(16) FO. 195/2310.British vice consul Mosu, October.17/ 1909.

سون (( میرزا غلام حسین شیرازي ))، رحلة " متنكر " الى بلاد مابین النهرین وكردستان، ت: (فؤاد جمیل )، ج١، ط١، مطبعة الجمهوریة، بغداد – ١٩٧٠، ص٢٤٨.

(١٧) سون (( میرزا غلام حسین شیرازي))، رحلة ...، ج١، م . س، ص٢٣٠؛ علي سیدو الگوراني، م . س، ص٤٠.

(١٨) محەممەد ئەمین زەکی بەگ، تاریخی سلێمانی وەڵاتی، ئا: ( رەفیق صالح )، ب٣، چ٢، سلێمانی– ٢٠٠٥، ل١٤٣.

(١٩) م. ر. هاوار، ب١، س . پ، ل١٥٨؛ عبدالرحمن ادریس صالح البیاتي، م . س، ص٥٤.

(٢٠) سون (( میرزا غلام حسین شیرازي))، رحلة ...، ج١، م . س، ص٢٣١.

(٢١) کوڕی حەمە پاشای سەرۆکی گەورەی هۆزی جافە دوای کوژرانی باوکی بەدەستی کەرەم وەیسییەکان لە ساڵی ١٨٨١ز. نازناوی پاشا و پۆستی سەرۆکایەتی هۆزی جافی وەرگرتووە.

(٢٢) ئازاد هیدایەت دەلۆ، س . پ، ب٢، بەڵگەنامەی ژمارە ( ٦ )، ل٢٢٣.

(23) T.C.BASBAKANLIK DEVLET ARSIVLER – GENEL MÜDÜRLÜGÜ Osmanlı Arsivi Daire Baskanlıgı, MUSUL – KERKÜK -LE -LG-L-ARS–V BELGELER–(1525 – 1919), ANKARA – 1993. BOA. Dâhiliye Nezâreti Muhâberât-ı Umumiye İdâresi, nr.42/57. S. 325-329.

(٢٤) (B.A. DH. M. U. I./ 1- 4/ 6) ، الباب العالي، (دائرة الشؤن الداخلیة)، النسخة المشفرة المستلمة من متصرفیة السلیمانیة، ٣/ اب/ ١٣٢٥.

(٢٥) م. ر. هاوار، ب١، س . پ، ل١٥٨.

(٢٦) سون (( میرزا غلام حسین شیرازي))، رحلة ...، ج١، م . س، ص٢٤٦؛ م. ر. هاوار، ب١، هـ . س، ل١٦٠.

(٢٧) محەممەد ئەمین زەکی بەگ، تاریخی سلێمانی...، ل١٤٢.

(٢٨) بەدرخان سندی، کۆمەڵگای کوردی لە دیدی رۆژهەڵاتناسیدا، و: ( د. ئیسماعیل ئیبراهیم سەعید )، چ١، چاپخانەی خانی، دهۆك – ٢٠٠٨، ل٥٠٧.

(٢٩) محەممەد ئەمین زەکی بەگ، تاریخی سلێمانی...، ل١٤٤.

(٣٠) سون (( میرزا غلام حسین شیرازي))، رحلة ...، ج١، م . س، ص٢٤٩.

(٣١) ن. م، ص٢٣١.

(٣٢) ( B.A. DH. M. U. I./ 1– 4/ 79)، الدولة العلیة العثمانیة، دائرة البرق والتلغراف، الى الوزارة الداخلیة الجلیلة، ٣/ اب/ ١٣٢٥.

(٣٣) محەممەد ئەمین زەکی بەگ، تاریخی سلێمانی ...، ل١٤٤.

[٣٤] (B.A. DH. M. U. I./ 1– 2/ 35)، الباب العالي، دائرة الصدارة العظمى (قلم المكاتبات)، موضوع: حل البرقية الواردة من متصرفية السليمانية. ( B.A. DH. M. U. I./ 1– 4/ 79)، الدولة العلية العثمانية، دائرة البرق والتلغراف، الى الوزارة الداخلية الجليلة، ٣/ اب/ ١٣٢٥.

[٣٥] کوڕی گەورەی حەبیبوڵڵاخانی باوەجانی سەرۆکی تیرەکانی جافی جوانڕۆیە، دوای مردنی باوکی ئەرکی سەروکاری هۆزەکەی گرتۆتە ئەستۆ و، لە سەردەمی ئەودا هێزی هۆزەکەی گەیشتووەتە ئاستێك کە دەوڵەتی ئێران نەیتوانیوە وەك پێویست دەست لە کاروباری ناوچەکانی سەر بە هۆزەکەی وەربدات. بڕوانە (کریم بیگ فتاح بیگ جاف، تاریخ جاف)، پژوهش: ( دکتر حسن جاف )، ت: ( دکتر محمد علی سلطانی )، انتشارات اراس، چ١، اربیل – ١٩٩٨، ص١٥٧–١٥٨.

[٣٦] ( B.A. DH. M. U. I./ 1– 4/ 79)، الدولة العلية العثمانية، دائرة البرق والتلغراف، الى الوزارة الداخلية الجليلة، ٣/ اب/ ١٣٢٥.

[٣٧] (B.A. DH. M. U. I./ 1– 3/ 46)، وزارة الداخلية، دائرة المخابرات العمومية، برقية الى وزارة الخارجية الجليلة، ٢٤/ رمضان/ ١٣٢٧(٢٦/ أيلول/ ١٣٢٥).

وزارت امور خارجه (ایران)، موضوع: راپورت از سرحدداري زهاب در خصوص شرارت اشرار احمدوند چلبی و پسر فتاح بیط و بهادرالملك، سال ( ١٣٢٨هـ )، كارتن: ١، پرونده:١، نمره كتاب: ١٦٢٥٧، دوسیه: ٢، تاریخ خروج: ٢٨/ جمادى الثانی/ ١٣٢٨هـ. ص:١٢.

وزرات امور خارجه (ایران)، موضوع : اقدام فتاح بیك به اتفاق احمدوندها به غارت اموال تجار، سال ( ١٣٢٨ق )، كارتن : ١، ثروندة: ١ ، نمره كتاب ثبت: ٢٣٥٩، دوسیه: ٢. ص: ١٤٧.

[٣٨] (A. B. DH. M. U. I./ 1– 6/ 5)، وزارة الداخلية، دائرة المخابرات العمومية، برقية الى وزارة الخارجية الجليلة، ٢٩/ تشرين الثاني/ ١٣٢٥.

[٣٩] وزرات امور خارجه (ایران)، موضوع : گزارش وزارت خارجه درخصوص ادامه شرارت و نافرمانی احمدوندها و مأموریت فاضل پاشا حاكم موصل از سوى دولت عثمانی برای سركوب این طائفه ، سال: ٢٤/ محرم/ ١٣٢٨هـ، كارتن: ١، پرونده: ١ ، نمره كتاب ثبت: ٢٢٠٩، دوسیه: ٢. ص: ١٦٢.

[٤٠] وزرات امور خارجه (ایران)، موضوع: اقدام حكومت كردستان جهت گرد احمدوندها از نقاط مختلف ایران، سال: ٥/ صفر/ ١٣٢٨هـ، كارتن: ١، پرونده: ١، نمره: ١٤٠٣. دوسیه: ٢. ص: ١٤٢.

(٤١) وزرات امور خارجه (ایران)، موضوع : مذاكره فاضل پاشا والی موصل با داودخان امر اعظم كلهر برای مقابله با اقدامات طائفه احمدوندها، سال: ١٤/ ذی الحجه/ ١٣٢٨هـ، كارتن : ١، پرونده: ١، نمره: ١٧٠٥، ص: ١٤٣.

(٤٢) كريم بيط فتاح بيط جاف، م . ث، ص١٤٦.

(٤٣) وزرات امور خارجه (ایران)، موضوع : گزارش وزارت خارجة درخصوص ادامه شرارت و نافرمانی احمدوندها و مأموريت فاضل پاشا حاكم موصل از سوی دولت عثمانی برای سركوب این طائفه ، سال: ٢٤/ محرم/ ١٣٢٨هـ، كارتن: ١، پرونده: ١، نمره كتاب ثبت: ٢٢٠٩، دوسيه: ٢. ص: ١٦٢.

(٤٤) (A.B. DH. M. U. I./ 1– 10/ 39 - 15)، الباب العالي، دائرة الصدارة العظمى (قلم المراسلات)، برقية الى نظارة الداخلية الجليلة، ٢٩/ ربيع الاول/ ١٣٢٨ ( ٢٨/ مارت/ ١٣٢٦).

(٤٥) (A. B. DH. M. U. I./ 1– 10/ 39 – 10 - 11) ، الباب العالي، دائرة المخابرات العمومية – الشعبة الثانية، موضوع: الاسئلة والأجوبة المدرجة في تقرير الأستيضاح المقدم من قبل مبعوثي الموصل (فاضل و داود أفندي) حول نتيجة المطاردات المتعلقة ببغاة الهموند و بارزان.

(٤٦) (A. B. DH. M. U. I./ 1– 10/ 16 - 5)، الباب العالي، دائرة الصدارة العظمى (قلم البرقيات)، موضوع: حل البرقية الواردة من ولاية الموصل، ١١/ مايس/ ١٣٢٦.

(٤٧) (A. B. DH. M. U. I./ 1– 11/ 18)، وزارة الحربية، دائرة المحكمة، الى وزارة الداخلية الجليلة، موضوع: حول اتخاذ قرار اللازم بشأن اعدام إحدى عصاة الهماوند، ٢٤/ ربيع الاول/ ١٣٢٨ (٢١/ نيسان/ ١٣٢٦).

(٤٨) ئەكرەمی مەحموودی ساڵحی رەشە، شاری سلێمانی، ب٢، بەغداد – ١٩٨٩، ل٢١٧–٢١٨.

(٤٩) ( A. B. DH. M. U. I./ 1– 11/ 10)، وزارة الحربية، دائرة المحاكمات، الى وزارة الداخلية، موضوع: حول محاكمة عصاة الهماوند المستمرين بأعمالهم الشنيعة وحكمهم مدة (١٥) عاما ....، ٢٦/ رجب/ ١٣٢٨ (٢٠/ تموز/ ١٣٢٦).

(٥٠) (A. B. DH. M. U. I./ 1– 2/ 35)، الباب العالي، دائرة الصدارة العظمى (القلم المكاتبات)، موضوع: حل البرقية الواردة من متصرفية السليمانية.

(٥١) محەمەد عەلی قەرەداغی، بووژانەوەی مێژووی زانایانی کورد لە رێگەی دەستخەتەکانیانەوە، ب٨، چ١، بڵاوکراوەی ئاراس، هەولێر – ٢٠٠٨، ل١٨٢.

(٥٢) فؤاد قزانجي، العراق في الوثائق البريطانية ١٩٠٥–١٩٣٠، ط١، دار المأمون للترجمة والنشر، بغداد–١٩٨٩، ص٧١. راپۆرتی سیاسی ساڵی ١٩٠٩ز. نوێنەری بەریتانی لە عێراق، ژمارە ( F.O, 371 – 1002 / 4235 ) کە لە مانگی ئازاری ساڵی ١٩١٠ بڵاوکراوەتەوە.

(٥٣) وزارت امور خارجه (ایران)، موضوع : آمدن احمدوندها به همراه شیخ محمود برزنجی به کردستان، سال : ١١/ شعبان/ ١٣٢٨هـ، کارتن : ٢٤ ، پرونده:٢، ص: ٤٩.

(٥٤) وزارت امور خارجه (ایران)، موضوع : گزارش آمدن شیخ محمود برزنجی به همراه احمدوندها به مریوان، سال : ١٢/ ربیع الاول/ ١٣٢٨ق، کارتن : ١ ، پرونده: ١، ص: ٧.
وزارت امور داخله (ایران)، موضوع : گزارش آمدن شیخ محمود برزنجی به همراه احمدوندها به مریوان، سال : ١٣٢٨هـ، کارتن : ١ ، پرونده: ١، ص: ٧١٢.

(٥٥) وزارت امور خارجه (ایران)، موضوع : اقدام عثمانی ها برای جلوگیری از شرارت احمدوندها و دادن بهانه به دست عثمانی برای تجاوز به خاك ایران، سال : ٢١/ جمادی الاول/ ١٣٢٨هـ، کارتن : ١ ، پرونده: ١، نمره: ١٢٢٦٩، ص: ١٤١.

(٥٦) وزارت امور خارجه (ایران)، موضوع: مأموریت فاضل پاشا والي موصل از طرف دولت عثماني مأمور دستگیری و تنبیه احمدوندها، و درخواست کمك از حکام کلهر و سایر طوایف سرحدی کرمانشاهان برای همکاری با فاضل پاشا و مراقبت از دسیسههای و تفرقه افکنی او در میان ایلات یادشده، سال:( ١٣٢٨ق )، کارتن: ١، پرونده: ١، دوسیه : ٢، نمره: ١٠٩٥١، ص: ١٥٥.

(٥٧) وزارت داخله (ایران)، موضوع: درخواست برای طرد احمدوندها برای جلوگیری از شرارت و تجاوز آنها به حدود کرمانشاهان با دولت عثمانی، سال: ( ١٣٢٨ق )، کارتن:١، پرونده:١، ص: ٥. وزارت داخله (ایران)، موضوع: تلگراف از کرمانشاه درمورد تنبیه و ارجاع احمدوندهاو درخواست از وزارت امور خارجه برای مذاکره با سفارت عثمانی برای همکاری در حل این مشکل، سال: (١٣٢٨ق)، کارتن:١، پرونده:١، ص: ٥.

(٥٨) وزارت داخله (ایران)، موضوع: درخواست از حکومت کرمانشاه برای تحقیق و بررسی موضوع تجاوز احمدوندها و بیرون کردن انها از منطقه، سال: جمادی الاول ١٣٢٨هـ، کارتن:١، پرونده:١، ص: ١٣٤

(٥٩) (A. B. DH. M. U. I. 1-10/ 39-5)، الباب العالي، نظارة الداخلية (دائرة المخابرات العمومية)، الشعبة الثانية. (A.B. DH. M. U. I. / 1- 10/ 16 - 8)، الباب العالي، نظارة الداخلية (قلم البرقيات)، موضوع: حل البرقية الواردة من ولاية بغداد، ١٠/ مايس/ ١٣٢٦.

(٦٠) المس بيل، فصول من تاريخ العراق القريب، ت: ( جعفر الخياط )، مطبعة دار الكشاف، بيروت – ١٩٤٩، ص٥٨.

(٦١) (A. B. DH. M. U. I. / T. 1328 – B. 13/ I – 9143)، ادارة دائرة تلغراف الدولة العلية العثمانية، برقية من رئيس الهماوند الاسبق (محمد امين) عضو مجلس جمجمال المحلي الى الصدارة العظمى، مركز الاصدار: الموصل، ١/ اب/ ١٣٢٦.

(62) F.O, 371/3407, XM 07793, from India office to Foreign office, 19. 4. 1918.

## ملخص البحث

تشكل الحركة المسلحة التي قامت بها عشيرة الهموند بين عامي ( ١٩٠٨ – ١٩٠٩ )، إحدى أهم الحركات وأكثرها فاعلية من السلسلة المتواصلة من الحركات والإنتفاضات التي قاموا بإشعالها أفراد هذه العشيرة.

وعلى الرغم من أن هذه الحركة موجهة بالأصل الى الدولة العثمانية وإنقلاب (تركيا الفتاة) وإعلان المشروطية. لكن آثارها وإنعكاساتها إمتدت الى المناطق الحدودية والى المؤسسات والمعسكرات والنقاط الحدودية للحكومة الإيرانية، خاصة بعد نزوح أفراد عشيرة الهموند أثر تلك الحركة الى منطقتي (زهاو وجوانرو) الموجودتان في داخل الأراضي الإيرانية. وهذا ما أدى الى وجود ذكر أحداث تلك الحركة في الأوراق والوثائق الإيرانية والعثمانية في نفس الوقت. وبالرغم من أن تلك الوثائق مكتوبة بروح الكراهية والأعداء، الا انها مليئة بالمعلومات الجديدة والمخفية حول الحركة.

لذا وقد إعتمد الباحث فضلا عن المصادر التأريخية، على كثير من أوراق ومستندات والوثائق الموجودة في أرشيف الوزارة الخارجية الإيرانية، وأرشيف رئاسة الوزراء في أسطنبول. مع إعطاء التحليلات الشخصية اللازمة للوثائق التي بحاجة الى التوضيح والتحليل، وذلك في سبيل إزالة الغموض والإشكاليات الموجودة في متن كل تلك الوثائق. وخلال تلك الوثائق إعطاء معلومات دقيقة وجديدة حول أحداث ومستجدات تلك الحركة بأسبابها ونتائجها.

## Abstract

The armed movement or uprising of Hamawand’s between 1908-1909 was one of the most important and effective uprisings among a series of such movements done by these people.

Even though this uprising was against Othoman State (Turkey al-fatat) but its influence has passed the borders of Iran and army institutions on the border as well due to the fact that Hawamand people have fled to Zahaw and Jwanrro inside Iran territory. This was the reason for including this event in the documents. Those documents are specialized of the uprising events as well as about the corporation between those two countries to hit the Uprising and make it weak. Although those documents are written by enemies and hostile people, they are rich treasures and full of new and hidden information about the uprising

In addition to historical resources , the researcher has depended on documents found in the archive of Iranian Foreign ministry , archive of the prime ministry in Istanbul along with personal analysis when necessary about controversial issues in the documents. These documents provide accurate and valuable information about the uprising, underlying factors and the results.

# رۆژنامەی (کورد)ی سمکۆ (١٩٢٢)

**پ. ی. د. ئازاد عوبێد سالح**
بەشی مێژوو، کۆلێژی ئاداب،
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**سەرەتا**

سەرهەڵدانی ئیسماعیل ئاغای شکاک (سمکۆ)، لە رۆژهەڵاتی کوردستان، تا ئێستا زۆری لەبارەوە نووسراوە، بەڵام ئەوەی تا ئێستا زۆر مشتومڕی لەبارە کراوە، لایەنی رووناکبیری و بەتایبەتیش رۆژنامەوانیی رۆژگاری سمکۆیە، کە بە تەواوی روون نەکراوەتەوە. بۆیە بایەخدان بە ساخکردنەوەی ئەم لایەنە وەك کارێکی زانستیی بە پێویست زانرا، بەتایبەتی کە هەندێ زانیاریی پەیوەست و ژمارە (٣)ی رۆژنامەکە کەوتنە بەردەست.

گرفت و کێشەی ئەم توێژینەوەیە، بەردەست نەبوونی ژمارەکانی رۆژنامەکەیە، هەروەها دەست رانەگەیشتن بە ئەرشیفی وڵاتانی وەك رووسیا، بەتایبەتی کە ئەو رۆژگارە سۆڤیەت زۆر لە نزیکەوە لە سۆراخی جموجوڵەکانی سمکۆدا بووە، هەروەها کەمتەرخەمی لە کۆکردنەوە و هێنانەوەی ئەو بەڵگەنامانەی کە تایبەتن بە کورد.

لەو توێژینەوەیەدا لەگەڵ ئاوڕدانەوەیەکی زۆر خێرا لەلایەنی رووناکبیری رۆژگاری سمکۆ، باس لەلایەنی رۆژنامەوانیی سەردەمی سمکۆ تاڕادەیەك بەپێی پێویست باسکراوە، بەتایبەتیش ساخکردنەوەی دەرچوونی رۆژنامەکە کە بەناوی (کورد) دەرچووە، لەوەدا لێکۆڵینەوە لە بەشێکی ناوەڕۆکی ژمارە (١)، بە پاڵپشتی سەرچاوەیەك و پاشان لێکۆڵینەوە لە ناوەڕۆکی ژمارە (٣)ی رۆژنامەکە و ساخکردنەوە و ناساندنی ئەوانەی دەوریان لە دەرکردنی رۆژنامەکەدا هەبووە. وێڕای ئەمە هێنانە سەر رێنووسی ئەمڕۆی هەرسێ لاپەڕەی رۆژنامەکە– بەداخەوە لاپەڕە (٢)ی رۆژنامەکەمان پێ نەخوێندرایەوە – لەگەڵ پاشکۆ.

ئەم کارەش بەپاڵپشتی چەند سەرچاوەیەك کراوە، لەوانە کتێبی (کورد لە ئەرشیفی رووسیا و سۆڤیەت دا) لە نووسینی (د. ئەفراسیاو هەورامی)، کە زانیاریی گرنگی لەبارەی ژمارە (١)ەوە تێدایە، هەروەها ژمارە (٣)ی ڕۆژنامەکەش کە بەم دواییانە کەوتە بەردەست.

ڕۆژنامەوانیی کوردی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان وەك بەشێك لە مێژووی ڕۆژنامەوانیی کوردی، بەهۆی بارودۆخی سیاسی نەتوانراوە بە تەواوی سەروسۆراخی لایەنە شاراوەکانی بکرێت.

وەك زانراوە، ڕۆژنامەوانی بەزۆری زادەی ئازادییە، وەك بەشێکی بزووتنەوەی رزگاریخوازیش دەورێکی گەورە لە وشیاریی سیاسی و گەیاندنی پەیام و بڵاوکردنەوەی رۆشنبیریدا هەیە.

ئیسماعیل ئاغای شکاك ناسراو بە (سمکۆ) (١٨٧٥ – ١٩٣٠) وەك کەسایەتییەك لە سەرەتای سەدەی بیستەم بەدەرکەوت، بە تایبەتیش دوای غافڵکوژیی جەوهەر (جەعفەر) ئاغای برای لەساڵی ١٩٠٥ لە تەورێز. سمکۆ پەیوەندی بە عەبدولڕەزاق بەدرخان (١٨٦٨ – ١٩١٨) و رووسەکانەوە هەبووە، تەنانەت لە ساڵی ١٩١٤ لەسەر ئاستێکی فراوان ناسراوە و لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانی سیاسەتێکی تاڕادەیەك هێمنانەی گرتووەتە بەر و دواتر زیاتر درەوشانەوەی بەخۆیەوە بینی[1].

سمکۆ دەیویست دەستبەسەر هۆزەکانی سەرسنووری تورکیا و گۆمی ورمێ دابگرێت و ناوچەیەکی بەرفراوانی ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژئاوای گۆشەکە بخاتە ژێر دەستی خۆی بە شاری ورمێشەوە، لە بەهاری ١٩٢٢ دەسەڵاتی سەربەخۆیی ڕاگەیاند[2]. دیارە سەید تەهای نەهری (   –١٩٣٦) و عەبدولڕەزاق بەدرخان نەخشیان لە دنەدانی هەستی نەتەوایەتی سمکۆدا زۆر بووە.[3].

بزووتنەوەکانی سمکۆ ماوەی شەش ساڵ لە نێوان هەڵکشان و داکشان بەردەوامی هەبووە تا سەرەنجام ئەویش بە فێڵ لە ناوەڕاستی تەممووزی ١٩٣٠ لە شنۆ کوژرا[4].

بێگومان هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرا، دروستبوونی پێوەندی لە نێوان سمکۆ و سەید تەهای نەهری و عەبدولڕەزاق بەدرخان دوو کەسایەتی دیاری نێو

بواری سیاسیی ئەو رۆژگارەی ناو بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان، کاریگەری زۆریان لە کار و چالاکییەکانی سمکۆدا هەبووە.

ئەوەی بە خاڵی درەوشاوەی ژیانی سمکۆ لە قەڵەم دەدرێت، لە بواری رووناکبیریدا، کردنەوەی یەکەمین قوتابخانە بووە بە زمانی کوردی لە شاری (خوی)[٥] کە بەهاوکاری عەبدولڕەزاق بەدرخان لە ساڵی ١٩١٣، دوای ئەوەی کۆمەڵەیەکی رووناکبیری کوردیان هەر لە (خوی) بە ناوی (جیهانداني) دامەزراندووە بەنیازبوون رۆژنامەیەك و چاپخانەیەك و خوێندنگایەکی نەتەوەیی کوردی دابمەزرێنێت. بۆ ئەمەش داوای پاڵپشتی لە رووسەکان کرا و بەرنامەیەکی تێروتەسەلیش بۆ پێشخستنی پێوەندیی رووناکبیری کورد و رووسیا دانرا[٦]، بەڵام ئەوەی بە کردەوە جێی گرت، کردنەوەی خوێندنگایەکی کوردی بوو لە (خوی) لە ساڵی ١٩١٣، کە لە ئاهەنگێکی تایبەتیدا لە رۆژی ٤ی کانوونی دووەمی ١٩١٣، وەك یەکەم قوتابخانەی کوردی لە شاری خوی کرایەوە کە بە کۆمەکی کۆکراوەی کوردان خۆیان دروست کرابوو، ژمارەی قوتابییەکان (٢٩) قوتابی بوونە[٧].

## سەرەتای رۆژنامەوانیی کوردی لە رۆژهەڵاتی کوردستان:

بەپێی سەرچاوەکان سەرەتای رۆژنامەوانیی کوردی لە رۆژهەڵاتی کوردستان بە بڵاوکراوەیەك دەست پێدەکات، کە زانیارییەکان لەبارەیەوە زۆر پێك ناکۆکن هەر لە جۆری بڵاوکراوە، ناو، شوێنی دەرچوون و ساڵی دەرچوون کە عەبدولڕەزاق بەدرخان (١٨٦٨ – ١٩١٨)، دەرکردووە، بڕوانە: خشتە

| ژ | ناو | جۆری | | ساڵی دەرچوون | شوێنی دەرچوون | ئەوانەی دەریانکردووە | سەرچاوە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | کوردستان | رۆژنامە | – | ١٩١٣ | ورمێ | عەبدولڕەزاق بەدرخان – سمکۆ | نوری عەلی ئەمین ١٩٥٩[٨] |
| ٢ | کوردستان | رۆژنامە | – | ١٩١٣ – ١٩١٤ | = | پیاوماقوڵێکی مەهاباد یارمەتی داوە | محەمەد تۆفیق وردی ١٩٦٩[٩] |

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٣ | کوردستان | گۆڤار | کوردی تورکی | ١٩٠٨ | ورمێ | عەبدولڕەزاق بەدرخان | جەبار جەباری ١٩٧٠ |
| ٤ | کوردستان میسینەری | گۆڤار | – | ١٩٠٨ – ١٩٢٨ | شیکاگۆ | میسیۆنێرەکان | جەبار جەباری ١٩٧٠[١٠] |
| ٥ | کوردستان | گۆڤار | – | ١٩١٢ | ورمێ | عەبدولڕەزاق – سمکۆ | جەمال خەزنەدار ١٩٧٣[١١] |
| ٦ | خوی | گۆڤار | – | ١٩١٣ | خوی | عەبدولڕەزاق | عەبدوڵڵا سەمەدی ١٩٩٩[١٢] |

دواتــر خــەڵکی دیکــەش هــاتوون هەنــدێ لــەو زانیارییانــەیان دووپــات کردووەتەوە[١٣].

ئەوەی جێی سـەرنجە ئـەو زانیارییـە پێـك ناکۆکانـە سـاخکردنەوەی وردیـان پێدەوێت، بـەهۆی نـەبوونی سەرچـاوەی یەکلاکـەرەوەی پێویسـت بـەم لایەنـە تـا ئێستا نەتوانراوە ئەو کارە بکرێت[١٤].

**ڕۆژنامەی ( کورد – ١٩٢٢ ):**

سەبارەت بە ڕۆژنامەوانی ڕۆژگاری ڕاپەڕینی سمکۆ لـەدوای ١٩٢١، ئـەوە لـە هەمووی ڕاست و دروستتر و ئەوەی ئێستا بەردەستە ئەو ڕۆژنامەیە کە سمکۆ لـە ڕۆژگاری پڕ شکۆی خۆیدا فەرمانی دەرکردنی داوە، ئەویش ڕۆژنامەی (کورد)ە.

سەرچاوەیەك بە پاڵپشتی بڵاوکراوەی (ڕۆژهەڵاتی نوێ) نووسیویە:

سمکـۆ لـە تشـرینی یەکـەمی ١٩٢١ بارەگـای سـەرکردایەتییەکەی بردووەتـە مـوکری کـۆن پایتـەختی مـەهاباد، دەڵـێن دەسـتی بـە دەرکردنـی ڕۆژنامـەی کوردستانی سەربەخۆ کردووە، بەئامانجی ئەوەی ببێتـە زمانحـاڵی داخوازییـەکانی کورد[١٥].

سەرچاوەیەکی دیکەش باس لـە دەرکردنـی گۆڤارێك دەکـات بـەناوی (ڕۆژی کوردستان) کە لەلایەن یەکێکی مەهابادییەوە دەرچووە[١٦].

بـەپێی بەڵگەنامەیـەکی بـەریتانیایش سمکـۆ لـە سـاڵی ١٩٢١ حکومـەتێکی سەربەخۆی کوردی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە باشووری گۆلی ورمێوە تا ڕووباری

جەغەتوو پێکهێناوە، لە مەهابادیش، رۆژنامەیەکی وەك زمانحاڵی حکومەتەکەی بەناوی کوردستانی سەربەخۆ دەرکردووە[١٧]. بەڵام دروست ئەوەیە کە لە ساڵی ١٩٢٢ رۆژنامەکەی بەناوی (کورد) لە ورمێ دەرکردووە.

رەنگە کۆنترین سەرچاوە کە بەدروستی ئاماژەی بەو رۆژنامەیەی (کورد)ی سمکۆ کردبێت، عەلائەدین سەجادی (١٩١٥– ١٩٨٤) بێت کە نووسیویە: (کورد" رۆژنامەیەکی کوردی و زمانحاڵی سمایل ئاغای سمکۆ بووە، لە ١٩٢١ لە شاری "ورمێ" دەرچووە. تەنها سێ چوار ژمارەی لێ دەرکردووە لەوەدا پەکی کەوت.)[١٨].

لە سەرچاوەیەکی فارسیش ئاماژەیەك هەیە و نووسیویە: رۆژنامەیەك بە زمانی کوردی بەسەرپەرشتی "محمد تورجانی زادە"[١٩] لە ساڵی ١٣٤٠ (١٩٢٢) لە ورمێ بڵاوکرایەوە کە رێبازەکەی سیاسی بوو و حەوتووی جارێك دەردەچوو[٢٠].

جەبار جەباریش لەبارەی ئەو رۆژنامەیەوە نووسیویە: "رۆژنامەیەکی کوردییە، زمانی شۆرشگێرانی سمایل ئاغای سمکۆ بووە لە ساڵی ١٩٢١ لە شاری ورمیە دەرچووە، نزیکەی چوار ژمارەی بە رێکوپێکی لەلایەن شێخ محەمەدی قزڵجیەوە دەرئەچوو ئیتر پەکی کەوت."[٢١]، وابزانم هەر ئەوەی سەجادییە بە هەندێ دەسکاری و زیادکردنەوە.

ئەو زانیارییە پێك ناکۆکانە هەروا مایەوە تا بۆ یەکەم جار لە باشووری کوردستان هێمن موکریانی (١٩٢١ – ١٩٨٦)[٢٢]، بە پاڵپشتی کتێبی (محەمەد تەمەدون) (اوضاع ایران در جنگ اول) کە لە ساڵی (١٣٥٠ی هەتاوی = ١٩٧١) چاپکراوە، زانیاریی وردتر و کلێشەی رۆژنامەکەشی لەگەڵ وتارێك بڵاوکردەوە. لەو وتارەدا ئاماژە بە رۆژنامەیەك دەکات بەناوی رۆژی کورد – شەوی عەجەم، یان رۆژی کورد و دواتریش (کورد)[٢٣]. کە هەر ئەوەی بەناوی (کورد)ە دروستترە و کلێشەکەی بڵاوکراوەتەوە و رۆژی (١٢ی شەواڵی ١٣٤٠ = ٨ی حوزەیرانی ١٩٢٢) دەرچووە. دواتریش لەساڵی ١٩٨١ کلێشەیەکی دیکەی هەر ئەو رۆژنامەی (کورد) لە گۆڤاری (گرشەی کوردستان)[٢٤] بە وتارێکی بێ ناو بڵاوکراوەتەوە کە دیارە لە نووسینی محەمەد ساڵح ئیبراهیمی (شەپۆل)ە[٢٥][٢٦].

سەبارەت بەو دوو کلێشەیە واتە ئەوەی کتێبی (اوضاع ....) و (گرشە....) ، هەروەها لەبارەی بەراوردکردنی ئەو رۆژنامەیە لەگەڵ (بانگی حەق)ی سەردەمی شێخ مەحموود (١٨٨٣ — ١٩٥٦) وتارێکی تێروتەسەلی لەبارەیەوە نووسراوە، ئاخۆ کامیان زمانحاڵی یەکەمی شۆڕشی کوردستانە[٢٧]. لەویَ بەهەڵە کلێشەکەی (گرشەی کوردستان) بە ژمارە (٢) دانراوە، راستییەکەی ژمارە (٣)یە، وەك دواتر رۆژنامەکە لە هاوینی ٢٠١٤ بڵاوکرایەوە[٢٨]. جاریَ دەبیَ ئەوە بڵێین کە ئیدی رۆژنامەکە هەر بە ناوی (کورد) دەرچووە، چونکە کلێشەی دوو ژمارەی لەبەردەستە. جگە لە (تەمەدون)یش تا هەنووکە کەسی دیکە ئاماژەی بەوە نەکردووە کەوا بەناوی (رۆژی کورد — شەوی عەجەم)........ هتد، دەرچووبێت.

ئەگەر باس لەوە کراوە کە محەمەد تەمەدون زیاتر لە بیست ژمارەی لە ئەرشیفی خۆی پاراستبێت[٢٩]، ئەوا بەلای ئێمەوە هیچ رێی تێناچێت ئەو هەموو ژمارەیە لەو ماوە کورتەدا (لە بەهاری ١٩٢٢ تا ئابی ١٩٢٢) کە بەزۆری دەکاتە (١٦) هەفتە دەرچووبێت، خۆ ناشکرێت بڵێین رۆژانە دەرچووە، بەتایبەتیش لەو رۆژەگارەدا.

ئەگەر رۆژانەی رووداوەکانیش دیاربکەن، ئەوا "لە بەهاری ١٩٢٢ سمکۆ خۆی بە شای کوردستانی سەربەخۆ راگەیاندووە و حکومەتی خۆی پێکهێناوە، هەوڵیداوە پێوەندیی دیپلۆماسی لەگەڵ وڵاتانی بیانی دابمەزرێنێت. حکومەت دەستی کرد بە دەرکردنی گۆڤاری "کوردستان" — راستییەکەی (رۆژنامەی کورد — توێژەر) — زمانحاڵی رەسمی حکومەتەکەی. بەڵام سوپای ئێران توانی هێزەکانی ئیسماعیل خان لە ئابی ساڵی ١٩٢٢ تێك بشکێنێت، سمکۆ لە تورکیا ون بوو، هێزەکانی حکومەت دەستیان بەسەر تەشریك (چەهریق. توێژەر)، پایتەختی "کوردستانی سەربەخۆ" و زێدی بنەماڵەی ئیسماعیل ئاغادا گرت"[٣٠].

سەبارەت بە چۆنیەتی دەرکردنی رۆژنامەکە (تەمەدون) هەندیَ زانیاری لەو بارەیەوە تۆمارکردووە و ئاوای نووسیوە: "رۆژێك شێخ عەبدوڵڵا[٣١] (لە کەسانی تێگەیشتووی سمکۆ و خزمی سەید تەها) هاتە لای من لە میانەی قساندا ئەوەی دەربڕی کە ئاغا (واتە سمکۆ) نیازی وایە لەبەر ئەوەی بڵاوکراوە لە رەزائیە (ورمیَ — توێژەر) نییە، ئەو کەموکورتییە پڕ بکرێتەوە و لە رەزائیەش رۆژنامەیەك

بڵاوبکرێتەوە. ئاخۆ بەڕای ئێوە بە چ جۆر و ئەندازە دەکرێت رۆژنامەیەك لەو شارەدا بڵاوببێتەوە، کە سەنگین و جوانیش بێت و جێی سەرنجی نووسەرانیش بێت، لە وەڵامی شێخ عەبدوڵڵادا ئەوە روونکرایەوە: بەداخەوە پیتەکانی چاپخانەی ئێمە زۆر کەمن بەشی چاپی رۆژنامە ناکات، شێخ عەبدوڵڵا کە ئەو وەڵامەی بیست رەنگ و رووی گۆڕا و منیش ترسام و هەستم بە هەڵەی خۆم کرد و گوتم: ئەگەر لەگەڵ کرێکارانی دەزگاکەی خۆمان هیمەت بکەین رەنگە کەموکورتییەکان لابرێن و بتوانرێت رۆژنامەکە چاپ بکرێت، بەڵام دەبێ زۆر کۆشش بکەین بۆ ئەوەی ئامرازی پێویست ئامادە بکرێت، لێرەدا سیمای شێخ عەبدوڵڵا کرایەوە و وەڵامی نەدایەوە. هەرچەندە ئەو بەڵێنی دا کە مزی کرێکاران و کارمەندانی رۆژنامەکە بدات، بەڵام نەدەکرا ئەو رۆژانە بڕوا بە قسەی کوردان بکرێ، چونکە سەرپێچی لە فەرمانی سمکۆ لەو هەلومەرجەدا یاریکردن بوو بە گیانی خۆت،..."[٣٢].

پاشان دەنووسێت: ".... لە دوای رۆیشتنی بە ناچاری من، سمکۆ فەرمانی دابوو کە کتێبخانە و چاپخانەکەم داگیر بکەن و مەلا محەمەد تورجانی خەڵکی سابڵاخی موکریان (مەهاباد) ناو راسپێردرابوو بۆ ئەوەی رۆژنامەی کوردی چاپ و بڵاو بکاتەوە و ئاغای مەلا محەمەد تورجانیش بێ ئەوەی کەس دەستی وەبەرنێ بەشێکی لە کتێبە باشەکانی کتێبخانەکەی منی هەڵگرتبوو و بەشێکی دیکەشی بۆ ماڵی خۆیان بردبوو، سەرباری ئەو کارەی لە بارەی کتێبخانەکەی من، ئەوا ناوی چاپخانەکەشمی گۆڕیبوو، تابلۆی چاپخانەی تەمەدونی هەڵگرتبوو، لەجێی ئەو تابلۆی چاپخانەی غیرەتی دانابوو! و رۆژنامەیەکیشی بە زمانی فارسی و کوردی بڵاوکردبووەوە، تەنیا بەناوی رۆژنامەیەکی هەفتانەی کوردی بەناوونیشانی (رۆژی کرد = شەوی عەجەم" کە دواتر بە ناوی (رۆژی کورد) چاپ بوو و دواتریش تەنیا بە ناوی (کورد) دەریکردبوو، ئێمە وا چەند دێڕێك لە رۆژنامەی کورد لە ژمارەی ساڵی یەکەم ١٣٤٠ وەك نموونە لێرە دێنینەوە" : کلێشەی رۆژنامەکەی بڵاوکردووەتەوە[٣٣].

ئەو ژمارەیە، ژمارە یەکەمی رۆژنامەی (کورد)ە کە وەك گوترا لە (١٢ی شەوالی ١٣٤٠ = ٨ی حوزەیرانی ١٩٢٢) دەرچووە، تێیدا ئەم زانیارییانەی تۆمارکردووە:

ساڵی یەکەم، لاپەڕەی یەکەم لە ناوەڕاست، سەرەتا ئایەتی "واعتصموا بحبل الله جمیعاً ولاتفرقوا) نووسراوە، لە ژێری دوو دەست تەوقە لەگەڵ یەك دەکەن وەك نیشانەی یەکگرتن، لە ناوەڕاستیدا (کرد — کورد) لەگەڵ ساڵی ١٣٤٠ کۆچی و زەخرەفەیەك کراوە. لەلای راستی نووسراوە: "شوێنی کارگێڕی ورمێ چاپخانەی غیرەت —بەرێوەبەری محەمەدی تورجانی — مەقالاتێك مەنفەعەتی کوردانی تێدابێ وەردەگیرێ". "جارێ لە هەر هەفتەدا یەکێك چاپ دەکرێ"، "١٢ی شەوالی ١٣٤٠" لای چەپ: حەقی رۆژنامە پێشەکی وەردەگیرێ. ناوەوە ساڵێك ٥٠ بۆ دەرەوە ٦٠ و شەش مانگ ناوەوە ٢٧ و ٣٥ قران. نرخی یەك دانە دە شاهی، نرخی ئیعلاناتی هەر دێڕێ دوو قران".

لە ژێرەوە لە ناو دوو خەت بە فارسی نووسراوە: "رۆژنامەیەکە سیاسی، ئەدەبی، ئەخباری سەر مەقالی بۆ فارسی وەردەگێڕدرێت — کوردێك دەینووسێ بۆ هەموو کوردان"(٣٤).

دوای پشکنین و گەڕانێکی زۆر، خۆشبەختانە لە "راپۆرتێکی کونسوڵی سۆڤیەت هاوڕێ پاڤۆڤسکی لە ئەرزەڕۆم لە رۆژی ١٩٢٣/١/١١"، باسی ئەو رۆژنامەیەی (کورد) دەکات و تێیدا وێڕای هەندێ لەو زانیارییانەی سەر کلێشەی رۆژنامەکە کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێکردن، نووسیویە: "رۆژنامەی کورد — یەکەم ساڵی بڵاوکردنەوەی— هەفتەی جارێك دەردەچێت، دوانزەی شەواڵی ١٣٤٠ بەرامبەر ٩ی حوزەیرانی ١٩٢٢ — (نرخی ساڵانەی لە فارس (مەبەستی ئێرانە — توێژەر) پەنجا قرانە و لە دەرەوە شەست قرانە و نرخی هەر ژمارەیەك دە شاهییە)، "ئەو وتارانە بڵاودەکاتەوە کە لە بەرژەوەندی گەلی کورد دەنووسرێن"(٣٥).

لێرەدا من وای بۆ دەچم، کە ئەو ژمارەیە لە ئەسڵدا ژمارەی لەسەر نەبووبێت، ئەگینا چۆن راپۆرتنووس ئاماژەی پێ نەدەکرد، لە کاتێکدا بەڕوونی ئاماژەی بە ساڵەکەی کردووە، کە تەنیا ساڵی یەکەم (سال اول) و ژمارەی لاپەڕەی لەسەرە.

جێی ئاماژەیە لە گۆڕینی مێژووی کۆچییەکە، رۆژێك لەگەڵ ئەوەی ئێمە جیاوازی هەیە(٣٦)، بەڵام لێرەدا لە هەمووی گرنگتر وتارێك بەناوی (سمکۆ)

بەسەردێڕی "مرۆڤ ئەوەی کە دەیەوێ تەنیا بە هەوڵدانی خۆی پێ دەگات" لە بنی نووسراوە: "وتاری سمکۆ سەبارەت بە کۆمەڵگای کوردەواری ئابووری و عەدالـەت و چەوساوەیی لە ژێردەستی زۆرداران"(٣٧).

لەو وتارەدا ئاماژە بەوە کراوە کە بێگانان چەند ماف گەلی کوردیـان پێشـێل کـردووە و پـەلاماریان داوە و سـەروەت و سـامان و کەرامـەتیان بـردووە، لەوانـە: ئاسوری، ئەرمەن، "فارسی هاوئایین و برایانن، دەوڵەتی روسیا خـۆی کوردسـتانی داگیرکردووە بەبیانووی جیاوازی ئایینەوە"(٣٨)

پاشان سەرزەنشتی ئەو "برا دیینیانەی کورد" دەکات کە هیچ "هاوسۆزییەك لەگەڵ کورد ناکەن، بەڵکو لەو تراژیدیایەش بێدەنگن کە بەسەری هاتووە. کردەوە دزێو و پیسەکانی ئەوانیش کە تا ئێستا بەردەوامە هەموو سـنوورێکیان بڕیـوە کـە زمان لە دەربڕینیان عاجزە"(٣٩).

لەوانەش گرنگتر ئاماژە بە یەکگرتن و یەکبوون دەکـات، تەنانـەت ئـەوە لـەو ئایەتەی کە لەسەر کلێشەی ڕۆژنامەکـەی دانـاوە (واعتصـموا ........) و هـەروەها ئەو دروشمەی لەسـەر ڕۆژنامەکـەش دانـدراوە پێشـتر ئاماژەمـان پێکـرد دووپـاتی ئەمـە دەکەنـەوە و نووسـیویە: "ئێمـەی کـورد جگـە لـە یـەکگرتن و یـەکێتی هـیچ ڕێگایەکی ترمان بۆ ڕزگاری لەدەست دوژمنان نییە، هیچ ئامرازێکی تر بۆ ئەم گەلە بێبەش و بێ پشتیوانە نییە جگە لەوەی دەست لە ناو دەستی یەك بنـێین، ڕێگـای ڕزگاریمان هەر ئەوەیە و هیچی تر."(٤٠)

لەوانەش زۆر گرنگتر ئەو هەستی نەتەوەیی و بەرگریکردنەی کە (سمکـۆ) لـە خۆی دەکات، لە کاتێکدا دوژمنانی کورد ئەویان بـە کەسـێکی خێڵـەکی و یـاخی و سەرکێش و دز و تالآنچی و ڕۆبـن هـودی ڕۆژهـەلآت دوور لـە ئامـانجی نەتەوایـەتی ناساندووە، ئەوا ئەو لێرە زۆر بەڕوونی بەرگری لە خـۆی دەکـات و وەلآمـی ئەوانـە دەداتەوە، ئەوان بە تاوانبار و دز و تالآنی ناودەبات: "من کوردم و ژیانم لە پێنـاو ڕزگاری و بەختەوەری گەلەکەم بەخت کردووە و بەختی دەکەم، بەلآم بـەپێی ئـەو پڕوپاگەندەی فارسەکان لەسـەر مـن بلآویـان کردۆتـەوە، کردەوەکـانی منیـان بـە خراپکاری داناوە و بە خراپکاریش ناوم دەبەن، بەلآم من چەتە و ڕێگر و خراپەکار نیم، من پارێزەری مافم. بەلآم فارسەکان زۆردار و دزن، تا ئێستاش هەر خـەریکی

تالآنکردنی ولآتی کوردستانن و سووکایەتی بە کورد دەکەن و هەوڵی لەناوبردنی هەموو دەستکەوت و کەرامەتی کورد دەدەن"لەم رووەوە داوا دەکات ئەوەی لە خەمی ئەو کوردەوەیە "دەبێ دەست لە ناو دەست لە دژی دوژمنان خەبات بکەن پشتگیری لە گەلەکەیان بکەن"[٤١].

بایەخی ئەو وتارەی بەناوی سمکۆ بڵاوبووەتەوە چ وەك وتاری سمکۆ – گەر بۆشی نووسرابێت، بەڵام هەر دەربڕی هەست و نەستی ئەمە و بەناوی کەسی یەکەمیش دەدوێت – چ وەك ناوەڕۆك یەکجار بەرز و بایەخدارە و ئەمە بیروباوەڕ و هەڵوێست و شارەزایی سمکۆ دەردەخەن، لە هەلومەرجی ئەو ڕۆژەی کوردستان، کە بۆچوونی تا ئێستاشی لەگەڵدابێت زۆر تەواو و دروستن!

بەدوای ئەو وتارەی سمکۆ لە ژێر سەرناوی (لە هەواڵەکانی بەشی دەنگوباسی لەشکری بەرەی شەڕی ڕۆژهەلآت)دا کە مێژووی (۱۹۲۳/٥/۱)ی بەسەرەوەیە، تێیدا لە هاتنی ئەمیر زەیدی کوڕی بچووکی مەلیکی مەککە (حوسێن) دەکات بۆ موسڵ و سەرۆك هۆزە عەرەب و کوردەکانی کۆکردووەتەوە بۆ ئەوەی بەرەو ئینگلیزیان رابکێشێ، بۆ ئەوەی بەڵێنیان لێ وەربگرێت کە ناوچەی موسڵ و دەوروبەری سەر بە ئینگلیزن، بەڵام خەڵکەکە ئەمیر زەیدیان بە خائینی موسڵمانان ناوبردووە، ئەمیر سەرکەوتوو نابێ، لەپاڵ ئەو هەواڵە هەر بە دوایدا و لە پەڕەگرافێکی سەربەخۆدا هاتووەتە سەر باسی باوکی عومەرخان و باوکی سمکۆ کە لەسەر ڕێبەرایەتیکردن لە کێشە و شەڕدا بوونە لە سەردەمی خۆیدا، بە دەستتێوەردانی رووسەکان کارەکە بۆ بەرژەوەندیی باوکی سمکۆ یەکلایی بووەتەوە، بەڵام لەدوای شکستی سمکۆ لەسەر دەستی دەوڵەتی ئێرانەوە ئەوا عومەرخان خەلآت کراوە و نازناوی سالاری جەنگیان داوەتی[٤٢].

هەر لە درێژەی ئەو ڕاپۆرتەدا بەسەر ناوی "ڕۆژنامەی (استقلال)* بەغدا، ژمارە (۱۳۲) لە ۱۹۲۳/٥/۲۱" نووسیویە کە: شێخ مەحموود و هێزەکەی بەرفەرمان و گوێڕایەڵی خۆی بۆ دەوڵەتی عێراق دەربڕیوە و ئەگەر بچێتە بەغدا ژیانی مسۆگەر دەکات. ئەوەی مایەی سەرنجە هەر لە دوای ئەوە باس لە سوپایەکی دوو هەزار کەسی عەجەمان دەکات بەفەرمانـدەی خالۆ قوربان لە میاندواوەوە هێرشی بۆ سابلآخ بردووە لە ۲۸ی رەمەزان (۲٦ی نیسانی

١٩٢٢)[٤٣]، لە هەمان کاتدا هێزێکی دیکەی شەش سەد کەسی بە فەرماندەی نەسروڵڵاخان بۆ سەر سایین قەڵا و بۆکان هێرشی بردووە و نووسراوە: "هێزە قارەمانەکانی ئێمە لە ناوچەی سەقز بە سەرۆکایەتی سەید تەها ئەفەندی ئاگادار دەکرێنەوە و ئازایانە هەڵدەکوتنە سەریان و بە تەواوی تێکیان دەشکێنن". پاشان باسی شەڕەکە بەوردی دەکات کە چۆن هێزەکانی کورد گەمارۆی سابلاخ تێکدەشکێنن و دوای چوار کاتژمێر شەڕ "خالۆ قوربان و شازادە و روحڵڵا میرزا بە خەنجەری کوردی قارەمان دەکوژرێن" چەند دەسکەوتیان دەبێت هەروەها لە ٣٠ی رەمەزانیش هێزەکانی نەسروڵڵاخان تەفروتوونا دەکەن و دەشکێن و لەم شەڕەدا لە کوردان "حەوت کوژراو و سیانزە بریندار‌بوون"ـە، پاشان پیرۆزبایی ئەو سەرکەوتنە لە لەشکری کوردستان دەکات و دەنووسێت: "پیرۆزبایی و شانازی خۆمان ئاڕاستەی لەشکری سەرکەوتوومان دەکەین و سڵاویان بۆ دەنێرین و ئەم شانازیانە کە ئەوانە بۆ ئێمەیان هێنا، دەبێ بە پیتی زێڕین لەسەر لاپەڕەکانی مێژووی کوردستان بنووسرێن تا کورد بۆ هەمیشە شانازی بە رۆڵەکانی خۆیەوە بکات. هیوای چاکبوونەوە بۆ بریندارەکان دەخوازین و هیواداریین خوای گەورە شەهیدەکانمان ببەخشێ کە لە پێناوی راستی و حەقدا شەهید بوون. رۆڵە و نەوەکانیان دەبێ بزانن کە تەواوی گەلی کورد ئەمەك باری قارەمانییەتی باوکانی ئەوانن، لەمەودوا لەباتی باوکە شەهیدەکانیان تەواوی گەلی کورد چاودێر و ئاگاداریانە"، ئەم ریپۆرتاژە ئیمزای "موحەمەد جمالەدین[٤٤]— چاریق"ی بەسەرەوەیە و لە ژێرەوەشی نووسراوە: "سەرنووسەری رۆژنامە: موحەمەد تورجانی، چاپخانەی غیرەت"[٤٥].

## بابەتی کوژرانی خالۆ قوربان

لە پاشکۆی رۆژنامەی ژمارە (٢)ی کوردی چاپخانەی ورمێ: هەواڵنێری ئێمە دەنووسێت: کوژرانی خالۆ قوربان و شکانی لەشکری ئەو بۆ خاتری خوێندەواری بەڕێز روون دەکەمەوە . رۆژی ٢٨ی مانگی رەمەزان (١٣٤٠)ی مانگی لەوکاتەی لەشکری کورد لە ژێر فەرماندەی ئاغای سەید تەها ئەفەندی لە دەوروبەری قوزلو پەلاماری ساین قەڵای دابوو هەواڵی پەلاماری لەشکری خالۆ قوربان لە

میانـدواوەوە بـە شـاری وێـران شـەهر و سـابلاخ (مـەهاباد) لـەڕێی دوو کەسـی سوارئاغای سەرداری مـوکری گەیشـت، دەسـت و بـرد رووی لـە سـابلاخ کردبـوو و شەوی ٢٩ی (ڕەمەزان) لە بۆکانـەوە گیربووبـوو و بـەیانی زوو جولـەی کـرد و دوو کاتژمێر بۆ ڕۆژئاوا مابوو لە دەوروبەری گوندی دەرمان، سـەرۆك هۆزەکـان لەگـەڵ سـەید تـەها ئەفەنـدی ئەنجومـەنی ڕاوێـژ و گفتوگۆیـان پێکهێنـا و نەخشـەی پەلاماردانی لەشکری خالۆقوربانیان بەو شێوەیە کێشا:

جیهانگیربـەگ (لـە هـۆزی هـەرکی) ئەسـکەندەرخان (لـە خـەڵکی برادۆسـت) هەمزەئاغا (لە هۆزی مامەش) و ئەمیر ئەسعەد هبوکری و سالار سەعید لـە خـەتی لاچین، لە سەروەختی ڕۆژئاوابوون بڕیاردرا کە لە هەرسـێ خـەت لـە یـەك کاتـژمێر (دیاریکراو) دەست بە پەلامار و تەقەکردن کرا و ئەمیرلعەشائیر و ئەمیر ئەسعەد و سالار سەعید بەپێی بڕیارگەلێکی گشتی لە کازیوی سپێدەی ٢٩ی ڕەمەزان لە قەد شاخی (زاوابووك) لەگەڵ ژمارەیەك هێزی خالۆقوربان کـە لـە قـەد گـردی دوشـانی مەجید لە نێو سەنگەربەندی، ئامادەی شەڕ بوون و دەسرێژیان کرد و لـە هـەردوو لاوە شەڕ دامەزرا، سوارانی کورد ڕێیان نەدا شەڕ درێژە بکێشێت: بـەپرتاو خۆیـان بـە سـەنگەرەکانی عەجـەم داکـرد، ئـەوانیان بـە لوولـەی تفـەنگ دەرکـرد و ڕامالّی..ژمارەیەك دیل — ژمارەیەکیش کوژراو — ژمارەیەکی دیکەش بەرەو گوندی (ئـەگریقاش) بـۆ لای خـالۆ قوربـان هـەڵاتن. سـوارانی ئەمیرولعەشـایر و هـەروەها ئاغای حاجی سەتوە و سەڵتەنەی حاکمی سابلاخیشیان بـە دیـل گـرت و سـوارانی ئەمیر ئەسعەدیش تۆپێکی مەترەلۆز (مسلسل)یان دەسکەوت بوو.

ئەسـپ و ئێسـتر و تفـەنگی زۆریشـیان لـە هـەمان پـەلاماردا گرتبـوو، ئەمیرولعەشـایر و ئـەمیر ئەسـعەد و سـالار سـەعید دوای ئـەوەی لـە کوشـتن و دیلکردنی کەسانی داوشان مەجید (ناوی شاخێکە) تەواو بوون، ژمارەیەك سواریان بەدوای هەڵاتووەکاندا نارد و بەخۆشیان پـەلاماری ژمارەیـەکی دیکـەی هێزەکـانی خالۆقوربانیان دا کە لە قەد شاخی (غەزالی)دا بوون، ئـەوانیش دوای پێکـدادانێکی کورت شوێنەکەیان چۆڵ کرد و هەڵاتن، لەوانیش ژمارەیەك کوژراو و دیل و ئەسـپ و تفەنگێکی زۆریان گرت.

سوارانی سالار سەعید لەو جێیە یەك تۆپی مەترەلۆزیان گرت، هەڵاتوانی ئەو شوێنە بەو دۆخ و حاڵە شەپرێوە گەیشتنە ئەگریقاش، لەشکری خاڵۆ قوربانیش بە ترس و بێ ورەوە بوون دەستیان بە هەڵاتن کرد.

لــە هــەمان کاتــدا ئاغایــانی مــەنگوڕ و هــەرکی و زەرزا بــەو پەشــێویە لــە سەروبەندی پێکداداان خاڵۆقوربانیان لەگەڵ ژمارەیەك پلەدار و فەرماندە و سەرباز کوشت و ژمارەیەکی زۆریش دیل کران، پیـاوانی سـەید تـەها ئەفەنـدی ٣ عـەرادە تـۆپ و سـوارانی مـەنگوڕ یـەك عـەرادە تـۆپ و سـوارانی هـەرکی یـەك عـەرادە مـەترەلۆزیان لەگـەڵ تفـەنگ و کەرەسـتەی زۆر و دوو عـەرادە تـۆپی گـەورەیان بەدەست هێنان، بەپێی قسەی هەندێك سوارەی ئەحمەد کـەلالی ئاغـای مـەنگوڕ و بە قسەی یەکی دیکە ئەحمەدخانی هەرکی خاڵۆ قوربانیان کوشتووە.

هەڵاتووانی لەشکری خاڵۆقوربان زۆربەیان بۆ شوێنەکانی خۆیـان گەڕانـەوە و دووسەد کەسیشیان رەوانەی تەورێز کرانـەوە و کۆلۆنێـڵ نەسـروڵڵاخانی سـەرۆکی لەشکری ژاندارمەیش کە لە ساین قەڵاوە پەلاماری موکریان (مەهاباد)ی دابوو، لەو رووداوانە بەتەواوی بێ ئاگا بوو، رووەو بۆکان رۆیشتبوو بەو نیازەی کە بگاتە لای خاڵۆ قوربان، ئەمیر ئەسعەد هەر کە ئەو هەواڵەی بیست یەکسەر رۆیشـتبوو خـۆی گەیاندبووە ئەمیرئاوا تەنیشت بۆکان و کۆلۆنێلیش هاتبووە بۆکان هەرکـە هـەواڵی کوشتنی خاڵۆقوربان و شکستی لەشکرەکەی ئەو دەبیستێ بۆکان بەجێ دەهێڵێـت و رووەو ساین قەڵا دەڕوات.

سوارانی بەگزادە و سەرداری موکری سۆراخی ئەوان دەکەن و سوارانی ئەمیر ئەسعەد و ئاغایانی دیکە و هبوکریش دیسان بەپرتاو بۆ یارمەتی سـوارانی مـوکری و بەگزادە دەچـنە سـەربازگەی جەندرمـە، لـەو چـیایەی تەنیشـت گونـدی ئـالبلاغ گەمارۆی دەدەن و ژمارەیەکی زۆریش کوژراو و دیل و دەسکەوتی زۆریـان دەبێـت لە پەلاماری سوڵتان عەبدولحەمیدخان (ئەفسەری جەندرمە) دەکوژرێـت، کۆلۆنێـڵ لەگەڵ پاشمـاوەی ژمارەیـەك لـە پاسـەوانانی شـەو لـە شـاخ دێنـە خـوارەوە و لـە بیراهەوە رادەکەن.

ئاغایانی بەگزادە، فەیزوڵڵا بەگیش یەك عەرادە تـۆپی گـەورەیان گـرت و بـۆ چـەهریقیان رەوانـە کـردووە. لـە راسـتیدا کـار و خۆبەخشـی سـەرجەم ئاغایـانی

موکری، لە بەجێگەیاندنی بەرزی ئەرکی نەتەوەیی جێی ڕێزە، ان شاءالله بەناوی ئەمەکداری ئەو ڕۆژنامە ناوازەیە بڵاو دەکەینەوە. ع ش(٤٦).

لێرەدا ژمارە (١)ی ڕۆژنامەی کورد تەواو دەبێت، ئێستا باس لە ناوەڕۆکی ژمارە (٣)ی ڕۆژنامەکە دەکەین کە کەوتووەتە بەردەست(٤٧).

لەم ژمارەیەشدا هەمان کلێشەی ژمارەی (١)ی (١٢ی شەواڵی ١٣٤٠) بڵاوکراوەتەوە تەنیا جیاوازییان ژمارە و مێژووی دەرچوونیەتی، واتە: ژمارە (٣)، دووشەنبە ٢٨ی زیلقەعدەی ١٣٤٠ = ٢٣ی تەممووزی ١٩٢٢.

ڕۆژنامەی کورد هەر لاپەڕەی دابەش بووە بۆ سەر دوو ستوون و هێڵێك ناوبڕیان دەکات، لەم ژمارەیە (٣) وتاری یەکەم بێ ناوونیشانە.

لە ڕۆژنامەی (کورد)دا شیعری سیفولقوزات(٤٨) سەبارەت بە سمکۆ بڵاوکراوەتەوە وەك سەید عوبەیدوڵڵای ئەیوبیان دەڵێت لەلایەن محەمەد جەمالەدین هەکاری (قازی سمکۆ)وە بۆ ڕۆژنامەکە نێردراوە:

**سمکۆی، خودا کە داوە بەمەساحێب و ڕەئیس**
**شوکری بکەین بە زار و زبان و ددان و لێو**
**مەقسوودی وی ئەمە، کە هەقی مە بداتە مە**
**تەکلیفی مەش وهایە، فیدای بین بە نێر و مێ**(٤٩).

پارچەی شیعری دووەمی سەیف کە لەو ژمارەیەدا بڵاوکراوەتەوە ئەمەیە:

**کوردینە! تاکەی ئێمە لە کێوان میسالی دێو؟**
**دێین و دەچین و بۆمە نەبێ قەت خودان و خێو**
**ڕێی وانە کەهکەشان و ڕێی ئێمە بەردەڵان**
**جێی وانە تەخت و بەخت و جێی ئێمە بەرد و چێو**
**ڕەشماڵە ماڵ و کەشك و پەنیرە مەتاعی مە**
**قەسر و سەرایی خەڵکی دییە پڕ لە زێڕ و زیو**(٥٠).

لەم ژمارەیەی ڕۆژنامەی (کورد)دا کە بە گشتی هەر لاپەڕەی بەسەر دوو ستوون دابەش بووە بەداخەوە لاپەڕەی (٢) لای ئێمە نەخوێندرایەوە. ئەوانی دیکە (١ و ٣ و ٤)مان کوردییەکەی هێناوەتە سەر ڕێنووسی ئەمڕۆی کوردی و

فارسییەکەشمان وەك خۆی نووسـیوەتەوە. بابەتـە کوردییەکـە یەکسـەر کراوەتـە فارسـی و ئەوانـەی لـەو ژمارەیـەدا نووسـینیان هەیـە: قـازی سمکـۆ، محەمـەد جەمالەدین هەکاری، سەیفولقوزات.

– وتارێك قازی سمکۆ – محەمەد جەمالەدین هەکاری (کوردی)
– چوار دێڕ شیعری سەیفولقوزات.
– وتارێکی قازی سمکۆ – محەمەد جەمالەدین هەکاری (فارسی)
– وتارێکی محەمەد تورجانی (کوردی)
– وتارێکی محەمەد تورجانی (فارسی).

لە خوارەوە نووسراوە چاپخانەی غیرەت.

لەلاپەڕەی (١)دا سەبارەت بە بـارودۆخی رۆژهـەلاّتی کوردسـتان بـە زاراوەی کرمانجی سەروو نووسیویە: لە چوار سالّی بـەر لـە دەرچـوونی رۆژنامەکـە (١٩٢٢) واتـە لـە دوای جـەنگی یەکـەمی جیهـانی ئـەو رووداوانـەی روویانـداوە، بەتایبـەتی راپەڕینی کورد لەو ناوچانە کە ئـەویش خـۆی لـە راپـەڕینی سمکـۆی شـکاك خـۆی دەنوێنێ لە لایەن رۆژنامەکانی دەوڵەتی ئێران بە کـاری شـەقاوەیی و یـاخیبوون و چەتەگەران ناوبردووە، جا لەبەرئەوەی کـورد رۆژنامـەی نـەبووە داکـۆکی لـەخۆی بکات و راستییەکان بۆ خەلّك روون بکاتەوە، قسەی رۆژنامـەکانی دەولّـەتی ئێـران بوونەتە راستی لای خەلّك، بۆیە کـە لـەو هەلومەرجـە رۆژنامـەی کـورد دەرچـووە، ئەرکی ئەو رۆژنامەیە کە راستییەکان بۆ رای گشتی خـەلّك روون بکاتـەوە، چـونکە هیچ میللەتێك بەقەد کـورد لـەو شـەڕەدا دووچـاری زیـان و مـالّوێرانی و کاولکـاری نەبووە و لەبەرئەوەی کەسیشی نییە داکۆکی لێ بکـات. بۆیـە بـەناوی کوردایـەتی داوای لە بەڕێز بەڕێوەبەری رۆژنامەی خۆشەویسـتی (کـورد)ی کردبـوو ئـەم چـەند دێڕانەی بۆ بلاّو بکاتەوە"[٥١]

لەلاپەڕە (٣)دا و لە وتارێکی کوردیدا دیارە تەواوکەری لاپـەڕە (٢)ــە، بـاس لەو زولّم و ستەمە بێ ئەندازەی دەکات، کە دەولّەتی ئێران لە خەلّکی کوردسـتانی دەکات و وای لە کـوردان کـردووە چـیدی بەرگـە نـەگرن و ئـەو دەولّەتـە نایـەوێت کـوردان بپارێزێـت، ئـەوا بـا دەسـت لـە کـوردان بـەردا و ئـەوان (کـوردان) خۆیـان سەروکاری خۆیان دەکەن، لەبەرئەوەی کورد لە ناو کۆڕی دەولّەتان پشتگیری لـێ

بکەن ناچار ما دەست بداتە چەك و راپەڕێت، ئەگەرچی وەك دەڵێت: "عەجەمان هۆی راستی راپەڕینی کوردان دەزانن، بەڵام راستیان نەگوتوە و ناویان لێ نابوون یاخی و چەتە، دیارە راستی ئەوەیە کە کورد مەبەستیان شەقاوەت نەبووە، بەڵکو بۆ مافی میللەتیَ خۆ خەبتینە"[٥٢].

راستەوخۆ لەدوای ئەم وتارە، چەند دێڕە شیعرێکی سەیفولقوزات دێت ئەمە یەك دێڕە لە شیعرەکە:

**کوردینە تاکەی ئێمە لە کێوان میثالی دێو**

**دێین و دەچین بۆ من نەبوو قەت خواردن و خێو**[٥٣]

لە وتارە فارسییەکەدا باس لە ئەرمەن و ئاسوری و پەیوەندییان لەگەڵ کورد دەکات، وادیارە کورد لەسەر قسەی ئێران پەلاماری ئەوانەی داوە، بەڵام ئەوان ئەرمەنی و ئاسورییان لەباوەش گرت و پاراست، ئەوانیش لە کوردیان داوە و دەستدرێژی زۆریان کردووەتە سەر کوردەکان، کوردیش بۆ بەرگری لە ناموسی خۆی دەستی داوەتە چەك و دژی ئێران جەنگاو لە چەندین شوێنی کوردستان هێزەکانی ئێرانیان دەرکردووە، بەڵام کورد بە ئازایەتیی خۆڕسکی خۆی توانیویە لە تەواوی شەڕەکان سەربکەوێت، دیارە ئەوان کورد بە شەقاوە دادەنێن، بەڵام وانییە بۆ مافی خۆیان دەکۆشن[٥٤].

راستەوخۆ دوای ئەویش چەند دێڕە شیعرێکی سەیفولقوزات دێت پەسنی سمکۆ دەکات کە بۆ کورد چەند گەورەیە[٥٥].

لە لاپەڕە (٤)دا وتارێکی مەلا محەمەد تورجانی (قزلجی) تێدایە بە هەردوو زمانی کوردی و (کرمانجی ژێری) و فارسی، وتارەکە (کوردییەکەی) بێ ناونیشانە، بەڵام فارسییەکە بەناوی (بیان مرام)ە، واتە (روونکردنەوەی پەیام)ە، لێرە لەبارەی پەیامی کورد نووسیویە، لە کۆتاییدا پەیام و ئامانجی کورد پاراستنی شەرەفە و نەتەوە و سەقامگیری ئاشتی و ئاسوودەییە و هەوڵ و کۆششیان بۆ ئەوەیە لە ژێر ستەمی ئێران رزگار بن و لەو هەڕەشەیەی لەسەریانە دەرباز بن، کە مێژووی کوردستان بەسەردەکەیتەوە دەبینی هەمیشە گیان و ماڵ و ناموسیان لە مەترسیدا بووە، زوڵمی زۆریان لێکراوە و کورد دووچاری مەترسیی دەرەکی بوونەتەوە، زوڵم و هەڕەشەی جۆراوجۆریان لێ کراوە، بە

کوشتن و زیندانی و بێبەشکردنی کورد لە هەرچی کارێکی خێر و چاکە و زوڵمی جۆراوجۆری ئێران بۆ کورد بە شتێکی ئاسایی وەرگیراوە، هەر ئەم ستەمە بێ ئەندازەیە وایکردووە کورد پەنا بۆ چەك ببەن و ڕابپەڕن، لە کۆتاییدا نووسیویە: "لێمان گەڕێن دەست لە حقوقمان مەدەن!!! لەوە زیاتر مەمانکەنە جێگای تاڵان و بڕ!!! تەواوی ئارەزووی کوردان عیبارەتە لەو جوملە: حیفزکردن خۆیان و پەیداکردنی ئاتییەکی ڕووناك".

سەبارەت بە دەرکردنی ڕۆژنامەی (کورد)ی سمکۆ، محەمەد ساڵح ئیبراهیمی (شەپۆل) لەسەر زاری مەلا ئەحمەدی تورجانی[٥٦] ڕووداوێك دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

.......... ساڵی ١٣٥٤ی هەتاوی (١٩٧٥ز) پڕ زانا ئوستاد ئەحمەد تورجانی زادە هاتبووە تاران، بەخزمەتیان گەیشتم، بەسەرهات و قسەی خۆشی بۆ دەگێڕامەوە، فەرمووی: سمکۆ لە کاکم پڕ زانا مەلا محەمەد تورجانی زادە (قزڵجی) ویستبوو لە شاری ورمێ کار بۆ نووسینی ڕۆژنامەیەك بەناوی (کورد) بگرێتە ئەستۆ، منیش هاوکاریم دەکرد. جا کاتێ ڕۆژنامەکە لە بن چاپ هاتە دەرێ، فەرمووی: ئەحمەد، خۆت دەبێ ئەو ڕۆژنامە بۆ سمکۆ ببەی، ماشێن هات منیش ڕۆژنامەم برد بۆ چهریق، ئەو ڕۆژە زۆربەی سەرۆك هۆزەکان لەوێ لە خزمەت سکۆ (سمکۆ – توێژەر) دابوون، کە چوومە ژوورێ دانیشتم و پیاوەکانی سمکۆ ڕۆژنامەکەیان هێنا، سمکۆ دەستوریدا لە بەردەمی هەریەك لە میوانەکان ڕۆژنامەیەك دابنێن، لەپاشان سمکۆ ڕووی دەمی کردە میوانەکان و بە زاراوەی کوردی شیرینی شکاکی فەرمووی: ئاغاینە، من خەرج و مەخاریجی ئەم ڕۆژنامەم دابینکردووە، بەڵام ڕۆژنامەیەك کە دوای ڕوخانی ڕژیمی شای زوڵم و مارز، بە زمانی کوردی چاپ بکرێ دەبێ بە لیرە بیکڕن، جا یەکی لیرەیەك لەسەر ڕۆژنامەکە دابنێن و ئەوسا دەستوری بە یەکێ لە پیاوەکانی خۆیدا لیرەکان کۆبکەنەوە و بیهێنن بۆ جەنابی مەلا ئەحمەد تا خەرجی بکەن،......."[٥٧]

## دەقی ڕۆژنامەی (کورد) وەك خۆی

ل١-١

چار ساله وقوعاتێك لوان سەرحەدان واقع دبن عەجەم
بواستا غەزەتێت خوە بەناوی شەقاوەتیٚ ئیعلان دکەن
مرۆڤێت دروژی چکوژ حەقیقەتا شولی بیٚ خەبەرن بوی
تەرزی دزانن حال ئەوە حەقیقەتا شولی ئەوەیە مەهیوی
هەیە جریدا کوردان ئیرۆ پاشوە راستییا دشنیت وها
بنویست وا خەلق حەقیقەتی بزانت:
(دوی بایدا چەند خەبەران ئەز دیٚ بێژم)
لە هەموو کەس مەعلومە کو دوی حەربا عمومیدا ئیرانیٚ
بیٚ تەرەفییا خوە ئیعلان کری بۆ حالی ئەو مللەتی چو دەولەتێت
محارب هەندی کردێت کەفتی و سەرحەدا ئیرانێدا
موتەزەرر نەبویە ئەوە لە مەیدانێیە هەرکەسی باوەڕ نەکەت
بەلان بێت بینت ئامال ..... بو کوردێت فەقیر نمایە
ئایا ئەوە ژ چەبو؟ ئەگەر دەولەتا ئیرانیٚ- کو حەتا نهۆ خوە
مەتبوعی وی مللەتی کورد فەقیر کەفتی دوی موحبتی دزانی
محارب بو لەورا مللەتی تابعی وی موتەزەرر بووە کای
ئیعلانی حەربی دەگەڵ دەوڵەتی کرییە بەلان بدە زانین

ل ١- ٢

از آقای مدیر محترم جریده شریفه (کرد) خوا هشمندم
بنام کردیت این چند سطر بندەرا دریکی از ستونهای
(جریده برای اطلاع عمومی درج فرماید)
وقایع چهار سالهء کردستان را ایرانیان در جرائد خود
بنام شقاوت اکراد اعلان کرده وقارئین محترم جرائد
نیزچون از حقیقت کار بی خبرند به اظهارت جرائد
باور کرده و چنین تصور مینماید در صورتیکه تمامی

اظهارت جرائد ایران محض کذب بوده و نام شرافت
قیام کردستان بنام منحوسه شقاوت لکەدار میکند
لهذا فریضة کردي خود میدانم حقیقت مسئله را
بطور واضح برای اطلاع عمومی بوسیلهء جریده
شریفه عرض وبسمع قارئین محترم برسانم اولا دولت
ایران دراین جنگ بین المللی بی طرفی خودرا اعلان
کرده بود بدبختانه هیچ کدام ملت دول محارب
مثل کردستان سرحد ایران منجرنشده دوچار صدمات
فوق الطاقة نکردید علت این مسئله هایی اقتداری

ل ٣ – ١

سەرکوردان گەلەك شولێت وەهاکردنە کوردبێت فەقیر ژوی زولمێ، ژوی
جبری بی تاب مان ئیدی تەحەمولا وان نەما
مەجبور بوون ئیدعاکرن مادام دەولەتا ئیرانی نەشێت مە
موحافەزە بکەت و ژ غەیر زولمێ چو معامەلە دیتر دگەل مەناکت
بلان دەستێ خۆە ژمە بکێشیت ئەم بو خو دێ ئیدارا خوە
بکەن، و ملك و جێی خوە ژی دێ موحافەزە بکەن کوردێت
فەقیر چکو واسطا نەشری و مرۆڤێت وان لناو مەجلسا
دەولەتان تنەبوو ژ بوو وی فکرا خوە ژ غیر سلاحی چو واسطە
دیتر نەدیتن دەست دانە سلاح خوە عەجەم هێدی هێدی ژناو
دا ئەژ عەجەمان تەمیزکن، عەجەمان ئەو فکرە دەزانی، سەبەبی
ئیقداما کوردان د زانی بەلێ راستی نەدگۆت، دگۆت کورد
شەقاوەتێ دکەن هەردەم ئۆردویەك تەرتیب دکر سەوق
دکرە سەر کوردان، بەڵکە کوردان تەمامەن مەحو کەت ئەو فکرە
ئینتشار نەکەت بەلێ کوردان غیرەت و ثەبات کرن شەجاعەتا خوە
یا فیتری ئیزهارکرن دە هەمی شەڕاندا غالب بوون نها شول
گەهشتە دەرەجەکی نێزیکە عەجەم بۆ خوەژی مەغلوبیەتا خوە

و غالبیت و حەقانیەتا کوردان ئیقرار کەت ئەگەر ئیقرار نەکت
ژی وقایعی دی شهادەتیٚ یێ لە حەقیقەتیٚ بدەن مەجالا ئینکاری
نامینیت ئەو وقوعاتێت چار ساڵە دوی موحیتی دقومیت
سەبەب ئەو بو کو من عەرز کر شەقاوەت نینە مودافەعا حەقێیە:
(قازی سمکۆ — محەمەد جەمالەدین هەکاری)

(قسمەتی ئەدەبی) (اثر قەلەمی ئاغای سیفولقوزات)

**کوردینە تاکەی ئێمە لە کێوان مثالی دێو**

**دێن و دەچین بۆ مە نەبی قەت خودان و خێو**

**خەڵکی هەموو لە باغ و لە شارانە کەیف خۆش**

**ئێمە بڵاو و بێسەر ماوین لە دەشت و کێو**

**رەشماڵ و کەشك و پەنیرە مەتاعی مە**

**قەسر و سەرای خەڵکی دییە پڕ لە زێڕ و زیو**

**ژێردەستی و ئیتاعەتی بێگانە تابەکەی**

**شەرمە لە بۆ مە هێندە بژین بی نشان و نێو**

ل ٣ — ٢

وارامنەرا بە بغل کشید کردستان را در اول کار
بشویق وترغیب نمود ومیکفت مکر اکراد مسلمان
نیستند چرا انتقام از اثوری وارمنی نمیکشند ملت
بی چارەء کرد نیز بە اغفال ایرانیان فریب خوردە
یکدفعە کار از کار کذشت پس از انکە ایرانیانبە آمال
ملعنت کارانەء خود نائل شدە و ناموس اکراد را
بادست ارامنە و اثوری محو کردند ارامنە و اثوری
وامثل اولاد عزیز بە اغوش خود کشیدند چون
ملت کرد بی صاحب و فریاد مظلومانە اش راکسی
نبود جواب برهد بجز قیام برای حفظ ناموس خود
چارە دیگری ندانستند بسایە اسلحە خود مظهر

شده با ایران جنكيدند وايرانيان را از چندين
ولايات كردستان خارج نمودند لكن ايرانيان
حقيقت مسئله راپنهان واسم شقاوت رابه اكراد
مى بندن وهر زمان اردوى ترتيب داده بسر اكراد
سوق ميدهند بالاخره نيز اولاد عزيز خود
ارمنى را مسلح كرده بسر اكراد سوق نمودند
كه كردستان را بكلى محو كنند خوشبختانه ملت
كرد در قيام خود بكات كردند وشجاعت فطرى
خود راب بعالم نشان دادند و در تمامى جنكها فتح
موفقيت حاصل نمودند فعلاهم ايرانيان از كردهء
خود نادم وبجز بستن اسم شقاوت به اكراد بچيز
ديكرى متوصل نيستند تشبثات كردستان
شقاوت نيست حفظ حقوق وناموس است:
(قاضى سمكو — محمد جمال الدين الحكارى)

**گوردانی کوردەکان بەخودا رۆژی غیرەتە**
**دەس دەینە خەنجەران و پیاوانە بێینە نێو**
**سمکۆ (خودا) کە داوە بە ئێمە ساحێب و رەئیس**
**شوکری بکەین بە زار و زبان و ددان و لێو**
**مەقسودی وی ئەمە: کە حەقی مە بداتە مە**
**تەکلیفی مەش وەهایە فیدای بین ب نێر و مێو**

ل ٤ — ١

هەرچەندە ئێمە لە زمنی لوائحێك لە پێشدا دەرجمان کرد
مەرامی کوردانمان دەقارئین گەیاند، ئەما دووبارە بۆ
توضیح عەرزبان دەکەین: نیهایەت ئارەزووی کوردان و
نوقتەی نەزەریان راگرتن و ئاگاداری شەرەفی قەومییەتە و
بەرقەرارکردنی ئاسودەیی و ئازادی تەواوە کە لەسەر ئەو

زەوی و ئاو و خاکە بە دڵخۆشی بتوانن زندەگانی بکەن.
جدد و جەهدی کوردان د وە دایە کە لە ژێر چەرخی سیاسەتی
ئێرانیان کە بۆ نەهێشتنی وان هەمیشە دەکرێ دەرچن، و بۆ
نەجاتی ئەو مللەتە لە خەتەراتێکی هەڕەشەی نەمانیان لێ دەکا، مەجبور
بە ئیقدامات بوون، لە رێگای سابت کردنی ئەمنیەتی تەواوکە
لە حالی از تراب دەرچی لە دڵی هەموو لا ئیتمینانی مەحکەم
پەیدا بکا فیداکاری دەکەن.
هەرکەس بەڕاستی و ئینساف تەماشای تاریخی کوردان
بکا دەبینی: کە جان و جیدان، روح و مال، غیرەت و
ناموسی وان هەڕەشەی سەختی ئێرانیانی لەسەرە.
زوڵم و بێ حیسابی زاهری و باتنی (لە قەبیل جەریمە
کوشتن، زەجر و حەپس، نەهێشتنی وسائلی تەرەقی، بێ بەش
کردن لە نیشانانی مەدەنیەت، بۆ داننانی مەنافعی خێرییە، رێ
نەدان لە چاککردنی ئموری ژیانی خۆیان و شەریکی نەکردن
لە هیچ کار و شوغلێکدا دنیو خستنی نیفاق و . ...و ..........)
لە تەرەف ئێرانییان بۆ سەر کوردان لە ئومووری عادی بەڵکو
حالەتێکی تەبیعی بوو. دەگەڵ ئەو هەموو زوڵمەی خۆیان کە تەبعی
بەشر قبوولی ناکا هیچ وەختێکیش موحافەزەیان لە کوردان
نەکردووە، کوردان هەمیشە تووشی مەسائیبی خارجیش بوون
لەبەرئەوانە عواملی غیرەت دە کورداندا وەجۆش هات،
پەنایان برد بۆ سوپەری قیامی خۆیان ئاویشتە سەنگەری ئیقدام و
نواندنی مەوجودییەن بە دەنگی بڵند ئەو کەلیمەی حەقە دەڵێن:
لێمان گەڕێن دەست لە حقوقمان مەدەن! ! ! لەوە زیاتر
مەمانکەنە جێگەی تالان و بڕۆ! ! ! تەواوی ئارەزووی کوردان
عیبارەتە لەو جوملە: حیفزکردنی خۆیان و پەیداکردنی ئاتییەکی رووناک.
(م. د) تورجانی)

ل ٤ — ٢
(بيان مرام) هر چنده در ضمن مندرجان سابقي مامرام
كردانرا بقارئين افاده نموديم، دلي دوباره محض
توضيح معروض ميداريم غايه امل نقطه نظر كردان حفضا
شرافت قوميت و برقرار داشتن آسايش و آزادى
تام است كه در آتيه در اين سر زمين وآب و خاك
بارفاه حال بتوانند زندگانى كنند جد جهد كردان در
اين است كه خودرا از زير محور سياست ايرانيان
كه هميشه براى هدم وخفه كردن ايشان در دوران
بوده خلاص نمايند، وبراى نجات دادن قوم خويش
از خطراتى كه خيلى تهديد آورو وحشت انكيز
است مجبور باقداماتي قاطع شده، در راه استقرار
يك امنيت تام كه از حال تزلزل مبهميت بيرون
آمده، در قلب عموم توليد يك اطمينان پايدار نمايدندا
كارى ميكننده هركس بدون انحراف از دائره صدق
وانصاف مراجعه تاريخ كردستان نمايد خواهد ديد:
كەجان و وجدان، ومال وعزت وناموس كردان
معرض تهديدات سخت ايرانيان بوده وميباشد،
ظلم وتعدى مادى ومعنوى (از قبيل زجر وقتل، جريمه
وحبس، اعدام وسائل ترقى، محروم كردن از آثار
مدنيت، عدم تأسيس منابع تعالى مداخله ندادن در تنظيم
امور حياتى وعزم اشتراك در هيج كار وشغلى و.. و ..)
از طرف ايرانيان بر سركردان بمثابهء امور عاديه تلقى
شده وبلكة يك حالت طبيعيه راتشكيل ميدهد باوصف
اين همه مظالم كه طبع بشرى تحمل آنرا روا نميدارد،
در اين مدت سلطنت هيج وقتى ملت كرد را محافظه
نكرده وكردان هميشه دچار مصائب خارجى هم

شده‌اند. لهذا عوامل غیرت در کردان بهیجان وغلیان
آمده ملتجی بسپر قیام وپناهندهبسنگر اقدام وابر از
موجودیت شده باصدای رسا این کلمه‌ءحقه رامی
سرایند: بکذارید دست بحقوق مانزنید ! ! ! از این
زیاده مارا مورد زاخت ونارنسازید ! همه‌ءآمال
کردان عبارت از این جمله است: حفظ حقوق وتحصیل
آتیه درخشان (محمد ترجاني) چاپخانهء غیرت.

**ئەنجام:**

سەرەتای رۆژنامەوانیی کوردی لە رۆژهەڵاتی کوردستان: هێشتا بەڵگە و زانیاریی یەکلاییکەرەوەی زۆری پێدەوێت، سەرەنجام لەم توێژینەوەیەدا دەرکەوت کە سمکۆ بایەخی رۆژنامەنووسی بە چاکی زانیوە، بۆ گەیاندنی پەیامەکەی، بۆیە فەرمانی داوە بە دەرکردنی رۆژنامەیەك بەناوی (کورد) لە شاری ورمێ لە ساڵی ١٩٢٢، کە تێیدا وێڕای داکۆکی لە خۆی و ناساندنی بزووتنەوەکەی وەك بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی، داوای یەکێتی و یەکگرتوویی کردووە، لە هەمبەر دوژمنەکانی کە کورد و بزووتنەوەکان بە دز و تاڵانچی و یاخی ناوبردووە. دەرکردنی ئەو رۆژنامەیە گەورەیی سمکۆ و بایەخدانی ئەو بە رووناکبیری و بایەخی رۆژنامەوانی لای ئەو دەردەخات، کە لەمەش کۆمەڵێك کەسایەتی و زانای دیاری ئەو رۆژگارە دەوری دیاریان بینیوە لەوانە: سەید عەبدوڵڵا شەمزینی، مەلا محەمەدی تورجانی (قزڵجی)، محەمەد جەمالەدین هەکاری (قازی سمکۆ). لە رۆژنامەکەیدا شیعری سەیفولقوزاتی قازی شاعیری ناوداری موکریان بڵاوکراوەتەوە.

بێگومان ئەمە لاپەڕەیەکی پرشنگداری رووناکبیری و سەرەتایەکی گرنگی رۆژنامەوانیی کوردییە لە رۆژهەڵاتی کوردستان.

بەهیوای دۆزینەوەی هەموو ژمارەکانی دیکەی ئەو رۆژنامەیە و رۆژنامەکانی دیکەش، لە هەمان کات داوا لە توێژەران دەکەین هەر یەکەو لە شوێنی خۆی و بەتایبەتیش ئەوانەی لە دەرەوەن، لە خەمی هێنانەوەی ئەو بەڵگەنامە و گۆڤار و رۆژنامانەدابن کە تا ئێستا نەدۆزراونەتەوە، بۆ ئەوەی بتوانرێت لە نووسینەوەی مێژووی کورد کەڵکیان لێ وەربگیرێت.



سال اول

(واعتصموا بحبل الله جمیعاً ولا تفرقوا)

جیکی اداره و د‌ومی چاپخانه غیرت

مدیر محمد ترجانی

مقالاتیك منفعت کردان تیدابی وردگیری

جاری له هرهفته‌ذا یکیك چاپ دکری

١٢ مانك شوال ١٣٤٠

صفحه

حق روزنامه پیشکی وردگیری

| | داخله | خارجه |
|---|---|---|
| سالیك | ٥٠ | ٦٠ قران |
| ششمانك | ٢٧ | ٣٥ |

قیمت یك نسخه ده شاهی

قیمت اعلانات هر دیری دو قران

٨

رزونامیکه سیاسی ادبی اخباری سرمقالی ترجمه‌دکری بفارسی دینوسی کردیك بوه‌و کردان

کلیشه عناوین روز نامه کردی



شماره ۳ | سال اول | صفحه ۱

جیگی ادارە ودمی چاپخانە | (واعتصموا بحبل الله جمیعاً ولا تفرقوا) | حق روزنامە پیشکی ورد گیری

تحریرت مدیر محمد ترجانی | | داخلە خارجیە

مقالاتیك منفعت کردان | | سالیك ۵۰ ۶۰ قران

تیدایی ورد گیری | | ششماهك ۲۷ ۳۵

جاری لەهرهفتەدا یکیك چاپ | کرد | قیمت یك نسخەدە شاهی

دکری دوشنبە | | قیمت اعلانات هر

۲۸ مانك ذیقعدە ۱۳۴۰ | | دیری دو قران

روزنامیکە سیاسی ادبی اخباری سرمقالی ترجمە دکری بفارسی دینوسی کردیك بوهو کردن

چار ساله وقوعاتیت لو ان سرحدانی و اقع دبن عجم

براسطا غزتیت خوه بناوی شقاوتی اعلان دکن

مروفیت دور ژی چکوژ حقیقتاشولی بی خبرن بوی

طرزی دزانن حال اوه حقیقتاشولی نەوەیە مەهیوی

هیە جریدا کردان ایرو پاشوه راستیادشتیت رها

بنوسیت داخلی حقیقتی بزانت :

(دوی بایدا چند خبران ازدی بیژم)

اولی هیر کس معلومە کو دوی حربا عمومیدا ایرانی

بی طرفیا خوه اعلان کری بو حال او ملتی چود ولتیت

محارب هندی کردیت کفتی دسرحدا ایرانیدا

متضرر نبوبەا وەلیدانی یەهر کسی باور نکت

بلانیت ببینت نەنفوس، نەمال بو کردیت فقیرنمایە

آیا او دژچه بو؟ اگر دولتا ایرانی ـ کو حتاما خوه

متبوعی وی ملتی کرد فقیر کفتی دوی محیطی دزانی

ـ محارب بولو راملتی تابعی وی متضرر بو. کانی

اعلان حرب دکل کی دولتی کری یەبلان بده زانین

از آقای مدیر محترم جریدە شریفە (کرد) خواهشمندم

بنام کردیت این چند سطر بندەرا دریکی از ستونهای

جریدە برای اطلاع عمومی درج فرمایید

وقایع چهارساله کردستاندرا ایرانیان درجرائد خود

بنام شقاوت اکراد اعلان کرده وقارئین محترم جرائد

نیز چون از حقیقت کار بی خبرند به اظهارات جرائد

باور کرده و چنین تصور مینمایند در صورتیکه تمامی

اظهارات جرائد ایران محض کذب بوده و نام شرافت

قیام کردستان بنام منحوسه شقاوت لکه دار میکنند

لهذا فریضه کردی خود میدانم حقیقت مسئله را

بطور واضح برای اطلاع عمومی بوسیله جریده

شریفه عرض و بسمع قارئین محترم برسانم اولا دولت

ایران در جنگ بین المللی بی طرفی خود را اعلان

کرده بود بدبختانه هیچ کدام ملت دول محارب

مثل کردستان سرحد ایران مجروح نشده دوچار صدمات

فوق الطاقه نگردیده علت این مسئله هم نابی اقتداری

شماره ۳ سال اول صفحه ۳

سر کردان کلك شولیت وها کر نه • کردیت فقیرژوی ظلمی، ژوی جبری بی تاب .ان ایدی تحملا وأن نما مجبو ر بون ادعا کرن مادام دولتاایرانی ئشیت مه محافظه بکت و ژغیر ظلمی چومعامله دیتر د کل مه نا کت بلان دستی خوه ژمه بکیشت ام بو خوه دی اد اراخوه بکن، وملك وجی بی خوه ژی دی محافظه بکن کردیت فقیر چکو و اسطا نشری، و مروفیت وان لناو مجلسا دولتان تنه بو ژ بو ری فکراخوه ژغیر سلاحی چو واسطه دیتر ندین دست دا نه سلاحا خوه عجم هیدی هیدی ژناو [illegible]

د اژ عجمان تمیز کن؛ عجمان ژ فکره دزانی؛ سببی اقدام اما کرد ان د زانی بلی راستی ند کوت مد کوت کرد شقاو تی د کن هردم اردویك ترتیب د کر سوق د کر ه سر کرد ان، بلکه کردان تماماً محو کت او فکره انتشار نکت بلی کردان غیرت وثبات کرن شجاعتا خوه یافطری اظهار کرن دهمی شراندا غالب بون نها شول کهشته د رجه کی نیز یکه عجم ژ خوه ژی مغلوبیتا خوه وغالبیت وحقانیتا کرد أن اقرار کت اگر اقرار نکت ژی رقایع دی شهادتی بی لحقیقتی بدن مجالا انکاری نا مینت او وقوعانیت چارساله دوری محیطی د قومت سبب او بو کو من عرض کرشقاوت نینه مدافعا حقی یه:

قاضی سمکو • محمد جمال الدین الحکاری

(قسمت ادبی) • ( اثرقلمی آغای سیف القضات )

کردینه تا کی ایمه لکیوان مثال دیو.

دینو و د چین بو مه نبی قط خد ان و خیو.

خلکی همو لباغ ولشا رانه کیف خوش.

ایمه بلاو و پیسره ماوین لدشت و کیو.

وشماله مال و کشك و پنیره متاع مه.

قصر و سرای خلك دیه پر لزیر و ریو.

ژیر دستی و اطاعت ییکانه تا یکی

شرمه لبومه هینده بژین بی نشا ن و ییو.

وارامنه را به بغل کشید کردستان را دراول کار تشویق وترغیب نمود ومیگفت مکرا کراد مسلمان نیستند چرا انتقام از اثوری وارمنی نمیکشند ملت بی چاره کرد نیز به اغفال ایرانیان فریب خورده یکدفعه کار از کار گذشت پس از انکه ایرانیان به آمال ملعنت کارانه خود نائل شده وناموس اکراد را بادست ارامنه واثوری محو کردند ارامنه وانوری را مثل اولاد عزیز به اغوش خود کشیدند چون ملت کردی صاحب وفریاد مظلومانه اش را کسی نه د جواب بدهد بجز قیام برای حفظ ناموس خود چاره دیکری ندانستند بسایه اسلحه خود مظهر شده با ایران جنکیدند وایرانیان را از چندین ولایات کردستان خارج نمودند لکن ایرانیان حقیقت مسئله را پنهان واسم شقاوت را به اکراد می بندند وهر زمان اردوی ترتیب داده بسر اکراد سوق میدهند بالاخره نیز اولاد عزیز خود ارمنی را مسلح کرده بسر اکراد سوق نمودند که کردستان را بکلی محو کنند خوشبختانه ملت کرد در قیام خود ثبات کردند وشجاعت فطری خود را بعالم نشان دادند ودر تمامی جنکها فتح موفقیت حاصل نمودند فعلاهم ایرانیان از کرد خود ناوم وبجز بستن اسم شقاوت به اکراد بچیز دیکری متوصل نیستند تشبثات کردستان شقاوت نیست حفظ حقوق وناموس است:

قاضی سمکو - محمد جمال الدین الحکاری

کرد ان کردکان بخدا روژ غیرته.

د س دینه خنجران و پیاوانه بینه نیو.

سمکو (خدا) کەداوه بمه صاحب و رئیس.

شکری بکین بزار و زبان و دد ان ولیو.

مقصود و ی امه: که حق مه بداته مه.

تکلیف مش و هایه فدای بین بنیر و میو.

شماره ۳ سال اول صفحه ۴

هرچندایمه له ضمن لوائحیك له پیشدا دو جمان کرد مرام کردانمان دقارئین گیاند، اما دوباره بو توضیح عرضیان دکین: نهایت آرزوی کردان و قطعی نظریان داگرتن و آگاداری شرف قومیته و برقرار کردن آسودیی و آزادی تواوه که له سراو زوی و آو وخاکه بدلخوشی جوانی زندگانی بکن. جد وجهد کردان دوه دایه که له ژیرچرخ سیاست ایرانیان که بوفهیشتن وان همیشه دگری درجن، و بو نجاتی او ملته له خطراتیك هرشی نماتیان لی دکا مجبور باقدامات بون، له ریگی ثابت کردن امنیت تواو که له حال اضطراب درچی. بلیل همرلا اطمینان محکم پیدا بکاندا کاری دکن.

هر کس براستی و انصاف تماشای تاریخ کردان بکا دبینی: که جان و وجدان، روح ومال، عزت و ناموس وان هرشی سخت ایرانیان لسره.

ظلم و بیحسابی ظاهری و باطنی (له قبیل جریمه و کشتن، زجر وحبس، نهشتنی وسائل ترقی، بی بش کردن له نشانان مدنیت، بودانان منافع خیریه، ری نه‌دان له چاك کردن امور ژیان خویان وشریك نکردن له هیچ کاروشتیك داونیوخستن نفاق. و. و...) له طرف ایرانیان بو سر کردان له امور عادی بلکو حالتیك طبیعی بو. دکل او همو ظلم خویان که طبع بشر قبولی ناکا هیچ وختیکش محافظیان له کردان نکردوه، کردان همیشه توش مصائب خارجیش بون لبراوانه عوامل غیرت ده کرداند او جوش هات، جایان برد بو سیر قیام خویان آوشه سنگر اقدام و نواندن موجودیت بدنك بلندا و کلمی حقه دلین: لیمان گرین دست لحقوقمان مدن!!! لوه زیاتر مبانکنه جیگی تالان وبرو!!! تواو آرزوی کردان عبارته لوجمله: حفظ کردن خویان پیدا کردن آتیه یکی روناك. ◆§(م. د) ترجانی§◆

§بیان مرام§ هرچند در ضمن مندرجات سابقی مامرام کردانرا بقارئین افاده نمودیم، ولی دوباره محض توضیح معروض میداریم غایه امل نقطه نظر کردان حفظ شرافت قومیت و برقرار داشتن آسایش و آزادی تام است که در آتیه در این سرزمین و آب وخاك باوفاه حال بتوانند زندگانی کنند جد جهد کردان در این است که خود را از زیر محور سیاست ایرانیان که همیشه برای هدم و خفه کردن ایشان دگر دوران بود خلاص نمایند. وبرای نجات دادن قوم خویش از خطراتی که خیلی تهدید آور و وحشت انگیز است مجبور باقدامات قاطع شده، دو واه انتشار یك امنیت تام که از حال تزلزل و بهمت بیرون آمده در قلب عموم تولید یك اطمینان پایدار نماید فدا کاری میکنند. هر کس بدون انحراف از دایره صدق و انصاف مراجعه بتاریخ کردستان نماید خواهد دید: که جان و وجدان، و مال و عزت و ناموس کردان معرض تهدیدات سخت ایرانیان بوده و میباشد. ظلم و تعدی مادی و معنوی (از قبیل زجر و قتل، جریمه و حبس، اعدام وسائل ترقی؛ محروم کردن از آثار مدنیت، عدم تأسیس منابع تعالی مداخله ندادن در تنظیم امور حیاتی و عدم اشتراك در هیچ کار روشنائی و. و...) از طرف ایرانیان برسر کردان بمثابه امور عادیه تلقی شده و بلکه یك حالت طبیعیه را تشکیل میدهد. با وصف این همه مظالم که طبع بشری تحمل آنرا روا نمیدارد؛ در این مدت سلطنت هیچ وقتی ملت کرد را محافظه نکرده و کردان همیشه دچار مصائب خارجی هم شده‌اند لهذا عوامل غیرت در کردان بهیجان و غلیان آمده ملتجی بسیر قیام و بناهنده بسنگر اقدام و ابراز موجودیت شده با صدای رسا این کلمه حقه را می سرایند: بکذارید دست بحقوق ما نزنید!!! از این زیاده مال امور داخت و تاز نسازید. اهمه آمال کردان عبارت از این جمله است: حفظ حقوق و تحصیل آتیه درخشان (محمد ترجانی)

.چاپخانهٔ غیرت.

## پەراوێز:

[١] بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، خەباتی رزگاریخوازی کورد و ئازەر لە ئێران، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: ئازاد عوبێد سالح، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ٣٨.

[٢] بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: جليلى جليل وآخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، ترجمة: د. عبدي حاجي، دار الرازي، بيروت، ١٩٩٢، ص ١٣١ – ١٣٢.

[٣] بڕوانە: مارتين وان بروينست، قبايل كرد ودولت ايران سرگذشت شورش سمكو، ترجمة: سيد محمد صمدي، مهاباد، ١٣٦٥ خورشيدي (١٩٨٦م)، ص ٣٨ – ٣٩.

[٤] بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: د. کەمال مەزهەر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤١ – ٤٢.

[٥] خوی: شارێکە لە باکووری رۆژهەڵاتی کوردستان.

[٦] جليلى جليل وآخرون، المصدر السابق، ص ٧٩.

[٧] بۆ زانیاریی تێروتەسەل و ورد بڕوانە: عبدالفتاح علي يحيى، عبدالرزاق بدرخان البوتاني، نشاطه الثقافي والسياسي، "كاروان" (مجلة)، اربيل، العدد (٦٥)، حزيران ١٩٨٨، ص ١٢٥ – ١٣٧، م. س. لازاريف، المسألة الكردية ١٨٩١ – ١٩١٧، ترجمة: اكبر أحمد، مركز كوردستان للدراسات الستراتيجية، ٢٠٠١، ص ٣٢٥.

[٨] نوری عەلی ئەمین، رۆژنامەگەری لە کوردستاندا، "نەورۆز" (گۆڤار)، ژمارە (١)، ساڵی یەکەم، نەورۆزی ١٩٥٩.

[٩] محەمەد تۆفیق وردی، رۆژنامەگەریی کوردی لە کوردستانا، "روناکی" (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە (٢)، تشرینی یەکەمی ١٩٦٩.

[١٠] جەبار جەباری، سەرجەمی بەرهەمە رۆژنامەنووسییەکانی شەهید جەبار جەباری، ئامادەکردن و پوختەکردنی: عەبدوڵڵا زەنگەنە، چاپخانەی هێڤی، هەولێر، ٢٠١٠، ل ١٢٤.

[١١] جەمال خەزنەدار، رابەری رۆژنامەگەریی کوردی، بەغدا، ١٩٧٣، ل ١٩.

[١٢] سەید عەبدوڵڵا سەمەدی، گڕوگاڵی منداڵانی کورد، یەکەمین گۆڤاری منداڵان بە زمانی کوردی، "رامان" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (٤)، ٥ کانوونی دووەمی ١٩٩٩، بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: عەبدوڵڵا زەنگەنە _ رەفیق ساڵح، رابەری رۆژنامەنووسی کوردی: "رۆژنامەڤانی" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (١١–١٢)، ٢٠٠٣، ل ٩٢ – ٩٣، جوتیار تۆفیق، بیبیلۆگرافیای رۆژنامەگەری کوردی لە رۆژهەڵاتی کوردستان و دەرەوەیدا (١٩٠٨ – ١٩٨٨)، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٧

[١٣] مارتين وان بروينسن، عشاير كرد ودولت ايران: مورد شورش سمكو، ترجمة: حسن قاضي، مطالعات كردي "نشريه"، پاريس، جلد ١، شماره (٤)، سال سوم، تابستان ١٣٦٥، ص ٢٢ – ٣٦.

(١٤) بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: عەبدوڵڵا زەنگەنە _ ڕەفیق سالّح، ڕابەری ڕۆژنامەنووسی کوردی: "ڕۆژنامەڤانی" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (١١–١٢)، ٢٠٠٣، ل ٩٢ – ٩٣

(١٥) الشرق الحديث، ١، عدد ٩ (١ شوباتی ساڵی ١٩٢٢)، ٥٨٤، ئارنۆڵد توینبی، بە وەرگرتن لە: وديع جويد، الحركة القومية الكردية نشأتها وتطورها، ط١، دار آراس – دار الفارابي، اربيل، ص ٣٤٢ – ٣٤٣، مارتين وان بروينسن، عشاير كرد.....، ص ٢٢ هامش.

(١٦) دیڤید مەکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، ئەبوبەکر خۆشناو لە فارسییەوە کردوویەتی بە کوردی، چ٢، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥، ل ٣٦٧.

(١٧) Fo371/40219, The Kurdish Problem, Foreign office Rasearch Department, 6April.1944. بە وەرگرتن لە (د. وليد حمدى، الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية، مطابع سجل العرب، لندن، ١٩٩٢، ص ٢٨٦، ١٩٤٤.

(١٨) بڕوانە: علاءالدين سجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چ ٢، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٧١، ل ٦١١. چاپی یەکەمی ئەو کتێبە لە ساڵی ١٩٥٢ لە بەغدا دەرچووە و لەوێ ئاماژەی پێکردووە.

(١٩) مەلا محەمەد تورجانی (مەلا محەمەد قزڵجی) کوڕی مەلا حوسێن کوڕی مەلا عەلی قزڵجییە، لە ١٨٩٥/٧/٨ لە مەهاباد لەدایك بووە، ساڵی ١٩٢٢ بەشداری بزووتنەوەکەی سمکۆی شکاکی کردووە. بۆ خوێندن چووەتە میسر و لە ئەزهەر خوێندوویەتی، دواتر لە بەغدا نیشتەجێ بووە، چەند دانراوێکی گرنگی هەیە لەوانە: (التعريف بمساجد السليمانية ومدارسها) لە ١٩٣٨ لە بەغدا چاپ بووە، لە ١٩٥٩/٩/١٤ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: جوتیار تۆفیق، بیبیلۆگرافیای ڕۆژنامەگەری کوردی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و دەرەوەیدا (١٩٠٨ – ١٩٨٨) ل٨١–٨٢، محمد علي القرەداغي، في رحاب اقلام شخصيات كردية، بنکەی ژین، مطبعة شڤان، السليمانية، ٢٠٠٧، ص ١١ – ١٨.

(٢٠) على دهقان، رضائية ياسرزمين زردشت، تهران، ابن سينا، اسفند، ١٣٤٨ش. لە "رامان"، ژمارە (٤١)، ١٩٩٩/٢/٥، ل ٢١٩، وەرگێراوە.

(٢١) بڕوانە: سەرجەمی بەرهەمە ڕۆژنامەنووسییەکانی شەهید جەبار جەباری،......... ل ١٢٥.

(٢٢) هێمن (محەمەد ئەمین سەید حەسەنی شێخەلئیسلامی موکری) لە ٥ی مایسی ١٩٢١ لە گوندی (لاچین)ی نزیك مهاباد لەدایك بووە. لە حوجرە و قوتابخانە خوێندوویەتی، زوو دەستی داوەتە شیعر و نووسین و دواتر چووەتە ناو کۆڕی سیاسەت و وەك ئەندامی (م. س) ح. د.ك – ئێران، وەك شاعیرێکی دیار حیسابی بۆ دەکرێت و ماوەیەکی زۆریشی لە باشووری کوردستان بەسەربردووە. دەزگای بڵاوکردنەوەی سەلاحەدینی لە ورمێ دامەزراندووە و گۆڤاری سروەی لێ دەرکردووە. لە ١٩٨٦/٤/١٩ کۆچی دوایی کردووە و لە مەهاباد نێژراوە. جوتیار تۆفیق، هەمان سەرچاوە، ل ١١٧ – ١٢٦.

(٢٣) محمد تمدن، اوضاع ایران در جنگ اول یاتـأریخ رضـائیة، تمـدن، اسـلامیة، تهـران، ١٣٥٠ش (١٩٧١ن)، ص ٣٦٩ ٣٧٢، هـێمن، رۆژنامـەی کـوردی لـە کوردسـتانی ئێـران دا، (بـەیان) ) (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە (١٧)، ئەیلولی ١٩٧٤، ل ١ – ٧.

(٢٤) گرشەی کوردستان: گۆڤارێکی مانگانەی سیاسی، کۆمەڵایەتی، عیلمی، ئـەدەبی و هونـەری بوو، بە کوردی لە تاران دەرچووە. خـاوەنی ئیمتیـاز و بەڕێوەبـەری بەرپرسـیاری محەمـەد ساڵح ئیبراهیم (شەپۆل)ـە، ژمارە (١) لە ئاداری ١٩٨١ و دواژمارەی (٩) لـە کۆتـایی ١٩٨١ دەرچـووە. بـۆ زانیـاریی پـتر بڕوانـە: د. ئـازاد عوبێد، گرشـەی کوردسـتان، "K 21" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (١٨ – ١٩)، بەرگی دووەم، ئابی ٢٠١٣، ل ٣٠١ – ٥٧٠.

(٢٥) بڕوانە: سەرەتای رۆژنامەگەری لە کوردسـتان، "گرشـەی کوردسـتان"، ژمـارە (٩)، ١٩٨١، ص ٨ – ١١.

(٢٦) محەمەد ساڵح ئیبراهیمی (شەپۆڵ)، لـە سـاڵی ١٩٣٣ لـە مـەهاباد لـە بنەماڵەیـەکی ئـایینی زانستی لەدایك بووە. لە ساڵی ١٩٥٦ خوێندنی ئایینی تەواو کردووە و بووەتـە وتاربێـژ. لـە ساڵی ١٩٩٢ دکتۆرای لە زانستی ئیسلامی وەرگرتووە و بووەتە مامۆستا لە زانکـۆی ئـازادی ئیسلامی لە تاران. چەندین دانراوی جۆراوجۆری هەیە، قورئانی پیرۆزی کردووەتـە کـوردی. خاوەن و سەرنووسەری گۆڤاری (گرشەی کوردستان) بووە کـە ژمـارە (١)ی لـە ١٩٨١/٣/١ لـە تـاران دەرچـووە و نـۆ ژمـارەی لـێ چـاپ کـردووە. بڕوانـە: محەمـەد سـاڵح ئیبراهیمـی (شـــەپۆل)، کۆمەڵـــە وتـــارێ: بـــە لێکۆڵینـــەوە و لێکدانـــەوە و نووســـینی بـــە شـــێوەی دایرەتولمـەعاریف، دەزگـای توێژینـەوە و بڵاوکردنـەوەی موکریـانی، چـاپخانەی خـانی (دهۆك)، هەولێر، ٢٠١٠.

(٢٧) بڕوانە: د. ئازاد عوبێد ساڵح، داخۆ رۆژنامەی (کورد) یان (بانگی حەق) یەکـەمین رۆژنامـەی شۆڕشی کوردستانە؟، "رۆژنامەنووس" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (١٢)، پـایزی ٢٠٠٧، ل ٧١ – ٧٧.

(٢٨) بڕوانە: "کـرد" (رۆژنامـە)، ورمـێ، شمـارە (٣)، سـال اول، ٢٨ ذیلقعـدە ١٣٤٠، ص ١. بـۆ یەکـەمین جـار لـە رێـی تـۆڕی کۆمەڵایـەتی Facebook لەلایـەن فەرەیـدوون حـەکیم زادە بڵاوکرایەوە.

(٢٩) سەید عەبدوڵڵای سەمەدی، گروگاڵی منداڵان، ل ٢١٩.

(٣٠) بڕوانە: جلیلی جلیل وآخرون، المصدر السابق، ص ١٣٢.

(٣١) سەید عەبدوڵڵای نەهری لە ساڵی ١٨٩٠ لە تائیف هاتووەتە دنیاوە، پیـاوێکی خوێنـدەوار و رووناکبیر بـووە، دەسـتی نووسـین و شـیعری هـەبووە، ئەنـدامی لقـی خۆیبـوون بـووە، لـە ساڵانی چل بەدواوە بە یەکجاری لە (دزە)ی مەرگـەوەڕ (ورمـێ) لـە خۆرهـەڵاتی کوردسـتان نیشتەجێ بووە. وەك رابەری تەریقەتی نەقشـبەندی سـەیری کـراوە و رێـزی لـێ نـراوە. لـە ١٩٦٧/٥/٢٤ کۆچـی دوایـی کـردووە. بڕوانـە: بیرەوەرییـەکانی سـەید عـەزیزی شـەمزینی،

(زیندگی من)، ئامادەکردن و ساغکردنەوەی: محەمەد حەمەباقی، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠١١، ل ١٦ — ٢٠.

(٣٢) بڕوانە: محمد تمدن، منبع پشین، ص ٣٦٩.

(٣٣) همان منبع، ص ٣٧٠ — ٣٧١.

(٣٤) همان، ص ٣٧١؛ هەروەها بڕوانە کلێشەکە لە پاشکۆدا.

(٣٥) د. ئەفراسیاو هەورامی (وەرگێڕان و ئامادەکردن)، کورد لە ئەرشیفی رووسیا و سۆڤیەتدا، پێداچوونەوەی کوردییەکەی: مستەفا غەفوور، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ٢٩٠.

(٣٦) بڕوانە: د. ئازاد عوبێد ساڵح، داخۆ ........ ل ٧٤.

(٣٧) بڕوانە: د. ئەفراسیاو هەورامی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٩٠.

(٣٨) هەمان سەرچاوە، ل ٢٩٠ — ٢٩١.

(٣٩) هەمان سەرچاوە، ل ٢٩١.

(٤٠) هەمان سەرچاوە، ل ٢٩١.

(٤١) هەمان سەرچاوە، ل ٢٩١.

(٤٢) هەمان سەرچاوە، ل ٢٩٢.

* استقلال: رۆژنامەیەکی سیاسی رۆژانە پاشان هەفتانە بووە، خاوەنەکەی عەبدولغەفور بەدری بووە لە ٢٨ی ئەیلوولی ١٩٢٠ لە بەغدا دەرچووە، تا خاوەنەکەی لە ژیاندا بووە بەردەوام بووە، بڕوانە: زاهدة كريم، دليل الجرائد والمجلات العراقية ١٨٦٩ — ١٩٧٨، ط٢، دارالنشر والمطبوعات الكويتية، ١٩٨٢، ص ٣٠.

(٤٣) ئەو پەلامارە پاشان بووەتە وتارێکی سەربەخۆ وەك پاشکۆی ژمارە (٢)، لە رۆژنامەکە بڵاوکراوەتەوە. بڕوانە: کوژرانی خالۆ قوربان.

(٤٤) وێڕای کۆشش و گەڕان و پشکنینی زۆر بۆ ناساندنی ئەو کەسایەتییە، بەڵام هیچمان دەستگیرنەبوو.

(٤٥) هەمان سەرچاوە، ل ٢٩٢ — ٢٩٣.

(٤٦) محمد تمدن، اوضاع ایران، .......... ل ٣٨١ — ٣٨٣. وای بۆ دەچم ئەو (ع ش)ـە، سەید عەبدوڵڵای شەمزینی (نەهری) بێت، کە پێشتر کورتە پێناسەیەکی کرا.

(٤٧) ئەم ژمارەیە بۆ یەکەم جار لە ٢٠١٤/٥/٣١ تۆڕی کۆمەڵایەتی (فەرەیدوون حەکیم زادە وەرمانگرت و لەوێدا نووسراوە: کە لە بنجدا رۆژنامەکە لەلایەن محەمە رەزا سەیفی قازی لە تاران دۆزراوەتەوە، عەلی کەریمیش لە حەسەنی قازی وەریگرتووە و فەرەیدوونیش لە عەلی کەریمی.

(٤٨) ئەبوحەسەن سەیفی قازی لە ساڵی ١٨٧٦ لە مەهاباد هاتووتە دنیاوە و خوێندنی ئایینی تەواوکردووە، لە عەرەبی و فارسی و کوردی و تورکیدا مامۆستا بووە و شیعری بەو زمانانە

گوتــووە و شــاعیرێکی بــەتوانابوو. بــە مامۆســتای شــاعیرانی موکریــان بەشــاگردی حــاجی قادری کــۆیی (١٨١٥ – ١٨٩٧) پەســن دراوە. لــە ســاڵی ١٩٤٥ کۆچــی دوایــی کــردووە. بــۆ زانیاریی پتر لە بارەی ژیان و شیعرەکانی بڕوانە: ژیان و شیعرە کوردییــەکانی ســەیفولقازی ١٨٧٦ – ١٩٤٥. ژیــان و شــیعرە کوردییــەکانی ســەیفولقوزاتی قــازی ١٨٧٦ – ١٩٤٥، ئامــادەکردنی: ئــەنوەری ســوڵتانی – حەســەنی قــازی: بنکــەی ژیــن، چــاپخانەی شــڤان، سلێمانی، ٢٠٠٨.

(٤٩) ژیــان و شــیعرە کوردییــەکانی ســەیفولقوزاتی قــازی ١٨٧٦ – ١٩٤٥، هــەمان سەرچــاوە، ل ٢٥٨، بڵاوکردنــەوەی هــەمان شــیعر لای د. محەمــەد ســاڵح ئیــبراهیمیش پشــت راســت کراوەتەوە. بڕوانە: گرشەی کوردستان (گۆڤار)، تاران، ژمارە (٩)، ١٩٨١، ل ٨ – ١١.

(٥٠) ژیان و شیعرە کوردییەکانی سەیفولقوزاتی قازی .... ل ٢٦٨.

(٥١) بڕوانە: "کورد" (رۆژنامە)، (ورمێ)، ژمارە (٣)، ل ١.

(٥٢) بڕوانــە: قــازی سمکــۆ – محەمــەد جەماڵــەدین هــەکاری، کــورد، ژمــارە (٣)، ٨ی تــەمموزی ١٩٢٢ – ٨ی زیلقەعیدەی ١٣٤٠، ل ٣.

(٥٣) بۆ زانیاریی پتر و شیعرەکە بڕوانە: کــورد، ژمــارە (٣)، ل ٣؛ ژیــان و شــیعرە کوردییــەکانی سەیفولقوزاتی قازی ١٨٧٦ – ١٩٤٥، ئامادەکردنی: ئەنوەری ســوڵتانی و حەســەنی قــازی، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٨.

(٥٤) بڕوانــە: قــازی سمکــۆ – محەمــەد جەماڵــەدین هــەکاری، کــورد، ژمــارە (٣)، ٨ی تــەمموزی ١٩٢٢، ل ٣.

(٥٥) بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل ١.

(٥٦) مەلا ئەحمەد تورجانی زادە کوڕی مەلا محەمەد حوسێن کوڕی مەلا عــەلی قزڵجییــە، ســاڵی ١٩٠٣ لە مەهاباد لەدایك بووە، ماوەیــەك مــەلا و دواتــر بووەتــە فەرمانبــەر، پاشــان بووەتــە مامۆســتای زمــان و ئــەدەبی عــەرەبی لــە زانکــۆی تــەورێز، چــەند دانراوێکــی هەیــە. لــە ١٩٨٠/٩/٢٤ لە شاری تەورێز کۆچی دوایی کردووە. بۆ زانیاری پتر بڕوانە: جوتیــار تۆفیــق، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٢ – ٨٣.

(٥٧) محەمەد ساڵح ئیبراهیمی،......، ل ١٠٨ – ١٠٩، هەروەها بڕوانە: محەمەد صالح ئیبراهیمی (شەپۆل) نیشــتمان ناســی و نــاودارانی کــورد، چ١، تــاران، ٢٠١١، مــەلا ئەحمــەد مــەلا علــی قزڵجــی، ل ٤ – ٥، کــەریمی حیســامی، (لــە بیرەوەرییــەکانم)، ١٩٩٥– ٢٠٠١، بــەرگی یانزدەهەم، ستۆکهۆڵم، ٢٠٠١، ل ١٨٨ – ١٨٩.

## ملخص البحث

يتنـاول هـذا البحـث بدايـة مـوجزة مـن تـأريخ الصـحافة الكورديـة في شـرق كوردستان مع التطرق الى الجانب الثقافي للحركة الكوردية هناك بقيادة اسماعيـل آغـا شكاك (سمكو). خصوصاً الجريدة التي امر باصـدارها في اورميـة عـام ١٩٢٢، باسـم (كرد) وقد كرس (سمكو) الجريدة بهدف الدفاع عن نفسـه وتعريـف بحركتـه كحركـة قومية، وقد تم العثور على العدد (٣) من الجريـدة وقمنـا بالبحـث عـن تـأريخ صـدور الجريدة ومن ثم دراسة العدد (٣) والتي هي لآن تحت اليد.

كما قمنا باعادة كتابة أصل العدد بالأملاء الكوردي الحالي بغية تسهيل قرائته من قبل قراء اليوم، مع تعريف هؤلاء الذين كان لهم دور في اصـداره، وهـم كـل مـن: سيد عبدالله الشمزيني، ملا محمـد ترجـاني (قزلجـي)، محمـد جمـال الـدين حكـاري (قاضي سمكو)، سيف القضاة القاضي.

لاشك ان هذه صفحة ثقافية مشـرقة لبدايـة مهمـة للصـحافة الكورديـة في شـرق كوردستان.

بأمل العثور على الاعداد الباقية لهذه الجريدة والجرائد الاخرى، وفي نفس الوقت ادعو الباحثين وكل من موقعه وبالاخص الـذين هـم في الخـارج، البحـث والعمـل علـى اعادة الوثائق والجرائد والمجلات الكورديـة الـتي تعتـبر في عـداد المفقـودين لحـد الآن بغية الاستفادة منها في تدوين تأريخ الكورد.

# Abstract

This research deals with a brief history of the Kurdish Media in eastern Kurdistan, then it shows the intellectual, and media aspects of the Kurdish revolutionary movement in eastern Kurdistan in which represented by Ismael Agha Shekak ( Simko). It also deals with the Newspaper called "Kurdish" that Shekak himself ordered to establish it in Werme in 1922.

That is undeniable, Simko has tried to show his ability and to introduce his national movement.

The third edition has recently found. In addition, After doing a research on it. There is no doubt about the date of publishing the first edition.

The third Edition transmitted in to the current Kurdish spellings for readers to be read easily. Lots of famous Kurdish leaders played a major role of publish it. For instance, Sayed Abdullah Shamzini, Muhammed Turchani (Qzilji), Muhammed Jamela, ddin Hakarri (Qadri Simko) and Sabkhalquzati Qazi.

Undoubtedly, It was a brilliant beginning of Kurdish Media in eastern Kurdistan.

We wish to find other edited numbers of the newspaper. Meanwhile, we are asking all Kurdish researchers particularly who live out of Kurdistan to find all the documents about Kurds with Newspapers and Magazines. They will be very important to write Kurdish history which means we can get more benefits from them to write history of Kurds.

# خەسرەوی ڕوزبە و
# کوردەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە گەرمیان
# ١٩٥٥ - ١٩٣٧

م/ ئەحمەد محەمەد ناسر (ئەحمەد باوەڕ)
بەشی مێژوو – کۆلێژی پەروەردە – زانکۆی گەرمیان

**پێشەکی:**

ڕەزاخانی مازندەرانی (١٨٧٨– ١٩٤٤) لە (شوباتی ١٩٢١) دا و لە ڕێگای کودەتایەکی سەربازییەوە، بە هاوکاری هێزی سەربازیی بەریتانیا، توانی تاڕادەیەك جڵەوی دەسەڵات لە فەرمانڕەوایانی قاجاری (١٧٩٢– ١٩٢٥) وەربگرێ و دەست بەسەر کاروباری بەشێکی ولاتی ئێرانی قاجاریدا بگرێت، بەلام بە تەواوی ئەوەی بۆ نەهاتەدی کە بتوانێت کۆتایی بە دەسەلاتیان بهێنێت، تا ئەوکاتەی لە (نیسانی ١٩٢٦) دا، دوای ئەوەی کە سوڵتان ئەحمەد شای قاجار (١٨٩٧– ١٩٨٨)[1] بەرەو دەرەوەی ولات و بێ گەڕانەوە لە دەسەلات دوورکەوتەوە[2]. ئەمیش وەك شای ئێران لە بەردەم پەرلەمانی ئەو ولاتەدا تاجی شاهانەی لەسەر نا و لێرە بەدواوە بە ڕەزاشای پەهلەوی (١٩٢٦– ١٩٤١) ناسرا، ڕۆژ بە ڕۆژ دەسەلاتی تاکڕەوانەی خۆی دەست پێکرد و یەکێك لە هەنگاوەکانی ئەوە بوو، کە خۆی وتەنی دەیویست جۆرێك لە ڕیفۆرم و شان بە شانی ئەوەش سینترالیەتی ئێرانی بگەڕێنێتەوە بۆ هەموو ناوچەکان، بە شێوازێکی سەرکوتکەرانەی عەسکەرتاریانە مامەڵەی لەگەڵ هەموو ئەو ڕەگەزو زمان و نەتەوانەدا دەکرد، کە ئەو دەیەویست بیانخاتەوە ژێر دەسەلاتی تاکڕەوانەی خۆیەوە، هاوکات دەیویست لە هەموو خەسڵەتێکی نەتەوەیی و ڕەگەزی و زمانەوانی دایانماڵێت. بۆ نموونە: یەکێك لە هەنگاوە سەرکوتکەرانەو ڕاگواستنەکانی ئەوە بوو زۆر بە چڕی و بێ ڕەحمانە دەستی دایە ڕاگواستنی

ژمارەیەکی زۆر لە هۆزەکانی گەڵباخی و جەلالی و مەنمی و پیرانی و هی تر و بۆ ناوچەکانی سوڵتان ئاوا و کرمان و شیراز بە تایبەتی لە ساڵی (١٩٣٥) دا [٣]. هاوکات هەموو ئەمانەش بۆ خۆیان لەگەڵ دەسەڵات گرتنە دەستی ڕەزاشاوە کۆمەڵێك شۆڕش و ڕاپەڕینی جۆر بەجۆریان بە دوای خۆیاندا هێنا، هەر لە کورد بە ڕێبەرایەتی سمکۆ ئاغای شکاك، لوڕ بە ڕێبەرایەتی میهر عەلیخان و شێخ عەلیخانی لوڕ، عەرەب بە ڕێبەرایەتی شێخ خەزعەل و دواتر خێڵی بەنو تەرەف لە ناوچەی عەرەبستان لە ساڵی (١٩٣٦) دا، هەروەها شۆڕشی قەشقایی و بەختیاری و بوێر ئەحمەدییەکانی ناوچەی شیراز [٤]. بە جۆرێك زۆرێك لە ڕێبەرانی ڕاپەڕینەکانی کورد و بەختیاری و قەشقایی و عەرەب و نەتەوەو ڕەگەزەکانی دی لە لایەن فەرمانڕەوایانی ئێرانی پەهلەوییەوە گیران و دواتر بە پیلانی جۆر بەجۆر لە تارانی پایتەخت و لە ناوچە دوورە دەستەکان و زیندانەکاندا، لە بارودۆخی گوماناویدا، دەکوژران و لە ناودەبران [٥]. هەروەها بەشێکی تریشیان لە تاو دەسەڵاتیان بۆ وڵاتانی دەوروبەر هەڵدەهاتن و خۆیان نەداوە بەدەستەوە، لەوانە: جەعفەر سوڵتانی هەورامی (١٨٩٦– ١٩٤١)[٦]، حەمەڕەشید خانی بانە ( ١٨٩٨– ١٩٧٤)[٧]، مەحموود خانی دزڵی (١٨٧٠– ١٩٤٦)[٨] و سۆفی بەگی وەڵەدبەگی جافی ناوچەی جوانڕۆ، کە ماوەیەکی زۆر لە ناوچە سنوورییەکان و چیای بەمۆی باشووری کوردستاندا درێژەی بە ڕاپەڕینی خۆی دا، تا ئەوکاتەی لە پلانێکی نەخشە بۆ داڕێژراودا و لە لایەن هێزەکانی هەردوو وڵاتی عێراق و ئێرانەوە ناچار نەکراو تەنگی پێ هەڵنەچنرا، خۆی نەدایە دەستی فەرمانڕەوایانی عێراقەوە وەك دواتر لە سەری دەدوێین [٩]. یان کەسایەتییەکی وەك جەعفەر سوڵتانی هەورامی و لە سەروبەندی ڕاپەڕینەکەیدا و لە کاتی هەڵاتن و تەنگ پێهەڵچنینیدا بۆ ناوچەکانی باشووری کوردستان لە تەوەری شارۆچکەی تەوێڵەی سنوورییەوە بەپێی بەڵگەنامەکانی عێراقی پاشایەتی شارۆچکەی ناوبراو لە لایەن فڕۆکەی ئێرانییەوە بۆردومان دەکرێت و دەبێتە هۆی کوژران و برینداربوونی دەیان کەس[١٠].

ئەم کورتە لێکۆڵینەوەیەمان، بەسەریەکەوە لە پێشەکی و دەرئەنجام و چوار تەوەری سەرەکی پێکهاتووەو بابەتێکە تائێستا بەکەمی نەبێت، بەم

شێوەیە لەبارەیەوە نەنووسراوەو ئاماژە بەوردەکارییەکانی نەکراوە، وەك ئـەوەی تەوەری یەکەمیان: سەبارەت بە ڕاپەڕینی قەدەم خێر و شێوازی پەناهێنانی کەس و کـارو بنەماڵەکەیـەتی، دوای شکسـتهێنانیان لەگـەرمیان لـە نـاو هـۆزی کـوردی زڕگۆشی شارۆچکەی قزرەبات و شاری خانەقین و دواتر جافی گەرمیاندا. تـەوەری دووەمیان: پەیوەستە بە هۆزی گـەلّباخی و ڕاپەڕینیانـەوە، بەرانبـەر بـەهێزەکانی ڕەزاشای پەهلەوی و شێوازی پەناهێنانیان بۆ ناوچـەکانی باشـووری کوردسـتان و بە تایبەتی گەرمیان. بەلاّم تەوەری سێیەم: سەبارەت بـە ڕاپـەڕینی سـۆفی بـەگی وەڵەدبـەگی جـافی جوانڕۆیـە، لـە بەشـی ڕۆژهـەلاّتی کوردسـتان و چـیای بـەمۆی سنووری هەر لە باشووری کوردستان و دواتر خۆ بەدەسـتەوەدانی بـە حکومـەتی عێراق و ژیانی پەناهەندەیی بنەماڵەکەی، لە کەلار و لـە نێـو بـەگزادەکانی جافـدا، بـەلاّم تـەوەری چـوارەم و کۆتـایی، زیـاتر تـەرخانکراوە بـۆ سـەربردە و ژیـانی پەناهەنـدەیی گـەورە ئەفســەری بەڕەگـەز ئـازەری ناسـراو و ئەنـدامی لیژنـەی مەرکەزی حیزبی تودەی ئێرانی (خەسرەوی ڕوزبە) لە کـەلار و بـە تایبـەتی لـەنێو خانەوادە و بەگزادەکانی جافدا.

## تەوەری یەکەم

## سەربردە و پەناهەندەیی بنەماڵەی قەدەم خێر لە قزرەبات و شاری خانەقین:

ڕاپەڕینی ژنە میری ناسراوی کورد قەدەم خێر لەوکاتەوە دەست پێدەکات، کە لە ساڵی (١٩٢٥) بە دواوە ڕەزا شای پەهلەوی بەتەواوی دەستی بەسەر حکومڕانیەتی ئێرانی قاجاریدا گرت و ڕۆژ بەڕۆژ دەسەلاتی تاکڕەوانەی دەست پێکرد، یەکێك لە هەنگاوەکانیشی بەرانبەر بە هێزە بەرهەڵستکارەکان و بە تایبەتی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد بەغەدر کوشتنی برایەکی قەدەم خێری میرزادەی کورد بوو بە ناوی (شاه مراد خان)ەوە[11]. هەندێك سەرچاوەی دیش جەخت لە سەرئەوە دەکەنەوە کە: خانمی قەدەم خێر کە هاوسەری میرزا حسێن خانی سەرۆکی گەورەی لەك بوو، لە پێشدا بە پیلانی سەرلەشکری ئێرانی عەبدوڵلاّ خانی تەهماسبی، حسێن خانی مێردی کوژراوە و ئەمیش بۆ تۆڵەکردنەوەی خوێنی مێردەکەی ئالآی شۆڕشی دژی دەوڵەتی ئێرانی پەهلەوی هەڵکردووە و لە ماوەی ساڵێکدا، سەدان سەربازی ئێرانی کوشتووە و کۆتایی بە دەسەلاتی دەوڵەتی ئێران لە ناوچەی هۆز و تیرەکانی خوڕەم ئاباد و پشتکۆ و بەرکۆدا هێناوە[12]. لێرەش بەدواوە ئەم ژنە و میرزادە ناسراوەی کورد لەگەڵ جیهان خانمی هاوسەر و جێنشینی هومایون خانی سەرۆکی (هۆزی مەڵکشاهی)دا کەوتۆتە پلانی ئەوەی، کە هەموو هێزە کوردییەکان لە یەك سەنگەر و لەدەوری خۆیان کۆبکەنەوە، بە مەبەستی ئازادی و سەربەخۆیی وڵاتی کوردستان، بۆ ئەم مەبەستەش یەکێکی دی لە هەنگاوەکانی قەدەم خێر ئەوە دەبێت، نامەیەك بۆ شێخ مەحموودی حەفید (١٨٨١– ١٩٥٦) دەنێرێت و داوای یارمەتی و یەکخستنی هێزەکانی هەردوولا دەکات بە ڕێبەرایەتی شێخ مەحموودی حەفید بۆ ئەوەی بە هەردوولایانەوە ڕووبەڕووی دوژمنانی کورد و زوڵم و ستەمیان ببنەوە، تەنانەت ئەوەش بۆ شێخ مەحموود ڕوون دەکاتەوە کە ئەو ئامادەیە هەموو هێزو سەروەت و سامانەکەی خۆی بخاتە ژێر دەسەلاتی شێخ مەحموودەوە کە بەسەریەکەوە بەشی دوو ساڵیانی دەکرد، بەلاّم شێخ مەحموود بەو داواکارییەی ڕازی نابێت، بەوەی کە دوایی هاوسەنگەرەکانی دەستی لێ هەڵدەگرن و سەرزەنشتی ئەوەی

دەکەن کە دەستی لە بەشی باشووری کوردستان (عێراق) هەلگرتووە لە پێناوی ئافرەتێکی خاوەن سەروەت و ساماندا [١٣]. ڕەزا شای پەهلەویش لای خۆیەوە و لە ڕێگای شاندێکەوە نامەیەکی بۆ دەنێرێت و وەك سەرچاوە مێژووییەکان جەختی لە سەر دەکەنەوە سەرەڕای دەرکردنی بڕیاری لێبووردنی گشتی بۆ هەموو چەکدارەکانی هاوکات داوای ئەوەشی لێ کردووە کە مێردی پێ بکات، بەلآم قەدەم خێر لەلای خۆیەوە زۆر بە ڕەقی وەلآمی دەداتەوە و بۆی دەنووسێت: (من ئافرەت نیم تا مێرد بکەم بەلکو تۆ ئافرەتی) [١٤]. بۆیە ئەویش دواتر هێزێکی سەربازی زۆری دەنێرێتە سەر کەچی ئەمیش دوای بەرگری و شۆڕشێکی بەرفراوان کە بەسەریەکەوە نزیکەی (٥) پێنج سالێ تەواوی خایاندووە داکۆکی بەردەوامی لە خۆی و ناوچەکانی ژێردەسەلآتی دەکات و بە هەموو هێزێکی خۆیانەوە بەرامبەر بە هێرش و داگیرکاریی ئێرانی پەهلەوی دەجەنگێت. بەلآم دواتر کە فەرمانڕەوایانی بەریتانیا دێنە ناو هاوکێشەکەوە و دەکەونە پالپشتیی هێزەکانی ڕەزاشای پەهلەوییەوە و بە هەموو جۆرە چەك و یارمەتییەکی دارایی پشتگیری لێ دەکەن، ئەمەش بۆ خۆی دەبێتە مایەی ئەوەی هێزەکانی (قەدەم خێر و جیهان خانم) ی هاوپەیمانی شکست بهێنن و بەشێکیش لە ڕێبەرانی شۆڕشەکە لەلایەن فەرمانڕەوایانی ئێران و هێزی سەربازیانەوە دەستگیر دەکرێن و بەشێکی تریشیان بە تایبەتی بنەمالەی قەدەم خێر بە شێوازێکی نهێنی پەنا دەبەنە ناو هۆزی بوێر ئەحمەدی ناوچەی شیراز و لەوێش زۆر ڕێزیان لێ دەگیرێت، بە جۆرێك چوار سال پێش ڕووخانی ڕەزاشای پەهلەوی قەدەم خێر لەتەمەنی (٦٩) سالیدا واتە لە سالی (١٩٣٧) دا کۆچی دوایی دەکات و هەر لە سەر وەسیەتی خۆی لە سەر کێوی ئەلوەندی ڕۆژهەلآتی کوردستان بە تەنیشت شیرینی کچیەوە ئەسپەردەی خاکی دەکەن [١٥]. هەروەها بەشێکی تری هێزو بنەمالەکەی قەدەم خێر بە تایبەتی منالی کوڕو کوڕەزاکانی لەگەل جیهان خانم و ئەختەری کچی پەنا دەهێننە بەر ناوچەکانی باشووری کوردستان و ناو (هۆزی زڕگۆش)[١٦] لە دەوروبەری شارۆچکەی قزڕەباتی ئەودەمانە کە ڕیش سپیی گەورەیان خالۆ قەمەری زڕگۆشی بووە و تاماوەیەك لەوێ دەمێننەوە. پاشان دەچنە ژێر سایەی عەبدوللآ بەگی کوڕی کەیخەسرەو بەگی جاف و نەوەکانی مەحموود پاشای جاف

(١٨٤٥– ١٩٢١)ەوە، ئـەویش لای خۆیـەوە هـەموو شـوێن و پێداویسـتییەکیان بـۆ دەستەبەر دەکات و ڕۆژانە چـاودێرییەکی وردیـان دەکـات و تەنانـەت کارئاسـانیی ئەوەشیان بۆ دەکات کە منالّەکانیان لـە خوێنـدن دانـەبڕێن. وەك ئـەوەی لـەکاتی یەکەمین سەردانیکردنیا بۆ لای جیهان خانم و بنەمالّەی قەدەم خێر پێیان دەلّێت: (بۆ ئەوەی منالّەکانتان بتوانن لە قوتابخانـە بخـوێنن، دەفتـەر نفوسـی عێراقیتـان لەسەر تاقمی خۆمان بۆ دەرئەکەین)[١٧]. بە جۆرێك دوای ماوەیەك لە دامەزراندن و نیشتەجێکردنی بنەمالّـەی قـەدەم خێـرو جیهـان خـانم لـە شارۆچـکەی قزڕەبـات، هەریەك لە حاجی ئیبراهیم بـەگی جـاف (١٨٧٨– ١٩٥٢)[١٨]، شـێخ حیسـامەدینی دەککە لە ناوچەی دەککە و شاری خانەقینەوە بە مەبەسـتی میـوانی و سـەردانێك دەچنە قزڕەبات و مالّی عەبدوللاّ بەگی کەیخەسرەو بەگی جـاف، بەڕێکـەوت ڕۆژی هەینی ئەبێت و بـۆ نوێـژی هـەینی دەچـنە مزگـەوتی مـەحموود پاشـای جـاف لـە ڕێگەی ڕۆیشتنیانداو لەبەردەم دەرگای مالّێکدا تووشی دوو مندالّ ئـەبن، شـێوازی ئاخـاوتن و قسـەکردنیان سـەرنجیان ڕائەکێشـێ کـە لـە خـەلّکی ناوچـەکە ناچـن، دواییش کە قسە لەگەلّ عەبدوللاّ بەگی جافدا، ئەویش سەربردەی بابەتەکـەیان بـۆ دەگێڕێتەوە و ئەوانیش لە بـەر بچـووکیی شارۆچـکەی قزڕەبـات و بـۆ ئـەوەی لای فەرمانڕەوایانی عێراق و ئینگلیز ئاشکرا نەبن، دەیانگوێزنەوە بۆ شاری خانەقین و لـە گـەڕەکی (حەمیدیـە) چـەند خانوویـەکیان بـەکرێ بـۆدەگرن، بـەوەی شـاری خانەقین بە بەراورد لەگـەلّ شارۆچـکەی قزڕەباتـدا گـەورەترەو هاوکـات شـێوازی گفتوگۆو ئاخاوتنی دانیشتوانەکەشی لەگەلّ بنەمالّەی قەدەم خێرو جیهـان خانمـدا زیـاتر نزیکـەو لـە ئاشکرابوونیانیشـەوە لای فـەرمانڕەوایانی عێـراق و ئینگلیـز دوورە[١٩]. سەرەڕای ئەوەش بەئاسانی دەیانتوانی ئاگایان لـە کەسـوکاری خۆیـان بێـت، وەك ئـەوەی زۆر جـاریش شـێخ حیسـامەدینی شـێخ عوسمـانی دەککـە کـە وەکیلی حاجی ئیبراهیم بەگی جاف بوو لە گونـدی (زاویـە)ی ناوچـەی قزڕەبـات: (بە نهێنی پیاوی خۆی دەنارد بۆ ناوچەی ئەلّوەند و پشتکۆ، بۆ ئەوەی نووسراوی جیهان خانم ببات بۆ دۆستەکانی و وەلاّمی بـۆ ئەهێنانـەوە)، یـان زۆر جـاری واش بووە، بە مەبەستی زیـارەتکردن بـۆ شـوێنە پیرۆزەکـان: (هـەموویانیان ئـەبردن و زیارەتی شاری کەربەلا و نەجەفیان پێ ئەکردن). بـە شـێوازێك ئـەم بنەمالّەیـە لـە

بەشی باشووری کوردستان و بە تایبەتی شاری خانەقیندا مانەوە، تا ئەو کاتەی جەنگی دووەمی جیهانی (١٩٣٩– ١٩٤٥) بەرپابوو، بە چەند ساڵێك دواتریش ڕەزاشای پەهلەوی لە (١٦ی ئەیلولی ١٩٤١)دا، لە کاروباری دەسەلاتی ئێران دوورخرایەوە بۆ تاراوگە (جۆهانسبێرگ) ی پایتەختی باشووری ئەفریقیاو هەر لەوێش مرد، ئەوجا ئەمانیش بڕیاریاندا دووبارە بگەڕێنەوە ولات و ناوچەی ڕەسەنی خۆیان لە لوڕستان، وەك ئەوەی هەردوو میری جاف واتە عەبدوڵلا بەگی کەیخەسرەو بەگ و حاجی ئیبراهیم بەگی جاف، جگە لە دەستگرۆیی و یارمەتیی پێویست بۆیان، سەیارەی تایبەتییان بۆ گرتن و تا شارۆچکەی قەسری شیرین بەڕێکران و لەوێشەوە بەرەو ناو کەسوکاری خۆیان و ناوچەی خۆیان گەڕانەوە[٢٠].

## تەوەری دووەم

## ڕاپەڕینی هۆزی گەڵباخی و نیشتەجێبوونیان لە گەرمیان (١٩٣٧ – ١٩٤٢):

بەپێی لێکدانەوەی بەشێك لە سەرچاوە مێژووییەکان، گەڵباخییەکان پێشتر لە بەشی باشووری کوردستان و لە ناوچەی قەڵاچوالان و شاری سلێمانی ئێستادا و بەتایبەتی لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی شا تەهماسبی دووەمی سەفەوی (١٧٢٢– ١٧٣٢) هوە بەرەو بەشی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و لە ناوچەکانی سەر بە شاری سنە نیشتەجێ بوون و بە زۆری لە خزمەتی فەرمانڕەوایانی ئەوکاتەی کوردستان و ئەردەڵانییەکاندا بوونە و لە ساڵانی پێشتریشدا، لە ناوچەی شارەزووردا لە ناکۆکی و شەڕێکی بەردەوامدابوون، بە تایبەتی لەگەڵ هۆزێکی گەورەی وەك جافدا و ژمارەیەکی زۆر لە نێوانیاندا کوژراوە[٢١]. بەڵام کەسێکی وەك سەید مەحموودی نەبەویی سەرەڕای ئەوەی کە باس لە دلێری و کەم هاوتایی گەڵباخییەکان دەکات لە نێو هۆزەکانی کوردا هاوکات لە بارەی ڕەسەنایەتی و بنەچەشیانەوە دەنووسێت: (ئەم خێڵە لە (٦– ٧) تیرە یان بنەماڵە پێك هاتوون و هەر هەموشیان بەڕەسەن دەچنەوە سەر عەباس ئاغای گەڵباخی کە لە دێی گەڵباخی ژووروی ناوچەی هەورامانی ڕۆژهەلات لە دایك بووەو، بە زۆری بنەماڵەکانی ئەم هۆزەی کورد لە بەشی ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا بەسەریەکەوە لە تیرەکانی وەك: قەمەری، کاك سەوەندی (کاکە وەندی)، مراد گۆرانی، گاملی، چۆخەڕەشی و دوراجی پێکهاتوون و هەروەها لە لایەکی تریشەوە هۆزی ناسراوی وەرمەزیاریش وەك تیرەیەك دەبرێتەوە سەر ئەم هۆزەی کورد، هەریەکەشیان سەرۆك و کوێخای تایبەت بە خۆیان هەیە و سەرۆکی سەرەکیشیان تا ئەم ساڵانەی دواییە دوو کەس بوون، بە ناوەکانی کوێخا حەسەن و کوێخا خەسرەوەوە) [٢٢]. هەموو ئەمانەش بەزۆری و بە سەریەکەوە شوێنی نیشتەجێبوونیان دەکەوێتە گوندە ئاوەدانەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی سەر بەناوچەکانی شاری سنە و دیواندەرەوە و هاوکات لەڕووی زمان و شێوازی ئاخاوتنیانەوە زیاتر لە شێوەزاری کرمانجی خواروو بەتایبەتی لە شێوازی سۆرانی و بن لەهجەی ئەردەڵانییەکانەوە زۆر نزیکن[٢٣]. بۆ بژێوی ژیان و وەك سەرچاوەی

خـۆراکی جگـە لـە کشـتوکاڵکردنی بـەردەوام، لەگـەڵ ئەوەشـدا سـەرگەرمی بەخێوکردنی مەڕو ماڵاتن و بەزۆری هەر لە دێهات و ناوچە ئاوەدانەکانی خۆشیاندا بە ژیـانی گـەرمیان و کوێسـتانەوە خـەریك بـوون. ژمـارەی ئـەم هـۆزە بـەگوێرەی ڕۆژنامەی کەیهانی ساڵی (١٣١١– ١٣١٥) ی هەتاوی بەرانبەر بـە (١٩٣٣– ١٩٣٧) ی زایینی نزیکەی (٥٠٠) ماڵێك بوونە و هاوکات بە گوێرەی بەڵگەنامـەی ڕێکخـراوی کاروباری خێڵەکانی ئێران لە ساڵی (١٣٦٠)ی هەتاوی بەرانبەر بە (١٩٨٢) زایینی نزیکەی (٣٧٥) خانەوادە و نزیکەی (١٨٦٧٩) کەس بوون [٢٤]. بەڵام لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی پەهلەوی و بەتایبەتی ڕەزا شا خۆیدا، کـە دەیەویسـت دەسـەڵاتی ناوەندگەرای بنەماڵەی پەهلەوی، بۆ تەواوی وڵاتی ئێران بگێڕێتەوە و بـە بۆچـوونی خۆیان وڵاتێکی دوور لە مەزهەبگەرای هاوچەرخ لە ئێرانی ئەو کاتـەدا، دابمـەزرێنن و زمـانی فارسـی بکەنـە زمـانی فـەرمی وڵات و لەگـەڵ ئەوەشـدا سـنوورێك بـۆ دەسـەڵاتی خێـڵ و هۆزەکـان دابنـێن، بـەوەی کـە گوایـە ئەمانـە لـەڕابردوودا لـە خزمەتی وڵاتانی دەرەکیدا بوون. جا بـۆ جێبـەجێکردنی ئـەم پلانـەش دوو ڕێگـای سەرەکییان گرتۆتە بەر، یەکەمیان: بەکارهێنانی هێزی سەربازی بووە بەمەبەستی داماڵینی هۆزەکـان لـە چـەك و تەقەمـەنی و دەسـەڵاتی چـەکدارییان، دووەمیـان: نیشتەجێکردنیان و دوورخستنەوەیان لە ژیـانی کۆچـەرایەتی و گواسـتنەوەیان بـۆ ئەو شوێن و ناوچانەی کە زیاتر دەسەڵاتی باڵای دەوڵـەتی پەهلـەوی بەسـەردا زاڵ بێت[٢٥].

ژمارەیەکی زۆریش لە خێڵ و هۆزە کوردەکانیش وەك هـەر هـۆز و نەتـەوە و ڕەگـەزێکی تـری ژێـر فەرمانڕەوایـەتی ئێرانـی پەهلـەوی لـە دەسـەڵاتیان یـاخی دەبوون و ئامادە نەدەبوون بچنە ژێر دەسەڵاتیانەوە. بـۆ نموونـە هـەر لـە سـاڵی (١٩٣٦)ەوە هــەر یــەك لــە عەشـیرەتەکانی تیلـەکۆ و مـەنمی و دواتـریش تـیرە ناسـراوەکانی سـەر بـەهۆزی گـەڵباخی لەوانـە بـوون، کـە کەوتنـە ڕاپـەڕین و دژایەتیکردنی ئەو پلانەی دەسەڵات و ئەمەش بـۆ خـۆی ماوەیـەکی زۆری خایانـد، تائەو کاتەی ڕەزاشای پەهلەوی لە نێوان سـاڵانی (١٩٣٦– ١٩٣٩) دا و لـە ڕێگـای سـەرکوتکردن و بـەکارهێنانی زەبـروزەنگ و هێـزی سـەربازییەوە، بەفەرمانـدەیی سەرلەشـکری سـەربازی (مەیمەنـدی) کەوتـە پلانـی سـەرکوتکردنی هـەموو ئـەو

ڕاپەڕینانـە و تەنانـەت زۆرێـك لـە سـەرکردەکانیانی دەسـتگیرکرد. هەرچـەندە لـە سـەرەتادا و بـەهۆی بـەرگری هێـزی چـەکداری و قارەمانانـەی گەڵباخییـەکان خۆیانـەوە نـەیانتوانی سـەرکەوتووبن. بـەڵام دواتـر لـە ڕێگـای پلانـی وتوویـژ و دانووسـتانەوە بەسـەریاندا سـەرکەوتن و بەشـێکی زۆریشـیان بـۆ ناوچـە دوورە دەستەکانی ئێرانی ئەوکاتەی دوور دەخستنەوە یان لە زیندانەکانی: سنە، تـاران، سەبزەوار و ئەسفەهاندا زیندانی دەکردن و دەیخستنە ژێر چاودێریی ڕاستەوخۆی توندەوە. بۆیە بەشێکی زۆر لە گەڵباخییەکانیش لەتاو پاراستنی خێـزان و مـاڵ و منـداڵیان و هـەروەها بـۆ ئـەوەی ملکەچـی فـەرمانڕەوایانی سـەربازی پەهلـەوی نەبنـەوە، بەناچـارییەوە و لـە ژێـر چـاودێری چـەند کەسـایەتییەکی شـارەزاو ناسراویاندا لە: گوندی (مەڕەگەرە) ی ناوچەی دیوانـدەرە کۆبوونەوەیـەك دەگـرن و.... لە پێنـاوی پاراسـتنی گیـانی ژن و منداڵیانـدا.. هـەموو سـەرۆك عەشـیرەت و چـەکدارەکانیان بڕیـار دەدەن بێنـە وڵاتـی عێـراق و بەتایبـەتی باشـووری کوردستانەوە. ئەوە بوو دوای مانـدووبوون و ڕووبـەڕوو بوونەوەیـەکی بـەردەوام و شـەڕکرن لەگـەڵ هێزەکـانی ئێرانـدا، خۆیـان گەیاندۆتـە ناوچـە سـنوورییەکان و بەشێکی زۆریشـیان لـە ڕێگـای هەڵاتنیانـدا، بـەرەو باشـووری کوردسـتان لەلایـەن کاربەدەستان و هێزەکانی ئێرانـی پەهلەوییـەوە دەسـتگیر دەکـرێن و سـەرەتا لـە چەند مزگـەوتێکی وەك: (هاجـەرە خـاتوون و ڕەشـید قـەڵا)ی ئـەو کاتـەی شـاری سنەدا دەخرێنە بەندیخانەوە و ئەوانی دیشیان هەر چۆنێك بێت و بە نـاو سـەرماو سـۆڵەی زسـتان و بەفربارینـدا، بـەرەو بەشـی باشـووری کوردسـتان دەبنـەوە و تەنانەت ژمارەیەکی زۆریشیان لەسەرماندا ڕەق هەڵدێن و گیان لە دەست دەدەن، هەروەها بەشێکی تریشـیان لـە سـەرەتاکانی وەرزی بـەهاری سـاڵی (١٩٣٨)ەوە، بەناچـارییەوە خۆیـان دەگەیەننـە دێهـات و گونـدە سـنوورییەکانی وەك: سـەیان، میشاو، شێرە و نزارەو لەلایەن سلێمان خـانی ڕۆغزایـی سـەر بـە هـۆزی گـەورەی جافەوە پێشوازییان لێ دەکرێت و پـەنا دەدرێـن و هاوکارییـەکی باشـیان دەکـەن. شان بەشانی ئەوانەش بەشێکی تریان بە تۆمەتی سنوور بەزاندنەوە لەلایەن دەزگا ئەمنییـەکانی ئەوکاتـەی عێراقـەوە دەسـتگیر دەکـرێن [٢٦]. بـەجۆرێك بەشـێك لـە سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەوەدەکەن، کە فـەرمانڕەوایانی ئێرانـی پەهلـەوی

لە نێوان ساڵانی (١٩٣٤ – ١٩٤٠) دا و لە زیندانەکانی خۆیدا، بەلای کەمەوە نزیکەی (١٢٠) کوردیان کوشتووە [٢٧]. جگە لەوەش زۆرێك لە کوردە دوورخراوەکان، کە لە بەهاری (١٩٤٣)ەوە و دوای دوورخستنەوەی ڕەزا شای پەهلەوی لە دەسەڵات، لەلایەن وڵاتانی هاوپەیمانەوە، بەتایبەتی بەریتانیاو یەکێتی سۆڤێتی پێشوو لە (١٦ی ئەیلولی ١٩٤١)ەوە و سەرەتای دەسەڵات گرتنەدەستی کوڕەکەی محەمەد ڕەزا شا (١٩٢١– ١٩٨٠) [٢٨]. ئەمانیش بە تەواوی ڕێگایان بۆ فەراهەم ئەبێتەوە، بۆ ئەوەی بتوانن دووبارە بگەڕێنەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان و بۆ جارێکی دی لەگەڵ کەسوکاری خۆیاندا یەك بگرنەوە. هەروەها بەشێکی تریشیان هەڵوێستی یاخیبوونیان گرتەوەبەر و دەکەوتنەوە دژایەتیکردنی بەردەوامی دەسەڵات. بۆیە ئەوانیش لەساڵانی دواتردا کەوتنە چەك داماڵینی ناوچەکە، بۆ ئەوەی ئارامییان بۆ بگەڕێننەوە [٢٩]. یان یەکێکی دی لە هەنگاوەکانی دەسەڵات، بەتایبەتی ڕەزا شای پەهلەوی وەك پێشتریش ئاماژەی بۆ کرا ئەوە بوو، کە زۆرێك لە گەڵباخییەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی، بۆ شار و ناوچەکانی تاران، ئەسفەهان سەبزەوار و هەمەدان و دوورترین ناوچەکانی وڵات دوور دەخستەوە و لەبری ئەوانە ژمارەیەکی زۆری لە تورك زمانەکان لە شوێنەکانیان نیشتەجێ دەکرد [٣٠]. لەلایەکی تریشەوە زۆرێك لە گەڵباخییەکان لە دەرئەنجامی ڕاپەڕین و یاخیبوونیان لە دەسەڵات و لە تاو زیندانی و دوورخستنەوەیان کە پەنایان هێناوەتە بەر باشووری کوردستان و لە زۆر ناوچەیدا نیشتەجێ بوون، بە تەواوی تێکەڵ بە دانیشتوانەکەی بوون و تا ئێستاش نەگەڕاونەتەوە شوێن و ناوچەکانی پێشووتری خۆیان. بەتایبەتی لە شارو شارۆچکەکانی ناوچەی گەرمیان و هەروەها شار و ناوچەکانی تری وەك: سلێمانی، هەولێر، موسڵ، شارەزوور، پێنجوێن و هەڵەبجە تا ئێستاش زۆرێك لە نەوەکانیان لەم ناوچانەدا ماونەتەوە و هاوکات زۆرێك لە گەورە پیاوان و بەساڵاچووانی گەرمیان وەك یادگارێك باس لە سەربردە و ئاوارەیی و بێ دەرەتانی ئەو گەڵباخییانە دەکەن، کە لە ڕۆژگاری خۆیدا و بەتایبەتی لە کۆتایی سییەکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوودا، پەنایان هێناوەتە بەر دێهات و ناوچەکانیان لە سنووری گەرمیاندا [٣١].

وەك ئـەوەی لـە گونـدێکی گـەورە و ئـاوەدانی وەك (ئۆمـەربل)ی سـەر بەشـاری کفـری ناوچـەی گەرمیانـدا، زۆرێـك لـە گـەورە پیـاوان و بەساڵاچـووانی گوندەکە بـاس لـە شـێوازی ژیـان و بـارودۆخی ئـەو بنەماڵـەو خانەوادانـەی هـۆزی ئاوارە و بێ نەوای گەڵباخی دەکەن کە لە کـاتی ئـاوارەبوون و هەڵاتنیانـدا، لـەتاو دەسەڵاتی سـەرکوتکەرانەی سـەربازی و تاکڕەوانـەی ڕەزا شـای پەهلـەوی، چـۆن پەنایان هێناوەتە بەر ناوچەکەی ئـەوان و هاوکـات ئـەوانیش چـۆن لای خۆیانـەوە پەنا و داڵدەیان داون وەك دەگێڕنەوە: (بە زۆری ئەو خێزان و خانەوادانەی هـۆزی گەڵباخی کە لە ڕۆژهەلاتی کوردستانەوە هاتبوونە گـەرمیان و گونـدێکی ئـاوەدانی وەك ئۆمەربل، خەڵکی ناوچەی گێزملی سەر بـە شـاری سـنە بـوون و سـەرگەورەو دەم چەرموویان لەو دەمانەدا کەسایەتییەك بـووە بـەناوی یـەحیا خانـەوە، پـێش ئەوەشی بێنە گەرمیان و گونـدی ئۆمـەربل ماوەیـەك لای داود بـەگی فـەتاح بـەگی جـاف (١٩٠٥– ١٩٦٦)[٣٢] بـوون لـە کـەلار و لـەنێو بـەگزادەکانی جافـدا داڵـدە درابوون)، ئەمانە بەسەریەکەوە لە گوندێکی ئاوەدانی وەك ئۆمەربلدا چوار خێزانی گـەورەو قـەرەباڵغ بـوون و بـەپێی گێڕانـەوەی خۆیـان سـەرۆکی سـەرەکییان کەسـایەتییەك بـووە. بـە نـاوی حەمەڕەشـید خانـەوەو لـەو ماوەیـەدا لای فەرمانڕەوایانی ئێرانی پەهلەوی لە زینداندا بووە. بەڵام کوڕەکەی کە ناوی عـەول بوو زیاتر هەر لە گوندی ئۆمەربل ژیاوە، سەرۆك خێزانێکی تریان کە حەمە ڕەشید خانی چاری پێ دەوترا خێزانەکەی ناوی (تەلیعە) بووە و کوڕێکی هەبووە بە ناوی فایەقەوە، هەروەها خۆیشی لەلایەن عەباس ئاغای کـوڕی سـەید موحسـین ئاغـای ساداتی کفرییەوە کە خاوەن زەویوزار و موڵکی ناوچەکە بوون کرابووە (شـەعنە) واتە سەرکاری گوندی ئۆمەربل، جگە لەوەش چەند خێزانێکی تری هۆزی گەڵباخی ڕۆژهەلاتی کوردستان خۆیان گەیاندبووە لای دارا بەگی سەرۆك هۆزی داودە(١٨٩١ – ١٩٥٦)[٣٣] و ئـەو جێگـای بـۆ کردبوونـەوە، بـە زۆری و بـۆ بـژێوی ژیـان ڕۆژانـە پیاوەکانیان لـە سـکەی شـەمەندەفەری شـاری مووسـڵ کرێکارییـان کـردووە [٣٤].

هاوکات باس لەوەش دەکەن، کە ئەمانە لە کاتی هەڵاتن و ئاوارەبوونیاندا تووشـی مەینەتییەکی زۆر بوون، تا گەیشتوونەتە ناوچەی گـەرمیان، هـەر وەکـو خۆشـیان گێڕاویانەتـەوە لەبرسـانا ناچـاربوون ماینـەکانی خۆیـان سـەربڕن بـۆ خـواردن و

تەنانەت بەفری ڕێگاش وای لێکردوون کە سکی ماینەکانی خۆیان هەڵدڕن، بۆ ئەوە پێی بەفربردووی منداڵەکانیانی تیا گەرم بکەنەوە، کەچی ئەمانە دوای چەند ساڵێك و لە کاتی دەسەڵات و بەرپابوونی بزووتنەوەکەی ڕەشید عالی گەیلانی ساڵی (١٩٤١) بەدواوەو دوای ئەوەی بڕیاری لێبووردنیان لەلایەن حکومەتی ئێرانەوە بۆ دەرچووە، وردە وردە گەڕاونەتەوە بۆ وڵات و ناوچەکانی خۆیان لە بەشی ڕۆژهەڵاتی کوردستان [٣٥]. هەروەها دانیشتوویەکی دیکەی گوندی ئۆمەربل لەبارەیانەوە دەڵێت: گەڵباخییەکانی ئۆمەربل لە پێشدا لە کەلار بوون و ژمارەشیان لە کەلار زۆرتر بووە تا ئۆمەربل خۆشیان گێڕاویانەتەوە، کە ئەوان لەلایەن کەریم بەگی جاف و مەحموود بەگی ڕەزابەگەوە نێردراونەتە گوندی ئۆمەربل و ئافرەتێکیان کە مێردەکەی لەلایەن فەرمانڕەوایانی ئێرانەوە گیرابوو ناوی ئامینە گەڵباخی بوو و منداڵەکانیشی ناویان عەبدولڕەحمان و محەمەد و ڕابیعە بوون و چەند خێزانێکی تریشیان لە گوندی (بساکان)ی لای ناحیەی شێخ تەویلی ئێستا ژیاون، هەرکە دەستیان بە گەڕانەوەش کرد، هەواڵی گەڕانەوە و لێبووردنیان لە کەلارەوە پێ گەیشت[٣٦].

## تەوەری سێیەم

## ڕا پەڕینی سۆفی بەگی وەڵەدبەگی جاف و شێوازی ژیانیان لە کەلار (١٩٣٧- ١٩٤٢):

بە زۆری هۆزی وەڵەدبەگی یان تیرەی وەڵەدبەگی کە بە یەکێك لە لق و تیرە ناسراوەکانی جافی جوانڕۆ دادەنرێت و بەسەریەکەوە لە چەند بەرەباب و لقێکی سەرەکی پێکهاتوون لەوانە: دەروێشی، دەلەژێری، خاڵوانی، نادری، کاکەڕەشیدی، عەلی ئاغایی، یوسف یارئەحمەدی، گاخۆری، گورگ کوژی و قادر میروەیسی. بە جۆرێك هەریەك لە: لقەکانی یوسف یارئەحمەدی و گاخۆری و گورگ کوژیان لە ناو جافی گۆران و جوانڕۆیی و تەنانەت مورادیشدا بەرچاو دەکەون و هەریەك لەوانەش ئەمانە بەتیرەی سەرەکی خۆیان دەزانن [٣٧].

هەروەها وەڵەدبەگییەکان لە بەشی ڕۆژهەلاتی کوردستاندا، ناوچە و دێهاتە کوێستانییەکانیان دەکەوێتە: قەڵای سپی، ماخۆشین، ڕەئیس، بناوچکە، کرە، کەزازی، دەسورخ، حەسەن ئاوا، شەش بید، شاینگان، مامنان، گەراب، دەوڵەت ئاوای سەروو، نەهرابی، بان شەلە، خانم ئاوا و گەمشتەر و لای سەروویان بریتییە لە: جوانڕۆ و لای ڕۆژهەلاتیان شارۆچکەی ڕوانسەر و خۆرئاواشیان خێڵی قوبادی و لای باشووریشیان هۆزی ناسراوی سنجاوی و جافی گۆرانە. بەڵام ناوچە گەرمیان نشینەکانیان بەزۆری بریتییە لە دێهاتەکانی: تیلەکۆ، باوەیسی، شێخ ڕۆزبەهان، تەپەڕەش، پشتیلکە، جێگەران و چەند گوندێکی تر دەگرێتەوە. ئەمانەش لای باکووریان ناوچەی ئەزگەلە و خانە ئاشوور واتە (باوەجانی) و لای باشووریان دێهاتەکانی خێڵی نێرژی و لای خۆرئاواشیان وڵاتی عێراق و باشووری کوردستان و ناوچەکانی حاجیلەر و چوارکلاوی سەر بە شاری خانەقین دەگرێتەوە [٣٨].

ئەمانەش بەهەمان تەرزی هۆز و خێڵەکانی تری وڵاتی ئێران و کوردستان لەگەڵ دەسەلاتگرتنە دەستیدا بە ڕووی ڕەزاشا و سیاسەتیدا ڕاپەڕین و ئامادەی ئەوە نەبوون، کە ملکەچی ئەو سیاسەتەی بن بۆ چەك داماڵینی خێڵەکان و هۆزەکان، وەك ئەوەی هەر لە ساڵی (١٩٣٥)ەوە ژمارەیەکی زۆری لە خێڵ و هۆزە کوردەکانی بۆ سوڵتان ئاوا و کرمان و شیراز دوور خستەوە بەجۆرێك گواستنەوەیان لە بارودۆخێکی زۆر خراپدا بوو تەنانەت ژمارەیەکی زۆر لە پیاوان و

ژنـان و مناڵانیـان لـە ڕێگـای گواسـتنەوەیاندا بـەرەو شـوێنی دوورخسـتنەوەیان گیانیان لە دەستدا[٣٩]. کەسایەتییەکی وەك سۆفی بەگی جـافی جـوانڕۆش کاتێـك ڕەزا شـای پەهلـەوی هێـزی سـەربازی نـاردە سـەر ناوچـەکەیان تـاقمێکی زۆر لـە سەرۆکەکانی ئەو ناوچەیە لـە لایـەن هێـزی سـەربازی ئێرانییـەوە دەسـتگیرکران و ڕەوانـەی زینـدانی قەسـری قاجـەر کـران، بـە جۆرێـك ئەوانـە بـە زۆری لـە هـەموو دەورانی فەرمانڕەوایەتی ڕەزاشادا لە زینداندا مانەوە، لەوانە: ئاغا شڕەی ئێناخی سـەر بـەهۆزی گـەورەی جـاف و خـەڵکی ناوچـەی (مـەڕەخێڵ)ی شـاری پـاوەی پارێزگـای کرماشـان، کـە نزیکـەی چـل سـاڵی تـەواوی بەزینـدانی و دوورخراوەیـی لەکەسـوکار بەسـەربرد[٤٠]. یـان حـاجی عـەلی خـانی ئەکبـەری (١٨٨٦– ١٩٧٢) سەرۆك هـۆزی گـەورەی کـەڵهوڕ لـە ناوچـەی کرماشـان کـە چـەندین سـاڵ لـە تـاو دەسەڵاتی سەرکوتکەرانەی بنەماڵـەی پەهلـەوی، کەسـوکار و وڵاتـی خـۆی بـەجێ هێشت و بە ئاوارەیی و پەناهەندەیی لە کەلاری ژێردەسەڵاتی بەگزادەکانی جاف و شاری خانەقین دەژیا. هەروەها ژمارەیەکیشیان لە زینداندا گیانیان لە دەستدا یان دەرمانخوارد کران و ئەوانەشیان کە مانەوە دوای دەسـەڵاتی ڕەزا شـای پەهلـەوی ئازاد کران و بۆ شـوێن و ناوچـەکانی خۆیـان گەڕانـەوە [٤١]. بـەڵام کەسـایەتییەکی ناسراوی وەك سۆفی بەگی کوڕی فەتاح بەگی جافی وەڵەدبـەگی، وەك پێشـتریش ئاماژەی بۆ کرا، لەگـەڵ ژمارەیـەك چـەکدارەکانیدا بـەماڵ و منـاڵی خۆیـەوە دوای ئەوەی لە لایەن سوپای ئێرانیەوە و لە ناوچـەکەی خـۆی ئابلۆقـەدرا، لـە گەڵیانـدا کەوتە شەڕەوە و چەند سەربازو پلەدارێکی لـە هێـزی سـەربازی ئێرانـی کوشـت و نزیکەی حـەوت چـەکداری خۆشـی کـوژران و بـە ناچـارییەوەو بـە مـاڵ و منـاڵـەوە خۆیـان گەیانـدە نـاو خـاکی عێـراق و چـیای بـەمۆی سـەر سـنوور لـە باشـووری کوردسـتان و یـاخیبوونی خـۆی ڕاگەیانـد و ئـەم ناوچـەیەیان کـردە بنکـەی بەرگریکردن [٤٢]. هەروەها جەعفەر سـوڵتانی هـەورامیش کـوڕێکی خـۆی بـە نـاوی محەمەدڕەشید بەگ و برایەکی کە ناوی ئەحمەد بەگ بوو لەگەڵ پـەنجا چـەکداردا ناردە هانایەوە و لەلایەکی تریشەوە لەبـەر ئـەوە بـوو تـا لەلایـەن هێزەکـانی ڕەزا شـای پەهلەوییـەوە گـیرۆدە نـەبن و دەسـتگیر نـەکرێن [٤٣]. ئـەوەبوو بـە هـەموو توانایانەوە کەوتنە بەرگریی بەردەوام و بەهیچ جۆرێك ئامـادە نـەبوون خۆیـان بـە

دەستەوە بدەن، بەڵکو ڕووبەڕووی هێزە سەربازییەکانی ئێرانی پەهلەوی و تەنانەت عێراقیش دەبوونەوە، تا ئەوکاتەی پەیماننامەی سەعد ئابادی (٨ ی تەمووزی ١٩٣٧) لە نێوان هەریەك لە وڵاتەکانی عێراق، ئێران، تورکیا و ئەفغانستاندا مۆرکراو بەشێك لە بنەماکانی ڕێککەوتننامەی ناوبراو سەرەڕای ئەوەی بە ڕوونی دژی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بووە، لە هەر چوار پارچەی کوردستاندا، هاوکات لە ماددەی (٤) ی پەیماننامەکەشدا جەختیان لە سەرئەوە کردبووەوە: (دەوڵەتانی پەیمانکار بەڵێن بە یەکتری ئەدەن کە لە هیچ کاتێدا نە بەتەنیاو نە لەگەڵ دەوڵەتێکی تردا هیچ جۆرە کارێکی دەستدرێژیکەرانە دژی یەکتر نەکەن)[٤٤]. هەروەها بەپێی بنەماکانی پەیماننامەکە کۆکیش بوون لە سەر ئەوەی بەرهەڵستکاری یەکدی ڕادەستی دەزگا ئەمنییەکانی یەکدی بکەنەوە و لەو بارەیەشەوە هاوکاری تەواوی یەکتر بن، وەك ئەوەی هەریەك لە فەرمانڕەوایانی ئێرانی پەهلەوی و عێراقی پاشایەتی لە هەردوو لاوە هێزی خۆیان بۆ سەر سۆفی بەگی جاف و چەکدارەکانی ڕەوانە کردووە، ئەوەبوو سۆفی بەگ سەرەڕای بەرگری و داکۆکیکردنێکی زۆر بە ناچارییەوە و لەگەڵ ماڵ و خۆیان داوە بەدەست هێزەکانی عێراقەوە و لە وێشەوە ڕەوانەی شاری بەعقووبە کراون، بەو نیازەی بەپێی بنەماکانی پەیماننامەی سەعد ئابادی (١٩٣٧) ڕادەستی دەزگا ئەمنییەکانی ئێرانی پەهلەوییان بکەنەوە، بەڵام کاتێك هەریەك لە کەریم بەگی جاف و داود بەگی برای لە کەلارەوە بەمەیان زانیوە لای کاربەدەستانی بەغدا بۆیان تێ کەوتوون و لەسەر داوای ئەوان ئازاد کراون. کەچی تا فەرمانی ئازادبوونیان گەیشتۆتە شاری بەعقووبە وەکو دەڵێن: سۆفی بەگی جاف لە هەلومەرجێکی تەمومژاویدا وەفات دەکات[٤٥]. لە لایەکی تریشەوەو: (بەپێی هەندێك گێڕانەوە گوایە دەرمانخواردکرابێت. جا لە بەرئەوەشی نەتوانراوە بگەیەنرێتە خەستەخانە و لای دکتۆر لە شارەکانی وڵاتی خۆی کەسوکاری خێڵەکەی هەر چۆنێك بووە گەیاندوویانەتە شاری بەغداو هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە و دواتر تەرمەکەشیان لە گۆڕستانی بەگزادەکانی وەڵەدبەگی جاف لەسەر سنوور ئەسپەردەی خاك کردووە). کەچی محەمەد سەعید بەگی جافیش دەنووسێت: (لەسەر وەسیەتی خۆی لە بناری کێوی بەمۆ نێژراوە)[٤٦]. بەڵام میر

و بەگزادەکانی جافی گەرمیان وەك هەڵوێستێك ماڵ و منداڵ و کەسوکارەکەیان گواستۆتەوە کەلار و داڵدەیان داون. جگە لەوەش لای فەرمانڕەوایانی عێراق ئاسانکاریی ئەوەشیان بۆ کردوون کە وەك پەنابەر مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت و مووچەی مانگانەیان بۆ ببڕدرێتەوە و تەنانەت منداڵەکانیشیان بە ناوی جافی عێراق و باشووری کوردستانەوە لە ئاوایی کەلاری کۆنی ئەو دەمانەدا بخرێنە بەر خوێندن (٤٧). بەگوێرەی بەڵگەنامە و تۆمارەکانی یەکەمین قوتابخانەی سەرەتایی خوێندن لە شاری کەلار، کە بۆ یەکەمین جار لە سەردەمی پاشایەتی و لە ساڵی (١٩٣١)دا کراوەتەوە، بە تایبەتی لەو دەمانەیدا کە ئەوان پەنایان هێناوەتە بەر ناوچەی گەرمیان و کەلاری ئەودەمانەی ژێر دەسەلاتی بەگزادەکانی جاف، زۆرێك لە منداڵەکانیان لەم قوتابخانەدا خراونەتە بەرخوێندن و تا کاتی گەڕانەوەیان و کۆتاییهێنانی دەسەلاتی ڕەزاشای پەهلەوی و هاتنە سەرکاری محەمەدی کوڕی ئەمان لە کەلاردا ماونەتەوە و درێژەیان بە خوێندنی خۆیان داوە، تەنانەت لە ساڵ و کاتی گەڕانەوەشیاندا هۆکاری وازهێنانیان لە خوێندن وەك تێبینییەك بەرامبەر بە ناوەکانیان دەستنیشان کراوەو بۆ هەریەکەشیان بە زمانی عەرەبی نووسراوە: ((ذهب الى بلاد العجم فترك)). هاوکات هەر هەموویان لە ڕەگەزی کوڕ بوونەو بەسەریەکەوە، ساڵی لەدایکبوونیان لە نێوان ساڵانی: (١٩٢٩–١٩٣١) بووە، هەروەها لە بەرانبەر بە شوێنی لەدایکبوونی (مسقط الرأس) هەر یەکەشیاندا بە ڕوونی نووسراوە: (ایراني)، جگە لە هەموو ئەوانەش هەر یەکەشیان بۆ ماوەی چوار ساڵی تەواو لە کەلاری ئەوکاتە خوێندوویانە، بەڵام ساڵی چوارەمی خوێندنیان بە هۆی بڕیاری لێبووردن و گەڕانەوەیانەوە بۆ وڵات و ناوچەی خۆیان تەواو نەکردووەو دووبارە گەڕاونەتەوە واتە لە ساڵەکانی خوێندنی: (١٩٣٨– ١٩٣٩) و (١٩٣٩– ١٩٤٠) و (١٩٤٠–١٩٤١)، (١٩٤١– ١٩٤٢)دا لە کەلاردا بوونە، بەسەریەکەوە قوتابی و خوێندکارە (وەڵەدبەگی)یەکان، کە لەو ماوەیەدا لە کەلار خوێندوویانە ناوی تەواو و نمرە و زانیارییەکانیان وەکو خۆی ماوەتەوە کە بەزۆری ئەمانە بوون، وەك لە خوارەوە ناویان هاتووە:

١– بـاقی دارا خـان، لـەدایکبووی سـاڵی (١٩٣١). هـەروەها بەرامبـەر بەناوەکەی نووسراوە: (تاریخ دخوله الی المدرسة ١/ ١٠ / ١٩٣٨)، بەرامبـەر نـاوی هەریەکەشیان نووسراوە (ئێرانی).

٢– ئەنوەر سۆفی فەتاح بەگ، لەدایکبووی ساڵی (١٩٢٩).

٣– خەلیل سۆفی فەتاح بەگ، لەدایکبووی ساڵی (١٩٣١).

٤– عیزەت ئاغا بەگ فەتاح بەگ، لەدایکبووی ساڵی (١٩٣٠).

٥– ئەشـرەف فەلاَمـەرز، لـەدایکبووی سـاڵی (١٩٣٢)ەو بەرانبـەر بـەناوی باوکیشی نووسراوە: (الاب متوفي) واتە باوکی مردووە و تەنها نمرەی سـاڵی (١٩٤١ – ١٩٤٢) لە ناو تۆمارەکەیدا هەیە.

٦– بەهادین سۆفی فەتاح بەگ، لەدایکبووی ساڵی (١٩٣٠).

٧– سەعید ئاغا بەگ فەتاح بەگ، لەدایکبووی ساڵی (١٩٣٠)[٤٨].

واتـە بـەم شـێوەیە وەڵەدبەگییـە ڕاپـەڕیوەکانی جـاف لـە کـەلاری ئـەو دەمانەدا و لە پەنای بەگزادەکانی جافدا درێژەیان بەژیانی خۆیانداوە، بە تایبەتی تـا ئەوکاتـەی کـە ڕەزاشـای پەهلـەوی لـە سـەروبەندی سـاڵانی جـەنگی دووەمـی جیهـانی (١٩٣٩ – ١٩٤٥) دا و لـە ناوەڕاسـتی مـانگی (ئـەیلولی ١٩٤١) دا، لـە ژێـر فشـارو لەلایـەن ولاَتـانی هاوپـەیمانی وەك بـەریتانیا و یـەکێتی سـۆڤێتەوە لـە دەسـەلاَتی شـاهانە دووردەخرێتـەوە بـۆ کوڕەکـەی و هاوکـات هـەموو گـیراو و زیندانییانی سیاسیی سەردەمی پێشووش بەلێبووردنی گشتی ئازاد کران، یـەکێك لەوانەش یەعقوب بەگی برای سۆفی بەگی وەڵەدبەگی جـافی جـوانڕۆ بـوو، کـە لـە زینـدانی (قەسـری قەجـەر)ەوە، دووبـارە گەڕایـەوە نـاو کەسـوکاری و ڕاسـتەوخۆ لەوێشەوە بە یاوەریی هێزێکەوە لە خزمانی، دەگاتە بەشی باشووری کوردستان و ناوچەی گـەرمیان بـۆ لای بـەگزادەکانی جـاف لـە کـەلار و پـاش سوپاسـگوزاری و مانەوەی بۆ ماوەیەك، لە نێو بەگزادەکانی گەرمیان و کەلاردا، کـە هێشـتا سـەرۆك هۆزی گەورەی جاف کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف و داوود بەگی برای لـە ژیانـدا بوون، هەر ئەوساش هـەموو خـزم و کەسـوکارەکەی لەگـەڵ خۆیـدا دەباتـەوە، بـۆ ڕۆژهەلاَتی کوردستان و ناوچەی جوانڕۆ [٤٩].

## تەوەری چوارەم

## سەربردە و پەنابەریی خەسرەوی ڕوزبە
## لە نێو بەگزادەکانی کەلاردا (١٩٥٣- ١٩٥٥):

یەکێك لەو کەسایەتی و بەرهەڵستکارانەی ئێران کە لە سەردەمی محەمەد ڕەزاشای پەهلەوی (١٩٢١– ١٩٨٠) دا پەنای هێنابووە بەر ولاّتی عێراق و ناوچە کوردنشینەکانی باشووری کوردستان لە گەرمیاندا ڕێبەر و کەسایەتی ناسراوی حیزبی تودە (شیوعی)ی ئێرانی خەسرەوی ڕوزبە (١٩١٦– ١٩٥٩) بوو، ئەمەش دوای چەند جارێك لە دەستگیرکردن و ڕاوەدوونانی ڕێبەر و ئەندامانی حیزبی تودە هات لە لایەن دەزگا سەرکوتکەرو ئەمنییەکانی ئێرانی پەهلەوییەوە، ناچار بوون پەنا بۆ ناوچە جۆر بەجۆرەکانی ناوەوەی ئێران و دەرەوەی ببەن بۆ نموونە یەکێك لەوانە ئیرەجی ئەسکەندەری (١٩٠٨ – ١٩٨٥)[٥٠] بوو، کە بە ناچارییەوە ولاّتی بەجێ هێشت و خۆی گەیاندە یەکێتی سۆڤێت و دواتر ئەڵمانیای ڕۆژهەلاّت، هەروەها حکومەتی ئێرانیش بە هاوکاریی هێزەکانی بەریتانیا هێرشی خۆی بۆ ناوچەکانی باشووری ولاّت دەست پێکرد بە تایبەتی بۆ سەر قەشقایی، بەختیاری، بۆویر ئەحمەدی، کوردانی کەلهوڕ، عەرەبەکانی کەعب و سەرکوتکردنی ڕێکخستنەکانی حیزبی تودە لە: بوشەهر، یەزد، شیراز،کرمان وکرماشان و شوێنانی دی و داخستنی تەواوی نووسینگە و بارەگاکانیان، بە تایبەتی لە ساڵی (١٩٤٩) بەدواوە کە هەوڵی کوشتن و تیرۆرکردنی محەمەد ڕەزاشا درا، ئەوە بوو لێرە بەدواوە حیزبی تودەی وەك حیزبێکی نا قانوونی و ناڕەسمی ڕاگەیاند و ژمارەیەکی زۆریشی لە سەرکردە و ئەندامە دیارەکانی دەستگیرکرد و خستنیە زیندانەوە [٥١]. هەروەها لە کودەتای جەنەراڵ زاهیدی بەدواوە بەسەر دکتۆر موسەدەقدا خەسرەوی ڕوزبەش یەکێك بوو لەوانەی کە بە ناچارییەوە پەنای هێناوەتە بەر بەشی باشووری کوردستان و لەمەشیاندا ڕێبەران و ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی عێراقی تاڕادەیەك ئاسانکاریی پێویستیان بۆ کردبوو. بەلاّم ئاسان نەبووە بەوەی بتوانن شوێنێکی گونجاوی بۆ بدۆزنەوە، تا تیایدا پەنای بدەن، چونکە هەریەك لە حکومەتی عێراقی پاشایەتی (١٩٢١– ١٩٥٨) و ئێرانی پەهلەوی (١٩٢١– ١٩٧٩) لە مێژەوە پەیماننامەی جۆر بەجۆر هەبووە لە

نێوانیاندا سەبارەت بە مەسەلەی سنوور و هێزە بەرهەڵستکارەکانی نێوانیان، بۆ ئەوەی هەرلایەو سەرانی هێزی ئۆپۆزسیۆنی یەکدی ڕادەستی یەکتر بکەنەوە. لەم بارەیەشەوە موکەڕەم تاڵەبانی (لەدایکبووی ١٩٢٣)[٥٢] دەنووسێت: (ڕۆژێك تێکۆشەرێکی ئێرانی لە تاو ڕاوەدوونانی ڕژێمی شاهنشاهی محەمەد ڕەزای پەهلەوی خوێنڕێژ و بە مەبەستی پەنا هێنان هەلاتبوو و خۆی گەیاندبووە ئەم ناوچەیە واتە (ناوچەی گەرمیان)، هاوکات وای پێویست دەکرد من یان براکەم واتە مەبەستی شێخ عەتای تاڵەبانی (١٩٢٥– ٢٠٠٠)[٥٣] هاوکاری پێویستی بکەین و بیپارێزین. بەلاّم لەبەر ئەوەی ئێمەش بە هۆی چالاکیی سیاسیمانەوە لە ژێر چاودێری ئەمنیدا بووین و ئەو ئەرکەشمان پێ جێبەجێ نەدەکرا، بەلاّم ئەوەی کە بەم ئەرك وکارە هەڵسا برای دووەممان محەمەد سەعید بەگی جاف (١٩٢٥– ١٩٩٦)[٥٤] بوو کە بۆ ماوەیەکی زۆر پێشوازی لەو خەباتکارەی حیزبی تودە کردو بە ناوێکی خواستراوەوە داڵدەی دا، ئەوەش بۆ خۆی ئەفسەری سەربازی لە سوپای ئێرانی ئەو کاتانەدا و هاوکات ئەندامی لیژنەی مەرکەزی و بەرپرسی ڕاگەیاندنی حیزبی تودەی ئێرانی خەسرەوی ڕوزبە بوو [٥٥].

**- کورتەیەك سەبارەت بە ژیاننامەی خەسرەوی ڕوزبە ( ١٩١٦- ١٩٥٩ ):**

بەپێی زۆرێك لە سەرچاوە عەرەبی و فارسی و ئێرانییەکان خۆیان کەسایەتییەکی وەك: خەسرەوی ڕوزبە کە بە چەندین ناوی خواستراوەوە بە ناوبانگ بووە لەوانە: سەعیدی، ستخەر واتە کورتکراوەی مولازمی تۆپخانە خەسرەوی ڕوزبە: ((مخفف ستوان توبخانە خسرو روزبە)). دووەمین کوڕی بنەماڵەی: (ضیاء لشکر)ە و لە ساڵی (١٩١٦) زایینی لە خێزانێکی هەژاری کەم دەست لە سامینی سەر بە شاری مەلایەر لە ئوستانی هەمەدان و لە خێزانێکی بەڕەگەز ئازەری هاتۆتە دونیاوە، خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی ئەمەریکی لە مەلایەر و ناوەندی و دوا ناوەندی هەر لە شاری هەمەدان تەواو کردووە، بەجۆرێك کار و خوێندنی پێکەوە گرێ داوە و دواتریش کۆلێژی سەربازی بەشی (تۆبخانە) و هەروەها کۆلێژی ئەندازیاری بەشی میکانیکی بەسەرکەوتوویی تەواو کردووە. لێرەش بەدواوە و وەك: مولازمێکی کۆمەنیست، بیرکاری زان، نووسەر،

پسپۆڕی سەربازی و مامۆستای کۆلێژی ئەفسەری شۆرەت و ناوبانگی ڕۆیشتووە، یەکێك لەو کتێب و نامە زانستییانەشی کە لە قۆناغی کۆلێژی سەربازیدا بڵاوی کردۆتەوە و زیاتر شۆرەت و ناوبانگی داوەتێ بە ناوونیشانی: بنەما زانستییەکانی دەزگای ڕووناککەرەوە لە تۆپخانەی دژە ئاسمانیدا (اصول علم اجهزة الاضاءة فی المدفعیة المضادة للجو)ی بووە، کە بەسەریەکەوە هەموو کتێبە چاپکراوەکانیشی کە لە بوارەکانی ئەندازیاری و زانستی سەربازییدا بڵاوی کردوونەتەوە ژمارەیان گەیشتۆتە نزیکەی (٣٧) کتێب و بڕوانامەی زانستی، کە زۆریان بۆ ماوەیەکی زۆر مەنهەجی خوێندنی کۆلێژی سەربازی بوون لە وڵاتی ئێراندا. شان بە شانی هەموو ئەوانەش بە بەردەوامی یارمەتی و دەسگرۆیی کەسوکار و براکانی کردووە و هەرچییەکیشی لێ مابێتەوە هەمووی بۆ کڕینی کتێبی زانستی بە تایبەتی زانستی بیرکاری تەرخانی کردووە، ماوەیەکیش بە هۆی ڕێگیریکردنی لە مەسەلەی دزی و ڕەشوەخۆری و فەسادی لە ڕیزەکانی سوپا و بە هۆی تێکەوتن و دەست لە پشتدانی چەند ئەفسەرو دەرەجەدارێکی سەربازییەوە بۆ باشووری ئێران و ناوچەی ئەهواز دوورخراوەتەوە.بەڵام وەکتر لەوێش درێژەی بە خەباتی سیاسی و بەخزمەتکردنی خۆی داوە ، پاش گەڕانەوەشی بۆماوەیەکی زۆر کراوەتە مامۆستای کۆلێژی سەربازی لە تاران و هاوکات یەکێکیش بووە لە مامۆستا شارەزاو خوێندەوارەکانی ئەو کۆلێژە. بەتایبەتی لەو دەمانەیرا، کە ڕەزمارا لێپرسراوی یەکەمی کۆلێژەکە بووە. هەروەها لە ساڵی ١٩٤٤ زایینییەوە پەیوەندی کردووە بە ڕیزەکانی حیزبی تودە (شیوعی) ی ئێرانییەوە و زیاتر لە بوار و دەزگای سەربازی ئەو حیزبەدا درێژەی بەکاری خۆی داوە [٥٦]. ماوەیەکیش لەگەڵ سەرهەنگی سەربازی سیاماکدا بەرپرسی یەکەمی باڵی سەربازی ئەو حیزبە بوون[٥٧].

لە ساڵی (١٩٤٥) ەوە خەسرەوی ڕوزبە بۆتە ئەندامی دەستەی جێبەجێکردنی ئەم ڕێکخراوە و هاوکات سەرگەرمی و مانەوەی وەك مامۆستا لە کۆلێژی ئەفسەران تا ساڵی (١٩٤٦) ی خایاندووە واتە تا ئەوکاتەی ڕاپەڕینی ئەفسەرانی ناوچەی خۆراسان دژ بە حوکمڕانیەت و فەرمانڕەوایەتی بنەماڵەی پەهلەوی بەرپابووە. لێرە بەدواوە ئەمیش خۆی بۆ ماوەیەك لە بەر چاوان ون

دەکات و دواتریش کتێبێك بەناوی خواستراوی (ستخەر)ەوە و بە ناونیشانی ئیتاعەتی کوێرانەوە (اطاعت کورکورانە) دژ بە سیاسەت و فەرمانڕەوایەتی محەمەد ڕەزا شای پەهلەوییەوە بڵاودەکاتەوە و هەموو بۆچوون و لێکدانەوەو ڕەخنەیەکی خۆی بە ڕای گشتی جیهانی و تەواوی ئێرانیانی ئەوکاتە دەگەیەنێت. تا ئەوکاتەی لە (٦ نیسانی ١٩٤٧)دا دەستگیر دەکرێت و لە (٧ ئایاری ١٩٤٧) دا، بەڕێنمایی چەند کەسایەتییەکی وەك: حیسامی لینکەرانی، ئەبوحەسەنی عەباسی و سەفیەی حاتەمی لە زینـدان هەڵدێت و دادگـای سەربازیش لای خۆیەوە بە شێوەیەکی غیابی بە (١٥) مانگ زیندانی و دەرکردنی لە ڕیزەکانی سوپا حوکمی بۆ دەردەکات. هەروەها یەکێك لە هەنگاوە سیاسی و سەربازییەکانی خەسرەوی ڕوزبە ئەوە بووە، کە لە ساڵی (١٩٤٨)دا، بە هاوکاریی حەوت کەسایەتی تری ناو ڕێکخستنەکانی حیزبی تودە گرووپێکی هەشت کەسی پێکەوە بنێن، بەمەبەستی تیرۆرکردنی گەورە بەرپرسانی فەرمانڕەوایەتی پەهلەوی لەوانە: ئەحمەد قەوام سەڵتەنە (١٨٧٦ – ٢٣/ ٨ / ١٩٥٥)[٥٨]ی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی ئێرانی ئەوکاتە، کە لە ڕیزی پێشەوەی پلان و بەرنامەیاندا بووە، بە سەریەکیشەوە دەستەکە بە زۆری لە کەسایەتییە باڵا و دیارەکانی ناو حیزبی تودە پێکهاتبوون لەوانە: (حیسامی لینکەرانی، ناسری سارمی، سەیفوڵلا هەمایون فەرەج، مەنوچەهر ڕەزمخواە، ئیبراهیمی پرما، سەفیەی حاتەمی کە ناسراو بووە بە(سەفا خانم) و هاوکات هاوسەری حیسامی لینکەرانی بووە لەگەڵ ئەبو حەسەنی عەباسی)دا[٥٩]. لە بارەی پلان و بەرنامەی ئایندەی گرووپەکەشەوە خەسرەوی ڕوزبە بە ڕاشکاوییەوە دەنووسێت: (ئێمە خۆمان بە دامەزرێنەری ئەو گرووپە دەزانین و بیرمان لەوەش کردۆتەوە هەرکاتێك کاروبارمان فراوان بووەوە، ئەوا دەتوانین ژمارەیەکی زیاتر ئەندام لە دەوری خۆمان کۆبکەینەوە)[٦٠]. تەنانەت یەکێك لە چالاکییەکانیشیان، بریتی بووە لە تیرۆرکردنی ڕۆژنامە نووسی ناسراوی ئێرانی محەمەدی مەسعودی سەرنووسەری ڕۆژنامەی (مرد امروز)، دیارە ئەمەشیان لەبەر ئەوەبوو بەوەی، کە گوایە ڕۆژنامە نووسی ناوبراو لەو دەمانەدا وەك کەسێکی ئۆپۆزسیۆن هاتۆتە بەرچاو و بەردەوام لەگەڵ دەزگاکانی دەسەڵات و حکومەتدا ناکۆك بووە و ڕەخنەی توندی لێ گرتوون، ئەمانیش، کە ئەمەیانکردووە وەك شوێن ونکێیەك بووە، بۆ ئەوەی لە داهاتووداو لەپاڵ ئەمەدا

هەر پلان و پرۆسەیەکی تری کوشتنیان ئەنجامدا، کەس نەتوانێت گومان لە دەستەکەیان بکات و هاوکات بشتوانن، پرۆسە و تیرۆری تری گەورە بەرانبەر گەورە بەرپرسان و فەرمانڕەوایانی پەهلەوی ئەنجام بدەن. وەك ئەوەی لە (١١ شوباتی ١٩٤٨)ی زایینیدا ئەوەیان جێبەجێ کرد. ئەمەش لە کاتێکدا بوو، کە هێشتا دکتۆر ڕەزا ڕادمەنش سکرتێری حیزبی تودەی ئەوکاتەی ئێرانی بوو، بەڵام بە دەستگیرکردنی خەسرەوی ڕوزبە و بە تایبەتی لە (نیسانی ١٩٤٨) دا، وردە وردە دەستەکەش بە تەواوی لاواز بوو و چالاکییەکی ئەوتۆیان نەما[٦١].

هاوکات دوای کۆمەڵێك چالاکیی جۆر بەجۆرو خۆشاردنەوەی بەردەوامی لە بەرچاوی دەزگا ئەمنییەکانی فەرمانڕەوایانی پەهلەوی، بەتایبەتی لە ناو خێڵێکی ناسراوی وەك قەشقایەکانی ناوچەی چوار مەحاڵی بەختیاریدا، بەڵام ئەو هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بووە و: ((بە مەبەستی درێژەدان بە خەباتکردن بگەڕێتەوە ناو هاوڕێیانی و هەرکە گەڕاشەوە لە لایەن دەزگای ساواکی ئێرانییەوە دەستگیرکراو بە تۆمەتی خیانەتی گەورە درایە دادگایەکی سەربازی، بە جۆرێك ناو دادگاشی کردە مینبەرێك بۆ داکۆکیکردن لە ئازادیخوازانی گەلانی ئێرانی و مافە ڕەواکانی گەلی کورد لەو وڵاتەدا))[٦٢]. ئەوەبوو خەسرەوی ڕوزبە دوای چەندین ساڵ خەبات و چەندین ساڵی زیندانی و هەڵاتن لە زیندان و خۆشاردنەوەی سەرنجڕاکێش و گۆڕینی ناوی ڕاستیی خۆی بە ناوی خواستراو. جگە لە چاپدان و بڵاوکردنەوەی دەیان کتێبی فیکری و مەنهەجی لەبوارە جۆر بەجۆرەکاندا، فەرمانڕەوایانی پەهلەوی توانییان لە چوارچێوەی پرۆسەیەکی سەربازیدا و دوای گەڕانەوەی لە عێراق و باشووری کوردستان و بەتایبەتی ناوچەی گەرمیان، لە (٦ تەموزی ١٩٥٨) دا بەیەکجاری دەستگیری بکەن و لە (١١ ئایاری ١٩٥٩) دا گوللە بارانی بکەن، بە جۆرێك کوشتن و گوللە بارانکردنی کەسایەتییەکی وەك خەسرەوی ڕوزبە بۆخۆی دەنگدانەوەیەکی نێودەوڵەتی و ناوخۆیی ئەوتۆی بەدوای خۆیدا هێنا، کە لەزۆر سەرچاوەی ڕاگەیاندنی جیهانی و نێودەوڵەتییەوە باسی لێوە بکرێ و بایەخی تایبەتی پێ بدرێت، بۆ نموونە: شاعیری ناسراو و هاوچەرخی ئێرانی ئەحمەدی شاملۆ (١٩٢٥– ٢٠٠٠) بە پارچە شیعرێك ستایشی کردو هەروەها ڕۆژنامەی (ایزوستیا)ی ئەوکاتەش، وەك مەردێکی ئەفسانەیی ناوی کردە سەردێڕی خۆی وەك نووسیبووی: (مردی بود فسانه شد)[٦٣].

- **خەسرەوی ڕوزبە لە کەلار ١٩٥٣ – ١٩٥٥:**

هەر لەو دەمانەشەوە کە ئەندامی لیژنـەی مەرکـەزی حیزبـی تـودەی ئێرانـی خەسرەوی ڕوزبە پەنای هێنابووە بەر ناوچەی گەرمیان و بەتایبـەتی کـەلاری ئـەو دەمانەی ژێر دەسەلاتی بەگزادەکانی جاف، هەر بە ناوێکی خواستراوی تـرەوە لـە مـالی هەریـەك لـە: محەمـەد سـەعید بـەگی جـاف و کـەریم بـەگی جـاف (١٨٨٥– ١٩٤٩) مامی دا، کە چەند سـالێکی کـەم بـوو وەفـاتی کردبـوو، خـۆی پـەنا داوەو لەناو کۆمەلانی خەلکیشدا بە: (عەلی تورکە) ناسراو بـووە، هەرچـەندە خەسـرەوی ڕوزبە، بەچەند سالێك پێش هاتنی بۆ عێراق و ناوچەی گەرمیان لە زینداندا بووە و بەپێی بەلگەنامەکانی بالوێزخانـەی عێـراق لـە تـاران و لـە سـەردەمی پاشـایەتیدا لەگـەل نـۆ ئەنـدامی تـری حیزبـی تـودەی ئێرانـی وەك: دکتـۆر یـەزدی، بقراتـی، عـەلوی، دکتـۆر کیـانوری، سـەمەدی حـەکیمی، دکتـۆر جـەودەت.. تـاد لـە چوارچـێوەی پلانێکـی نەخشـە بۆداڕێـژراوی ئەندامـە سـەربازییەکانی نـاو ڕێکخستنەکانی حیزبی تـودە خۆیـدا لـە زینـدانی تـاران هـەلاتبوون [٦٤]. دووبـارە دەستیانکردۆتەوە بەکار و چالاکی بەردەوامی خۆیان لە ناو کۆمەلانی خـەلك و دام ودەزگـا جۆربـەجۆرەکانی حکومـەتی ئێرانیـدا[٦٥]. هاوکـات بـەپێی گێڕانـەوەو باسکردنی موکەڕەم تالەبانی خەسرەوی ڕوزبە کەسایەتییەکی ئـازەری و ئەنـدامی لیژنـەی مەرکـەزی حیزبـی تـودەی ئێرانـی و لـەو دەمانـەدا بەرپرسـی کاروبـاری ڕاگەیاندنیان بووە، مەسەلەی هاتنیشی بۆ عێراق و باشووری کوردستان زیـاتر لـە پاش ئینقلابی جەنەرال زاهیدی (١٨٩٧– ١٩٦٣)ەوە سەرچاوەی گرتووە، بەسەر دکتۆر محەمەد موسەدەق (١٨٨٢– ١٩٦٧) دا، لە سـالی (١٩٥٣) دا و لـە ڕێگـای ڕێکخسـتنەکانی حیزبـی شـیوعی عێـراق و بـە تایبـەتی بەرپرسـانی سـلێمانی و کـەرکووکی حیزبـی شـیوعی ئەوکاتـەی وەك: ئەحمـەد غـەفوور بابـان و نـافیع یونسەوە بـووە، وەك ئـەوەی ئـەوان داوایـان لـە شـێخ عـەتای تالـەبانی کـردووە، شوێنێکی نادیاری بۆ بدۆزرێتەوە کە تیایدا خۆی دالدەبدا، ئەوکاتە من لە زینـدانـدا بووم کە مەسەلەکەی بۆ گێڕامەوە، بەلام لە ڕاستیدا خـۆی ئەمـەی پـێ نـەکرابوو، لەبەر ئەوەی ئەوکاتە گوندی (زەرداو)ی ئێمـە لـە شـاری کفـری ئەوکاتـەو دەزگـا ئەمنییەکانی حکومەتی عێراقەوە، زۆر نزیك بـوو، قوتابخانـەی تیـابوو، هاتوچـۆی

زۆر لەسەر بوو، ئەویش خۆی دوێخانی هەبوو، میـوان و هاتوچـۆکەری زۆر هـەبوو، هەر بۆیە کە مەسەلەکەشی گەیاندبووە مەرحووم حەمە سەعید بەگی جـاف ڕازی بوو بەوەی، کە پەنای خەسرەوی ڕوزبە بدات و جێگای بکاتەوە بۆ خۆحەشاردان، چونکە لە ڕاستیدا حەمەسەعید بەگ کەسایەتییەك بـوو، دوور نـەبوو لـە ئـەفکاری چەپەوە و تەنانەت لە شۆڕشی (١٤ تەمووزی ١٩٥٨) بـەدواوە بـە نووسـراو داوای لە من کرد بۆ ئەوەی ئینتما بکات بۆ ڕیزی حیزبـی شـیوعی عێـراق، دوایـی کـە لـە منیشیان پرسی وتم: کەسێکی پاکە بەلاَم ڕەنگە نەتوانێت ئـەو ئەرکـە هـەڵبگرێت، چاکتر وایە لە هەندێ بزووتنەوەو حـەرەکاتی دیموکراتییـا کاربکـات، وەك ئـەوەی هەر لەم ماوەیەوە، بوو بەئەندام لە بزووتنەوەی ئاشـتیخوازاندا (٦٦). بـەجۆرێك لـە ناوچەی کەلار و شێروانەی ئەوکاتەشدا بە سەرۆکایەتی ئەحمەدی فـەتاح ڕۆسـتەم لـە ئەنـدامانی وەك: (محەمـەد سـەعید جـاف، جـوامێر عەبـدولقادر، عەبدولکـەریم مەعرووف، فەتاح عەزیز، عەلی سەلیم جـاف، مـەلا ئەحمـەدی هـۆرێنی و ڕەشـیدی شێخ حەسەن) پێکهاتبوون(٦٧). تەنانەت زۆرێك لـە بـەگزادە و میرزادەکـانی جـاف ئاگاداری تەواوی ئەم کەین و بەینەیەی عەلی تورکـە نـەبوون، لـە محەمـەد سـەعید بەگی کوڕی حەمە بەگی جاف خۆی زیاتر، بۆ پشتڕاستکردنەوەی ڕاکەی موکەڕەم تاڵەبانی لەم بارەیەشەوە ئەمجەد شاکەلی (١٩٤٨) ئەڵێت: (من زۆرجار خەسرەوی ڕوزبـەم لـە مـاڵی خۆمانـدا دیـوە و، تەنانـەت لـە سـاڵی ١٩٩٢دا سـێ ڕۆژ لـەولاَتی ئـەڵمانیا لەگـەڵ خوالێخۆشـبوو حەمـە سـەعید بـەگی جافـدا پێکـەوە بـووین، حەمەسەعید بەگ دەیوت: دوای ماوەیەك و موناقەشەیەکی زۆر و چەندوچـوونێکی زۆر لە کەلار بە تـەواوی ئـەوەم بـۆ ڕوون بـووەوە کـە خەسـرەوی ڕوزبـە کێیـەو چ خوێندەوار و چ کارە بـووە لـە ئێرانـدا، ئیـدی لەوەبـەدوا زیـاتر ڕێـزم لێ دەگـرت و بەردەوام کتێب وگۆڤـار و ڕۆژنامـەم دەدایـە، جگـە لـەوەش ڕۆژێـك باسـی ئـەوەی بۆکردم بەتایبەتی لەو دەمانەیدا کە تـازە لـە ئێرانـەوە هـاتبووە کـەلار و ناوچـەی گەرمیان، باسی ئەوەشیان بۆکردبوو، کە تـەنها سـێ کـەس دەتوانێـت تـۆ بگرێتـە خۆی و بتپارێزێت ئەوانەش هەریەك لە: ئیبراهیمی حاجی فەتاح (١٩٣٢ – ١٩٨٧) کادیری ناسراوی حیزبی شـیوعی عێـراق لـە ناوچـەی جەلـەولا و قـەرەبلاَغ، شـێخ لـەتیفی کـوڕی شـێخ مـەحموودی حەفیـد (١٩١٧ – ١٩٧٢) لەگـەڵ حەمەسـەعید

بەگی جاف لە کەلار[٦٨]. هاوکات بوونی کەسایەتییەکی وەك خەسرەو ڕوزبە لە شارە دێیەکی ئاوەدانی وەك کەلاری ئەودەمانەدا بووبووە مایەی ئەوەی کە لەو کاتەدا و دواتریش ڕەنگدانەوەیەکی فیکری و ئایدۆلۆجی بەرچاوی لەسەر بۆچوون و بیرکردنەوەی محەمەد سەعید بەگی جافیش دابنێت [٦٩]. هەر بۆیە لە ناو بەگزادەکانی جافی گەرمیان و کۆمەڵانی خەڵکیشدا دواتر محەمەد سەعید بەگی جاف، وەك کەسایەتییەکی چەپگەرا باسی لێوە دەکرا. تەنانەت ئیقباڵ خانمی کچی کەریم بەگی جاف (١٩٣٩)[٧٠]. لە بارەی خەسرەوی ڕوزبەوە دەڵێت: (بیرمە خەسرەوی روزبە کە لە کەلاری ئەو دەمانەدابوو و بە: (عەلی تورکە) ناودەبرا، بە زۆری لەماڵی مەرحووم حەمەسەعید بەگی جاف و ئێمەشدا باخەوان و خزمەتچی بوو، بیرمە لە حەوشەکەی ماڵی ئێمەدا، کە زۆر گەورەبوو، زۆرجار چەند کۆڵێك سەوزەی هەمەچەشنی دەکرد و ڕۆژانە زۆر بەوانەوە خۆی سەرگەرم و خەریك دەکرد، هەرکە قسەی لەگەڵ مندا بکردبایە و بە زمانی تورکی بانگی دەکردم و پێی دەگوتم: قیزم واتە کچم، کەسێك بوو بەزۆری جلێکی دڕاوی چڵکنی پینەکراوی لە بەردابوو، پێدەچێت هەموو ئەوانەشی هەر لەبەر ئەوە بووبێت کەس هەستی پێ نەکات و نەیناسێتەوە، هاوکات بیریشمە دوو کەسی تری ئێرانیش هەر لە کەلار و لە ماڵی ئێمەی ئەو دەمانەدا بوون و کە هەر ئێرانی بوون بە ناوەکانی غولامەلی و عەینەلییەوە بانگ دەکران، دیارە ناوی ئەمانەش هەر ناوی خواستراو بوون و تەنانەت هەردووکیشیان کە پیر بوون، هەرلە کەلاردا مردن و خەڵکی کەلار لە گۆڕستان ناشتنیان دوایی بە هەویەکانی گیرفانیاندا دەرکەوت، کە ئەوانە ناوی ڕاستییان نەبووە)[٧١]. هەروەها شێخ محەمەدی شێخ سلێمانی شاکەلی (١٩٣٢)[٧٢]. لەبارەی خەسرەوی ڕوزبەوە ئەڵێت: مەرحووم حەمە سەعید بەگی جاف بە تەواوی لەوە گەیشتبوو، کە خەسرەوی ڕوزبە کێیە و چ کارە بووە لە ئێراندا، بۆیە ماوەیەك ناردییە ماڵی ئێمە لە گوندی شاکەل، هەم وەك خۆشاردنەوە و هەندێك جاریش بەناوی ئیشکردنەوە، بۆ ئەوەی نەگیرێ و تووش نەبێت بۆ نموونە: لەو دەمانەی لەگوندی شاکەلدا بوو بیرێکی ئاوی بۆ ئێمە هەڵکەند و تەنانەت تەبیعەتێکیشی هەبوو، هەندێك خواردن حەزی لێ نەبوایە نەیدەخوارد، جگە لەوەش بە زمان و قسەکردن و هەڵسوکەوتیا دیاربوو، کەسێکی

ئاسایی نییەو ئەمەشم لە کاتێکدا بۆ دەرکەوت ڕۆژێك هەرچی هەویە و ئەوراقی گیرفانی هەبوو بە سودفە لێی کەوتبوون، کە سەیرم کرد لێی نووسرابوو خەسرەوی ڕوزبە [٧٣]. لەلایەکی تریشەوەو بەپێی بەڵگەنامەیەکی بڵاونەکراوەی ئێرانی پەهلەوی بەتایبەتی (شەهربانی کل کشور)ەوە هەر لەم دەمانەدا کە خەسرەوی ڕوزبە پەنای هێناوەتە بەر ناوچەی گەرمیان و کەلار پێنج ئەندامی تری سەر بەحیزبی تودەش کە بەهەمان شێوە لە سنووری ئێرانەوە پەڕیونەتەوە عێراق و ناوچە کوردنشینەکانی شاری خانەقین لە لایەن کاربەدەستان و فەرمانڕەوایانی حکومەتی عێراقەوە گیراون و لە ڕێگای سنووریی شاری قەسری شیرینەوە ڕادەستی پۆلیس و دەزگا ئەمنییەکانی ئێرانی پەهلەوی کراونەتەوە، کە بەسەریەکەوە بریتی بوون لە پێنج ئەندامانی دیاری حیزبی تودەی وەك: ((عەباسی سولەیمانی، عەبدولسەمەدی مورادی، عەبدولئەمیری فیعلی و عەلی فەرەجی و لە وێشەوە ڕادەستی لەشکری (١٢) ی شاری کرماشان کراونەتەوە)) [٧٤]. هەر دوابەدوای ئەوانەش پۆلیسی سەر سنووری کرماشان ژمارەیەکی تری ئەندامانی حیزبی تودەی، کە لە بەڵگەنامەیەکی بڵاو نەکراوەی تری نهێنی ئێرانیدا هاتووە و پاسەوانی سنوور (مرزبانی)ی هەردوو شاری قەسری شیرین و ئیلام ڕادەستی دەزگا ئەمنییەکانی شاری کرماشانیان کردوونەتەوە و لە وێشەوە بەهەمان شێوە دراونەتە دەستی لەشکری (١٢)ی شاری کرماشانەوە، بەڵام بەڵگەنامەکە زۆر بە ڕوونی باس لەوەش دەکات، کە ئەمانە لە کاتی گرتنیاندا شوناسنامەکانیان لەناوبردووە [٧٥]. بەڵام نووسەری ناسراو خەسرەو جافی کوڕی محەمەد سەعید بەگی جاف (١٩٤٥) [٧٦] لە بارەی ئەو دەمانەی ژیان و سەربردەی خەسرەوی ڕوزبەی گەورە بەرپرسی حیزبی تودەی ئێرانییەوە و شێوازی ژیانی لە کەلاری ئەو سەروبەندەدا بەرچاوڕوونییەکی زیاترمان ئەداتە دەستەوە، بەوەی ئەو کوڕی گەورەی محەمەد سەعید بەگی جافە و هاوکات خەسرەوی ڕوزبەش لە ماوەی خۆحەشاردان و ژیانی پەناهەندەیدا، لەگەرمیان و لە کەلار لە ڕێگای ڕێکخستنەکانی ئەوکاتەی حیزبی شیوعی عێراقییەوە لە ناوچەی گەرمیان، سپێردراوەتە ماڵی ئەوان و تەنها باوکی ئەویش بەپێی شەهادەتی هەموو بەگزادەکانی جاف بە نهێنی سەربردەی خەسرەوی ڕوزبەی

زانیوە، تەنانەت خۆشی لەم بارەیەوە دەنووسێت: (پەیوەندی و هاوکاری نێوان حیزبی شیوعی عێراقی و حیزبی شیوعی ئێرانی (تودە) لە زۆر بواردا بەردەوام بوو، چ لە ڕووی پاراستن و شاردنەوە و داڵدەدانی ئەندامە ئاشکرابووەکان یان لە ڕووی چۆنیەتی سیستەمی ململانێ و هەروەها بە شێوەیەکی گشتی تەقەلای هوشیارکردنەوە و زانستی مارکسییەت و هەروەها تێکڕای ڕۆشنبیری، ئەڵبەتە بۆ سەلماندنی ئەو جۆرە هاوکارییانە بەڵگەو دیکۆمێنت زۆر بە دەستەوەیە، یەکێك لەوانە داستانی ئەندامی لیژنەی مەرکەزی حیزبی (تودە)ی ئێرانی خەسرەوی ڕوزبە یە. خوالێخۆشبووی باوکم (حەمە سەعید بەگی جاف) کەسایەتییەکی ڕۆشنبیری ئەو قۆناغەی بووە و لە ناو ڕۆشنبیرانی کورد و عارەب و عەجەمدا بەو شێوەیە ناسراو بووە و پەیوەستە چەندین کەسی تێکۆشەری دژ بە دەسەڵات و حکومەتی پاشایەتی لە ماڵەکەیدا شاراونەتەوە و داڵدە دراون)[٧٧].

جا هەروەك خەسرەوجاف جەختی لەسەر دەکاتەوە، باوکی ئەو تا ئەوکاتە وەك ئەندام لە ڕیزەکانی حیزبی شیوعی عێراقیدا نەبووە و کاری نەکردووە، بەڵکو ئەو کەسایەتی و ڕووناکبیرێکی سەر بە ڕێکخراوە بەرهەڵستکارەکان بووە و هاوکات لایەنگیری هەموو بیرو بۆچوونێکی ئازادیخواز بووە، کە دژی ستەم و زۆرداری و بیری عەسکەرتاری جەنگابێت و خەباتی کردبێت، هاوکات بە حوکمی ئەوەی ئەو لە خانەوادەیەکی ناسراو و دەستڕۆیشتووی ئەوکاتەی کۆمەڵگای کوردەواری بووە لە باشووری کوردستان و بە تایبەتی لە ناوچەی گەرمیاندا، هەروەها لەلایەن دەسەڵات و حوکمی پاشایەتی ئەوکاتەشەوە ئەوان مامەڵەی تایبەتییان لەگەڵدا کراوەو نفوزێکی جەماوەری گەورەیان لە عێراق و تەواوی ناوچەکەدا هەبووە، بۆیە هەرکەسێك و بە هەر شێوازێك بووبێت و پەنای بۆ هێنابێتن، ئەوان وەك نەریتێکی کوردەوارییانە و خانەوادە و دەسەڵاتیان پەنای زۆرێك لە کەسایەتی و لە خەڵکانی لەو بابەتەیان داوە، هەرچەندە بیروڕایەکی چەپگەرای کەسایەتییەکی وەك (خەسرەوی ڕوزبە)ی ئەوکاتە و تەنانەت حیزبێکی سیاسی وەك شیوعی عێراقی و تودەی ئێرانی ئەو ڕۆژگارە بە ئاسانی لەگەڵ بیرکردنەوەی بنەماڵە و خانەوادەیەکی ئەوتۆدا نەهاتۆتەوە، بەڵام وەکتر کەسایەتییەکی وەك موکەڕەم تاڵەبانی و شێخ عەتای برای کە دوو ئەندامی

دیاری حیزبی شیوعی عێراقی ئەو دەمانە بوون و هاوکات لەو دەمانەشدا بە تایبەتی موکەڕەم تالّەبانی وەکو خۆی ئەلّێت: ئەو لە زینداندا و شێخ عەتای برای لە ژێر چاودێریدا بووە، بەلاّم محەمەد سەعید جافیان لە نزیکەوە ناسیوە و هاوکات بە ڕووی توانا و هەلّوێستی بنەمالّەکەشیاندا پەرمیونەتەوە بۆ ڕاسپاردەیەکی لەو بابەتە، لەلایەکی دیشەوە ئەوان خۆیان وەکو دکتۆر موکەڕەمیش بەڕوونی و ڕاشکاوانە جەختی لە سەر دەکاتەوە نەیانتوانیوە ئەو ئەرکە لە ئەستۆ بگرن و پەنایەك بۆ خەسرەوی ڕوزبە بدۆزنەوە، کە بە تەواوی دەستەبەری ژیان و ڕۆحی بکات و بیپارێزێت (٧٨). بە جۆرێك پلانی کارەکەشیان بە شێوازێك داڕشتۆتەوە کە کەم کەس بە ئاسانی بتوانێت هەستی پێ بکات و ببێتە مایەی ئاشکرابوونی. چونکە وەك خەسرەو جاف ئەلّێت و تەنانەت موکەڕەم تالّەبانیش پشتگیری تەواوی ڕاکەی دەکات: (خەسرەوی ڕوزبە لە مالّی ئەواندا وەك کرێکارێك قوڕکاری کردووە و بە ناوی خواستراوی: (عەلی توڕکە)وە و نزیکەی دوو سالّ... بەو شێوەیە بەردەوام بووە) و هاوکات: (هاوینان لە ژێر سێبەری دارتووەکەی ناو حەوشەیدا، دوای قوڕکاری نیوەڕوان چای دەکرد و هەنوزێکی دەکرد. بەندە منداڵ بووم، ساڵ وابزانم ١٩٥٢ یان ١٩٥٣ بوو، دروست لە یادم نییە.. لە بیرمە دەڕۆیشتمە ژووری زەخیرەوە و بە دزیەوە گیرفانەکانم پڕدەکرد لە شەکر و چا و دەمبرد بۆ عەلی توڕکە). هەروەها خەسرەوجاف لە بەشێکی تری دەستنووسەکەیدا باس لەوە دەکات، لەو دەمانەیدا کە خەسرەو ڕوزبەی گەورە بەرپرسی حیزبی تودەی ئێرانی لە کەلاردا و لە مالّی ئەواندا بووە. هاوکات ئەوەش لای زۆرێك لە ڕووناکبیرانی کوردی باشووری کوردستان و بە تایبەتی تەوەری گەرمیان ڕوونە کە حەمە سەعید بەگی باوکی ئەو وەك: نووسەرو وەرگێڕو ڕووناکبیرێکی ناسراوی کورد تا ئەودەمانەی ئێمە باسی لێوە دەکەین دەیان نووسینی جۆر بە جۆری لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکانی ئەو دەمانەیدا بلاّوکردبووەوە هەر لە: گۆڤاری بە ناوبانگی گەلاوێژ (١٩٣٩ – ١٩٤٩)، گۆڤاری دەنگی گێتی تازە (١٩٤٣– ١٩٤٧)، گۆڤاری هەتاو (١٩٥٤– ١٩٦٠) دواتریش گۆڤاری هیوا کە: (یانەی سەرکەوتنی کوردان) لە شاری بەغدا بلاّوی دەکردەوە. شان بە شانی هەموو ئەوانەش خاوەنی نامەخانە و کتێبخانەیەکی گەورە و

دەوڵەمەنـد بـووە لـەم ناوچـەیەدا، لەلایـەکی دیکەشـەوە ڕەنگـە دام و دەزگـا ئەمنییەکانی حکومەتی عێراق لە سەردەمی پاشایەتیدا بـە خۆشـیان سۆسـەیەکی ئـەوتۆیان کردبێـت کـە کەسـایەتییەکی ئـەوتۆ لـە کەلاردایـە، تەنانـەت دکتـۆر موکـەڕەمیش ئـەڵێت: (لـەو ماوەیـەدا هەرچـەندە مـن لـە سـجندا بـووم بـەڵام ئاگاداربووین کە حەمە سەعید بەگ کـەوتبووە ژێـر چاودێری پۆلیسـەوە و کاتێك ماڵەکەشیان پشـکنیبوو و حەمـە سـەعید بـەگ لـە ماڵـەوە نـەبووبوو عـەلی تورکـە هــەموو کتێبــە چــەپ و مارکســییەکانی لــە مــاوەی چــەند دەقیقەیەکــدا شـاردبووەوە)[٧٩]. هـەروەها چـاودێریکردنی ورد و دەسـتگیرکردنی خەسـرەوی ڕوزبـەش بـۆ ئـەوان هـەروا ئاسـان نـەبووە، بۆیـە مەسـەلەی پشـکنینی کتێبـی چەپگەرایان کردۆتە بیانوو و پاساوێك بۆ بەدواداچوونی بـارودۆخێکی لـەو بابەتـە. هەروەك وەك لەم بارەیەشەوە دەنووسێت: (وەك زۆر کەس ئـەوەی زانیـوە حەمـە سەعید بەگی جاف لە چلەکان و پەنجاکانی سەدەی بیستەمی ڕابـردوودا خـاوەنی گەورەترین کتاوخانەی شەخسی بووە لە لیوای کـەرکووك و هـەروەها سـلێمانیش، داستانی ئەو کتاوخانـە کـە چـەند جـار تـاڵانکراوە و کـۆڵ بـەکۆڵ بـووە بـۆ خـۆی داستانێکی ترە.. هەواڵ گەیشـتە مـاڵی ئێمـە سـبەینێ دام و دەزگـای تـەحقیقاتی جینـائی سـەر بـە: بەهجـەت عەتیـە (١٩٠٠–١٩٥٩)[٨٠] ی ئـەمنی بەغـدا دێـن بـۆ پشکنینی کیتاوخانەکەی باوکم، گرفت لەوەی دابوو باوکم لە ماڵ نـەبوو کەسـێکی وا چاوساق و خۆندەواریش لـە کـەلاردا نـەبوو ئاگـاداری کتـاوی چـەپگەرا و دژ بـە دەوڵەت بێت، دایکم ئاشفتە و پەرێشان نەیدەزانی چـی بکـاو ڕوو لـە کـوێ بکـات، شەو دایدابوو لە بیرمە (عەلی تورکە) هاتە دیوانەوە دایکم تورکی بە چاکی دەزانـی ڕووی کردە دایکم و وتی: نیگەران مەبە من ئەو کتاوانە دەناسم و وەدەریان دێنم. دایکم هیچ گرنگی بە قسەکەی (عەلی تورکـە) نـەدا و وەڵامیشـی نەدایـەوە، عـەلی تورکەش سوور بوو لە سەر قسەی خۆی و بەدایکمی وت: (خانم زەرەرت چییە من ئەو کتاوانە دەناسم)، دایکم بە دوودڵیـەوە هەڵسـاو یـەکێك لـە پیاوەکـان لۆکسـی هەڵگرد و ڕۆیشتنە ناو کیتاوخانەکـەی باوکمـەوە، لـە بیرمـە ئەوەنـدە منـاڵ بـووم کابرای لۆکس هەڵگر لۆکسەکەی نەختێك بەرز ڕاگردبـوو بەنـدە سـەرم نەیـدەدا لـە بنـی لۆکسـەکە، لـە مـاوەی چـەند چرکەیەکدا عـەلی تورکـە کۆمـەڵێك کیتـاوی لـە

کیتاوخانە وەدەر هێناو ڕوو بە دایکم: (ئیتر هیچ مەترسییەك لەکاردا نییەو هەرکێ دێ بۆ پشکنین با بێت). دایکم هەروا سەرسامانە دەینواڕییە عەلی تورکەیدا کە چەند بە ئاسانی ئەوکارەی ئەنجامدا ڕوویکردە عەلی تورکە و وتی: (تۆ کێی ئەو کیتاوانە لە کوێ دەناسی). وتی: (خانم من برایەکم هەیە لە ئێران خۆندەواری ئەو جۆرە کیتاوانەیە و منیش زۆر لەو کیتاوانەم بەدەستیەوە دیوە). دایکیشم وتی: (عەلی تورکە کار مەدە دەستمانەوە سبەینێ ئەو زرتە زەلامانە دێن)، وتی (خانم خۆمن ڕام نەکردووە، ئەگەر سبەینێ یەك دانە کیتاویشیان دۆزییەوە چی لەمن دەکەن بیکەن). هەرواش بوو، بە سبەینێیدا دوو سێ موسەلەحەی پۆلیس هاتنە ماڵمان و کتاوخانەیان پشکنی و یەك دانە کتاوی یاساغیان نەدۆزییەوە)[٨١].

تەنانەت مێژوو نووسی ئێرانی مەسعودی بەهنودی باس لەوە دەکات بەوەی: (خەسرەوی ڕوزبە کە بە یەکێك لە باوەڕپێکراوترین ئەندامی حیزبی تودە دادەنرێت لە ٢٨ی مورداد بەدواوە ژیانێکی مەخفیانەی بەسەر دەبرد هاوکات لە هەوڵی ئەوەشدا بوو کە حیزبی تودە لە لەناوچوون و هەڵوەشانەوەی تەواو سەرلەنوێ ببووژێنێتەوە، هەروەها ئەو یەکێك بوو لە وانەشی کەمتر لە هەموو ڕێبەرانی حیزبی تودە لە هەوڵی ڕۆح و گیانی خۆیدا بوو، لەو پێناوەشدا شەرەفمەندانە ڕووبەڕووی مەرگ بووەوە)[٨٢]. ئەوە بوو لەم هەلومەرجە بەدواوە ئیدی خەسرەو ڕوزبە لەوە زیاتر لە ژیانی ئیختیفاو داڵدەدانی لە گەرمیان و کەلاردا نامێنێتەوە و دووبارە دەگەڕێتەوە ولاتی ئێران و لە لایەن دەزگا ئەمنییەکانی ئێران و ساواکی ئێرانییەوە چاودێری دەکرێ و دەستگیر دەکرێت. بەزۆری وەکو وتمان نەخەڵکی کەلاری ئەودەمانەو نە بەشێکی زۆری بەگزادەکانیش نهێنیی خەسرەوی ڕوزبەیان نەدەزانی لە محەمەد سەعید بەگی جاف زیاتر هەروەك خەسرەو جاف ڕاشکاوانە لەم بارەیەوە دەنووسێت: (دوای یەك دوو مانگ کە عەلی تورکە گەڕایەوە ئێران و دەستگیر کرا، دەرکەوت عەلی تورکەی کرێکاری قوڕکاریکەری ماڵی ئێمە (خەسرەو ڕوزبە)ی گەورە بەرپرسی حیزبی تودەی ئێران بووەو لە لایەن حیزبی شیوعی عێراقەوە نێردراوەتە ماڵی ئێمە و مەرحوومی باوکم ئەوەی دەزانی و ئەو حاڵەتەی پارازتبوو) [٨٣]. بەلام بەشێکی زۆر لە ئەفسەرانی سەر بە حیزبی تودەی ئێرانی لە کودەتای جەنەراڵ

فەزڵڵا زاهیدی بەدواوەو بەشێکیان لە وڵات بەرەو ئەورووپاو وڵاتانی دەورووبەر هەڵاتن و بەشێکی تریشیان لە ماوەی سێ ساڵدا بەتایبەتی لەوکاتەوە کە ئەفسەری دوورخراوەی (ستوان خارجی) وەك ئەبو حەسەنی عەباسی ئەندامی دەستەی جێبەجێکاری سازمانی ئەفسەرانی تودە و نزیکترین کەس و باوەڕپێکراوترین کەسی خەسرەوی ڕوزبە لە (١٢ ئابی ١٩٥٥) دا لە شەقامی (جمال حق) ی شاری تاران و بە ژمارەیەکی یەکجار زۆری بەڵگەنامە و کتێب و شتومەکی نهێنیی جۆر بەجۆرەوە دەگیرێ، دوای ئەشکەنجەدانێکی زۆر و فشارێکی زۆر کە هیچ نهێنییەکی نەدرکان و هاوکات خەسرەوی ڕوزبەش برادەرانی دڵنیا دەکردەوەو پێی گوتن: ئەبولحەسەنی عەباسی پۆڵایە و وەك کێو بەرگری دەکات (ابولحسن عباسی فولاد است و چون کوه مقاومت خواهد کرد)[٨٤]. هەر ئەمەش وای لە محەمەد ڕەزاشا کرد کە بە خۆی بێتەوە سەر خەت و وتبووی یان ئەبێت ئیعتراف بکات یان ئەبێت بمرێت: ((یاحرف بزند یا بمیرد))، بە هەموو ئەمانەشدا دوایی زۆرێك لە سەرە داوەکان کەوتنە دەست و زۆربەی زۆریشیان گیران و هەر هەمووشیان لە چوار قۆناغی جیاوازدا تیرباران و لە سێدارەدران [٨٥].

بەجۆرێك خەسرەوی ڕوزبە دوا ئەفسەریان بوو کە بە چەند ساڵێك دوای گەڕانەوەی بۆ ئێران و لە (٦ تەمووزی ١٩٥٨) دا لە لایەن دەزگا ئەمنییەکانی ئێران و لە پرۆسەیەکی سەربازی و لە کۆڵانێکی داخراودا، دوای بریندارکردنی دەستگیر دەکرێت و پاش تیمارکردنی لە خەستەخانە دەبرێتە زیندانی (قزل قەڵا). بەپێی لێکدانەوەی مێژوو نووسی ناسراوی ئێرانی ئەروەندی ئەبراهیمیان بە تایبەتی لە هەردوو کتێبی: (اعترافات شکنجه شدگان) و (ایران بین ثورتین) دا دەنووسێت: (خەسرەوی ڕوزبە لە ڕەوش و بارودۆخێدا کە تا ئێستاش بە تەواوی ئاشکرا نییە، پاش دەستگیرکردنی و دوای ئەوەی کە خرایە ژێر لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوەی دەزگا ئەمنییەکانی دەوڵەتەوە هەر لە زیندانی (قزل قەڵا) و لە (١١ی ئایاری ١٩٥٩) دا، لەگەڵ (٢٥) کەسایەتی تری ئەو حیزبەدا، پێکەوە گوللە باران کراون و لێرەش بەدواوە واتە لە تیربارانکردنی خەسرەوی ڕوزبە بەدواوە ئەتوانرێت بوترێت، حیزبی تودەی ئێرانی کۆتایی بە چالاکییەکانی هات) [٨٦].

بەڵام یەکێك بوو لەوانەی لە کاتی بەرگری لە خۆ کردنیدا بەرانبەر بەدادگا

ڕەخنەیەکی زۆری لە فەرمانڕەوایەتی پەهلەوی دەگرت و داکۆکیشی لە مافی ڕەوای گەلانی ئێرانی دەکرد بە تایبەتی گەلێکی وەك کورد بۆ نموونە، بەپێی گێڕانەوەی موکەڕەم تاڵەبانی وتوویەتی: (ئەگەر حکومەتێکی دیموکراتی هەبووایە لە ئێراندا، ئەوا گەلێکی وەك کورد بە مافی ڕەوای خۆی دەگەیشت)[٨٧]. یان لە ڕەخنەیەکی تریدا لە محەمەد ڕەزاشای ئێران ئەوەیە کە ئەڵێت: (من تاوانبار ئەکرێم بە ئیلحاد، بەلام من ئەڵێم مەسەلەی ئیلحاد هەقی بەوەوە نییە تۆ تودەیی بیت یان نا. بۆ نموونە چەندین کەس هەیە لە ڕیزەکانی تودەشدانین و باوەڕیشیان بە خوا نییە، ئەوەتا کەسێکی وەك محەمەد ڕەزا شا خۆی بە ئاریامیهر دەزانێ و خۆی بە داکۆکیکاری ئیسلام و ڕێبازی شیعەگەری دەزانێت و هەموو ساڵێك برێك یارمەتی و پارە بۆ شوێنە پیرۆزەکان تەرخان دەکات و دەینێرێت و منیش ئینکاری ئەمەیان ناکەم بەلام فەرموون بابزانین شا سەرچاوەی ئەمەی لە کوێوەیە. هەمووی بریتییە لە ڕسوماتی قومارخانە، مەلاهی، مەباغی و رایسس و دەیاننێرێت بۆ بەڕێوەبردنی شوێنە پیرۆزەکان)[٨٨]. هەرچەندە دەزگا ئەمنییەکانی ئێران لێرەش بەدواوە، واتە لە بەرپابوونی شۆڕشی (١٤ی تەمووز) بەدواوە لە عێراق تا ڕادەیەکی زۆر کۆتایی بەچالاکییەکانی حیزبی تودە ئەهێنن لە ئێراندا کەچی لەگەڵ ئەوەشدا و لەڕێگای هەواڵی کۆنسوڵگەری و باڵوێزخانەکانیەوە بە تایبەتی لە عێراق، زۆر بەوردی چاودێریی چالاکییەکانی ئەندام و کەسایەتییە بالاکانیان کردووەو هەر هەواڵێکیشیان دەست کەوتبێت بەوردی دەسەلات و دەزگا ئەمنییەکانی خۆیان لێ ئاگادار کردۆتەوە[٨٩]. هاوکات دوو بەڵگەنامەی تری ئێرانی باس لەوە دەکەن کە چۆن دوو کەسایەتی وەك: نورەدین کیا نوری (١٩١٦– ٢٠٠٠) و ڕەزا روستا (١٩١٢ – ١٩٧٢) ی گەورە بەرپرسانی حیزبی تودە بەشێوازێکی نهێنی هاتوونەتە ولاتی عێراقەوەو یەکەمیان بۆ مەسەلەی بەشداریکردن لە خۆپیشاندانەکان و[٩٠]. هەروەها دووەمیشیان چۆن توانیویەتی بەجلی ئەفسەری عێراقییەوە و لە ڕێگای فرۆکەخانەی نێودەوڵەتیی عێراقەوە سەفەری ولاتی نەرویج بکات[٩١].

## ئەنجامگیری:

لە دەرئەنجامی ئەم کورتە لێکۆڵینەوەی، کە سەبارەت بە کورد و هێزە بەرهەڵستکارەکانی ئێران و ڕۆژهەلاتی کوردستان لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی پەهلەویدا خستمانەتە ڕوو، بە تەواوی ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردستان لە هەموو بەشەکانیداو بەتایبەتی لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانی بەدواوە، بەردەوام لە تێکۆشانی سیاسی و خەباتی چەکداری بووە. هەر لە بزووتنەوەکانی: بنەماڵەی شکاك و بە تایبەتی ئیسماعیل ئاغای شکاك واتە سمکۆ (١٨٧٥– ١٩٣٠)، سەردار ڕەشیدی ئەردەلانی، مەحموود خانی دزڵی، مەحموود خانی کانی سانان، جەعفەر سولتانی هەورامی و تەواوی هەموو ئەو بزووتنەوەو ڕاپەڕینانەی، کە لە چوارچێوەی بابەتەکەدا، تاڕادەیەك ئاماژەمان بۆکردوون، بە جۆرێك بەشێکی زۆر لەم شۆڕش و ڕاپەڕینانە دوای شکستهێنان و تەنگ پێهەڵچنین و بێ ئومێد بوونیان، پەنایان هێناوەتە بەر ولاتی عێراق و بەتایبەتی ناوچەکانی باشووری کوردستان و تا ئەوکاتەی توانیویانە بۆ ماوەیەك دووبارە خۆیان سازبدەنەوەو بۆ جارێکی دی خەباتی سیاسی و چەکداریی خۆیان دەست پێبکەنەوە، هەموو ئەمانەشی کە دەیڵێین: سەبارەت بە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی باشووری کوردستانیش دەتوانرێت بخرێتە هەمان پێوەرەوە و بەهەمان شێوە باسی لێوە بکرێت، بۆ نموونە کەسایەتییەکی وەك شێخ مەحموودی حەفید لە بەشی باشووری کوردستاندا زۆر جار وا هەڵکەوتووە، دوای شکستهێنانی لە شۆڕش و ڕاپەڕینە چەکدارییەکانیدا پەنابەرێتە بەر ڕۆژهەلاتی کوردستان و ناوچە سنوورییەکانی ئەو بەشەی کوردستان. هەروەها بۆ شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی دواتریش لەوانە: مەلا مستەفای بارزانی..تاد دەکرێت بەهەمان شێوە لێکدانەوەی پێویستی بۆ بکرێت. هەرچەندە لە کۆی هەموو ئەو پەیماننامە و پەیماننامە سنوورییانەی، کە لە نێوان عێراق و ولاتی ئێراندا مۆرکراون و، تەنانەت بەوانەشەوە کە لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی عوسمانی و بنەماڵە فەرمانڕەواکانی ئێرانی وەك: سەفەوی، ئەفشاری، زەندی و قاجاریدا مۆر کرابوون، چ لە دوورو چ لە نزیکەوە بەشێکی یەکجار زۆر لە بنەما سەرەکییەکانیان، پەیوەندیی یەکانگیریان بە گەلی کوردو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو

ڕادەستکردنەوەی ڕێبەرانی ئەو بزووتنـەوە نەیاریانـەوەوە هـەبووە کـە لـە ناوچـە کوردنشــینەکانی هــەردوولاوە ســەریان هەڵــداوە، وەك دەبینــی لــە ڕۆژگــارو ســەروبەندی ئــەم ڕاپــەڕین و شۆڕشــانەوە، کــە ئێمــە لــە چوارچــێوەی ئــەم توێژینەوەیـەدا باسمـان لێـوەکردوون، ڕێککەتنامەیـەکی چـوار قـۆڵی وەك سـەعد ئابـادی سـاڵی (۱۹۳۷)، کـە لـە نێـوان هەریـەك لـە: عێـراق، ئێـران، تورکیـاو ئەفغانستاندا مۆرکرا زۆر بەڕوونی لە چەند بەندێکی سەرەکیدا باس لـە هاوکـاری و دەســگرۆیی یەکـدی دەکـەن بـۆ ســەرکوتکردن و لــەناوبردنی هێــزو ڕاپەڕینــە نەیارەکانی یەکتر لە هـەموو پارچـەکانی کوردسـتاندا. هەرچـەندە لـەم قۆناغـەدا، هەریەك لە ولاَتی ئێران و عێراقـی پاشـایەتی بـە هـۆی هەڵگیرسـان و بـەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانییەوە لە ئەیلولی (۱۹۳۹) دا و هاوکات بە هـۆی داگیرکردنـی زۆرێك لە ناوچەکانی عێراق و ئێرانەوە لە لایەن سوپای هاوپەیمانانـەوە و لاوازیـی دەســەلاَتی ســینترالّیەتی (مەرکــەزی) هــەردوولاوە، بــە تــەواوی بۆیــان نــەکراوە بنەماکانی ئەو ڕێککەوتنامانە مۆربکەن، جگە لە پێشبڕکێ و دژایەتییان بـۆ یـەکتر لەبواری تری سیاسی و سەربازی بە تایبەتی کێشەی سنووریدا، کـە تـا ئێستاشـی لەگەڵــدا بێــت هــەر بەردەوامــە، هــەروەها لەلایــەکی تریشــەوە ئــەو هەســتە نەتەوایەتیەشـی، کـە لـە نێوەنـدی کۆمـەڵگای کوردییـەوە هـاتبووە کایـەوە، بـە تەواوی ڕێگە خۆشکەر بووە بۆ ئەوەی کـوردو تەنانـەت سـەرۆکی خێـڵ و بنەماڵـە کوردییەکانیش لە ناوچە کوردنشینەکاندا داڵدەی کوردی پارچەکانی یەکدی بـدەن و جێگـای شـیاو بـۆ یـەکتر بکەنـەوە. تـا ئەوکاتـەی دەروازەی تـازە و نوێتریـان لەبەردەمدا دەکرێتەوە بۆ درێژەدان بەخەبات، یـەکێك لەوانـەش بنەماڵـەی قـەدەم خێرو جیهان خانمە کە چۆن دوای شکستهێنانی ڕاپەڕین و شۆڕشکردنیان پـەنایان هێناوەتە نێو هۆزێکی وەك: زڕگۆش و جافەوە لـە ناوچـەی قزڕەبـات و خانـەقینی ئەو کاتانەدا، یان هـۆزێکی وەك گـەڵباخی و وەڵەدبەگییـەکانی جـافی جـوانڕۆ کـە چۆن هەر لە نێو خێڵ و هۆزەکانی گەرمیانـدا بەباشـی پـەنادراون و بـۆ ماوەیـەکی زۆر جێگـاو شـوێنی نیشـتەجێبوونیان بـۆ دەسـتەبەر دەکرێـت و دەپـارێزرێن لـە هەرجۆرە دەستدرێژییەك، بەڕادەیەك تێکەڵبوون و مانەوەیان بـە شـێوازێك ڕەنـگ ئەداتەوە کە بەشێك لەوانە بیر لە گەڕانەوەی دووبارە نەکەنەوەو لەگەڵ دانیشتوان

و خەلکەکەیدا بە تەواوی تێکەلّ بن و ببنە هاوولاتی ئەم ناوچانە. جگە لە هەموو ئەوانەش کەسایەتییەکی وەك خەسرەوی ڕوزبەی بەڕەگەز ئازەری و ئەندامی لیژنەی مەرکەزی حیزبی (تودە) ی ئێران، کە لەو دەمانەدا یەکێك بووە لەوانەی فەرمانڕەوایانی عێراقی پاشایەتی و ئێرانی پەهلەوی زۆر بەوردییەوە سۆسەیان کردووەو بەدوایەوە بوون، کەچی ئەویش هەر لە ناوچەی گەرمیان و کەلاری ئەو دەمانەدا دالّدەدراوە و بۆ ماوەی چەند ساڵێکی تەواو بە دەردی میرزا غولام حوسێنی شیرازی واتە میّجەر سۆن (۱۸۸۱– ۱۹۲۳) کە چۆن پەنای بردبووە بەر بنەماڵەی جافی هەڵەبجە، ئەمیش بەهەمان شێوازێکی خۆگۆڕانە (متنکر) لە ماڵی بەگزادەکانی جافی کەلارو وەك دەگێڕنەوە لە گوندی شاکەلی ئەوکاتەدا خۆی پەنا دەداو دواتریش لە نیوەی دووەمی پەنجاکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوودا، کە تائێستاش وەك مەسەلەیەکی زۆر تەمومژاوی ماوەتەوە، هەرچۆنێك بێت ئەگەڕێتەوە ولاتی ئێران و ڕاستەوخۆ لەلایەن دەزگای (ساواك) ی ئێرانییەوە دەستگیر دەکرێت و دوای ئەشکەنجەیەکی زۆر و دادگاییکردنی لە ساڵی (۱۹۵۹) دا لەگەلّ چەند کەسایەتییەکی تردا، گوللە باران دەکرێت.

## لیستی سەرچاوە و پەراوێزەکان:

(١)– باقر عاقلی، شرح حال رجال سیاسی و نظامی معاصر ایران، ج٢، نشر کفتار،(تهران: ١٣٨٠)،ص ١١٦٧– ١١٧٩.

(٢) – جون ليمبرت، ايران حرب مع التاريخ، ترجمة: حسين عبدالزهرة مجيد، مركز الدراسات الايرانية، جامعة البصرة، (البصرة: ١٩٩٢)، ص ١١٣ .

(٣) – فرح صابر، رضاشاه بهلوى التطورات السياسية في ايران ١٩١٨– ١٩٣٩، مركز كوردستان للدراسات الاستراتيجية، (السليمانية: ٢٠١٣)، ص ٣٣٦ .

(٤) – احمد نقيب زادة، دولت رضا شاه و نظام ايلى، تاثير ساختار دولت قدرت طراى رضاشاه بر قبايل و عشاير، چاپ اول، (تهران: ١٣٧٩)، ص ١٥٥– ١٦٥، فرح صابر، المصدر السابق ، ص ٣٣٤ – ٣٣٥ .

(٥) – جون ليمبرت، ايران حرب مع التاريخ ، ص ١١٥ .

(٦) – جەعفەر سولتانی هەورامی: ساڵی (١٨٩٦) لەدایك بووە و بۆخۆی کوڕی حەمە سەعیدسانی یەکەمی هەورامانە لە ناو سانەکانی (لهۆن)دا کەسێکی هەڵکەوتوو بووەو ڕێزێکی زۆری لە خەڵکی ڕۆشنبیر گرتووە. لەهەمان کاتدا هاوچەرخی گەلێك ڕووداوی گەورەی جیهانی و ناوچەکە بووە و لە زۆربەشیاندا ڕۆڵێکی دیار و بەرچاوی هەبووە، ماوەیەکیش لەتاو دەسەڵاتدارانی ئێران و بە تایبەتی ڕەزاشای پەهلەوی پەنای هێناوەتە بەر ئینگلیزەکان لە وڵاتی عێراق لە دەوروبەری ڕومادی بە پەناهەندەیی ژیاوە و لە ساڵی (١٩٤١)دا کۆچی دوایی کردووە لە هەڵەبجە ئەسپەردەی خاك کراوە. ابراهيم حامد الخالدي، تاريخ وقائع الشهر في العراق وما جاوره في مجلة لغة العرب البغدادية، يوليو ١٩١١– اكتوبر ١٩٣١، ط١، بيروت: ٢٠١٤)، ص ٦٥٧، هادی ڕەشید بەهمەنی، پەیامی هەورامان، چ٢، (سلێمانی: ٢٠٠٣)، ل ١٥٣– ١٦٥.

(٧) – حەمە ڕەشید خانی بانە: کوڕی قادرخانی کوڕی عەبدوڵڵا بەگی کوڕی بارام بەگی بانەیە ساڵی (١٨٩٨) لە گوندی شیوە گوێزانی ناوچەی پێنجوێن لەدایك بووە، قۆناغی منداڵی هەر لەم ناوچەیەدا بەسەربردووە، دوای مردنی (ئەحمەدی) براگەورە و کۆچکردنی باوکی لە ساڵی (١٩٢٥) دا بەرپرسیاری دەکەوێتە ئەستۆیەوە. جگە لەوەش چەند جارێك بە ڕووی دەسەڵاتدارانی ئێرانیدا ڕاپەڕیوە و ماوەیەك شاری بانە و دەوروبەری خستۆتە ژێردەسەڵاتی خۆیەوە، چەند ساڵێکیش بەئاوارەیی و دەستبەسەری لە عێراقدا ژیاوەو بەشداری لە کۆماری کوردستاندا کردووە و پلەی (ژنەراڵ)ی سەربازی پێ سپێردراوە لە (٤ی کانونی یەکەمی ١٩٧٤) دا کۆچی دوایی

کردووە، بڕوانە: کەیوان ئازاد ئەنوەر، حەمەرەشید خانی بانە، وەزارەتی ڕۆشنبیری (سلێمانی: ٢٠٠١)، ل ٣٩ – ٢٥٢.

(٨) – مەحمود خانی دزڵی: لە ساڵی (١٨٧٠) دا لە ئاوایی دزڵی ناوچەی هەورامانی تەخت لەدایك بووە لە پاش مردنی باوکیەوە کاروباری ناوچەکەی دەکەوێتە دەستەوەو لەئەنجامی تێکۆشان و خەباتیدا بۆگەلێك شوێنی جیاوازی وەك: هندستان، سنە، قەسری قاجار، هنێدی، رومادی، سلێمانی، کەرکوك و بەغدا دەستبەسەر و دوورخراوەتەوە و پەیوەندییەکی گەورەی لەگەڵ شێخ مەحمودی حەفید و سمکۆ ئاغای شکاك و سەردار رەشید ئەردەلانی و حەمە رەشید خانی بانەدا هەبووە لە بەهاری ساڵی ١٩٤٦ دا لەکاتی وتووێژدا لەگەڵ ئەفسەرێکی ئێرانیدا لە (کەلی ملە خورد) کە دەکەوێتە سنووری ولاتی ئێران و عێراقەوە دەرمان خوارد دەکرێ و دوای چەند رۆژێك کۆچی دوایی دەکات. بڕوانە: ابراهیم حامد الخالدي، تاريخ وقائع الشهر في العراق وما جاوره، ص ٦٥٧، عومەر مارف بەرزنجی، مەحمود خانی دزڵی شۆڕشگێڕی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، (سلێمانی: ٢٠٠٠)، ل ٣١– ٣٦.

(٩) – محمد علی سلطانی، جوغرافیای تاریخی و تاریخ مفصل کرمانشاهان، ایلات و طوایف کرمانشاهان، اوضاع اقلیمی، سیاسی، اجتماعی و اقتصادی، جلد دوم و سوم، چاپ دوم (تهران: ١٣٨١)، ص ٢٩٤ .

(١٠) – دار الكتب والوثائق، الوحدة الوثائقية، تعريب كتاب قائممقام قضاء حلبجة، السرى المرقم س / ٣١٠ والمؤرخ في (٢١ / ١٢ / ١٩٣١) والموجه الى متصرفية لواء السليمانية، الموضوع: مجيء طيارات الحكومة الايرانية الى طويلة وموقف الحدود، رقم الوثيقة ٤٢، ص ٥٤ .

(١١) – محمد توفيق وردى، الاكراد الفيليون في التاريخ، مطبعة اللواء، (بغداد: بلا)، ص ٣٣ .

(١٢) – محەمەد سەعید جاف، ئاوارە، ب١، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، (بەغدا: ١٩٩٧)، ل ١٠١– ١٠٢ .

(١٣) – محمد توفيق وردى، الاكراد الفيليون في التاريخ ، ص ٣٣– ٣٤ .

(١٤) – محمد توفيق وردى، ص ٣٣– ٣٤، سۆزان ڕەزا، شێرەکیژی کورد قەدەم خێر، سیروان (گۆڤار)، ژمارە (١٥)، پاییزی ٢٠١٢، ل ٣٦ .

(١٥) – حسن كريم الجاف، موسوعة تاريخ ايران السياسي، من سقوط الدولة القاجارية وظهور رضا شاه الى سقوط النظام البهلوي في عهد محمد رضاشاه وقيام الجمهورية الاسلامية الايرانية، المجلد الرابع، الدار العربية للموسوعات، (بيروت: ٢٠٠٨)، ص ١٢٨، محەمەد سەعید جاف، ئاوارە، ب١، ل ١٩٠ – ١٩٢ .

(١٦) – هۆزی زرگۆش: لە بەشی باشووری کوردستاندا بەزۆری دەکەونە ناحیەی قزڕەبات و دێهاتەکانی زنجیرەچیای حەمرینەوە لەگەڵ دێهاتەکانی ناحیەی مەندەلی، جگە لەوە بەشێکی تریان دەکەونە سنووری شارەکانی بەدرە و کوتەوە لە ناوەڕاستی عێراق و لە ڕووی بیروڕای ئاینییەوە بەزۆری موسڵمانی شیعەن و ڕێژەیەکی سونەشیان تێدایە. وێڕای ئەو بەشەیان کە دەکەونە شاری بەغداوە و زیاتر خۆیان بە هۆزێکی سەربەخۆ دەزانن، بەلاّم بەشێك لە سەرچاوەکان بەڕەسەن وەك تیرەیەکی سەرەکی هۆزی گەورەی کەڵهوڕ باسیان لێوەکردوون. بڕوانە: ولی فولادی منصوری کلهری، تاریخ سیاسی اجتماعی بزرگ ایل کلهر، ج٤، چ١، (کرمانشاه: ١٣٩٣)، ص٢٥٣٣، دیدەنی لەگەڵ دکتۆر حەسەن محەمەد حەسەن، خانەقین، ١٩ / ٣ / ٢٠١٥.

(١٧) – محەمەد سەعید جاف، ئاوارە، ب١، ل ١٩٦ .

(١٨) – حاجی ئیبراهیم بەگی جاف: کوڕی گەورەی سلێمان بەگی کوڕی حەمە پاشای جافە، ساڵی (١٨٨٧) لە دایك بووە، پلەکانی خوێندنی لە ناوەندە ئاینییەکانەوە دەست پێکردووە و، وەك کەسایەتییەکی خواناس و بە هاوکارێکی بەردەوامی هەژارو لێقەوماوان ناسراو بووە، لە ژیانیدا دوو ژنی هێناوە یەکەمیان: مەنیجە خان کە لە هۆزی باجەلاّن بووەو تەنها سێ کچی لێ هەبووە. دووەمیان: شەمسەخانی کچی جەمیل بەگی محەمەد عەلی بەگی جاف و لە نەوەی (عادیلە خان) ی خێزانی (وەسمان پاشا جاف) بووە و تەنها دووکوڕی لێ هەبووە بۆ دواکاتیش هەر بەپێی یاداشتە ڕۆژانەییەکانی مەلا عارفی کوڕی مەلا یەحیای خانەقین لە ڕۆژی سێ شەممە ١٨ نیسانی ١٩٥٢ کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: مەلا عارفی مەلا یەحیای خانەقین، یاداشت، دەستنووس .

(١٩) – حسن کریم الجاف، المصدر السابق، المجلد الرابع، ص ١٢٩ .

(٢٠) – محەمەد سەعید جاف، ئاوارە، ب١، ل ٢٠٠ .

(٢١) – علی اکبر وقایع نگارکردستانی، عشائرو ایلات و طوایف کرد، به کوشش محمد روف توکلی، (تهران: ١٣٨٧)، ل ٦.

(٢٢) – علی اکبر وقایع نگار کردستانی، مصدر پیشین ، ص ٦٤، خالید ئەحمەدی، بەسەرهاتی فەرمانڕەوایی گەڵواخییەکان، پێداچوونەوەو ڕێکوپێککردنی: حەسەن گۆران، چ١، (سنە: ٢٧٠٤)، ل ٢٤، (بەزۆری ئەو دێهات و گوندانەی لە بەشی ڕۆژهەلاتی کوردستاندا بەشوێنی نیشتەجێبوونی هۆزی گەڵباخی دادەنرێن ئەمانەن: فەراوا، خنجێرەی ژووروو، خنجێرەی خواروو، ئالۆلاّخ، کۆسەو مەر، عەلیاوای دۆڵە ڕەش، تازاوای دۆڵەڕەش، تازاوای قازی عەلی، گێزملی ژووروو، گێزملی خواروو، زەرتك،

بەردەسپی، ئافراسیاو، هالەگرەی خواروو، هالـەگرەی ژووروو، ئەحمـەد ئـاوا، قوجـەر، کەپەك، هەزار کانیان، نالەشکێنە، قورو ولاخ، میشاو، یـەنگی یـەخ، کـانی سـەی مـراد، مەرەگەر، قەلاگە، نەرگەسەلە، تەوەکلان، دەرەگـاوان، دەوریشـان، دۆزەغـەرە، کـۆل، قەلا ولیانە، دەرە هەر، دێ بنیاد، شانشین، سۆفی بلە، گۆڕیچە، تەینال، ئالیە مادەن، دەرەوەزان، دەرەوەزانی هۆبەتوو، حەسەن قەرە، تەنگباخ، هـەوارە گەرمـە، چـاولکان وەزیـر، مەیـدۆل، گۆلچـیەر، تـەیتاخ، کێلەکـەوو، کوتـك، یاپـەل، شـەریفاوا، نسـارە، باخچەلە، قالوچە، قەرەگەرە، باشلاخ، زەفەراوا، کەسنەزان، کانی چەرموو، قەلا ڕیانە، کەلەکان، ئەحمەوە کەڕ، دەرەسپ، گاوەشـەلە، زەڕینـە، تـەورێزر خـاتوون، زەڕینـەی هەوەتوو، پاپالە، شالی شل، ئەمیناوا، قەلا ڕووتەلە، گـورجی، شـاقەلا، دەواخ، بـەردە ڕەشە، ئیبرام ئاوا، هەرسـێ دەرەویانـە...تاد). بڕوانـە: خالیـد ئەحمـەدی، س . پ، ل ١٣– ٣٥ .

(٢٣) – خالید ئەحمەدی، س . پ، ل ١٣– ٣٥، عبدالحمید حـیرت سـجادی، ایـلات و عشـایر کردستان، مصدر پیشین،ل ١٢٢– ١٣٦، نڤیسین: دەستنڤیس، ئێل و ئویجاخێن کوردا ل کوردستانا ئێرانێ، توێژاندن و وەرگێڕن ژ فارسـی، مەسـعود خالـد گـولی، (هـەولێر: ٢٠١٠)، ل ٧٧– ٧٨ .

(٢٤) – سەید جەعفەر میر نیا، خێل و تایەفەکانی عەشایەری کوردی ئێـران، س . پ، ل ٧٤ .

(٢٥) – استفانی کرونین، رضا شاه و شکل گیری ایران نوین، ترجمه: مرتضی ثاقب فر، چ ٢ (تهران: ١٣٩٣)، ل ٣٢٧ .

(٢٦) – بڕوانە: خالید ئەحمەدی، س . پ، ل ١٣٤ – ١٦٥ .

(٢٧) – فرح صابر، رضا شاه بهلوي التطورات السیاسیة في ایران ١٩١٨– ١٩٣٩، ص ٣٣٦ .

(٢٨) – دکتر علی اصغر زرگـر، تـاریخ روابـط سیاسـی ایـران وانگلـیس در دوره رضـا شـاه، ترجمة: کاوه بیات، انتشارات معین، (تهران: ١٣٧٢)، ص ٤٥٤ – ٤٥٥ .

(٢٩) – عبدالحمید حیرت سجادی، ایلات و عشایر کردستان، ص١٤٠ .

(٣٠) – احمد نقیب زادة، دولت رضا شـاه و نظـام ایلـی، تـاثیر سـاختار دولـت قـدرت طـرای رضاشاه بر نفوذ قبایل و عشایر، ص ١٨٩، خالید ئەحمەدی، س .پ، ل ١٦٢.

(٣١) – نـەوزادی موهەنـدیس، هـۆزی گـەلباخی لـە سەرچـاوە مێژووییەکانـدا، (سـلێمانی: ٢٠١٢)، ل ٦٧، دیدەنی لەگەل حەبیبـە ئـەمین محەمـەد، تەمـەن (٨٥) سـال، خـەلکی ئۆمەربل، کەلار ٢٩ / ٣ / ٢٠١٥ .

(٣٢) – داود بەگی جاف: ساڵی ١٩٠٥ لە گوندی (میرە دێ)ی گەرمیان لە دایك بووە، کەسایەتییەکی دیار و شارەزاییەکی بەرچاوی لە زمانەکانی: عەرەبی، تورکی و فارسیدا هەبووە و لە ساڵانی جەنگی یەکەمدا لە سەر سنووری ئێرانەوە دژی لەشکری داگیرکەری ڕووسیا جەنگاوە، سەرەڕای هاوکاریکردنی شێخ مەحموود لە شەڕی ئاوباریکی (١٩٣١) دا دژی سوپای عێراق و بەریتانیا لە گەرمیاندا، جگە لەوە لەناوەندی سییەکانی سەدەی ڕابردووەوە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بووە، وەك نوێنەری کفری لە لیوای کەرکوك و تا کاتی بەرپابوونی شۆڕشی(١٤ تەمووزی ١٩٥٨) و لە ساڵی (١٩٥٩)ەوە پەنای بردۆتە بەر ئێران و لە ساڵی (١٩٦٦) دا لەوێ کۆچی دوایی کردووە، پاشان لە سنووری (مەنزەریە) وە تەرمەکەی هێنراوەتەوە گەرمیان و لە گۆڕستانی (سەید خەلیل) نێژراوە . بڕوانە: مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، (بەغدا: ١٩٩٥)، ل ٧٤، میر بەسری، ناودارانی کورد، و: عەبدولخالیق عەلائەدین، (هەولێر: ٢٠٠٩)، ل ٢٠٢.

(٣٣) – دارا بەگی داودە، کوڕی محەمەد عەلی کوڕی حەقی بەگی داودەیە، ساڵی (١٨٩١) لە دایك بووە، بە زۆری شوێنی نیشتەجێبوونی هۆزەکەی دەکەوێتە ناوچەی داقوقی سەربە شاری کەرکووکەوەو لە ساڵی (١٩٢٤) دا نوێنەری شاری کەرکوك بووە لە ئەنجومەنی دامەزراندنی عێراقدا و دواتریش لە خولەکانی: (١٩٣٥، ١٩٣٩، ١٩٤٢، ١٩٤٣، ١٩٤٧، ١٩٤٨) دا بۆ چەند جارێکی دی وەك ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق دەستنیشان کراوە و لە ساڵی ١٩٥٦ دا کۆچی دوایی کردووە . جمال بابان، اعلام الکرد، ج١، (اربیل: ٢٠١٢)، ص ٢٠٤ .

(٣٤) – دیدەنی لەگەڵ حاجی محەمەد ئەمینی ئۆمەربلی، تەمەن (٩٠) ساڵ، کەلار (٢٩ / ٣ / ٢٠١٥) .

(٣٥)– دیدەنی لەگەڵ حاجی سەعید محەمەدی (ئۆمەربل) ی گەرمیان و تەمەن (٩٠) ساڵ، کەلار (١٢ / ٣ / ٢٠١٥) .

(٣٦) – دیدەنی لەگەڵ حەبیبە ئەمین محەمەد، تەمەن (٨٥) ساڵ، خەڵکی ئۆمەربل، کەلار ٢٩ / ٣ / ٢٠١٥ .

(٣٧) – محمد علی سلطانی، جوغرافیای تاریخی وتاریخ مفصل کرمانشاهان، ایلات و طوایف کرمانشاهان، اوضاع اقلیمی، سیاسی، اجتماعی و اقتصادی، جلد دوم وسوم،(تهران: ١٣٨١)، ص ٢٢٩– ٢٣٣ .

(٣٨) – محمد علی سلطانی، مصدر پیشین، جلد دوم وسوم، ص ٢٢٩ .

(٣٩) – ابـراهيم خليـل احمـد و خليـل علـي مـراد، ايـران و تركيـا دراسـة في التـاريخ الحـديث والمعاصر، وزارة التعليم العالي والبحـث العلمـي، جامعـة الموصـل ، (الموصـل: ١٩٩٢)، ص ١٣٧ .

(٤٠) – شوان گەرمیانی، شیعرێکی ناتەواو مۆمێکی نیوە تەمـەن، ئاغـا شـڕەی ئێنـاخی کـێ بوو، مامۆستای کورد (گۆڤار)، ژمارە (١٤)، سوید، بەهاری ١٩٩٢، ل ١٧– ١٨ .

(٤١) – محەمەد سەعید جاف، ئاوارە، ب١، ل ١٧٩ .

(٤٢) – محمد علی سلطانی، مصدر پیشین، جلد دوم وسوم، ص ٢٤٩ .

(٤٣) – هادی رەشید بەهمەنی، پەیامی هەورامان، چ٢، (سلێمانی: ٢٠٠٣)، ل ١٦٤ .

(٤٤) – ئەحمـەد بـاوەڕ، دۆزی کـورد لـە پەیوەندییـەکانی نێـوان عێـراق و ئێرانـدا ١٩٣٧– ١٩٤٧، (سلێمانی: ٢٠١٠)، ل ٨٦ .

(٤٥) – حسن كريم الجاف، المصدر السابق، المجلد الرابع، ص ١٣٢ .

(٤٦) – محمد علی سلطانی، مصدر پیشـین، جلـد دوم و سـوم، ص ٢٤٩ " محەمـەد سـەعید جاف، ئاوارە، ب١، ل ١٨٠ .

(٤٧) – محەمەد سەعید جاف، ئاوارە، ب١، ل ١٨٠ .

(٤٨) – بۆ تۆمارکردنی ئەو زانیارییانە بە زۆری سوود لە تۆمارو قەیـدی یەکـەم قوتابخانـەی سەرەتایی کەلار وەرگیراوە، کە لە ساڵی ١٩٣١دا کراوەتـەوە . (سـوپاس بـۆ مامۆسـتا تایەری سەید عەبدوڵڵای بەڕێوەبەری کە ئاسانکاری بۆ کردین).

(٤٩) – محەمەد سەعید جاف، ب١، س . پ، ل ١٨٠، حسن كـريم الجـاف المصـدر السـابق، المجلد الرابع، ص ١٣٢ .

(٥٠) – ئیرەج ئەسکەندەری: ساڵی (١٩٠٨) لە تاران لە دایـك بـووە . قۆناغـەکانی خوێنـدنی تیا تەواوکردووە، بە مەبەستی تەواوکردنی خوێندن چۆتە پاریس و یاسای لـەوێ تـەواو کردووە و لە ساڵی (١٩٣٩) ەوە لەسەر بیری کۆمەنیستی لەگەڵ چـەند کەسـایەتییەکی تردا بۆ ماوەی پێنج ساڵ زیندانی کراوە و لەگەڵ دامەزراندنی حیزبی تودەی ئێراندا بـە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردراوەو لە ساڵی (١٩٤٧) دا و لـە کابینەکـەی قـەوام سەڵتەنەدا کە حیزبی تودە تیایدا بەشداری کردووە . کراوەتە وەزیری بازرگـانی، دوای یاساخبوونی تودەش لە وڵات هەڵاتووەو ماوەیەکی زۆر لـە سـۆڤێت و ئـەڵمانیا ژیـاوە و هەرلەوێش مردووە . بڕوانە: باقر عـاقلی، شـرح حـال رجـال سیاسـی و نظـامی معاصـر ایران، جلد١، ص ١١٩– ١٢٠.

(٥١) – یرواند ابراهیمیان، تاریخ ایران مـدرن، ترجمـة: محمـد ابـراهیم فتـاحی، چـاپ هفـتم، (تهران: ١٣٩١)، ص ٢٠٨ .

(٥٢) – موکەرەم تالەبانی: سالی (١٩٢٣) لە کەرکوك لە دایك بووە، خوێندنی سەرەتایی، ناوەندی و دواناوەندی لە شاری کەرکوك تەواو کردووە و دواتر لە کۆلێژی حقوق وەرگیراوەو هەر لە سەردەمی لاوییەوە پەیوەندی کردۆتە ڕێکخراوی دارکەر و هیواوە، دوای هەلوەشانەوەی هیواو لە سالی (١٩٤٦) ەوە پەیوەندی کردۆتە ڕیزەکانی حیزبی شیوعی عێراقەوەو بە هۆی ئینتمای حزبییەوە ماوەیەکی زۆر زیندانی کراوە، ماوەیەکیش بەکاری پارێزەری و پاشان بەڕێوەبەری گشتی ئینحساری توتن و ماوەیەکیش وەزیری ئاودێری بووە لە عێراقدا، لە سالی ١٩٧٩ ەوە لە کاری حیزبی دوورکەوتۆتەوەو لە سالی (١٩٨٧) دا، لە سەر داوای سەدام حوسێنی سەرۆکی پێشووی عێراق و ڕازیبوونی حیزبە کوردییەکان ڕۆلی نێوانگیری هەبووە لە نێوانیاندا، ئێستاش لە سلێمانی دادەنیشێت. بڕوانە: مکرم طالباني، مراحل تطور الحركة القومية الكردية، المجلد الثاني، ا(السليمانية: ٢٠١١)، ص ٧٨٣– ٧٨٥ .

(٥٣) – شێخ عەتای تالەبانی: کوڕی شێخ جەمالی تالەبانییە، سالی (١٩٢٥)دا لە دایك بووە . قۆناغی سەرەتایی خوێندنی لەکەرکوك تەواو کردووە، بە هۆی مردنی باوکیەوە دەستی لە خوێندن هەلگرتووە و، ماوەیەك ئەندامی پارتی هیوا بووە، لە سالی (١٩٤٧)ەوە پەیوەندی کردووە بەڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی عێراقەوە، لە سالەکانی ١٩٥٤ و سالی ١٩٦٠ بە هۆی چالاکی حزبییەوە دەستگیرکراوە و لە سالی (١٩٦١) دا دوور خراوەتەوە بۆ بەندیخانەی عیمارە . دواتر لەسەر فەرمان و لێبووردنی عەبدولکەریم قاسم (١٩١٤ – ١٩٦٣) گەڕاوەتەوە کوردستان و بووە بە بەرپرسی لیژنەی قەزای کفری حیزبی شیوعی عێراق، لە سالی (١٩٧٢) ەوە کراوەتە بەڕێوەبەری شارەوانی کفری و لە ڕاپەڕینی (١٩٩١) بەدواوە یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی (کۆمەلەی هیوای عێراقی)، لە (٤/ ٥ / ٢٠٠٠) . لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە. انظر: الشيخ عطا الطالباني، ذكريات النضال في كوردستان، ط١، (السليمانية: ٢٠١٠)، الصفحة الاخيرة .

(٥٤) – محەمەد سەعید جاف: سالی (١٩٢٥) لە کەلار لەدایك بووە، پلەکانی خوێندنی هەر لەم ناوچەیەوە دەست پێکردووە، یەکێکە لە خوێندەوار و ڕووناکبیرەکانی سەدەی ڕابردوو، دەیان نووسین و وەرگێڕانی لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکانی وەك: گەلاوێژ، هیوا، هەتاو، ڕوناهی و بەیان دا بلاو کردۆتەوە، لە سەردەمی خۆیدا، خاوەنی گەورەترین کتێبخانەی شەخسی بووە لە سنووری لیوای کەرکوکدا و بەرهەمێکی چاپکراوی هەیە، بە ناوی (ئاوارە) وە، ماوەیەکیش لە بواری ڕۆژنامەوانیدا کاری کردووە و لە (١٦/ ٣ / ١٩٩٦) دا لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: خوسرەو

جاف، پرسە، ئاهەنگی چلەی ماتەمینی خوالێخۆشبوو محەمەد سەعید بەگی جاف (٩/ ٥ / ١٩٩٦)، (بەغدا: ١٩٩٩)، ل ٦٤– ٧٣، محەمەد فاتح، پەرەسەندنی ژیانی حیزبایەتی لە کوردستانی باشووردا، (هەولێر: ٢٠١٤)، ل ٤١٣ .

(٥٥) – مكرم الطالباني، صديق السجون والمنافي، في ذكرى وفاة صديقي الوفي المرحوم محمد سعيد جاف، في: پرسە، ئاهەنگی چلەی ماتەمینی خوالێخۆشبوو محەمەد سەعید بەگی جاف (٩ / ٥ / ١٩٩٦)، ئامادەکردنی: خەسرەو جاف، (بەغدا: ١٩٩٩)، ل ٣٠ .

(٥٦) – محمد علي حسين، سقوط حزب تودة، عرض تحليلي لتاريخ الحزب الشيوعي الايراني وانهياره امام الاسلام، الطبعة الاولى، (طهران: ١٩٨٤)، ص ٣١– ٣٢ ؛ خسرو روزبە، ازویکی پدیا، دانشنامه ازاد، ٨ / ٣ / ٢٠١٥ .

(٥٧) – ارونـد ابراهيميـان، ايـران بـين ثـورتين، مركـز البحـوث والمعلومـات، الكتـب المترجمة،(الموصل: ١٩٨٣)، ص ٥٠٢ .

(٥٨) – ئەحمەد قەوام سەڵتەنە: کەسایەتییەکی سیاسی ئێرانی بووە لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی پەهلەویداو بە سەریەکەوە پێنج جار پۆستی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی وەرگرتووە، بە تایبەتی لە ساڵانی (١٩٢١، ١٩٢٢، ١٩٤٢، ١٩٤٧، ١٩٥٣)، بەڕێوی پیر (الثعلب العجوز) ناسراوەو لە ساڵی (١٩٥٥) دا لە شاری تاران کۆچی دوایی کردووە . بڕوانە: ویکبیدیا، تاریخ التسجيل (٣٠ / ٣ / ٢٠١٥) .

(٥٩) – محمد حسين خسرو پناه، سازمان افسران حزب تودة ايران ١٣٢٣– ١٣٣٣، مؤسسة نشر پژوهش شيراز (تهران: ١٣٧٧)، ص ١١٤، خاطرات ايرج اسكندرى، مؤسسة مطالعات پژوهشهاى سياسى (تهران: ١٣٧٢)، ص ٤٠١ .

(٦٠) – محمد حسين خسرو پناه، مصدر پيشين، ص ١١٨ .

(٦١) – مصدر پيشين، ص ١١٨– ١١٩ .

(٦٢) – مكرم الطالباني، صديق السجون و المنافي، ص ٣٠ .

(٦٣) – عباس بخشی، خسرو ڕوزبە کیست ؟، (لە ئەنتەرنێتەوە) وەرگیراوە، ڕۆژی تۆمارکردن، (١٠ / ٣ / ٢٠١٥)، خسرو روزبە، ازویکی پدیا، دانشنامه ازاد، ٨ / ٣ / ٢٠١٥ .

(٦٤) – دار الكتب والوثائق، الوحدة الوثائقية، رقم الملف (٤٩٥٥ /٣١١)، السفارة العراقية في طهران، التاريخ (١٨ / ١٢ / ١٩٥٠)، سري، وزارة الخارجية، بغداد، الموضوع: التقرير الاسبوعي عن ايران، فرار عشرة من سجناء حزب تودة من سجن طهران، رقم الوثيقة (١٥)، ص ٣٤ .

(٦٥) – دار الكتب والوثائق، الوحدة الوثائقية، رقم الملف (٤٩٦٥ /٣١١)، السفارة العراقية في طهران، التاريخ (١٨ / ١٢ / ١٩٥٠)، سري، وزارة الخارجية، بغداد، الموضوع: مواصلة نشاط حزب تودة، رقم الوثيقة (٧٨)، ص ٢٠٣ .

(٦٦) – دیدەنی تایبەت لەگەڵ موکەڕەم تاڵەبانی، سلێمانی، (٢٦ / ٣ / ٢٠١٥) .

(٦٧) – مەهدی محەمەد قادر، ڕۆڵی کورد لە بزووتنەوەی ئاشتیخوازان لە عێراقدا١٩٥٠–١٩٦٣، (هەولێر: ٢٠١٥)، ل ٥٤ .

(٦٨) – دیدەنی لەگەڵ ئەمجەد شاکەلی، شاکەل، ٢٩ / ٤ / ٢٠١٥ .

(٦٩) – مكرم الطالباني، صديق السجون والمنافي، في: پرسە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠ .

(٧٠) – ئیقباڵ خانی کچی کەریم بەگی جاف: ساڵی (١٩٣٩) لە کەلار لەدایك بووە، سەرەتاکانی خوێندنی هەر لەم شارەوە دەست پێکردووە و وەکو خۆی ئەڵێت: تا پۆلی سێیەمی ناوەندی خوێندووە، خێزانی سالاربەگی کوڕی داود بەگی جافە کە ئامۆزای خۆیەتی و زمانەکانی کوردی و عەرەبی و فارسی بە باشی دەزانێت، سالار بەگی هاوسەری لەگەڵ هاتنە سەرکاری کۆماری ئیسلامی لە ئێران و کۆتاییهێنانی فەرمانڕەوایەتی پەهلەویدا، ساڵی (١٩٧٩) لە سێدارەدراوە .

(٧١) – دیدەنی لەگەڵ ئیقباڵ خانی کەریم بەگی جاف، کەلار، (١٨ / ٣ / ٢٠١٥) .

(٧٢) – شێخ محەمەدی شێخ سلێمانی شاکەلی: ساڵی (١٩٣٢) لە شاکەلی گەرمیان لەدایك بووە، لە قوتابخانەی کەلاری سەرەتاییەوە دەستی بەخوێندن کردووە، کەسایەتییەکی خوێندەوارو ناسراوی گەرمیانە، هاوکات دەبێتە باوکی شاعیر و نووسەری ناسراو فەرهاد شاکەلی و ئەمجەد شاکەلی .

(٧٣) – دیدەنی لەگەڵ شێخ محەمەدی شێخ سلێمانی شاکەلی، شاکەل، (٢٩ / ٤ / ٢٠١٥).

(٧٤) – سازمان اسناد ملی ایران، وزارت کشور، شهربانی کل کشور، محرمانة، ازطرف رئیس شهربانی کلی کشور: مهندس غفاری، تاریخ (١٨ / ١٢ / ١٣٣٣) ، شماره (٣٩٠ / ٩٥٧٤١) .

(٧٥) – سازمان اسناد ملی ایران، وزارت کشور، شهربانی کل کشور، محرمانة، ازطرف رئیس شهربانی کلی کشور: سرهنگ نصیری، تاریخ ٩ / ١ / ١٣٣٤، زماره ٧١١٦٤ / ٥،

(٧٦) – خەسرەو جاف: ساڵی ١٩٤٥ لە کەلار لەدایك بووە و هەڵگری بڕوانامەی ماجستێری میعماریە. لە ساڵی (١٩٦٣)یەوە بۆتە پێشمەرگەو پلەی گەیشتۆتە سەرلق، لە داڕمانی حکومەتی بەعس بەدواوە دوو جار بۆتە ئەندامی پەرلەمانی عێراق، تائێستا چەندین گرەوی میعماری نێودەوڵەتی و خەڵاتی ڕۆشنبیری وەرگرتووە و، (٦٦) کتێبی

چاپکراوی لە بواری جۆربەجۆردا بلاوکردۆتەوە . بڕوانە: خوسرەو جاف، مەولانا و ڕازی نەی، (هەولێر: ٢٠١٤)، ل ٣٩٨ .

(٧٧) – دەستنووسێکی تایبەتی کاك خەسرەو جاف کە بۆ مەبەستی نووسینی ئەم لێکۆلینەوەیە بە دەستمان گەیشتووە .

(٧٨) – دیدەنی لەگەلّ موکەڕەم تالەبانی، سلێمانی، ٢٦ / ٣ / ٢٠١٥ .

(٧٩) – دیدەنی لەگەلّ موکەڕەم تالەبانی، سلێمانی، ٢٦ / ٣ / ٢٠١٥ .

(٨٠) – بەهجەت داود عەتیە: سالّی (١٩٠٠) لە بەسرە لەدایك بووە و بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی عێراق بووە. بەپێی ئیرادەیەکی شاهانە لە لایەن شا فەیسەلّی یەکەمەوە نازناوی (پاشا)ی دراوەتێ، بۆ یەکەم جار و دوای تەواوکردنی خوێندنی دواناوەندی لە سالّی (١٩٢٩) دا کراوەتە بەڕێوەبەری پۆلیس و لە سالّی (١٩٤٦)ەوە کراوەتە بەڕێوەبەری بەشی لێکۆلینەوەی جینائی و بەرپرسی بەدواداچوونی دۆسیەی شیوعییەکانی عێراق . لە (٢٠ی ئەیلولی ١٩٥٩) دا، بەپێی بڕیارێکی دادگای شۆڕش، کە فازیل مەهداوی بەڕێوەی بردووە لە سێدارە دراوە . بڕوانە: ویکیبیدیا، الموسوعة الحرة، (٢٢/ ٣ / ٢٠١٥) .

(٨١) – دەستنووسێکی تایبەتی خەسرەو جاف، س . پ .

(٨٢) – مسعود بهنود، از سید ضیاء تا بختیار، چاپ سیزدهم، (تهران: ١٣٩٠)، ص ٤٢٨ .

(٨٣) – دەستنووسێکی تایبەتی خەسرەو جاف، س . پ .

(٨٤) – محمد حسین خسرو پناه، مصدر پیشین، ص ٢٠٩ .

(٨٥) – محمد حسین خسرو پناه، مصدر پیشین ، ص ٢٠٩

(٨٦) – اروند ابراهیمیان، ایران بین ثورتین، مرکز البحوث و المعلومات، المصدر السابق، ص ٥٠٣، اروند ابراهیمیان، اعترافات شکنجه شدگان، لە ئینتەرنێتەوە وەرگیراوە، محمد حسین خسرو پناه، سازمان افسران حزب تودة ایران، ص ٢٢٥ .

(٨٧) – دیدەنی لەگەلّ موکەڕەم تالەبانی، سلێمانی، ٢٦ / ٣ / ٢٠١٥ .

(٨٨) – دیدەنی لەگەلّ موکەڕەم تالەبانی، سلێمانی، ٢٦ / ٣ / ٢٠١٥ .

(٨٩) – سازمان اسناد ملی ایران، نخست وزیر، جناب اقای نخست وزیر، محرمانة، رونوشت برای اطلاع وزارت کشورارسال میشود، بتاریخ (١٢/٢ / ١٣٣٧)، شماره (١٥٢٢٨) .

(٩٠) – سازمان اسناد ملی ایران، وزارت کشور، شهربانی کل کشور، محرمانة، رئیس شهربانی کل کشور . سپهبد علوی مقدم ، بتاریخ (١٢/١٤ / ١٣٣٧)، شماره (١٥٣٣٥) .

(٩١) – سازمان اسناد ملی ایران، از بغداد، وزارت امور خارجیة: جناب اقای حکمت وزیرمحترم امورخارجیة، بتاریخ (٢٩/ ٩/ ١٣٣٧)، شماره (١٦٩٢) .

## ملخص البحث

هذا البحث المعنون: (خسرو روزبه واكراد شرق كوردستان في گرميان ١٩٣٧– ١٩٥٥)، يسلط الضوء على جانب مهم من حركة المقاومة الايرانية والحركة القومية الكوردية في شرق كوردستان (ايران) ضد السلطة البهلوية وكيفية لجوئهم وايوائهم في جنوب كوردستان (العراق) ولاسيما في منطقة گرميان، بعد قمع مقاومتهم ونضالهم المرير من قبل الاجهزة الامنية والمؤسسة العسكرية الايرانية آنذاك . ومن تلك الانتفاضات على سبيل المثال: انتفاضة الاميرة الكوردية قدم خير، انتفاضة القبيلة الگلباخية الكوردية، انتفاضة صوفى بگ فتاح بگ الجاف في منطقة جوانرو، وكذلك نضال الشخصية الايرانية الازرية خسرو روزبه العضو والقيادي في اللجنة المركزية للحزب الشيوعي الايراني (توده) .

وقد اعتمدت في كتابة هذا البحث على المزيد من المصادر باللغات الفارسية، العربية والكوردية المتنوعة وكذالك الوثائق الرسمية الغير منشورة وخصوصا وثائق: (دارالكتب والوثائق العراقية) خلال العهد الملكي والوثائق الايرانية: (سازمان اسناد ملى ايران) خلال الحكم البهلوي . ناهيك عن بعض المقابلات الشخصية المتعلقة بالدراسة . ينقسم البحث الى عدة محاور رئيسية: يتضمن المحور الاول: سيرة ولجوء اسرة الاميرة اللرستانية قدم خير الى منطقة قزربات (السعدية الحالية) ومدينة خانقين وايوائهم من قبل عشيرتي الزرگوش والجاف. اما المحور الثاني: يتعلق بانتفاضة عشيرة الگلباخية الكوردية ضد رضاه شاه البهلوي في منطقة سنندج و ديواندره ومن حولها. في حين تضمن المحور الثالث: انتفاضة صوفي بگ فتاح بيك الجاف / فرع ولدبگى وكيفية عيشهم في بلدة كلار آنذاك (١٩٣٧– ١٩٤٢). اما المحور الرابع والاخير فيركز على سيرة الشخصية الايرانية الازرية والقيادي في تنظيمات الحزب الشيوعي الايراني وكيفية عيشه بشكل متنكر خلال نضاله السياسي باسم (علي توركه) بين رؤساء عشائر الجاف (بگزاده) في كلار . وكذلك اوضحت فى اطار هذا المحور حول عودته ثانية الى ايران سنة (١٩٥٥) ومن ثم القاء القبض عليه من قبل الاجهزة الامنية الايرانية (سافاك)، واحالته الى المحكمة العسكرية الايرانية في طهران التي دام حوالي (٦) ساعات وحكم عليه بالاعدام رميا بالرصاص في (١١ من شهر أيار سنة ١٩٥٩) مع (٢٥) شخصية اخرى ضمن تنظيمات الحزب الشيوعي الايراني (توده) .

# Abstract

This entitled research: (Khosro Roozba and the Kurds East of Kurdistan in Garmiyan 1937-1955), research highlights the important aspect of the Iranian Resistance Movement Kurdish in East Kurdistan (Iran) against the Pahlavi authority and how they settled in South Kurdistan (Iraq), particularly in the Garmiyan area, after the suppression of their resistance and bitter struggle by the Iranian security services and the military at that time. One of these uprisings, for example: the Kurdish uprising princess Qadam Kher, of the tribe of the Kurdish uprising Algulbakhiyah, Fatah Bag Sofi Bag Jaf's Uprising in Jwanro area, as well as the personal struggle of the Iranian Azari Khosro Roozba the member and the leader of the Central Committee of the Communist Party of Iran (Tudeh).

In writing this research many Persian, Arabic and Kurdish sources have been depended on , as well as unpublished documents, especially documents from ((House of Iraqi Books and Documents)) during the Royal era, the Iranian documents from((Iranian National Predication Organization)) during the Pahlavi reign , in addition to mention some personal interviews concerning the research.

The research is divided into several main sections: the first section includes: Dynasty Princess Qadam Kher's biography and her resorting to Qizzrabat area (Sa'diya currently) and the city of Khanaqin and sheltered by tribes of Al-zrqush and Aljaf. The second section talks about the uprising of the Kurdish tribe - Algulbakhyiah against Radha Shah Pahlavi in Sanandaj and Dewan Dara. While the third section includes the uprising of Sofi Beg Fattah Beg Aljaf / Walad Begy Branch and how they lived in Kalar (1937-1942). The fourth section and the last focuses on the personal biography of the Iranian Azeri and the leader in the Iranian Communist Party (Tudeh) and how he lived in disguise during his political struggle in the name of (Ali Turka) among the heads of Aljaf tribes (Begzadah) in Kalar. We have to mention that through this section we explained about his second return to Iran in 1955 and then captured by the Iranian security services (SAVAK), and he has been referred to the Iranian military court in Tehran, which lasted about 6 hours and sentenced to execution by firing on May 11th, 1959 with (25)other characters within the Iranian Communist Party (Tudeh).

# کێڵە نەخشێندراوەکانی گۆڕستانی پیر غەیب (بانیشار) لە شارۆچکەی خورماڵ
## ( توێژینەوەیەکی مەیدانییە )

د. زێدان ڕەشید خان ئاودەل برادۆستی
بەشی شوێنەوار – کۆلێژی ئەدەبیات
عەلی عەبدولڕەحمان بانیشاری

**کورتەی توێژێنەوەکە:**

گوندی بانیشار دەکەوێتە شارۆچکەی خورماڵ، وە گرنگی تایبەتی هەبووە لە مێژووی دروستبوونی ناوچەکە و مەڵبەندێکی گرنگی پێشکەوتنی ژیان و مێژووی ناوچەی شارەزوور بووە.

ئەم توێژینەوە گرنگی بە شیکاری کێڵە نەخشێندراوەکانی گۆڕستانی پیر غەیب لە گوندی بانیشار، وەك (توێژینەوەیەکی مەیدانی) زانستی لە رووی شوێنەوارییەوە، ئەمەش وەکو دەرخستنی لایەنێکی شارستانی و شوێنەواریی ئەم ناوچەیە، کە تاکو ئێستا هیچ ئاماژەیەکی زانستی و تیۆری بۆ نەکراوە.

ئەم توێژینەوەیە " کێلی پێنج گۆڕ " لە خۆ دەگرێت کە گۆڕی یەکەم کێلی لای سەر و خوارەوەی تێدایە، ئەوانی تر تەنها یەك کێلیان ماوە، وە ئەمەش بۆ یەکەم جارە ئەم کێلانە بە شێوەیەکی مەیدانی توێژینەوەی لایەنی هونەری شێوە ئەندازیاریی بیناسازی لەسەر دەکرێت، بۆیە لەم توێژینەوەدا زیاتر گرنگی بە لایەنی مەیدانی دراوە وەك بەشێکی سەرەکی لە توێژینەوە، لەبەر کەمیی سەرچاوە لەسەر ئەم کێلانە بەتایبەتی و ئەم ناوچەیە بە گشتی.

### شوێنی جوگرافیای گۆڕستانی پیر غەیب لە خورمال:

گۆڕستانەکە دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەلاتی گوندی بانیشاری کۆن، ئەم گوندە سەر بە شارۆچکەی خورماڵە[1]. بە دووری ٩ کیلۆمەتر لە باکوری رۆژهەلاتی خورماڵ. کەوتۆتە قەدپاڵی شاخە بەرزەکانی سوورێن کە هاوسنوورە لەگەڵ

کوردستانی رۆژهەلاتدا، بەلام ئەم گوندە کۆنەی بانیشار ئێستا ئاوەدان نییە، لە ساڵی ١٩٨٧ لەلایەن رژێمی بەعسەوە دانیشتووانەکەی راگوێزراون بۆ ئۆردوگای شانەدەری لە سنووری قەزای سەیدسادق، لەو کاتەدا گوندی بانیشاری کۆن نزیکەی ١٢٠ ماڵی تێدا ژیاوە، ئێستا هاولاتیانی رەسەنی بانیشار لە گوندێکی نوێتر دەژین کە ئەویش پێی دەگوترێت بانیشار یاخود بانیشاری نوێ، لەساڵی ١٩٩٢ ئاوەدانکراوەتەوە و زیاتر لە ١٤٠ ماڵی تێدا دەژیت [٢].

بەلام شارۆچکەی خورماڵ دەکەوێتە سەر رووباری زەلم[٣]. بەدووری (١٥) کیلۆمەتر لە باکوری رۆژئاوای پارێزگای هەڵەبجەی شەهیدەوە، (٧٤) کیلۆمەتر لە رۆژهەلاتی پارێزگای سلێمانییەوە دوورە، لە ساڵی (١٩٢٦) بۆیەکەم جار بووەتە ناحیە[٤].

گۆڕستانی (پیرغەیب) دەکەوێتە دەشتێکی تەخت، زیاتر لە ١٠٠٠ گۆڕی تێدایە بەشێك لەم گۆڕانە مێژوویەکی کۆنیان هەیە، بەپێی گێڕانەوەی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە ئەم گۆڕستانە مێژوویەکەی زیاتر لە (٢٠٠) ساڵ دەبێت[٥].

### واتای چەمکی پیر غەیب:

سەبارەت بە واتای (پیرغەیب) هیچ زانیارییەکی ئاماژە پێکراو نییە لە توێژینەوە زانستییەکاندا، بەلام نووسەر حەکیم مەلا ساڵح، کە لەسەر مێژوو و کلتووری ناوچەی خورماڵ و هەڵەبجە و هەورامان خاوەنی دەیان کتێب و نووسینی مێژووییە دەربارەی وشەی (پیر غەیب) دەڵێت " پیرغەیب بە واتای (شێخێکی غەیب زان) دێت، چونکە وشەی (پیر) ئەگەر بەراوردی بکەین لە زۆرینەی فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا بە واتای (شێخ) دێت، (غەیب) یش بە واتای (غەیب زان) دێت وشەکە لێکدراوە بەسەر یەکەوە واتە (شێخێکی غەیب زان) یان (پیر بابا غەیب) ەوە هاتبێت، کە (بابا) ش بە واتای (سەید، گەورە) دێت وشەکە هەمووی بەسەریەکەوە بەمانای (پیاوێکی گەورەی غەیب زان) دێت [٦].

بەوتەی نووسەری ناوبراو هەردوو وشەکە دروستە، چونکە (پیر، بابا) لە سەردەمی زەردەشتیدا بە(پیاوانی گەورەی ئاینی) وتراوە. قسەکانی ئەو نووسەرە بەو مانایە دێت گۆڕستانی (پیر غەیب) بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی

زەردەشتی (شەشـەمی کۆچـی \ سـێزدەهەمی زایـنی)، بـەڵام نووسـینەکانی سـەر کێڵەکان پێچەوانەی قسەکانی ئەم نووسەرەن [٧].

حەکیم مەلا ساڵح بۆچوونی وایە (پیر غەیب) ئەو (پیاوە گەورە ئایینە غـەیب زان)ە یان (شێخی غەیب زان، پیاوی گەورەی غەیب زان) بووبێت کـە یەکـەم جـار لەم گۆڕستانەدا نێژرابێت و پاشان ناوی گۆڕستانەکە بەناوی ئەوەوە ناونرابێت[٨].

**واتای چەمکی بانیشار:**

بـەپێی قسـەی پیـاوە بەساڵاچـووەکانی ئـەم گونـدە دانیشـتووانی ناوچـەی (بانیشار) بە واتای (پشتی شار – سەرەوەی شار) دێت، چونکە بانیشاری کۆن لە ناوچەیەکی (بەرز، بان) دایە، بەشی خوارەوەی ئەم گوندە (دەشتی شارەزوور) ی پێدەڵێن، لە کۆندا و پێش چەندین سەردەم لەمەوبەر ئەم ناوچەیە شار بووە ، کە گوندەکەش لە بنارەکەدا بووە پێیان وتووە بانیشار بەم شـێوەیە (بـانی – شـار) یـاخود (بـان – شـار) پاشـان پـیتی (ی) بـۆ (بـان) ەکـە بـە درێـژایی مێـژوو بـۆ زیادکراوە[٩].

لە کتێبی (هەگبە و هەوارگە) لە نووسینی (ئـەیوب ڕۆسـتەم) بـەرگی یەکـەم، باس لەوە دەکات لە سەردەمی پاشا (هواخشـترە) کـە پاشـای بـەهێزی مادەکـان (٦١٢ – ٥٥٠ پ. ز) بـووە، شـارێکی گـەورەی دروسـت کـردووە لـە گونـدی (بەردەبـەك) ەوە تـا شارۆچـکەی خورمـاڵ، واتـە لـە سـەردەمی مادەکانـدا ئـەو دەشـتەی کـە باسمـانکرد لـە خـوارەوەی گونـدی بانیشـار، شـار بـووە، بۆیـە گوندەکەش لە (بان) ێکدا بووە، پاشان دەشتەکەش لە (بەردەبەلەوە تا خورمـاڵ) لەلایەن ئەو پاشای مادەکانـەوە کـراوە بە(شـار)، واتـەی نـاوەڕۆکی ئـەم کتێبـە و قسـەی دانیشـتوانی ناوچـەکە لـەم خاڵـەدا یەکدەگرێتـەوە کـە (بانیشـار) واتـە (سەرەوەی شار – پشـتی شـار) ئێسـتا گونـدی (بەردەبـەك) ئاوەدانـە و سـەر بـە شارۆچکەی خورماڵە [١٠].

**ناوی خورماڵ لە سەرچاوە مێژووییەكاندا:**

سەبارەت بەناوی خورماڵ بۆچوونی جیاواز هەیە، لە كتێبی (خورماڵ لێكوڵینەوەیەكی سۆسیۆئەنثرۆپۆلۆجییە) لە نووسینی (ئیبراهیم حاجی زەڵمی) بەرگی یەكەم، بەم شێوەیە باس لەناوی خورماڵ دەكات:

خورماڵ ناوێكی لێكدراوە پاشان گۆڕانكاری بەسەردا هاتووە، واباس دەكرێت یەكەم جار گوڵعەنبەر بووە پاشان بووە بە خورماڵ، بەم شێوەیە: (گوڵعەنبەر)...گوڵەمبەر.. گوڵەمبار.. گوڵمار.. خوڵمار.. خۆرماڵ[١١]. چەند بیر و بۆچوونێكی تر بۆ خورماڵ هەیە، ئەوانیش دەڵێن خورماڵ لە وشەی (گوڵعەنبەر)ەوە هاتووە[١٢]. یاخود لە(گول عومەر)[١٣] و (گول ئەمار)[١٤].

هەروەها لە پەرتووكی (هەگبە و هەوارگە) هەروەك لە پێشتر ناوی هاتووە، باس لەوە دەكات قەڵای خورماڵ لە سەردەمی لۆلۆییەكان (٢٢٣٠ – ٢١٢٠ پ. ز) یەكێك بووە لە پایتەختە كۆنەكانی شارەزوور، چونكە لۆلۆییەكان لەو كاتەدا مەملەكەتی زاموایان دامەزراندووە كە چەند ناوچەیەكی سلێمانی گرتووەتەوە لەوانەش (شارەزوور)، واتە لۆلۆییەكان لە ناوچەی شارەزوور دەسەڵاتیان هەبووە، هەریەكە لە (گردی یاسین تەپە، گردی بەكراوا، قەڵای خورماڵ) لە ناوچەی شارەزوور پایتەختی لۆلۆییەكان بووە[١٥].

بەڵام مینورسكی لە پەرتووكی (دائرة المعارف) لە ماددەی شارەزوور ئاماژە بەناوی خورماڵ دەكات و دەڵێت ئەم وشەیە لە(غلام یاخود خلام)[١٦] وەرگیراوە و بۆتە خورماڵ [١٧]. گرنگیی ئەم ناوچەیە بۆ گرنگیی دەشتایی ناوچەی شارەزوور دەگەڕێتەوە كە دەشتاییەكی پان و گەورەی هەیە لە باشووری پارێزگای سلێمانی دەست پێدەكات تا دەگاتە سنووری نێوان كوردستانی عێراق و ئێران، ئەم دەشتاییە ٤٥ كم و پانییەكەی ١٥ – ٢٥ كم [١٨].

**پێناسەی گۆڕ:**

**گۆڕ** شوێنی مردووە، یاخود شوێنی ناشتنی مرۆڤە [١٩]. لە دوای گیان لەدەستدانی. مرۆڤ هەر لە سەرەتای ژیانەوە گرنگی بەناشتن و گۆڕ داوە لەكاتی سەردەمی ئادەمەوە تا سەردەمی چاخە بەردینەكان، بۆ نموونەناشتنی مرۆڤ لە ئەشكەوتی شانەدەر لە شاخی برادۆست [٢٠]. لە باكووری ڕۆژهەڵاتی هەولێر بە

دووری (١٥٥ کـم) کـە سـەرەتای دەسـتپێکی ناشـتنی مرۆڤـە لـە ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاست[٢١]. ئیتر دوای ئـەوە شـێوازی ناشـتن و گـۆڕی جیـاواز دروسـتکران، لـە ناوچـەیەك بـۆ ناوچـەیەکی تـر جیـاوازی هـەبوو، بـەڵام لـە سـەرەتای سـەردەمی ئیسلامدا گرنگی بە گۆڕ نەدەدرا، بەڵکو بە شێوەیەکی سادە و ساکار گۆڕ دروست دەکرا.

**کێلەکانی گۆڕستانی پیر غەیب:**

**کێلی یەکەم:**

**١- کێلی لای سەر**



کێلـی گـۆڕی لای سەر، شێوەی نزیکە لـە لاکێشـەیی، لـە لووتکەکەیـدا کۆتـایی دێت بە کەوانێکی شـێوە نزیـك لـە سێگۆشـەی ناڕێکی بەشـی سـەرەوە بەشێوەی هێڵێکی راست دەردەکەوێت، بەرزی (٤٦سم) پانی (٣٢سم) ئەستووری (٤سم). لە بـەردی کلسـی دروست کراوە. لە ناوەڕاستی کێلەکەدا لەناو چوارچێوەیەکی چوارگۆشەدا نەخشی گـوڵێکی شـەش گـەڵای شـێوە بازنـەیی پێکهـاتووە، لـەخاڵی ناوەڕاسـت دەسـت پێدەکـەن لـە کۆتاییـدا بەبازنـەوە لکـاون بەشـێوەیەکی ڕێـك، کـە ئـەم نەخشـە بەشـێوەی چـاڵی هـەڵکۆڵێنی هەڵکەنـدراوە. لـە بەشـی سـەرەوەی کێلەکـەدا لەسێگۆشەکەدا هەمان وێنەی گوڵی خوارەوە دووبـارە بۆتـەوە، بـەڵام پێوانەکـەی بچووکترە.

ئەم کێلە هیچ نووسینێکی لەسـەر نییـە، وە شـێوەی پـەڕی گوڵـەکان شـێوە بادامییە و شێوەیەکی ناسروشتی هەیە لـە گـوڵی بـەیبوون وەرگـیراوە. وە شـێوە بازنـەی بەشـێوەیەکی بـەربڵاو و لـە سـەردەمی عوسمانییەکانـدا لـە کوردسـتاندا بەکارهێنراوە بەتایبەت لە بیناسازیی عوسمانی لە هەولێر[٢٢]. و کۆیە و رواندز[٢٣].

### ٢- کێلی لای خوارەوە (لای پێیەکان):




کێلی گۆڕی ژمارە یەك لە ناوەوە کە لە بەردی کلسی دروست کراوە بەشێوەی لاکێشەیی بەرزی (٤٦ سم) پانی (٣٢ سم) ئەستووری (٤ سم). لە بەشی سەرەوەی شێوەی سێگۆشەی لەکۆتاییدا تیژ نییە، ئەم کێلە بە حەوت دێر نووسین نەخشێندراوە بە نووسینی کووفی شێوەی ثلث کەبە چاڵە هەڵکۆڵینی هەڵکەندراوە لە نێوان دێرەکان هێڵێکی رێك و پان لێکیان جیادەکاتەوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

دێری یەکەم: یاالله

دێری دووەم: هذا قبر

دێری سێیەم: المغفرة لها..........

دێری چوارەم: المرحوم مریم بنت

دێری پێنجەم: مراد أشهد أن لا اله

دێری شەشەم: الا الله و أشهد أن

دێری حەوتەم: محمد رسول الله

تێبینی دەکەین کە هەندێك پیت خوێندنەوەیان زۆر ئەستەمە، چونکە هۆکاری ئاو و هەوای سروشتی کاریگەری کردۆتە سەر کێلەکان و شێواندنی پیتەکان.

**کێلی دووەم:**




کێلی گۆڕ لە بەشی سەرەوە دروستکراوە لە بەردی کلسی شێوە لاکێشەی بەرزی (٥٤ سم) پانی (٣٢ سم) ئەستووری (٦سم). لە کۆتاییدا بە لووتکەیەکی شێوەی سێگۆشەیی تەواو کۆتایی هاتووە واتە بەشێوەی کەوانی تیژ، بەشی خوارەوەی ئەم کێلە لە لای راستیدا شکاوە و نەماوە، بەگشتی ئەم کێلە لە پێنج دێری جیاکراو لەیەکتر بە هێڵێکی پان شێوە کووفی ثلث پێکدێت بەم شێوەیەی خوارەوە:

دێری یەکەم: هذا قبر

دێری دووەم: للمغفرة المرحوم

دێری سێیەم: جوهر أشهد أن لا

دێری چوارەم: اله الا الله و ر

دێری پێنجەم: أشهد أن محمد رسول الله سنة ١١٠٦

تێبینی دەکەین کە دێری چوارەم پیتی راء زیاد نووسراوە، وە دێری پێنجەم لە دوو دێری لەناو یەك چوارچێوەی خۆیدا پێکدێت، وشەی (شهد) واتە (أشهد) لەبەر شکانی بەردی ئەم کێلە نەماوە.

### کێڵی سێیەم:




کێڵی گۆڕی لای سەر لە بەردی کلسی دروست کراوە، شێوەی چوارگۆشەی هەیە بەرزی (٤٠سم) پانی (٢٩ سم) ئەستووری (٦سم). لە بەشی سەرەوەی بەشێوەی کەوانی سێگۆشەیی لار کۆتایی دێت، وە بەشێك لەم کێڵە لەلای چەپی خوارەوەی شکاوە و نەماوە. ئەم کێڵە شەش دێر نووسین لە خۆ دەگرێت لە نووسینی شێوەی نوسخی عەرەبییە کە بەشێوەی هەڵکوڵینی دەرکەوتوو هەڵکەندراوە و نووسراوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

دێری یەکەم: تقبل یا رسول
دێری دووەم: أشهد ان لا اله
دێری سێیەم: الله وأشهد أن محمد
دێری چوارەم: الرسول الله سنة ١١٨٨
دێری پێنجەم: زكر ابن دنيا شال كاروان
دێری شەشەم: اكه — كان عزيز —————

### کێڵی چوارەم :

کێڵی گۆڕی لای سەرە لە بەردی مەڕمەڕی حەلان دروست کراوە، شێوەی چوار گۆشەی هەیە بەرزی (٣٨ سم) پانی (٣٤ سم) ئەستووری (٩سم). بەشی سەرەوەی بە شێوەی ڕێکە جیاوازە لەگەڵ کێڵەکانی تر، بەڵام بەشی لای راستی لە خوارەوە شکاوە و پارچەیەکی نەماوە. ئەم کێڵە پێکدێت لە پێنج دێر نووسینی




کووفی ثلث، بەشێوەی هونەری نووسینی دەرکەوتوو نووسراوە، دێرەکان لەناو چوارچێوەیەکی شێوەی لاکێشەیی نەخشێنراون لە سەرەتا و کۆتایی سێگۆشەی تیژ هەیە.

دێری یەکەم: هذا قبر مغفرة مرحوم

دێری دووەم: محمد ابن محمود

دێری سێیەم: أشهد أن لا اله الا الله

دێری چوارەم: و أشهد ان محمد ر

دێری پێنجەم: سول الله سنة ١٣١١ء

تێبینی دەکەین کە ئەو کەسەی ئەم نووسینەی کردووە شارەزایی تەواوی لەزمانی عەرەبیدا نەبووە، چونکە هەڵەی زمانەوانی تێدا کراوە، وەکو مێژووی ئەم کێلە کە لەبری هەزار ژمارەی یەك شێوەی نزیك لە ژمارە شەشی فارسی بەکارهاتووە، وە پیتی ر لەگەل وشەی سول واتە (رسول) بە جیا لە دوودێر نووسیوە.

## کێلی پێنجەم :

کێلی گۆڕی لای سەرە لە بەردی کلسی دروست کراوە و شێوەی لاکێشەیی هەیە، پێوانەکانی بەرزی (٦٠ سم) پانی (٣٢ سم) ئەستوری (٦سم) لەبەشی سەرەوەی بە شێوەی رێك دروستکراوە، بەڵام بەشی لای چەپ لەسەرەوە شکاوە، ئەم کێلە لە چوار دێر نووسینی کووفی ثلث پێکدێت کە بە شێوەی نووسینی دەرکەوتوو لە ناو چوارچێوەی شێوە لاکێشەیی نووسراوە.

دێری یەکەم: أشهد ا.........

دێری دووەم: الا اله الله و

دێری سێیەم: أشهد أن سنة ١٣١١

دێری چوارەم: محمد رسول الله




هەموو نەخش و زەخرەفەی سەر ئەو کێلانە بە شێوەی دەرکەوتوو نەخشێندراون، ئەمەش هەروەکو زۆربەی نەخش و زەخرفەی سەر بەردی کلسی و روخامی لە شاری هەولێر و مووسڵ لە سەردەمی عوسمانییەکاندا بەم شێوەیە دروستکراون [٢٤].

**دەرئەنجام و راسپاردەکان:**

١- ناوچەی شارەزوور بەتایبەتی بانیشار کاریگەری هەبووە لەسەر مێژووی شارستانیەتی کوردستان، لەو سەردەمە کۆنانەدا و بەردەوام بە درێژایی سەردەمە ئیسلامییەکانیش بە هەمان شێوە، بەڵام لە سەردەمی عوسمانییەکاندا کاتێک شارەزوور ولایەتی سەربەخۆ بووە دەورو کاریگەری زیاتری هەبووە و پیشکەوتنی زۆرتری بەخۆیەوە بینیوە، بوونی چەندین پارچەی شوێنەواری جیاواز بەدەر لە کێلەکان بەڵگەی راستەقینەی مێژووی ئەم ناوچەیەن.

٢- گرنگیی بابەتەکە وایکرد ئێمە توێژینەوە لەسەر ئەم کێلانە ئەنجام بدەین و بەپێویستی دەزانین پسپۆرە جیاوازەکانی شوێنەواریش توێژینەوەی هاوشێوەی لەسەر ئەنجام بدەن.

٣- بەکارهێنانی هونەری نەقش و نووسین و نیگار بەڵگەیە بۆ بەرەو پێشچوونی ناوچەکە لەبواری شوێنەوار لەو سەردەمەدا، نووسینی وشەی ئاینی وەکو (محمد، رسول الله) بەڵگەی خۆشەویستی پاك و راگرتنی ئاینی ئیسلامە لەلای کورد، بەتایبەت خەڵکی ئەم ناوچەکە دواتر بۆمان دەردەکەوێت لەچەند ناوچەیەکی تری کوردستان بەهەمان شێوە هەبووە، وە نووسینی شەهادەی ئیسلام (أشهد ان لا اله الا الله وأشهد أن محمد رسول الله) بەڵگەی گەواهیدەری ئەو راستییەن.

٤- لە دەرئەنجامی ئەم توێژینەوەیە بۆمان دەرکەوت کە نووسینی کێلی ئەم گۆڕانە کە هەڵەی زمانەوانیی زۆری تێدایە، ئەمەش بەڵگەیە کە ئەم نووسینانە لەلایەن کەسانێکەوە نووسراونەتەوە کە زمانی عەرەبییان لاواز بووە یاخود دەتوانین بڵێین کە خەڵکی ئەم ناوچەیە ئەم نووسینەیان نووسیوە.

٥- وای بۆ دەچین کەسانی خاوەن دەسەڵات و ساماندار کێلی گۆڕەکانیان نەخش و نووسینی لەسەر کرابێت، نەك خەڵکی ئاسایی.

٦- بەکارهێنانی بەردی کلسی هۆکاری زۆری هەیە، گرنگترینی ئەوەیە کە زۆرتر دەتوانێت بەرگەی کەش و ئاو هەوا بگرێت.

٧- لەسەر گرنگی بابەتەکە داواکارین لەلایەنی بەرپرس ئەرکی پاراستنی ئەم شوێنەوارە بگرنە ئەستۆو لە ئەگەری فەوتان رزگاری بکەن، چونکە لە ئێستادا بەشێك لە نووسینەکانی سەر کێلەکان بەهۆی نە پاراستنیەوە ناخوێنرێنەوە.

٨ — ئەم توێژینەوەیە دەبێتە بەشێك بۆ بەدیکۆمێنتکردنی ئەم شوێنەوارە لە داهاتوودا.

**پەراوێزەکان:**

(١) چاوپێکەوتن: محەمەد حاجی ڕەشید، ڕیش سپی گوند، لەدایکبووی ١٩٣٣، خورماڵ، ٢٨\٦\٢٠١٣ ز.

(٢) محەمەد حاجی ڕەشید، چاوپێکەوتن.

(٣) زەڵمی، ئیبراهیم حاجی: خورماڵ لیکۆڵینەوەیەکی سۆسیۆ ئەنثرۆپۆلۆجییە، سلێمانی، ٢٠٠٨ ز، ل١١ و١٢.

(٤) بەهمەن، هادی رەشید، پەیامی هەورامان، چاپی یەکەم (٢٠١١)، ل٢٣٥

(٥) سەردانی مەیدانی: ١١ \ ٣ \ ٢٠١٣.

(٦) چاوپێکەوتن: حەکیم مەلا ساڵح، نووسەر، لەدایکبووی ١٩٥٤، هەڵەبجە، ١٨ \٣ \٢٠١٣ ز.

(٧) حەکیم مەلا ساڵح، چاوپێکەوتن.

(٨) حەکیم مەلا ساڵح ، چاوپێکەوتن.

(٩) چاوپێکەوتن: عەبدلرەحمان محەمەد ساڵح، پیاوماقووڵی گوند ، لەدایکبووی ١٩٥٦، بانیشار، ١٨ \٣ \ ٢٠١٣.

(١٠) ڕۆستەم، ئەیوب: هەگبە و هەوارگە، سلێمانی، ٢٠١٣ ز، ل١٠٩.

(١١) زەڵمی، ئیبراهیم حاجی: خورماڵ لیکۆڵینەوەیەکی سۆسیۆ ئەنثرۆپۆلۆجییە، سلێمانی، ٢٠٠٨ ز، ل١١.

(١٢) بابان، جەمال: أصول اسماء المدن والمواقع العراقية، الجزء الاول، ١٩٨٩، ص١، ٥.

(١٣) کاکەیی، هاشم عاسی، کورد و چەند بابەتێکی مێژوویی، چاپخانەی ئارابخا، چاپی یەکەم، (کرکوك، ٢٠٠٦)، ل١٩٤.

(١٤) نەقشبەندی: حسام الدين علی غالب، شارەزوور و لوڕستانی باکور لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، (لیکۆڵینەوەیەکی (میژوویی و شارستانی) یە، وەرگێڕانی \ ڕەنج ئەبوبەکر محەمەد، چاپی یەکەم، چاپخانەی حەمدی، (سلێمانی، ٢٠٠٨)، ل١١٥.

(١٥) ڕۆستەم: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤.

(١٦) غلام، خلام، خادم: زاراوەیەکی کوردییە لەسەر دیالێکتی کرمانجی ژوورووییە، بۆمەبەستی خزمەتکاری یاخود کارەکەری پیاوە ناودارەکان و دەسەلأتدارەکانە، تەنانەت لە سەردەمی عوسمانییەکانیش ئەوانەی بۆ ئاغا و موتەسەریفەکان خزمەتیان کردووە ئەو ناوەیان پێ گوتراوە (برکات: مصطفى، الالقاب والوظائف العثمانية، دار غريب، (القاهرة، د.ت ، ص ٣٣٠).

(١٧) حسن، درويش يوسف، ألاسرة الشهرزورية ودورها السياسي والحضاري (٤٨٩ – ٦٣٠ هـ \ ١٠٩٥ – ١٢٣٢ م)، أطروحة الدكتوراه غير منشورة، (جامعة صلاح الدين)، (اربيل، ١٩٩٨)، ص ١٧. توفيق، وهبي، أصل تسمية شهرزور، مجلة سومر، عدد ١٧، (بغداد، ١٩٦١)، ص ١٢٩.

(١٨) مينورسكي: مادة شارەزوور (دائرة المعارف الاسلامية)، ١٣ \ ٤١٨، كرسيشس، ئيران \ ٤٧٩.

(١٩) نكرى، عبدالنبي بن عبدالرسول الاحمد، موسوعة مصطلحات جامع العلوم (الملقب بدستور العلماء)، تحقيق واشراف ومراجعة \ د. رفيق العجم، **نقله من** الفارسية الى العربية د. عبدالله الخالدي، مكتبة لبنان ناشرون، ط١، (بيروت، ١٩٩٧)، ص ٦٠٤.

(٢٠) ئاميدي، ايهان محمد قادر، انسان كهف شانيدر في كوردستان – العراق وعلاقته بالنياندرتال (دراسة انثروبولوجية حضارية لاقدم سكان الكهوف في كوردستان)، رسالة ماجستير – جامعة صلاح الدين (أربيل، ٢٠٠٧)، ص ٨.

(21) Solecki, Ralph, ((Shanidar cave)) A Paleolithic site in northern Iraq, and its relationship to the some age Sequence of Iraq, Summer, ol. ×1, No. 1, 1955.

Solecki, Ralph, ((Shanidar cave)) A late pleiston cene one site in northern Iraq, Lods, 1611, p. 414.

(٢٢) البرادوستي، زيدان رشيد خان آودل، الخانات والقيسريات في كويسنجق في العصرالعثماني، دراسة أثرية مقارنة، اطروحة الدكتوراه غير منشورة، جامعة دمشق، (دمشق، ٢٠١١)، ص ٨١ – ٢٣٥،

(٢٣) مستەفا، مەهدی جەلال، هونەری نەقش و زخرەفەی سەر بەرد لە پارێزگای هەولێر نێوان ساڵی (١٧٠٠ – ١٩٠٠ز) توێژینەوەیەکی مەیدانییە، نامەی ماستەر – بڵاونەکراوە (زانکۆی سەلاحەدین) ، (هەولێر، ٢٠١١)، ٦٢ –٦٣، ٩٤ –١٦٧.

(٢٤) الزيباري، منير رمضان ابراهيم، زخارف البيوت التراثية في مدينتي الموصل واربيل في أواخر العصر العثماني (دراسة ميدانية)، رسالة ماجستير غير منشورة (جامعة الموصل)، (الموصل، ٢٠١١)، ٨٩ –٩٩.

## ملخص البحث

تقع قرية بانيشار في بلدة خورمال. خورمال وما حولها لها أهمية حضارية وتاريخية خاصة لكونها تمثل مركزًا حضاريًا وتاريخيًا لمنطقة شهرزور.

هذه الدراسة تلقي الضوء على عدد من شواهد القبور الموجودة في مقبرة پيرغەيب في قرية بانيشار. اعتمدت الدراسة على (الدراسة الميدانية) والعلمية، لاظهار جانبٍ مهم من الجوانب الحضارية لهذة المنطقة، التي لم تتناولها أية دراسة علمية سابقاً.

تضم الدراسة "خمسة شواهد القبور "، القبر الاول يضم شاهدين (الاعلى والاسفل)، اما بقية القبور تضم كل واحد منهم على شاهد واحد فقط، تعتبر هذه الدراسة أول دراسة ميدانية تتناول شواهد هذه القبور من الناحية الفنية والشكل الهندسي، حيث ركزنا على الجانب الميداني كجزء أساسي للدراسة، وذلك بسبب قلة المصادر والمراجع حول موضوع البحث خصوصاً والمنطقة عموما.

## Abstract

Banishar is a village located in the territory of Khurmal, the cultural and historical center of Shahrazour and it has a significant role in the civilization of the region.

This study sheds light on the gravestones in Bergh graveyard in the village of Banishar. It's mainly based on fieldwork and scientific research from its archaeological prospective, to show an important side of art and design of gravestones as a cultural aspect of this region, which has not been studied before.

In this paper we studied "five gravestones" first contains two scenes (top and bottom), the rest of the graves have only one scenes. This study is the first field work and research for these gravestones, we studied its design, artistic elements. We focused mainly on the fieldwork as an essential part of the study, due to lack of references on the subject of research in particular and the region in general.

# ئیمپراتۆریەتی میدییەکان
# لە سەرچاوە مێخییەکاندا

**م.ی. ئارام جەلال حەسەن هەمەوەندی**
بەشی شوێنەوار – کۆلێژی ئەدەبیات –
زانکۆی سەلاحەددین– هەولێر

میدییەکان نەتەوەیەکی ڕەگەز ئارییاین[1] لە کۆتاییەکانی هەزارەی دووەمی پێش زاین و سەرەتاکانی هەزارەی یەکەمی پێش زاین بە دەشتاییەکانی باکوور و باکووری ڕۆژئاوای ئێران بڵاوبوونەتەوە[2]. میدییەکان سەرەتا وەك چەند هۆزێکی خێڵەکی کە زیاتر خەریکی مەڕومالات بەخێوکردن بوون بەناو دەشتاییەکانی ئێراندا بڵاوەیان کردبوو[3]، هیرۆدۆتس ئاماژە بەوە دەکات کە مادەکان لە شەش هۆز پێکهاتوون، کە ئەوانیش (ستروکناتیس – Strouknates، ئارزانتی – Arzantoi، ماگی – Magoi، بوودی – Boudi، بوسسی – Boussi، پاریتاکنی – paretaknoi)[4]، بەلام دەرکەوتنی میدییەکان لە ڕووداوە سیاسییەکان و ناوهاتنیان لە دەقە مێخییەکاندا، لەگەڵ هەڵمەتە سەربازییە فراوانخوازەکانی ئیمپراتۆریەتی ئاشووریی نوێ (٩١١–٦١٢پ.ز) بەرەو ئاراستەی ڕۆژهەلات و بەشەکانی دواوەی چیای زاگرۆس دەست پێدەکات. بەلام هەندێك توێژینەوە ئاماژە بەوە دەکەن بۆیەکەم جار ناوی مادەکان لە سەردەمی ئاشووری ناوەڕاست (١٥٠٠–٩١١ پ.ز) لە نووسراوێکی پاشا شەلمنصەری یەکەم (شولمانۆ – ئەشەریدۆی یەکەم)[5] کە تیایدا باس لەوە دەکات میدییەکان وەك هێزێك لە ناوچەکە دەرکەوتوون و کێشەی زۆریان بۆ مەملەکەتی ئاشوور دروست کردووە. هەروەها لە تێکستێکی مێخیی سەردەمی پاشا (تەگلات بلێزەری یەکەم / Tiglat –plisser I) (١١١٥–١٠٧٧ پ.ز) ناوی چەند هەرێمێکی میدییەکان ئاماژەی پێکراوە[6]، بەلام ئەو شتە جێگەی گومانەو من خۆم هیچ شتێکی وام نەبینیوە لە

نووسراوەکانی ئەم دوو پاشایەدا. بەپێی بەڵگەی نووسراوە مێخییەکان، بۆ یەکەم جار ناوی میدییەکان لە دەقێکی مێخیی تایبەت بە پاشای ئاشووری شەلمانصەری سێیەم (شولمانۆ –ئەشەریدۆی سێیەم) لە ساڵی (٨٣٦ پ.ز) هاتووە[٧]، ئاماژە بەوە دەکات کە لەکاتی ئەنجامدانی هەڵمەتێکی سەربازی بەرەو رۆژهەڵات بەرەنگاری هۆزێکی گەورە بۆتەوە کە لە بەشەکانی باکووری رۆژئاوای ئێران نیشتەجێ ببوون[٨]، کە تیایدا ئەو خاکەی کە میدییەکانی تیا نیشتەجێ بووە بە (kurMa-da-a)[٩] ئاماژەی پێکراوە کە بەواتای وڵاتی میدییەکان دێت[١٠]. هەروەك ئاشوورییەکان لە تێکستە مێخییەکانیان بەو میدییانەی کە نزیك بوون لە سنووری دەوڵەتی ئاشووری بە (مادای داننوتی madai- dannuti) واتە (مادە بەهێزەکان) ناو هێنراون، ئەو مادانەی کە دوور بوون لە سنووری دەوڵەتی ئاشووری پێیان دەوتن (madai- ruquti) کە بە واتای مادە دوورەکان دێت[١١].

زۆربەی هەرە زۆری بەڵگە شوێنەواری و مێژووییەکان دەریدەخەن کە میدییەکان سەرەتا لەشێوەی کۆمەڵ کۆمەڵ و رەوەندی بوونە، کە پیشەی زۆربەیان شوانکارەیی و کەمێکیشیان لە دەشتە بە پیتەکانی چیای زاگرۆس بە کشتوکاڵەوە خەریك بوون[١٢]، بەڵام دواتر بەشی هەرە زۆریان جێگیر بوون، هەروەك لە دەقە مێخییەکانی ئاشوورییەکاندا ئاماژەی پێوەکراوە، بەوەی ئەو میدییانەی کە لەسەر رێگا بازرگانییەکاندا نیشتەجێ بوون، بەتایبەتی ئەو رێگا بازرگانییانەی کە ئاشوورییەکان بەکاریان دەهێنا لە هاوردەکردنی بەردی بەنرخی وەك لازورد[١٣].

نووسراوە مێخییەکانی سەردەمی پاشا (شەمشی ئەدەدی پێنجەم – Shamshi- Adad V) (٨٢٣ – ٨١٠ پ.ز) ئاماژە بە بەردەوامبوونی هەڵمەتە سەربازییەکانی ئاشوورییەکان دەکات بۆ سەر ئەو هۆزە میدییانەی، کە لە ناوچەکانی بەشی باکوری دەریاچەی ورمێ نیشتەجێ ببوون[١٤]، ئەمەش لە هەڵمەتی سەربازیی سێیەمی خۆی بۆ سەر وڵاتی نائیری و میدییەکاندا ئاماژەی پێوە کراوە[١٥]. ئەم پاشایە لە نووسراوەکانیدا باس لە هێرشەکانی سوپای ئاشووری دەکات بۆ سەر چەند شارێکی میدییەکان، کە دەڵێت لە ترسی بەهێزیی سوپای ئاشوور، میدییەکان شارەکانیان چۆل کردو بۆ چیاکان هەڵاتن، هەروەها

دەڵێت لەم هەڵمەتەدا توانیم (٢٣٠٠) پیاوی میدی لە دانیشتوانی ناوچە میدییەکان رابگوێزمەوە و ١٤٠ سەربازی میدییەکان بە تەواوی چەك و کەلوپەلی سەربازی و شتومەکەوە دەستبەسەر بکەم و رایان بگوێزمەوە بۆ وڵاتی ئاشوور. شەمشی ئەدەدی پێنجەم لە نووسینەکانیدا باس لە شاری پاشایانەی میدییەکان دەکات و دەڵێت ناوی (ساگبیتۆ – Sagbitu) بووە، هەروەها باس لە ناوی (خاناسیرۆکا – ḫa-na-ṣi-ru-ka) دەکات، کە رەنگە ناوی شارێکی مادەکان بێت[١٦]، کە دەڵێت شاری پاشایانەی میدییەکان (ساگبیتۆ) و لەگەڵ نزیکەی ١٢٠٠ شارو شارۆچکەی تر هێرشم کردۆتە سەر و کاولم کردووە و ئاگرم تێبەرداون [١٧].

ئەمەی خوارەوەش دەقی ئەو تێکستە مێخییەیە کە باس لە هەڵمەتی شەمشی ئەدەدی پێنجەم دەکات بۆ سەر وڵاتی مادەکان[١٨]:

ú-še-ziz a-na $^{KUR}$ma-ta-a-a lu a-lik
TA pa-an GIŠ-TUKUL.MEŠ aš-šur ez-zu-te-te u e-peš
MÈ-ia dan-ni šá mu-né-eḫ-ḫa la I-šú-ú
ip-la-ḫu-ma URU.MEŠ-šu-nu ú-maš-še-ru
a-na KUR-e mar-ṣi e-lu-ú EGIR-šú-nu
ar-ti-di 2 LIM 3 ME GAZ.MEŠ šá ḫa-na-ṣi-ru-ka
KUR ma-ta-a-a GAZ-uk 1 ME 40 pit-ḫa-la-šu
lu e-kim-šú NÍG.GA-šú a-na la ma-ni
ú-ter-ra URU sag-bi-ta URU MAN-ti a-di
1 LIM 2 ME URU.MEŠ-šú ap-pùl aq-qur i-na IZI GÍBIL-up

مانا گشتییەکەی :

(من هێرشم کردە سەر زەوی مادەکان، کە زۆر ترسان لە رووبەڕووبوونەوەی چەکە قورسەکانی وڵاتی ئاشوور و سوپا بەهێزەکەی من، کە هیچ رکابەرێکی نییە، ئەوان (مادەکان) شارەکانیان چۆل کرد و بەرەو چیا سەختەکان هەڵکشان و منیش بەدوایان کەوتم، وە ٢٣٠٠ سەربازم لە خانیسرۆکا لێ کوشتن، هەروەها ١٤٠ سەربازم لێ گرتن لەگەڵ تەواوی کەلوپەلەکانیان و دوورم خستنەوە (لە وڵاتی ماد)، من (شەمشی ئەدەدی پێنجەم) هەڵسام بە کاولکردن و سووتاندنی شاری ساگبیتا کە شاری پاشایانەی مادەکان بوو، لەگەڵ ١٢٠٠ شاری تری مادەکان کە کاولم کردن و سووتاندمن)[١٩].

لێـرەدا نـاتوانین کـاولکردنی ئـەو ژمـارە زۆرەی نشـینگەی میدییـەکان لـەو ناوچـانە بەشـێوەیەکی دوور لـە راسـتی لـە قەڵـەم بـدەین، ئەمـەش چـونکە ئاشوورییەکان هەمان ناویان بـەکارهێناوە بـۆ شـار و بـۆ شارۆچـکە. واتـە وشـەی "ālu" لە لایەن ئاشوورییەکان مانای (شار، شارۆچکە، لادێ) دەدات[٢٠].

شەمشی ئەدەدی پێنجەم لە تەواوکەری دەقـە مێخییەکـەی پێشـوودا ئامـاژە بـەوە دەکـات، کـە مادەکـان ویسـتوویانە تۆڵـەی خۆیـان لـە سـوپای ئاشـووری بکەنـەوە، لەبـەر ئـەو کارەسـاتەی کـە ئاشـوورییەکان تووشـی وڵاتـی مادەکانیـان کردووە، هەر بۆیەش کاتێك سوپای ئاشوورییەکان لـەڕێگای گەڕانـەوەدا بـووە بـۆ وڵاتـــی ئاشـــوور، یـــەکێك لـــە میرەکـــانی مادەکـــان بـــەناوی (مونیرســـوارتا – Munerswarta) کە حاکمی هـەرێمی (ئارازیـاش – Araziaš) بـوو رێـی لـە سـوپای ئاشـووری گـرت، لەئەنجامـدا شـەڕێکی خوێنـاوی لـە نێوانیانـدا روویـداوە، بـەڵام دووبـارە میدییـەکان لـەم شەڕەشـدا شـکان، کـە تیایـدا شەمشـی ئـەدەد دەڵێـت، نزیکەی ١٠٧٠ جەنگاوەرم لێ کوشتن و دۆڵ و کەندەکانی نێوان چیاکەم پڕ کرد لە لاشـــەی مـــردووی ســـەربازانی مـــاد، پاشـــان ژمارەیـــەکی زۆر لـــە منداڵـــەکانیان، کچەکانیان، سەروەت و سـامانیان، مـەڕومالاتیانم لـێ بـەتالان بـردن و پاشمـاوەی شارەکەشیانم سووتاند و کاولم کرد[٢١]. ئەمەش دەقی نووسراوە مێخییەکەیە.

ina ta-a-a-ar-ti-a KUR-e $NA_4$ mu-si BAL-at
$^{m}$mu-nir-su-ar-ta $^{KUR}$A-ra-zi-áš-a-a a-di
1 LIM 70 mun-daḫ-ḫi-ṣi-šu ina
GIŠ.TUKUL.MEŠ ú-šam-qit
ADDA.MEŠ-šú-nu ḫur-ri na-at-ba-ki šá KUR-e-lu-ú
ú-mal-li DUMU.MEŠ-šú-nu
DUMU.MUNUS.MEŠ-šú-nu NÍG.GA-šú-nu
NÍG.ŠU-šú-nu $GU_4$-MEŠ-šú-nu UDU ṣe-ni-šú-nu um-ma-na-at
KUR-ia ma-da-ta lu im-šú-ʾa URU.MEŠ-šú-nu ap-pùl
aq-qur ina IZI GÍBIL-up ina $u_4$-mi-šú-ma ma-datû

مانای گشتی:

(لـــەکاتی گەڕانـــەوەم بـــە چـــیای موســـوی شـــاخاوی تێپـــەڕیم، تووشـــی مونیرسوارتای حاکمی هەرێمی ئارازیاش بووم، هەزار و حەفتا (١٠٧٠) جەنگاوەرم

لێ کوشتن، دۆل و تەنگەبەرەکانی چیاکەم پڕکرد لە تەرمی جەنگاوەرەکانی، پاشان دەستم گرت بەسەر سەروەت و سامانەکانی و منداڵەکان، کچەکان، کەلوپەلەکان، شتومەکەکان، رەشە وڵاخەکان، مەڕوماڵاتەکان، هەموویانم تاڵان کرد و بردم و پاشان شارەکەم وێران کرد و ئاگرم تێبەردا)[٢٢].

بەهەمان شێوە پاشا ئەدەد نیراری سێیەم (٨٠٩–٧٨٢پ.ز) کوڕی شەمشی ئەدەدی پێنجەم، باسی چەند هەڵمەتێکی سەربازی دەکات کە بۆ سەر میدییەکانی ناوچەکانی نێوان هەمەدان و قەزوین و دەریاچەی ورمێ ئەنجامی داون[٢٣]، بەڵام راستییەکەی ئەم کردەوە سەربازییانەی ئەدەد نیراری سێیەم بەم شێوەیە نییە، کە خۆی باسی کردووە، بەڵکو تەنها بۆ پاراستنی سنوورەکانی دەوڵەتی ئاشووری بووە لە بەشی باکوور و باکووری رۆژهەڵاتییەوە[٢٤]. ئەمەش چونکە وڵاتی ئاشوور لەماوەی فەرمانڕەوایی ئەم پاشایەدا تووشی کێشەی ناوەخۆیی ببوو، کە چەند شارێك یاخی ببوون، لەوانە شارەکانی وەك ئاشوور، نەینەوا، هەولێر، کەرکوك، کە دوای چوار ساڵ ئینجا توانی دووبارە ئەم راپەڕینانە کپ بکاتەوە و ئەنجامدەرانی بەسزا بگەیەنێت[٢٥]. هەروەها یەکێك لە هێرشەکانی پاشا تەجلات بلێزەری سێیەم (توکلتی – ئەپەل – ئێشار -Tukilti Apal-ešar)، کە تیایدا لە ساڵی (٧٣٧ پ.ز) هێرشی کردۆتە سەر ناوچەی میدییەکان و نزیکەی ٦٥٠٠٠ هەزار میدی بەدیل گرتووە و رایگواستوونەتەوە و هێناونی لە ناوچەی دیالە نیشتەجێی کردوون[٢٦]. شایانی باسە تەجلات بلێزەر لە تێکستە مێخییەکانیدا دەڵێت هێرشم کردۆتە سەر میدییە بەهێزەکان ئەمەش رەنگدانەوەی خۆی هەیە بەسەر بوونی دەسەڵاتی بەهێزی میدییەکان لە ناوچەکانی خۆیاندا لە کوردستان.

هەروەها دەڵێت: (من نوێنەری ئاشوورم بۆ خاکی میدییە بەهێزەکان ناردووە بۆ ئەوەی چاودێر بن)[٢٧].

تەجلات بلێزەری سێیەم ژمارەیەك لە شارە گەورەو گرنگەکانی میدییەکانی رووخاندووە و ئاگری تێبەرداوە کە بەتایبەتی ئەو شارانەی کە کەوتبوونە دەشتاییەکانی (شیرکاری – Shirkari) و (نەیشیان – Naishian) کە ئەم دەشتاییانەش زۆر بەناوبانگ بوونە لە بەخێوکردن و پەروەردەکردنی ئەسپ

و رەشەولاخ[٢٨]. بەم جۆرەش پاشا تـەجلات بلێـزەری یەکـەم توانیویـەتی گشـت زەوییەکانی میدییـەکان بخاتـە ژێـر رکیفـی خۆیـەوە[٢٩]. هێرشـە کاولکارییـە یـەك بـەدوای یەکـەکانی ئاشـوورییەکان هۆکـارێکی سـەرەکی بـوو بـۆ یـەکگرتنی هـۆزە میدییــەکان و پشــت بــەخۆ ببەســتن و بــەرگری لــە شــارەکانیان بکــەن، کــە بەناوبانگترینیان شاری (ئەکبەتانا– Akbatana) (هەمەدانی ئێستا) بوو، کە دواتـر کرا بەپایتەخی دەوڵەتی میدییەکان، ئەمە سەرەڕای بوونی هەندێك شاری تر کە لە رووی ئابوورییەوە گرنگیی تایبەت بەخۆیان هـەبوو وەك شـارەکانی (حەسـەن لـو، زیویێ)[٣٠].

لــە لایــەکی تــرەوە رووســای پاشــای مەملەکــەتی ئــۆرارتی کــە دژ بــە ئاشوورییەکان بەردەوام لە جەنگدا بوون، بووە هاوپەیمانێکی چاك بـۆ میدییـەکان لەسـەر زەوییــەکانی ئێـران لـەدژی ئاشـوورییەکان[٣١]، میدییــەکان وەك هێزێکـی کاریگەر لە سەر خاکی ئێران و هاوپەیمانی دەوڵەتی ئۆرارتی دەرکەوتن.

یـەکێك لـە گـەورەترین و بـەهێزترین هاوپــەیمانی ئۆرارتییـەکان بریتییـە لـە هاوپەیمانیەتی هـۆزە ئارییاییـەکانی ئێـران، کـە بـە سـەرکردایەتی سـەرۆك هـۆزی میدییەکان (دیاکۆ – Diakko)بوو[٣٢]، کـە لـە ئاڤێسـتا بـە (کـاڤی – kavi) نـاوی هـاتووە [٣٣]، بـەڵام لای هیرۆدۆتـس بـە (دایۆسـیس – Dioces) نـاوی هـاتووە[٣٤]، بەڵام لە سەرچاوە فارسییەکاندا بە (کەی قوبـاد – kay qubad) نـاوی دەبـەن[٣٥]. بەم جۆرە دیاکۆ وەك سەرۆك هۆزی میدییەکان توانی سـەرکردایەتی چـەندین لقـە هۆزێکی تری ئاریایی بکـات وەك (بووسـایی – Busae)، (پارتسـینی – Partseni)، (ستراکاتیس –Strachates)، (ئاریزانتـای –Arizantai )، (مـاگی –Magi)، کـە بـە یەکگرتنی ئەم هۆزانە لە ژێر دەسەڵاتی سەرۆك هۆزی میدییـەکان دیـاکۆ دەوڵـەتی میـدیا پێکهـات[٣٦]. دیـاکۆ وەك پاشـای دەوڵـەتی میـدی لـە سـاڵی (٧٤٥ پ.ز) فەرمانڕەوایی کردووە و هاوپەیمانی رووسای پاشای دەوڵەتی ئۆرارتی بووە دژ بـە دەوڵــەتی ئاشــووری[٣٧]، دیــاکۆ شــاری ئەکبــەتانا –akbatana) (بــە واتــای: بەیەکگەیشتنی رێگاکان)ی کردە پایتەختی دەوڵـەتی مـاد[٣٨]. ئـەو شـارە بـەر لـە چەرخی میدی ناوی (کیشیسسـۆ – kišissu) بـوو[٣٩]، بـەڵام مێژوونووسـی یۆنـانی هیرۆدۆتـس بـە (دیۆسـیس – Deioces) نـاوی هێنـاوە[٤٠]، بـەڵام لـە سەرچـاوە

مێخییەکاندا بە (بیت دیاکۆ — bit diaku) هاتووە، کە بەواتای (ماڵی دیاکۆ) دێت[٤١]، ئەمەش ئەوە پشتڕاست دەکاتەوە کە دیاکۆ دامەزرێنەری دەوڵەتی میدییەکان بووە. دامەزراندنی ئەم دەوڵەتەش هاوکات بوو لەگەڵ کۆتایی ماوەی فەرمانڕەوایی تێگلات بلێزەری سێیەم و سەرەتای فەرمانڕەوایی شەڵمەنصەری پێنجەم (شولمانۆ– ئەشەریدۆ)، لەو ماوەیەشدا بارودۆخی وڵاتی ئاشوور ناجێگیر بوو[٤٢]. ئەمەش یارمەتیدەر بوو بۆ ئەوەی میدییەکان بە سەرکردایەتی دیاکۆ لەگەڵ هۆزە ئێرانییەکانی تر یەکبگرن و سوپایەکی بەهێز دروست بکەن و وەك هێزێکی گەورە لە ناوچەکانی رۆژهەڵاتی وڵاتی ئاشوور دەربکەون. دەوڵەتی میدی وەك بەربەستێك وابوو لەنێوان هەردوو دەوڵەتی ئۆرارتی و ئاشوورییەکان، بەڵام هاوپەیمانی ئۆرارتۆ بوو. پاشا دیاکۆ بەردەوام هەوڵیدەدا فراوانخوازی ئەنجامبدات و پێگەی خۆی بەهێز بکات لەسەر حیسابی دەوڵەتی ئاشووری مەملەکەتی ماننا کە سەر بە قەڵەمڕەوی ئاشوورییەکان بوو.

لە دەقە مێخییەکانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە گشت میدییەکان لە ژێر کۆنترۆڵی دیاکۆ نەبوونە، ئەمەش بە روونی لە دەقە مێخییەکانی سەردەمی پاشا سەرجۆنی ئاشووری (٧٢١–٧٠٥ پ.ز) رەنگ دەداتەوە، کە تیایدا ئاماژە بەچەند حاکمێکی ماد دەکات، کە هاوپەیمانی مەملەکەتی ئۆرارتۆ بوونە و دژایەتی دەوڵەتی ئاشوورییان کردووە. لەوانە لە ساڵی (٧١٩ پ.ز) رووسای ئۆرارتی هاوپەیمانییەتێکی لەگەڵ دوو شاری میدی بەستووە بەناوەکانی (سوککا، بالا) و لەگەڵ هۆزەکانی زیکرتۆ و ناوچەی تابال و کرکەمیش، ئامانج لەو هاوپەیمانەتییە دژایەتیکردنی مەملەکەتی ئاشووری بوو[٤٣]. هەر لەبەر ئەمەش سەرجۆنی ئاشووری لە ساڵی سێیەمی فەرمانڕەوایی خۆیدا (٧١٨ پ.ز) هەڵمەتێکی سەربازی بۆ ناوچەکانی ئەم هاوپەیمانەتییە بەڕێوەبرد، لە ئەنجامدا توانی هاوپەیمانەتییەکە تێك بشکێنێت و هەردوو شاری میدی سوککا و بالا خاپوور بکات[٤٤].

هەروەها لە ساڵی ٧١٦ پ.ز دووبارە هەریەکە لە رووسای — Rusa) ئۆرارتی و (میتاتی — Mitatti) حاکمی زیکرتۆ و (باگدادی– Bagdadi) حاکمێکی میدی هاوپەیمانییەکیان دژ بە دەوڵەتی ئاشووری بەستا، لە سەرەتادا توانییان دەست بخەنە ناو مەملەکەتی مانیی هاوپەیمانی ئاشوورییەکان، سەرەنجام توانییان (ئازا

AZA–)ی حاکمی مەملەکەتی مانای هاوپەیمانی ئاشوورییەکان بگرن و بیکوژن و لەسەر چیای (وائوش – Uauš)[٤٥] فرێی بدەنە خوارەوە. هەر بۆیەش سەرجۆنی ئاشووری ئەم کارەی بە دژایەتیکردنی خۆی لە قەڵەم دا و بۆ ئەم مەبەستەش هەڵمەتێکی سەربازی بۆ ناوچەکە برد و توانی بەسەر ئەم کێشانەدا زاڵ بێت و ئەم هاوپەیمانەتییە تێك بشکێنێت و باگدادی حاکمی میدی بگرێت و لەسەر چیای وائوش پێستەکەی لێبکاتەوە، وەك تۆڵەیەك بۆ ئازای حاکمی مەملەکەتی مانا [٤٦].
دواتر سەرجۆنی ئاشووری برای ئازا کە ناوی (ئوللوسونو – Ullusunu) بوو کرد بە حاکمی مەملەکەتی مانا، بەڵام ئەمەیان هەر پاش ماوەیەکی کەم دەستی کرد بە دژایەتیکردنی دەوڵەتی ئاشووری و هاوپەیمانیەتی لەگەڵ هەریەکە لە رووسای ئۆرارتی و (ئاشوور– لیئو Aššur- le'u) حاکمی هەرێمی (کاراللا –Karalla) و (ئیتتی – Itti) حاکمی هەرێمی (ئاللابریا – Allabria) بەستا، هەر بۆیە پاشا سەرجۆنی ئاشووری هەڵمەتێکی سەربازی دژ بەم هاوپەیمانەتییە کرد، کە تیایدا بەم جۆرە لە تێکستە مێخییەکاندا ئاماژەی بەم هەڵمەتە سەربازییە کردووە:
((..... ئوللوسونو متمانەی دا بە رووسای ئورارتۆ، ئاشوور– لیئو حاکمی هەرێمی کاراللا، (ئیتتی حاکمی هەرێمی ئاللابریا، کە وەك بەکرێگیراوێکی سەر بە ئۆرارتۆ مامەڵەی کرد، هەربۆیە من بە تووڕەیی وەك هەورە تریشقە هێرشم کردە سەر ئەو هەرێمانە و توانیم دەست بگرم بەسەر (ئیزیرتۆ – Izirtu)ی شاری پاشایەتیماننییەکان و ئاگرم تێبەردا، پاشان دەستم گرت بەسەر هەریەکە لە شارەکانی هەرێمی (زیبیا – Zibia) و (ئارمەید – Armaid)، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئوللوسونو و خەڵکەکەی هەموویان وەك یەك پیاو بەیەك دەستە بێنە لام و قاچم ماچ بکەن و داوای لێخۆشبوونم لێبکەن، منیش بەزەییم پیا هاتنەوە و لێیان خۆش بووم و دووبارە ئوللوسونوم لەسەر تەختی دەسەلات دانایەوە. بەڵام (ئیتتی – Itti) حاکمی هەرێمی ئاللابریا خۆی و خێزانەکەیم دەستبەسەر کردن. ئاشوور– لیئو حاکمی هەرێمی کاراللا..... (تێکستەکە شکاوە ).... هەروەها شارەکانی (گانو – Ganu)....... (تێکستەکە شکاوە )...... دەستم گرت بەسەر شاری (نیکساما –Niksama) بوو و وە حاکمی ئەو شارەش کە ناوی (شیپا– شەرری – Šipa-šarri) دەستگیرم کرد....... (تێکستەکە شکاوە )...... شاری

(شورگادیا – Šurgadia)م خستە ناو دەستەکانی خۆم. گشت ئەو شارانەم لە رووی بەڕێوەبردنەوە خستە سەر هەرێمی (پارسواش – Parsuaš). بێل – شار – ئوصەر / Bēl-šar-uṣar) لە شاری (کیسیشیم – Kisišim) دەستگیرکرد و خۆیی و کەلوپەلە گرانبەهاکانی کۆشکەکەیم گواستەوە بۆ ئاشووری پایتەخت. وە فەرمانبەری خۆم لەشوێنی ئەو کرد بەحاکم بۆ بەڕێوەبردنی شارەکە و ناوی شارەکەشم گۆڕی بۆ (کار – ئورتا Kar-Urta)، وێنەی پاشایەتی خۆشم لە ناوی دانا. هەروەها زەوییەکانی (بێت –ساگبات Bīt- Sagbat) ، (بێت – خیرمامی Bīt-Ḫirmami)، (بێت – ئومارگی Bīt- Umargi) و هەریەکە لە شارەکانی (خارخوباربان Ḫarḫubarban)، (کیلام باتی Kilambati)، (ئارمانگو Armangu) دەستم بەسەرداگرتن و لەڕووی بەڕێوەبردنیشەوە خستنمە سەر (کار – ئورتا Kar-Urta)[٤٧].

پاشا رووسای ئۆرارتی لە ساڵی (٧١٥ پ.ز) بە هاوکاری دیاکۆی میدی هەڵمەتێکی سەربازی ئەنجامدا بۆ سەر مەملەکەتی ماننای هاوپەیمانی ئاشوورییەکان، لە ئەنجامدا توانی (٢٢) قەڵای مەملەکەتی مانا داگیر بکات، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی پاشا ئولوسونوی – Ulussunu)ی مانایی هانا بۆ سەرجۆنی ئاشووری ببات[٤٨]. هانا هێنانی ئوللوسونو پاشای مەملەکەتیماننا بۆ هاوپەیمانە ئاشوورییەکە بووە هۆی راکێشانی دەوڵەتی ئاشووری بۆ ئەنجامدانی هەڵمەتێکی سەربازی دژ بە دەوڵەتی میدی و دەوڵەتی ئۆرارتۆ، بۆ ئەم مەبەستە (شەڕڕۆکین– Šarru-qinu) (سەرجۆنی ئاشووری) لە ساڵی (٧١٨ پ.ز) هەڵمەتێکی سەربازیی فراوان بۆ سەر مەملەکەتی ئۆرارتۆ و مەملەکەتی میدییەکان برد، کە تیایدا ئاماژە بەوە دەکات کە پاشا سەرجۆنی ئاشووری توانیویەتی ئوللوسونوی هاوپەیمانی بگەڕێنێتەوە شوێنی خۆی و سوپای دەوڵەتی ئۆرارتۆ و میدی تێك بشکێنێت و ناوچە میدییەکانیش دەستبەسەردا بگرێت[٤٩]. سەرجۆنی ئاشووری دیاکۆی پاشای دەوڵەتی میدییەکان و بە لە یاسا دەرچوو ناو دەبات، لەو هەڵمەتەدا دیاکۆ لەگەڵ خانەوادە و خێزانەکەی دەستگیر دەکرێت و بۆ شاری حەماە لە سووریا[٥٠] دوور دەخرێتەوە، بەم جۆرەش دیاکۆ کۆتای پێ دێت، چونکە نازانرێت چارەنووسی چی بەسەر دێت لە دوای دوورخستنەوەی بۆ شاری حەماە.

زۆربەی هەرە زۆری ئەو هەڵمەتە سەربازییانەی سەرجۆنی ئاشووری ئەنجامی ئەدا بۆ سەر وڵاتی میدیا بوو، ئەمەش لەبەر زۆریی هەڵگەڕانەوەکان و یاخیبوون لە دژی دەسەڵاتی ئاشووری، کە حاکمە میدییەکان ئەنجامیان دەدا بە هاوکاری و پاڵپشتی دەوڵەتی ئۆرارتی. ئەمەش وایکرد کە سەرجۆنی ئاشووری سیاسەتی راگواستن بۆ سەر ناوچە میدییەکان ئەنجام بدات، نزیکەی (٣٠٠٠٠) سی هەزار جوولەکەی شاری سامیرە لە فەلەستین راگواستۆتەوە و بەسەر شارە میدییەکانی دابەشکردوون، ئەمەش هەروەك لە کتێبی تەورات ئاماژەی پێکراوە[٥١].

لە ساڵی حەوتەمی فەرمانڕەوایی سەرجۆنی ئاشووری چەند پێکدادانێك لە نێوان سوپای میدییەکان و ئۆرارتییەکان لەگەڵ سوپای مانناییەکان روویدا، هەر بۆیەش ئوللوسونو بەردەوام هانای بۆ لای سەرجۆنی ئاشووری دەهێنا بۆ بەهاناوەچوون و رزگارکردنی لە هێرشەکانی میدییەکان و ئۆرارتۆییەکان، ئەم کێشانە بوونە هۆکار بۆئەوەی سەرجۆنی ئاشووری پیلان دابڕێژێت بۆ هەڵمەتێکی سەربازیی فراوان بۆ سەر ناوچەکانی ئۆرارتۆ و میدییەکان، ئەم بیرۆکەیەش لە لایەن یەکێك لە راوێژکارانی پاشا سەرجۆنی ئاشووری پێشنیازکرا، ئەمەش دوای ئەوەی راپۆرتی هەواڵگرییەکان ئاماژەیان بە بوونی هەندێك کێشەی ناوخۆیی کردبوو لە توروشپای پایتەختی دەوڵەتی ئۆرارتۆ و ئامادەیی زۆرێك لە هۆزەکان بۆ پشتیوانیکردنیان لە سەرجۆنی ئاشووری[٥٢].

هەربۆیەش لە ساڵی (٧١٤ پ.ز) سەرجۆنی ئاشووری هەڵمەتێکی سەربازیی فراوان دەکات کە بە هەڵمەتی هەشتەم (چونکە لە ساڵی هەشتەمی فەرمانڕەوایی خۆی ئەنجامی داوە)، ناسراوە، کە تیایدا هێرش دەکاتە سەر زۆرێك لەناوچە میدییەکان و ناوچەکانی دەوڵەتی ئۆرارتۆ، کە رووداوەکانی ئەم هەڵمەتەی لە شێوەی راپۆرتێك نووسراوەتەوە بە نووسینی مێخی و پێشکەشی خواوەند ئاشوور کراوە (وێنە -١-)[٥٣]، هەروەك سەرجۆنی ئاشووری میدییەکان بە (میدییە بە هێزەکان / ma-da-a-a dan-nu-ti) ناو دەبات[٥٤]. هەروەها (uruma-da-a-a) ئاماژەیە بۆ وڵاتی ماد[٥٥].

گومانی تیانییە لەناوبردنی دیاکۆ نەبۆتە هۆی پەرتەوازەکردنی هۆزە میدییەکان و هۆزەکانی تری ئێران، بەڵکو جارێکی تر لەژێر فەرمانڕەوایی

(خشـاتریتای —xishathreta) ی کـوڕی دیـاکۆ خۆیـان ڕێکخسـتەوە، کـە لەلایـەن هیرۆدۆتس بە (فرائورتس — phraorts) ناوی هاتووە[٥٦].

هەروەها ناوی خشـاتریتا لـە نووسـراوەکانی پاشـا دارای ئـەخمینی لـە سـەر چیای بەهستوون هاتووە[٥٧]، ئەم پاشایە توانی گشت هۆزە میدییەکان یەك بخـات و سوپایەکی بەهێز دژی ئاشوورییەکان ڕێکبخات، هـەروەها تـوانی هاوپەیمانیـەتی لەگەڵ کیمیرییەکان[٥٨] و سکیسەکان[٥٩] دروست بکات دژ بە دەسـەڵاتی دەوڵـەتی ئاشووری[٦٠].

شایانی باسە یەکێك لە گرنگترین ئەو هۆکارانەی کە یارمـەتی خشـاتریتای دا بۆ دروستکردنی ئەم دەسەڵاتە بریتی بوو لە سەرقاڵبوونی دەوڵـەتی ئاشـووری لـە سەردەمی (سەنحاریب —dSīn-aḫē-eriba) بە کێشە ناوەخۆیی و کێشەکانی بابـل و عیلام ئەمەش بووە هۆی ئەوەی دەوڵەتی ئاشووری نەتوانێت وەك جاران هەڵمەتە سەربازییەکانی بۆ سەر ناوچەی میدییەکان ئەنجام بدات[٦١]. دەسەڵاتی میدییەکان بەردەوام بوو لە فراوانبوون و بەهێزبوون لە بەشەکانی ڕۆژهەڵاتی وڵاتی ئاشوور بە تایبـەتی دوای لاوازبـوونی دەوڵـەتی ئۆرارتـۆ لەلایـەك و پاڵپشـتی کردنـی هـۆزی پارسەکان بۆ میدییەکان کـە لـە بەشـەکانی باشـووری ڕۆژئـاوای ئێـران نیشـتەجێ ببوون[٦٢].

شـایانی باسـە سـین — ئـاخی — ڕیبـا لـە نووسـراوەکانی خـۆی، تایبـەت بـە هەڵمەتی دووەمی خۆی، کە بۆ سەر ناوچـەی کاشـییەکان و چـەندین ناوچـەی تـر ئاماژە بە مادەکـان دەکـات و کـە بـە (مـادە دوورەکـان) ناویـان دەبـات و دەڵێـت ئەوانم خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆم و سەریان بۆ پاشایەتیی من دانواندووە[٦٣].

بەهێزیی سـوپای میدییـەکان بـەهۆی لاوازبـوونی سـوپای ئاشـوورییەکان لـە بەشەکانی باکوری ڕۆژهەڵات بوو، ئەمەش چونکە لە سەردەمی پاشـا سـەنحاریب (سـین — ئـاخی — ئیریبـا) سـەرقاڵی جـەنگێکی خوێنـاوی بـوون لەگـەڵ بابـل و کلدانییەکان و عیلامییەکان، ناوچەکانی سووریا و فەلەستین ئەمـەش هـەروەك لـە نووسراوەکانی ئەم پاشایە خۆی دەردەکەوێت[٦٤]، لە ئەنجامی ئەم کێشانە (سـین — ئاخی — ئیریبا) لە سـاڵی ٦٨١ پ.ز لـە لایـەن کوڕەکـانی خـۆی کـوژرا و ئینجـا ئەسـەرحەدون (ئاشـوور — ئـاخی — ئیـدینا IdAššur - aḫē – iddina)[٦٥] دوای

تۆڵەسەندنەوەی خوێنی باوکی لە براکانی هاتە سەر تەختی دەسەلات (٦٨٠-٦٦٩ پ.ز)[٦٦].

سیاسەتی ئەسەرحەدون بە بەراورد لەگەڵ سیاسەتی سەنحاریبی باوکی تاڕادەیەکی باش پێچەوانە بوو، بۆیە هەوڵی دا ئەوەی باوکی وێرانی کردووە و لەناوی بردووە ئەو جارێکی تر بنیاتی بنێتەوە، بەتایبەت لە بەرامبەر شاری بابل[٦٧].

لەماوەی دەسەلاتی ئەسەرحەدون ژمارەیەك رووداوی مێژوویی زۆر گرنگ روویاندا کە کاریگەریی راستەوخۆیان هەبوو لەسەر ناوچەکانی رۆژهەلاتی کۆن بەگشتی و دەوڵەتی ئاشووری بە تایبەتی[٦٨]. لە گرنگترینی ئەو رووداوانە دووبارە دەرکەوتنەوەی میدییەکان بوو لەسەر مەیدانی سیاسی وەك هێزێکی باش لە بەشەکانی باکوری دەوڵەتی ئاشووری، پاشا ئاشوور - ئاخی -ئیدین هەوڵی دەدا میدییەکان بکات بە هاوپەیمانیی خۆی بۆ ئەوەی وەك بەربەستێك بێت لەنێوان خۆی و دەوڵەتی ئۆرارتۆ، هەروەها وەك هاوپەیمانێك لە دژی عیلامییەکان بەکاریان بهێنێت[٦٩]. هەر بۆیە لێرەدا دەبینین پاشای میدی خشاتریتای کوڕی دیاکۆ توانی هۆزە میدییەکان دووبارە کۆ بکاتەوە لەژێر رکێفی خۆی و سوود لەم دەرفەت و سیاسەتەی پاشا ئاشوور - ئاخی - ئیدین وەربگرێت بۆ بەهێزکردن و پتەوکردنی سوپای دەوڵەتی ماد[٧٠].

ئاشوور -ئاخی - ئیدین لە نووسراوەکانی ئاماژە بە هاناهێنانی سێ میری میدییەکان دەکات بەناوەکانی (ئۆپیس - Upes) گەورەی شاری (پارتاککو - Partakku)، (زاناسانا - Zanasana) گەورەی شاری (پارتوککا - Partukka)، (راماتایا - Ramataya) گەورەی شاری (ئورکازابانۆ -Urkazabanu)[٧١]، کە دەڵێت ئەمانە بە دەست و دیارییەوە هاتن بۆ لام لە شاری نەینەوا بۆ ئەوەی شارەکانیان بۆ بگەڕێنێتەوە لە چنگی کەسانێکی داگیرکەر. ئاشوور ئاخی ئیدین شارەکانی بۆ گەڕاندوونەتەوە بە یارمەتی سوپای ئاشووری لە بەرامبەریش سالانە باجیان بەسەر سەپاندوون بۆ ئەوەی بیدەن بە وڵاتی ئاشوور، کە تیایدا (ئاشوور - ئاخی - ئیدین) بەم شێوەی خوارەوە باسی دەکات[٧٢]:

((ئۆپیس – Upes) گەورەی شاری (پارتاککو – Partakku)، (زاناسانا – Zanasana) گەورەی شاری (پارتوککا – Partukka)، (راماتییا – Ramateia) گەورەی شاری (ئورکازابانۆ –Urkazabanu)، ئەو مادانەی کە وڵاتەکانیان زۆر دوورە، کە پاشایانی ئاشووری پێش خۆم (باوانی خۆم) هەرگیز داگیریان نەکردووە و پێیان نەخستۆتە سەر خاکەکەی، بەڵام ترسیان لە هێز و توانای خواوەند ئاشوور وای لێکردن کە ئەسپی بەهێز و بەردی لازورد و هەموو ئەو شتانەی کە لە چیاکانیاندا هەیە بیهێنن بۆ نەینەوای پایتەختم، پێیەکانیان ماچ کردم، وە بەهۆی چەند سەرۆکێکی تر کە دەستیان لەدژ بەرز کردوونەتەوە، لە من پاڕانەوە بۆ ئەوەی یارمەتییان بدەم و داوایان لێکردم هاوپەیمانیان بم و یارمەتییان بدەم، منیش ئەفسەران و حاکمی ئەو هەرێمانەی خۆم کە هاوسنووری شارەکانیانن لەگەڵیانم نارد، ئەوانیش (نوێنەرەکانی من) دانیشتوانەکەشیان بە ملکەچی هێنا بەر پێی حاکمەکانیان، باج و سەرانەی پاشایەتی خۆم ساڵانە بەسەریان سەپاند))[٧٣].

هەروەها ئاشوور –ئاخی –ئیدین لە نووسراوێکی خۆیدا باس لە هەڵمەتێکی سەربازی دەکات بۆ سەر زەوی (پاتوشەڕرا Patušarra)[٧٤] لە ناوەڕاستی زەوی میدییەکان لەلاپاڵی چیای بیکنی –Bikni)[٧٥]، ئەو زەوییەی کە هیچ کامێك لە پاشاکانی پێش خۆم پێی نەگەیشتوون، لەم هەڵمەتە سەربازییەی توانیویەتی (شیدیرپارنا -Šidirparna) و (ئیپاردۆ – Epardu) کە بە دەسەڵاتداری بەهێز ناویان دەبات و دەڵێت سەریان دانەنواندووە بۆ دەسەڵاتی من، بۆیە هەردووکیان لەگەڵ خەڵکەکەی ژێردەستەڵاتیان، ئەسپ سوارەکانیان، ڕەشە وڵاخەکانیان، مەڕ و ماڵاتیان، وشترەکانیانم هەموویانم وەك دەستکەوتی جەنگی ڕاگواستەوە بۆ وڵاتی ئاشوور[٧٦].

ئەمەش مانای ئەوە نییە کە میدییەکان هەموویان دژی دەسەڵاتی ئاشووری بوونە و بەردەوام لەگەڵیان لە شەڕدا بوونە. بەڵام جەربەزەیی و ئازایەتیی هۆزە میدییەکان وای کردووە کە پاشا ئاشوور –ئاخی –ئیدین هاوپەیمانیەتی لەگەڵ میدییەکان بکات.

هاوپەیمانیەتی میدییەكان لەگەڵ ئاشوور – ئاخی – ئیدین بووە هۆی بەهێزبوونی میدییەكان بەجۆرێك كە جێگای متمانە و باوەڕ و پشت پێ بەستنی پاشا ئاشوور – ئاخی – ئیدین بوون، ئەمەش لە بەشداربوونی میدییەكان لە ڕێوڕەسمی دیاریكردنی جێنشینانی پاشا ئاشوور – ئاخی –ئیدین ڕەنگ دەداتەوە، كە سێ ساڵ بەر لە مردنی خۆی لە شاری نەینەوا ئەنجامدرابوو، بەوەی كە (ئاشوور – بانی – ئەپلی $^{d}$Aššur-bani-apli) كرا بە پاشا لەسەر وڵاتی ئاشوور و (شەمش –شوم –ئوكین $^{d}$Šamaš-šum-ukin) كرا بە پاشا لەسەر وڵاتی بابل[٧٧].

لەم ڕێككەوتننامەیە میرێكی میدییەكان بەناوی (ڕاماتایا – Ramataia) حاكمی هەرێمی (ئوركازابانو – Urkazabanu)ی سەر بەدەوڵەتی میدی دەردەكەوێت. شایانی باسە ئەم میرە میدییەش لە ئاهەنگی دەستنیشانكردنی منداڵەكانی ئەسەرحەدون بۆ تەختی دەسەڵات (ئاشووربانی ئەپلی، شەمش شووم ئۆكین) ئامادەبوو، كە لەساڵی ٦٧٢ پ.ز لە شاری نەینەوا مۆركراوە [٧٨].

شایانی باسە ئەم پەیماننامەیە لە ساڵی ٦٧٢پ.ز بەستراوە كە تیایدا هاتووە:

((ئاشوور – ئاخی – ئیدین پاشای جیهان پاشای وڵاتی ئاشوور كوڕی سین –ئاخی – ریبا پاشای جیهان پاشای وڵاتی ئاشوور ئەو پەیماننامەیەكی كرد لەگەڵ ڕاماتایا حاكمی شاری ئوركازابانو، كوڕەكانی و نەوەكانی ڕاماتایا، لەگەڵ گشت خەڵكی ئوركازابانو، گشت ئەو پیاوانەی كە لەژێر فەرمانی ئەودان، بچووك و گەورە لە ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژئاوا گشت ئەوانەی ئاشوور –ئاخی – ئیدین پاشای وڵاتی ئاشوور فەرمان ڕەواییان دەكات.....))[٧٩]

پاشان دێتە سەر مەبەست لە ئەنجامدانی ئەو پەیماننامەیە كە تیایدا دەڵێت:

((ئاشوور – ئاخی – ئیدین پاشای وڵاتی ئاشوور لەبەرامبەر خواوەندەكانی زەوی و ئاسمان ئەو پەیماننامەیەی ئەنجامدا، لەپێناو دامەزراندنی ئاشوور –بانی –ئەپلی كوڕی گەورەتان ئاشوور – ئاخی – ئیدین پاشای وڵاتی ئاشوور وەك جێگرەوەی خۆی، كاتێك ئاشوور – ئاخی – ئیدین پاشای وڵاتی ئاشوور دەمرێت

ئەوا دەبێت ئاشوور – بانی – ئەپلی لە جێگەکەی لەسەر تەختی دەسەڵاتی ئاشوور دابنێن، بەپاشای خۆتان دەستنیشانی بکەن، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بکەن، دان بە شەرعیەتی دەسەڵاتەکەی دابنێن، لە هەموو شارو لادێکان بەرگری لێبکەن و دژایەتی نەکەن(٨٠).... هەروەها براکەی شەمش –شوم– ئۆکین دەبێتە پاشا لەسەر تەختی وڵاتی بابل...... لە کۆتایی پەیماننامەکەدا چەندین نەفرەت و نەعلەت و دوعای خراپ کراوە لە ئەگەری پابەند نەبوونی راماتایای میری میدی یان هەر کەسێکی تر کە ببێتە هۆی شکانی پەیماننامەکە(٨١)). (وێنە –٢–)

وادیارە راماتای میدی نەچۆتە ژێر رکێفی دەوڵەتەکەی خشاتریتای میدی، چونکە دەبینین پاشای میدی لە سەردەمی ئاشوور– ئاخی –ئیدین ویستی دەسەڵاتی خۆی فراوان بکات، بۆ ئەو مەبەستەش هێرشی کردە سەر شاری نەینەوا، چونکە خراپیی بارودۆخی ناوەخۆی دەوڵەتی ئاشووری بەهەل زانی بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، بەڵام خشاتریتا لە هێرشەکەی سەرکەوتوو نەبوو، چونکە ئاشوور– ئاخی –ئیدین توانی بەرپەرچی هێرشەکەی میدییەکان بداتەوە و تێکی بشکێنێت (٨٢). (وێنە ٣).

دوای ئەم رووداوانەش پەیوەندیی نێوان میدییەکان و ئاشوورییەکان بەرەو خراپی رۆیشت، بەجۆرێك کە ئاشوورییەکان زۆر لە تۆکمەیی و بەهێزبوونی رۆژ بەرۆژی دەوڵەتی میدی دەترسان، ئەمەش لە چەند تێکستێکی مێخی بە روونی دەردەکەوێت، کە تیایدا ئاماژە بەوە دەکات کە پاشا ئەسەرحەدون (ئاشوور – ئاخی – ئیدین mdaš-šur-ŠEŠ-SUM)زیاتر لە جارێك پرسیاری لە فالگرەوەکانی تایبەت بە خواوەند خۆر (خواوەند شەمش) کردووە لە ئەگەری سەرکەوتنی میدییەکان و هاوپەیمانەکانیان لە کیمرییەکان و مانییەکان لەکاتی هێرشیان بۆ سەر وڵاتی ئاشوور، کە ئەمەی خوارەوەش بەشێکی ئەم دەقە مێخییە (٨٣):

obv.

1- [dUTU EN GA]L-ú šá a-šal-lu-ka an-nam GI.NA a-pal-[an-ni]

2- [ mKa-áš-t]a-ri-ti EN-URU šá URU.kar-kaš-ši-i šá a-na mma-mi-ti-[ar-šú]

3- [EN-URU] ˹ šá ˺ LÚ.ma-da-a-a iš-pu-ru um-ma it-ti a-ḫa-meš niš-šá-kin it-ti

KUR[aš- šurKI ni-ik-kìr]

4- [$^{m}$ma-mi]-ti-ar-šú i-šem-mre-šú-ú ŠE.GA-šú-ú pa-ni-šú i-ban-[nu-u]
5- [i-n]a MU.AN.NA an-ni-ti it-[ti] $^{md}$aš-šur-ŠEŠ-SUM-na LUGAL [$^{KUR}$aš-šur$^{KI}$]
6- [i-na-ki-i-ri DINGIR-ut-ka GAL-ti [ZU-e]
7- [na-ka-a]-ra šá $^{m}$ma-mi-ti-ar-[šú] EN-URU šá LÚ.ma-da-[a-a]
8- [it-ti $^{md}$aš-šur-ŠEŠ-SUM-na LU]GAL $^{KUR}$aš- šur$^{KI}$ i-na SI[LIM-tim]

Rev.

1- [ lu-ú ZI.MEŠ lu-ú BAR. MEŠ -šal-ka $^{d}$UTU EN GAL-ú]
2- [Ki-i 1- $^{m}$ma-mi-ti-a]r-šú [EN-URU šá LÚ.ma-da-a-a] it-ti $^{m}$k[a-áš-ta-ri-ti]
3- [ EN-URU šá URU.kar]-kaš-ši-i [pi]-i-šú iš-šak-[ka-nu]
4- [ x x x it-ti-š]ú i-na-an-na pi-i-šú i-šá-[ka-nu]
5- [ it-ti $^{m}$]$^{d}$aš-šur-ŠEŠ-SUM-na LUGAL $^{KUR}$aš- šur$^{KI}$ i-na-ki-[ru]

**مانای دەقەکە:**

**دیوی پێشەوە:**

**[١- ئەی خواوەند شەمش، حاکمی مەزن، وەڵامی تەواو و ئەرێنیم بدەرەوە سەبارەت بەوەی کە پرسیارت لێ دەکەم.**

**٢-٣ / کاشتاریتۆ حاکمی شاری کارکاششی، بۆ مامیتیارشۆی حاکمی شاری میدییەکانی نووسیوە: بایەکبگرین و بەیەکەوە هێرش بکەینە سەر وڵاتی ئاشوور.**

**٤- ٦ / ئایا مامیتیارشۆ گوێی بۆ دەگرێت ؟ ئایا بەقسەی دەکات؟ تکایە ئەو وادەکات ؟ ئایا ئەو لەم ساڵە دەبێتە دوژمنی ئەسەرحەدون، پاشای وڵاتی ئاشوور؟ ئایا بەگەورەیی خوایەتی خۆت ئەمە دەزانیت ؟**

**٧-٨/ ئەگەر نەیارەکەم مامیتیارشۆ، حاکمی شاری میدییەکان، بەرامبەر ئەسەرحەدون پاشای وڵاتی ئاشوور، بڕیاری دەرکرد و کێشەکەی دووپات کردەوە......]**

**دیوی پشتەوەی تێکستەکە:**

[١- لێیان گەڕێ بابیبەنە دەرەوە و لەلایەك هەڵی بگرن.

٢-٣/ من پرسیارم لێکردی، ئەی خواوەند شەمش، ئەی خاوەن دەسەڵاتی گەورە، ئاخۆ مامیتیارشۆ حاکمی شاری میدییەکان، رێککەوت و لەگەڵ کاشتاریتۆ، حاکمی شاری کارکاششی.

٤- ٥ / ئاخۆ ئێستا ئەو دێت لەگەڵی رێکدەکەوێت، وە ئایا ئەو دەبێتە دوژمنی ئەسەرحەدون پاشای وڵاتی ئاشوور. ]

هەروەها ئاشوور – ئاخی – ئیدین پرسیار ئاراستەی خواوەند خۆر دەکات لە ئەگەری ئەنجامدانی هێرشێك بۆسەر ئاشوورییەکان لە لایەن پاشای میدییەکان خشاتریتا کە لە تێکستە مێخییەکان بە (مامیتیارشۆ – Mamitiaršu) ناسراوە و هاوپەیمانەکەی (کاشتاریتۆ–Kaštaritu) بەوەی کە کۆببنەوە و شەڕ بەرپابکەن دژ بە دەوڵەتی ئاشووری، هەروەها ئاشوور –ئاخی – ئیدین جارێکی تر پرسیاری لە خواوەند خۆر دەکات لە ئەگەری ناردنی سوپای ئاشوورییەکان بۆ ئەنجامدانی شەڕێك دژ بە میدییەکان و کیمرییەکان و هۆزە ئێرانییەکانی تر کە هەموویان کۆببوونەوە لەژێر دەسەڵاتی میدییەکان دژی ئاشوورییەکان. ئایا تاچەند سوپای ئاشوور خۆڕاگر دەبێت لە بەرامبەر یەکگرتنی هۆزە ئێرانییەکان بە سەرکردایەتی میدییەکان.

لەم پرسیارانەی ئاشوور – ئاخی – ئیدین ئاڕاستەی کاهنەکانی خواوەندی خۆری کردووە بۆ مەبەستی فالگرتنەوە و پێشبینیکردنی رووداوەکانی داهاتوو بەڵگەیە لەسەر ترس و دڵەڕاوکێی پاشا ئاشوور – ئاخی – ئیدین لە دەسەڵات و بەهێزیی سوپای دەوڵەتی میدییەکان(٨٤).

لەبەر ئەوە پاشا ئاشوور – ئاخی – ئیدین نەیویست خۆی بەشێوەیەکی راستەوخۆ بخاتە نێو شەڕێك کە ڕەنگە دەربازبوون تیایدا ئاسان نەبێت، هەر بۆیەش لەدوای سەرنەکەوتنی هێرشی خشاتریتا (فرائورتس) پاشای میدییەکان بۆ سەر نەینەوا دەستبەجێ ئاشوور – ئاخی – ئیدین هاوپەیمانییەکی لەگەڵ سکیسەکان بەست کە پێشتر هاوپەیمانیی میدییەکان بوون، ئەمەش لەبەرامبەر پێدانی ئاشوورییەکان بە چەند ناوچەیەك بۆ سکیسەکان لە بەشەکانی باکووری

ڕۆژهەڵاتی وڵاتی ئاشوور، بەم جۆرەش خشاتریتا لە ئەنجامی هەڵگەڕانەوەی سكیسەكان لەكاتی هێرشەكەی بۆ سەر شاری نەینەوا شكا و لە شەڕەكەدا كوژرا(٨٥).

دوای بێهێزبوونی سوپای دەوڵەتی میدیا لە ئەنجامی سەرنەكەوتنی لە داگیركردنی شاری نەینەوا، سكیسەكان ئەم هەلەیان قۆستەوە و هێرشیان كردە سەر دەوڵەتی میدییەكان و توانییان داگیری بكەن، بەمەش میدییەكان بۆ ماوەی (٢٨) ساڵ كەوتنە ژێر دەسەڵاتی سكیسەكان لە ماوەی (٦٥٣–٦٢٥ پ.ز)(٨٦).

كوڕی خشاتریتا كە ناوی كەی ئیخسار – kyaxsar بوو (هەروەك هیرۆدۆتس ئاماژەی پێكردووە)، بەڵام لە سەرچاوە كۆنەكانی پەهلەوی بەناوی (هۆڤاك شاترا – Hovak shatra)، هەروەك لە سەرچاوە بابلییەكان بە (ئوممە كیشتا – Ummakishta) ناوی هاتووە، شایانی باسە ناوی ئەم پاشایە كەی ئیخسار دواتر بووە بە نازناوێك بۆ پاشاكانی دەوڵەتی ساسانی كە گۆڕاوە بۆ كیسرا(٨٧).

كەی ئیخسار لە بارودۆخێكی ناڕووندا توانیویەتی خۆی لە ژێر دەستەڵاتی سكیسەكان دەرباز بكات، پاشان بووە بە هاوپەیمانیی پاشا (پرۆتۆسیاس – Protothyas)ی سكیسی(٨٨). هیرۆدۆتس ئاماژە بەوە دەكات كە كەی ئیخسار گشت سەركردەكانی هۆزە سیكیسی و كیمرییەكانی هاوپەیمانیان لەگەڵ سەركردەی چەندین هۆزی تر كە ئەوكات لە ئێران ئەژیان، ئەوانەی هەموویان بۆ كۆشكی خۆی لە شاری ئەكبەتانا داوەت كردووە، دوای ئەوەی هەموویان كەوتن و سەرخۆش بوون لەبەر زۆر خواردنەوەیان ئینجا فەرمانی كوشتنی هەموویانی دا، بەم جۆرەش پەرتەوازە بە هۆزەكان كرا و ئەو هێزەی جارانیان نەما، هەر بۆیەش كەی ئیخسار توانی جارێكی تر سەركردایەتیی میدییەكان بكات و خۆی وەك گەورەی گشت هۆزە ئێرانییەكان و ناوچەكانی ڕۆژهەڵاتی ئێران بناسێنێت(٨٩).

كەی ئیخسار گرنگییەكی تەواوی بە سیستەمی سوپا و بەهێزكردنی دا، شێوازی نوێی خستە ناو پێكهاتەكانی سوپاوە، وەك تیپی تیرهاوێژەكان، پیادەكان، ڕم هاوێژەكان، سوارچاكەكان، هەروەها جۆرە گالیسكەیەكی سەربازی داهێنا كە كاریگەرییەكی زۆری هەبوو لە سەركەوتنی میدییەكان لە شەڕەكانیاندا، بە جۆرێك كە ڕەنگدانەوەی خۆی هەبوو بەسەر ئەفسانە ئێرانییەكان(٩٠).

دوای ئـەوەی کـەی ئیخسـار تـوانی دەسـەڵاتی بەسـەر ئێـران بسـەپێنێت و بەشێك لە جەنگاوەرە سکیسە لێهاتووەکانیش بکاتە بەشێك لـە سـوپاکەی خـۆی، هەوڵەکانی بـۆ فراوانخـوازی لـە سـنوورەکانی دەوڵـەتی میـدی دەسـتی پێکـرد بـە تایبەتی بەرەو وڵاتی ئاشوور، ئەمـەش دوای ئـەوە دێـت کـە میدییـەکان بـوون بـە جێگرەوەی دەوڵەتی ئۆرارتۆ زۆربەی هەرە زۆری خاکی دەوڵەتی ئۆرارتۆ خرابووە سەر دەوڵەتی میدی[91].

دوای ئەمـە لـە سـاڵی ٦١٤ پ.ز کـەی ئیخسـار بـە سـوپایەکی زۆر تۆکمـە و ڕێکوپێکەوە بەرەو داگیرکردنی وڵاتـی ئاشـوور بەڕێکـەوت، سـەرەتا تـوانی شـاری (تەربیصۆ — Tarbiso) (ئێستا گوندی شەریف خانە کە (٥) کم دەکەوێتە بـاکوری ڕۆژئاوای شـاری نەینـەوا) داگـیر بکـەن[92]. کـە بەیـەکێك لـە مەڵبەنـدە ئـابووری و گارگێڕییە گرنگەکانی ئاشوورییەکان لە بەشی باکووری وڵاتەکەیان دادەنرا.

پاشان کەی ئیخسار بەرەو شاری ئاشـوور بەڕێکـەوت تـوانی لـە سـاڵی (٦١٤ پ.ز) داگیری بکات، بەشێك لە دانیشـتوانەکەی بکوژێـت و بەشـەکەی تـری بـەدیل گرت و گواستیەوە بۆ ئەکبەتانای پایتەختی دەوڵەتی ماد[93].

لە بەر ڕۆشنایی تێکستە مێخییەکانی تایبەت بە پاشای دەوڵەتی بابلی نـابۆ بولاصـەر (٦٢٧— ٦٠٥ پ.ز)، بۆمـان دەردەکـەوێت کـە ئـەم پاشـایە سـەرەتا بەشداری هێرشکردنە سەر وڵاتی ئاشـووری نـەکردووە لـەپاڵ میدییەکانـدا، بـەڵام دوای ئەوەی میدییەکان سەرکەوتوو بوون لە داگیرکردنی شاری ئاشوور ئـەوا نـابۆ بولاصـەر خێـرا خـۆی گەیاندۆتـە لای میدییـەکان و هاوپەیمانیـەتی لەگـەڵیان بەسـتووە، بـەپێی ئـەم هاوپەیمانیەتـەش کچـەزای پاشـای میـدی (ئـەمیتاس — Amytas) درا بە بە نەبوخەد نەسری کوڕی نابۆ بلاصەر[94]. شایەنی باسە یەکـەم هێرشـی هاوبەشـی میـدی و کلـدانی بـریتی بـوو بـۆ سـەر شـاری دور شـاررۆکین (خورساباد)[95].

زانیارییـەکانی نـاو دەقـە مێخییـەکان ئامـاژە بـەوە دەکـەن کـە لـە سـاڵی چواردەیەمی فەرمانڕەوایی نابۆ بولاصەر (واتە لە ساڵی ٦١٢ پ.ز) لە نزیك شاری نەینەوا هاوپەیمانیەتێکی تری بەستا لەگەڵ پاشا کەی ئیخسـاری میدییـەکان، کـە لە دەقە مێخییەکان ناوی پاشای میدییەکان بە (پاشای ئومان مانـدا) هـاتووە[96]،

وشەی (ئومـان – مانـدا / ummān- manda) وشـەیەکی ئەکەدییـە (زاری بـابلی) بـەمانای (گردبوونەوەیـەکی زۆر) (الجمـوع الغفـيرة) دێـت[٩٧]. بـەڵام لێـرە وەك نازناوێك بۆ پاشای میدی بەکار هاتووە[٩٨].

سوپای هاوپەیمانیەتی مـاد و بـابلی لـە رووبـاری دیجلـە پەڕینـەوە و بـەرەو شـاری نەینـەوا بەڕێکـەوت بـۆ مـاوەی سـێ مـانگ گـەمارۆی شـارەکەیان دا بـەڵام نەیانتوانی داگیری بکەن، لەبەر بەهێزیی بـەرگریکردنی ئاشـوورییەکان و تۆکمـەیی شووراکەی، بەڵام دواتر میدییەکان و بابلییەکان رووباری خۆسـەریان کـردەوە کـە یەکێکـە لـە لقـەکانی رووبـاری دیجلـە، بـووە هـۆی دروسـتبوونی لافـاو لـە شـاری نەینەوا، ئەمەش کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لە دروستبوونی کەلێن، کە بووە هۆی ئەوەی سوپای میدی و بابلییەکان لە مانگی ئابی ساڵی ٦١٢ پ.ز بتوانن بچنە نـاو شاری نەینەوا و پاشای ئاشـووری (سـین –شـار– ئوشـکن) بکـوژن و شـارەکەش تاڵان بکەن [٩٩].

لەدوای ئەو سەرکەوتنە مەزنە و دڵنیابوونی میدییەکان لە رووخـانی سـتوونی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری و بەجۆرێك کە جارێکی تر ناتوانێت ببێتە هـۆی ترسـناکی بۆ ئیمپراتۆریەتی میدییەکان ئەوە وایکرد پاشای میدی کەی ئیخسار بکشـێتەوە و ئەرکی ڕاوەدوونانی پاشماوەی سوپای ئاشوورییەکانی خستە ئەستۆی بابلییـەکان بە سەرکردایەتی نەبۆ بلاصەر[١٠٠].

شـایەنی باسـە پاشمـاوەی سـوپا و هێـزی ئاشـوورییەکان بەسـەرکردایەتی شازادەیەك بەناوی (ئاشوور ئۆبالت) لە شاری حەران جێگیر ببوون. ئەم پاشایەش داوای یارمەتی لە فیرعـەونی میسـر (نیخـۆی دووەم) کـرد (٦١٢–٥٩٥ پ.ز)، هـەر لەبەرئەمەش میدییەکان ناسراو بە ئومان ماندا لەگەڵ بابلییـەکان هێرشـیان کـردە سەر حەران و لەناویان برد و کۆتاییان بە ئاشوورییەکان هێنـا، بـەڵام بابلییـەکان بە سەرکردایەتی نابو – ئوخود – ئوصەری دووەم توانی لە شەڕی کـەرکمیش لـە ساڵی (٦١٠ پ.ز) بەرپەرچی سوپای میسر بداتەوە، کە بووە هۆی شکانی سـوپای میسـرییەکان و کۆتاییهـاتنی هاوپەیمانیـەتی سیاسـیی نێـوان میسـرییەکان و ئاشـوورییەکان لـە ناوچـەکانی رۆژهـەڵاتی خـواروو بـە شـێوەیەکی یـەکجارەکی، بەمەش لە ساڵی ٦٠٥ پ.ز کۆتایی بە دەوڵەتی ئاشووری دێت[١٠١].

سەرکەوتنی پاشا کەی ئیخسار لـە رووخانـدنی دەوڵـەتی ئاشـووری وای کـرد ئـەو جـارە روو بکاتـە ناوچـەکانی ئاسـیای بچـووك، ئەمـەش وای کـرد لەگـەڵ بەرژەوەندییەکانی مەملەکەتی لیدیا دژ بوەستێتەوە، هەربۆیەش شەڕ و پێکدادان لەنێوان میدییەکان و لیدییەکان سەری هەڵدا، کە میدییەکان بە سەرکردایەتی کەی ئیخسار بوو، لیدییەکانیش بە سەرکردایەتی ئالیاتس (Alyates) بوو. ئەم شەڕەش بۆ ماوەی پێنج ساڵ بەردەوام بوو کە تیایدا هیچ کامیان نەیانتوانی سەرکەوتنێکی یـەکجارەکی بەسـەر لایـەنی بەرامبـەردا بەدەسـت بهێنێـت[١٠٢]، ئەمـەش چـونکە لەسـاڵی (٥٨٥ پ.ز) شـەرێك لـەنێوان هـەردوولا روویـدا کـە بەشـەڕی رۆژگـیران نـاونراوە، چـونکە لـەم شـەڕەدا دیـاردەی رۆژگـیران روویـدا، ئەمـەش بـووە هـۆی ترسانی سـوپای هـەردوولا و بـە رووداوێکـی خـراپ و ترسـناکیان لێکدایـەوە، ئـەم رووداوی رۆژگیرانەش بووە هۆی ئەوەی کە هەردوو لایەن پەیماننامەیـەکی ئاشـتی لە نێـوان خۆیـان مـۆر بکـەن، کـە تیایـدا پاشـای هـەردوو لا لـە خـۆێنی یـەکتریان خـواردەوە[١٠٣]. دیمـەنی ئـەم رێککەوتننامەیـەش لـە هەڵکۆڵدروەکـەی قزقاپـان هەڵکۆڵـدراوە[١٠٤] (وێنـەی ٤). بـەپێی ئـەم پەیماننامەیـەش رووبـاری (خـالیس — Ḫalys (قزل یەرماقی ئێستا) کرا بە سـنووری نێـوان هـەردوو مەملەکـەتی میـدی و لیـدی[١٠٥]، شـایانی باسـە ئـەم رێککەوتنـە بـۆ ئـەوەی بـۆ ماوەیـەکی درێژخایـەن بـەردەوام بێـت، هاوسـەرگیرییەکی سیاسـی تیـا ئەنجامـدرا، بـەوەی (ئـارینیس — Arenes) کچی پاشای مەملەکـەتی لیـدیا درا بـە (ئەسـتیاگس —Astyages) کـوڕی پاشـای مەملەکـەتی میـدی[١٠٦]. بـەو جـۆرەش دەوڵـەتی میـدیا بـووە یـەکێك لـە ئیمپراتۆریەتـە بـەهێزەکانی ناوچـەی رۆژهـەڵاتی کـۆن لـە پـاڵ هەریەکـە لـە ئیمپراتۆریەتەکانی بابلی و میسری و لیدی. (وێنە ٤)

دوای مردنی پاشا کەی ئیخسـار، کـوڕی ئەسـتیاگس کـە نـاوی (ئاژدیهـاك — Azhidihak) کە بەیۆنانی بەمانای (ئەژدیها) دێت. بەڵام لـە زمـانی ئەکـەدی (زاری ئاشووری و بابلی) بە (ئیشتومیگۆ —ištumego) ناونراوە کـە بـەمانای (هاوێـژەری ڕم) دێـت[١٠٧]. هـەروەها لـە زاری ئاریـایی کـۆن بـە (ئاریشـتڤاگا — Arishtivaga) هاتووە کە بە مانای تیرهاوێژ دێت. ئەمـەش دوا پاشـای ئیمپراتۆریـەتی مادەکانـە کە دواتر دەسەڵات دەگوازرێتەوە بۆ ئەخمینییەکان[١٠٨].

کەی خەسرەو لە ساڵی ٥٨٥ پ.ز کۆچی دوایی کردووە، ئاستیاگس بوو بە جێگرەوەی باوکی[١٠٩]. بەڵگە مێژوویییەکان وا پیشان دەدەن کە ئاستیاگس کچێکی هەبوو بەناوی (ماندانی – Mandane) کە درابوو بە یەکێك لە میرەکانی هۆزی پارس (فارس) بەناوی قەمبیزی یەکەم لە ساڵی ٥٧٦ پ.ز، لەم هاوسەرگیرییەی ماندانی و قەمبیزی یەکەم پاشای ئەخمینیی بەناوبانگ (کۆرشی گەورە – Cyrus) لەدایك بووە، کە ئەمەیان دواتر توانی هەردوو ئیمپراتۆریەتی میدی و بابلی لەناو ببات[١١٠].

شایەنی باسە هۆکارەکانی لەناوچوون و رووخانی ئیمپراتۆریەتی مادەکان دەگەڕێتەوە بۆ چەندین هۆکار، لەوانە هۆکاری کۆمەڵایەتی کە تیایدا ئەستیاگس زیاتر گرنگی بە بوارەکانی رابواردن و خۆشگوزەرانی دەدا، ئەمەش چینی دەسەڵاتدار و میرەکانی گرتەوە و بەجۆرێك کە رابردووی پڕ لە جەربەزەیی و راهێنانە سەربازییە قورسەکانیان بیر چووبوەوە و هەر خەریکی رابواردنی شەوانە و ئاهەنگگێڕان بوون، ئەمەش ببووە هۆکارێك بۆ بێهێزبوون و بێ ئاگاییان لە داهاتووی ئیمپراتۆریەتەکەیان و کە دواتر بووە هۆی لەناوچوونیان[١١١].

لە رووی سیاسییەوە دەتوانین بڵێین پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی هەڵەی ئیمپراتۆریەتی مادەکان لەگەڵ هێزە سیاسییەکانی تری دەوروبەری رەنگدانەوەیەکی خراپی هەبوو بۆخۆی، بۆ نموونە لە سەرەتادا هاوپەیمانیەتی نێوان میدییەکان و بابلییەکان بە ئاراستەیەکی باش رۆیشت، بەوەی کە زۆربەی ناوچەکانی رۆژهەڵاتی کۆن لەنێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی میدی و بابلی دابەش کرا، بێجگە لە خاکی مەملەکەتی لیدیا، بەمەش زۆربەی ناوچەکانی بەشی رۆژهەڵات بوو بە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی میدییەکان، کەچی هەریەکە لە سوریا و فەلەستین و عیلام بوو بە بەشی ئیمپراتۆریەتی بابلییەکان (کلدییەکان). بەڵام نەبوخەد نەسر (نابۆ – ئوخود – ئۆصەری دووەم) کوڕی نابۆ بلاصەری پاشای بابل ترسی هەبوو لە بەهێزیی ئیمپراتۆریەتی میدییەکان هەر بۆیەش لە ترسی هێرشی لە ناکاوی میدییەکان بۆ سەر وڵاتی بابل شوورایەکی بەهێزی دروست کرد کە بە شوورای میدیا ناسراوە، ئەم شوورایە لە رووباری فورات لە لای کەناڵی سەقلاوی دەست پێدەکات و درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە شاری دورکوڕیکالزۆ

(عەقەرقووف ئێستا) بەردەوام دەبێت تا دەگاتە نزیك رووباری دیالا، پاشماوەی ئەم شوورایە تاکو ئێستاش ماوە لە بەشەکانی باکووری شاری بەلەد[١١٢].

وادیارە میدییەکان لە سەردەمی نابۆنائید (٥٥٦– ٥٣٩ پ.ز) کە دوا پاشای دەوڵەتی بابلی بوو هێرشیان کردە سەر ناوچەی حەران و پەرستگای خواوەندی مانگ (خواوەند سین)ی تاڵان کرد، ناوچەی حەران و پەرستگاکەی بەیەکێك لە پیرۆزترین ناوچەکان دادەنرا لە لایەن نابۆ نائید، ئەمەش لەبەر بوونی پەرستگای خواوەند سین کە پیرۆزییەکی زۆری هەبوو لە لایەن نابۆ نائید لەلایەك و دایکی پاشا نابۆ نائید گەورەی کاهنە ژنەکانی پەرستگای خواوەند سین بوو لە حەران لە لایەکی ترەوە. هەر بۆیەش ئەم هێرشەی میدییەکان بۆ سەر حەران بووە هۆی ئەوەی نابۆ نائید بچێت هاوپەیمانیەتی لەگەڵ فارسەکان ببەستێت کە وەك هێزێکی سیاسیی نوێ دژ بە میدییەکان سەریان هەڵدابوو[١١٣].

لە لایەکی ترەوە سەرهەڵدانی ناکۆکی لە نێوان ئەستیاگس پاشای میدییەکان و یەکێك لە سەرکردە بەهێزەکانی بەناوی (هێرپاکۆس – Herpakos) کە هیرۆدۆتس بە شێوەیەکی تاڕادەیەك ئەفسانەیی چیرۆکی ئەم ناکۆکییە دەگێڕێتەوە، بەوەی کە شەوێك پاشا ئەستیاگس خەونێك دەبینێت و بەوەی کە ماندانای کچی و مێردەکەی قەمبیز منداڵێکیان دەبیت، ئەو منداڵە دەبێتە گەورەی وڵاتی میدیا و فارس، هەر بۆیەش بڕیاریدا ئەو منداڵە بکوژرێت، بۆ ئەو مەبەستەش فەرمانی بە هێرپاکۆس کرد بچێت ئەو منداڵە ببات و بیکوژێت، بەڵام کاتێك هێرپاکۆس دەیبات بیکوژێت دڵی نەرم دەبێت و لە ئەنجام نایکوژێت و دەیدات بە خێزانێکی شوانکارە بۆ ئەوەی بە نهێنی بەخێوی بکات. بەڵام دوای (١٠) ساڵ ئەو منداڵە گەورە بوو، پاشا ئاستیاگس هەستی بەم شتە کرد، بۆیە دووبارە بانگی هێرپاکۆسی کرد و لێی پرسییەوە کە چارەنووسی ئەو منداڵە چی بەسەر هات کە فەرمانی پێکرد بیکوژێت، هیرپاکۆس راستییەکەی وەڵام دایەوە بەوەی کە نەیکوشتووە، هەر بۆیەش ئاستیاگس زۆر تووڕە دەبێت بۆیە فەرمانی دا کە هێرپاکۆس منداڵی خۆی بخوات وەك سزایەك بۆ ئەو کارەی. هەرچی کۆرش بوو چوو بۆ لای دایك و باوکی لە وڵاتی فارس[١١٤].

لـە راسـتیدا ئـەم رووداوانـەی کـە هیرۆدۆتـس باسـی دەکـات شـێوەیەکی ئەفسـانەیی بـەخۆی گرتـووە، تـا رادەیـەکی لـە چـیرۆکی شـانۆگەری تایبـەت بـە نووسـەری یۆنـانی بـەناوبانگ (سـۆفۆکلیس — Sophocles) دەچـێت (٤٩٥– ٤٠٦ پ.ز) کـە شـانۆگەرییەکە بەناونیشـانی (ئـۆدیس پاشـایە)، رەنگـە هیرۆدۆتـس ویستبێتی روخسارێکی ئەفسانەیی بدات بـە کەسـایەتی کۆرشـی دووەم (کۆرشـی گەورە) کە دواتر دەبێت بە گەورەی رۆژهـەڵاتی کـۆن. بـەڵام گۆمـانی تیانییـە کـە کۆرشی گەورە حاکم بووە لەسەر هەرێمی ئەنشان لەو کاتەی کە لە ژێر دەسەڵاتی میدییەکان بووە[115].

بـەڵام دوای هێرشـی میدییـەکان بـۆ سـەر حـەران و کـاولکردنی پەرسـتگای خواوەند سین لێکەوتەوە، کۆرشی گەورە ئەم هەلە بۆ خۆی ئەقۆسێتەوە و بۆ ئەو مەبەسـتە هاوپەیمانیـەتێك لەگـەڵ نـابۆ نائیـد پێکـدەهێنێت دژ بـە ئیمپراتۆریـەتی میدی و ئاستیاگسی پاشاکەی، کاتێـك ئاسـتیاگس هـەواڵی ئـەم هاوپەیمانەتییـەی کۆرش و نابۆ نائیدی بیست بڕیاری بانگهێشـتکردنی کۆرشـی کـرد بـۆ ئەکبـەتانای پایتەخت تا هۆکاری ئەم کارەی روون بکاتەوە، بەڵام کۆرش رەتی کردەوە بچێتە لای، ئەمەش بووە هۆی تووڕەبوونی ئەستیاگس، هەر بۆیە سـوپایەکی زۆری نـارد بـە سـەرکردایەتی هیرپـاکۆس بـۆ لـەناوبردنی یـاخیبووانی هـەرێمی ئەنشـان بـە سەرکردایەتی کۆرش، بەڵام کاتێك هێرپاکۆس گەیشتە مەیدانی شـەڕ رێـك ئـەویش بەخۆی و سوپاکەیەوە چوو بـۆ ریـزی کـۆرش و دژی ئاسـتیاگس وەسـتایەوە[116]، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئاسـتیاگس بـە سـەرکردایەتی خـۆی سـوپایەکی تـر ئامادە بکات دژ بە کۆرش و هیرپاکۆس لە ئەنجام شەڕێك روویدا و تیایـدا کۆرشـی گـەورە سـەرکەوت و ئاسـتیاگس بـە دیـل گـیرا[117]، بەمـەش لـە سـاڵی(٥٥٠ پ.ز) کـۆرش شـاری ئەکبەتانـەی بـە پایتـەختی دەوڵەتـە نوێکـەی خـۆی (دەوڵـەتی ئەخمینی) هەڵبژارد[118]، بەم جۆرەش کۆرشی گەورە توانی دەوڵـەتی میـدیا لـەناو ببات و خـۆی ببێتـە گـەورەی ئیمپراتۆریـەتێکی نـوێ، کـە بـەناوی ئیمپراتۆریـەتی ئەخمینی ناسراوە لە مێژوودا.



**وێنە –١–**

**نووسراوە مێخییەکەی سەرجۆنی ئاشووری دووەم کە باس لە هەڵمەتەکەی ساڵی هەشتەمی دەکات لەساڵی (٧١٤ پ.ز) بۆ سەر وڵاتی ئۆرارتۆ و ناوچە میدییەکان کە لەشێوەی راپۆرتێك پێشکەش بەخواوەند ئاشووری کردووە.**

بڕوانە:

Hamawandi, A.: Musasir in the Cuneiform sources, (Erbil:2012), Musasir Journal, p.177




وێنە -٢-

**پێشەکی دەقی ئەو نووسینە مێخییەی کە باس لە هاوپەیماننامەکەی راماتایای میدی لەگەڵ ئەسەرحەدون دەکات سەبارەت بە دیاریکردنی جێنشینانی پاشا ئەسەرحەدون.**

**بڕوانە:**

Wiseman D. J.: The Vassal treaties Esarhaddon, Iraq, vol.20, (Londaon:1957), Pl. 1



وێنە -٣-

دیمـــەنی تـــاڵانکردنی شـــاری (کیشاســـۆ - Kišassu)ی میدییـــەکان لـــە لایـــەن ئاشوورییەکانەوە.

بڕوانە:

Starr, I.: "Queries to the Sun go", (Hilsinki:1990),SAA, Vol. 4, p.49



**وێنە -٤-**

**نەخشە هەڵکۆڵدراوەکەی قزقاپان .**

**بڕوانە:**

http://www.lisa.gerda-henkel-stiftung.de/ im_land_ der_berge_ archaeologischer_ survey_im _irakischen_kurdistan




**وێنە —٥—**

نەخشەی ئیمپراتۆریەتی میدییەکان .

بڕوانە:

http://www.kurdistanica.com/?q=gallery&g2_itemId=144

## پەراوێز و سەرچاوەکان:

(1) خودادیان، ئەردەشیر: ئارییەکان و مادەکان، وەرگێڕانی: عەلا نوری بابە عەلی، (سلێمانی: ٢٠٠٣)، لا ١١٨.

(2) الأحمد، سامي سعيد و رضا جواد الهاشمي: تاريخ الشرق الأدنى القديم ايران والأناضول، بغداد: ١٩٨٥)، ص٨١.

(3) سەرفراز، عەلی اکبر، بەهمەن فەیروز مەندی: دێرینە ناسی و هونەر لە سەردەمە مێژووییەکانی دەوڵەتی ماد و هەخامەنشی، وەرگێڕانی: وریا قانع، (هەولێر: ٢٠٠٩)، بەرگی یەکەم، لا ٣٠-٣١.

(4) ئەلخەلیل، ئەحمەد مەحمود: مەملەکەتی ماد، وەرگێڕانی: حەمە سەعید کەلاری، (هەولێر: ٢٠١٣)، لا ٣٢.

(5) شولمانۆ- ئەشەریدۆ Shulmanu-asharidu: ئەمەش ناوی یەکێك لە پاشا ئاشوورییەکانە کە بە مانای (خواوەند شولمانۆ هەر خۆی یەکەمە) دێت، ئەم ناوە لە تەورات بە شلمنصر هاتووە هەر بۆیەش زۆرێك لە سەرچاوە بیانی و عەرەبییەکان ناوی شەلمانصەر بەکاردێنن بەڵام ئێمە هاتووین ناوە راستەقینەکەمان بەکارهێناوە وەك چۆن لە دەقە مێخییەکاندا هاتووە.

(6) محمد، فاتح عبدالله محمد: العلاقات السياسية والعسكرية بين الآشوريين والميديين خلال الفترة (٩١١-٦١٢ ق.م)، رسالة ماجستير غير منشورة، (جامعة السليمانية: ٢٠٠٨)، ص٣٣.

(7) سليم، أحمد أمين: دراسات في تاريخ الشرق الأدنى القديم مصر. العراق. ايران، (لبنان: ٢٠٠٩)، ص ٤٩٠.

(8) ساكز، هاي: قوة اشور، ترجمة: عامر سليمان (بغداد - ١٩٩٩)، ص ١٢٠.

(9) kurMa-da-a: لێرەدا بەمانای وڵاتی مادەکان دەگەیەنێت، چونکە وشەی (kur) وشەیەکی سۆمەرییە و وەك هیمای دیاریکەر (علامة دالة) بەکاردێت لەپێش ناوی وڵاتە بیانییەکان.

(10) Luckenbill, D.D.: Ancient records of Assyrian and Babylonia, (Chicago:1926), Vol. 1, p.206.

(11) احمد، جمال رشيد: ظهور الكورد في التأريخ، ج٣، (أربيل: ٢٠٠٥)، ص٢٤٤.

(12) بابان، شوکروڵا: مێژووی کورد و کوردستان، (هەولێر: ٢٠٠٤)، لا ٣٠-٣١.

(13) ساكز، هار: قوة آشور، ص١١٦.

(14) باقر، طه وآخرون: تأريخ ايران القديم، (بغداد: ١٩٨٠)، ص٣٨.

(١٥)Grayson, A. K.: Assyrian Rulers of the Early First Millennium BC II (858-745 BC.), (London:2002), p.181.

(١٦) Waters, M.: notes on the Medes and their "Empire" from JER 25:25 to HDT 1,134, (CDL press, 2011), p.244.

(١٧) Luckenbill,D.: Ancient records of Assyrian and Babylonia, Vol. 1, p.257.

(١٨) Grayson, A. K.: Assyrian Rulers of the Early First Millennium BC II (858-745 BC.), p.185.

(١٩) Ibid, p. 185-186.

(٢٠) ئاشوورییەکان وشەی (alu) بەکاردەهێنن بۆ شار و بۆ گوند (لادێ) واتە جیاوازییەك ناکەن لە ڕووی ناوەوە، هەربۆیەش بوونی ١٢٠٠ نشینگە (شار و گوند) شتێکی ئاساییە، بەڵام ئەگەر لێرەدا تەنها مەبەست ١٢٠٠ شار بێت ئەوە بێگومان شتێکی هەڵەیە و دوورە لە ڕاستی. بۆ زانیاری بڕوانە:

Gelb, J. & others: Chicago Assyrian Dictionary, (chicago:1964), vol. A1, p.379

(٢١) محمد، فاتح عبدالله محمد: العلاقات السياسية والعسكرية بين الآشوريين والميديين خلال الفترة (٩١١–٦١٢ ق.م)، ص٧٢.

(٢٢) Grayson, A. K.: Assyrian Rulers of the Early First Millennium BC II (858-745 BC.), p.186.

(٢٣) علي، عادل هاشم: الدولة الميدية، (٧٤٥–٥٥٠ ق.م)، مجلة دراسات ايرانية، عدد ١٣، ص٥١.

(٢٤) باقر، طه: المقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج١، (بغداد: ١٩٧٣)، ص٥٠٥.

(٢٥) نفس المصدر السابق: ص٥٠٤.

(٢٦) Luckenbill, D.D.: Ancient Records of Assyrian and Babylonia, Vol. 1, p.281

(٢٧) البرواري، ريبر جعفر أحمد: الحملات العسكرية الآشورية على كوردستان (٩١١–٦١٢ ق.م)، (أربيل: ٢٠١٢)، ص ١٣٤.

(٢٨) علي، عادل هاشم: الدولة الميدية، ص٥٢.

(٢٩) رافع، ساهر: تأريخ وحضارة ايران من عصور ماقبل التاريخ وحتى ٣٥٠م، (مصر: ٢٠١١)، ص٣١–٣٢.

(٣٠) سورخابی، عوبەید: مێژووی شوینەوارناسی ڕۆژهەڵاتی کۆن، لا١٩٧ بەدواوە.

(٣١) Hamawand, A. J.: Musasir in the Cunieform Sources, Musasir Journal, no. 1 (Erbil: 2013), p.183-184

(٣٢) باقر: المقدمة، ج٢، ص٣٩١.

(٣٣) علي: الدولة الميدية، ص٥٣.

(٣٤) احمد، جمال رشيد، فوزي رشيد: تأريخ الكوردِ القديم، (اربيل:١٩٩١)، ص١١٢ .

(٣٥) ئەلخەلیل: مەملەکەتی ماد، لا.٤٠.

(٣٦) دیاکۆنۆف، م.أ.: مێژووی ماد لە زنجیرەی مێژووی کامبریج، وەرگێڕانی:عوبەید سـورخایی، (هەولێر:٢٠١٣)، لا.٧٧–٨٠.

(٣٧) بابان، شوکرولا: مێژووی کورد و کوردستان، لا ٣٥.

(٣٨) Vallat, F.: Repertoire Geographique des Textes Cuneiformes, (Wiesbaden:1993), RGTC, Vol. 11, p. CXXXVII.

(٣٩) ئەلخەلیل: مەملەکەتی ماد، لا ٤٧.

(٤٠) باقر، طه: المقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج٢، (بغداد: ١٩٥٦)،ط٢، ص٣٩٢.

(٤١) لە زمانی ئەکەدی (زاری ئاشووری) وشەی (bit) بەمانای: مال، خانوو " دێت، لە سـەردەمی ئاشـووری زۆرێـك لـە شـارەکان بـەم شـێوازە نـاوبراون، ئەمـەش وەك ئاماژەیـەك بـۆ مـاڵی کەسەکە یان ماڵی پێگەی دەسەڵاتی. بۆیە (bit Diaku) واتە " ماڵی دیاکو ".

(٤٢) محمـد: العلاقـات السياسـية والعسـكرية بـين الآشـوريين والميـديين خـلال الفـترة (٩١١–٦١٢ ق.م)، ص٨٨.

(٤٣) قاسم، محمد علي: سرجون الآشوري،٧٢١–٧٠٥ ق.م، رسالة ماجستير غير منشورة، (جامعة بغداد: ١٩٨٣)، ص٨٠.

(٤٤) Luckenbill, D.D.: Ancient Records of Assyrian and Babylonia, Vol. 2, p.281, p.3.

(٤٥) چیای وائوش: یەکێکە لە چیا سەختەکانی زنجیرە چیای سـاهند کـە دەکەوێتـە رۆژهـەڵاتی دەریاچەی ورمێ. بڕوانە:

البرواري: الحملات العسكرية الآشورية على كوردستان (٩١١–٦١٢ ق.م)، ص ١٣٨

(٤٦) Luckenbill, D.D.: Ancient Records of Assyrian and Babylonia, Vol. 2, p. 5

(٤٧) Ibid, p. 5.

(٤٨) دیاکۆنۆف: میدیا، وەرگێڕانـی لـە فارسـییەوە بـۆ کـوردی: بورهـان قـانع، (هـەولێر:٢٠٠٨)، چاپی دووەم، لا ٢٦٧.

(٤٩) Dangin, T.: Huitieme Campagne de Sargon(714 av. J.-C.),(Paris: 1912), TCL 3 , p.8-9.

(٥٠) Luckenbill, D.D.: Ancient Records of Assyrian and Babylonia, Vol.2, p.6

(٥١) محمـد: العلاقـات السياسـية والعسـكرية بـين الآشـوريين والميـديين خـلال الفـترة (٩١١–٦١٢ ق.م)، ص٩٤–٩٥، هەروەها بڕوانە:

التـوراة: سـفر الملـوك الثـاني الاصـحاح ١٧: ٣-٦. لێـرەدا ئامـاژە بـەوەدەکات کـە شلمنصـری پێنجەم هێرشی کردبێتە سەر شاری سامرە و دانیشتوانەکەی ڕاگواستیتەوە، ڕاستییەکەی شلمنصری پێنجەم تەنها گەمارۆی شارەکەی دابوو کە ماوەی ٣ ساڵی خایاندبوو، بەڵام سەرجۆنی ئاشووری کە لەدوای شەلمنصری پێنجەم هات توانی شاری سامرە داگیر بکات و دانیشتوانەکەشی ڕابگوازێتەوە بۆ ناوچە مید نشینەکان.

(٥٢) ساكر، هاري: عظمة بابل، ترجمة: عامر سليمان، (بغداد: ١٩٧٩)، ص١٤٦.

(٥٣) بۆ تەواوی چیرۆکی هەڵمەتە سەربازییەکە بە دەقی مێخییەکە بڕوانە:

Dangin, T.: Huitieme Campagne de Sargon(714 av. J.-C.),(Paris: 1912), TCL 3 , , p. 2-81.

(٥٤) Ibid, p. 8.

(٥٥) Adali, S.: Ummān-manda and its Significance in the First Millennium B.C., (Sydney: 2009), p27.

(٥٦) علي: الدولة الميدية، ص٥٣.

(٥٧) Waters, M.: notes on the Medes and their "Empire" from JER 25:25 to HDT 1,134, (CDL press, 2011), p.244.

(٥٨) کیمیرییەکان – Kimmerians: ئەمانەش نەتەوەیەکن لە ناوچەکانی قەوقازەوە ڕوویان لە بەشێك لە ناوچەکانی کوردستانی کۆن کردووە، لە نیوەی یەکەمی هەزارەی یەکەمی پێش زاین، بۆ یەکەم جار لە نووسراوەکانی پاشا سەنحاریب ئاماژەیان پێکراوە. بڕوانە:

سليمان، عامر: "منطقة الموصل في النصف الاول من الالف الاول قبل الميلاد " في موسوعة الموصل الحضارية، المجلد الاول، (موصل:١٩٩١)، ص١٠١.

(٥٩) سکیسەکان Scythian: ئەمانەش لە ناوچەکانی قەوقاز لە باشووری ڕووسیا ڕوویان لە ناوچەکانی کوردستانی گەورە کردووە بە ماوەیەکی کەم لە دوای کیمیرییەکان، بۆ یەکەم جار لە نووسراوەکانی پاشا ئەسەرحەدون ئاماژەیان پێکراوە کە بە (ئەشکوزای) ناویان هاتووە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:

رو، جۆرج: العراق القديم، ترجمة و تعليق: حسين علوان حسين، (بغداد:١٩٨٤)، ص٤٣٥.

(٦٠) الشـمري، طالـب مـنعم حبيـب: سـنحاريب سـيرته ومنجزاتـه، (٧٠٤-٦٨١ ق.م)، رسـالة ماجستير غير منشورة، (جامعة بغداد: ١٩٨٦)، ص٣٠٨.

(٦١) علي: الدولة الميدية، ص٥٥.

(٦٢) الأحمد، سامي سعيد و رضا جواد الهاشمي: تأريخ الشرق الأدنى القديم ايران والأناضول، (بغداد: ١٩٨٥)، ص٨٩-٩٠.

(٦٣) Luckenbill, D.D.: Ancient Records of Assyrian and Babylonia, vol.2, p.118

(٦٤) Ibid, p. 115-159.

(٦٥) Radner. K. The Prosopography New – Assyrian Empire, Vol.1: part1, (Finland: 1998), P. 145-146.

(٦٦) القره داغي، رافدة عبدالله عبدالصمد: كوردستان العراق في التاريخ القديم في ضوء المصادر المسمارية من الالف الثالث ق.م حتى ٦١٢ ق.م، اطروحة دكتوراه غير منشورة، (جامعة السليمانية: ٢٠٠٨)، ص١٦٠.

(٦٧) الوردي، محمود فارس عثمان: الممالك في العراق القديم النشوء واسباب السقوط ٢١١٢–٦١٢ ق.م، اطروحة دكتوراه غير منشورة، (جامعة الموصل: ٢٠١١)، ص ١٦٨.

(٦٨) سليمان: "منطقة الموصل في النصف الاول من الالف الاول قبل الميلاد "، ص١٠١.

(٦٩) الوردي: الممالك في العراق القديم النشوء واسباب السقوط ٢١١٢–٦١٢ ق.م، ص ١٦٩.

(٧٠) محمد: العلاقات السياسية والعسكرية بين الآشوريين والميديين خلال الفترة (٩١١–٦١٢ق.م)، ص١١٠، هەروەها بڕوانە:

رو: العراق القديم، ص٤٣٥– ٤٣٦.

(٧١) Parpola, S. & Watanabe, K.: New Assyrian Treaties and Loyalty Oathes, (Hilsinky : 1988), SAA 2, p. 30.

(٧٢) رو: العراق القديم، ص٤٣٥– ٤٣٦.

(٧٣) الفتلاوي، احمد حبيب سنيد: اسرحدون ٦٨٠–٦٦٩ ق.م، رسالة ماجستير غير منشورة، (جامعة واسط: ٢٠٠٦)، ص١٥١.

هەروەها بڕوانە:

Parpola, S. & Watanabe, K.: New Assyrian Treaties and Loyalty Oathes, SAA 2, p. 30.

بەڵام لەم سەرچاوەیە دەڵێت تێکستەکە شکاوە بە ناتەواوەتی ماوەتەوە بۆ خوێندنەوەی تێکستە شکاوەکە بڕوانە:

Luckenbill, D.D.: Ancient Records of Assyrian and Babylonia, Vol.2, p.208

(٧٤) بۆ زانیاری دەربارەی ئەم پاشایە بڕوانە:

Ebling, E. & othres.: Reallexicon der Assyriologie und Vorderasitischen Archäologie, (Berlin:2003-2005),RLA Vol. 10, p.366.

(٧٥) چیای بیکنی واتە چیای دەماوەند نزیك شاری تهران. بڕوانە:

(٧٦) Borger, R, Die Inschriften Asarhaddon Konigs von Assyrien ,(osnabruck, 1967), **AFO** Vol. 9, p.54. see also:

Luckenbill, D.D.: Ancient Records of Assyrian and Babylonia, Vol.2, p.208-209

(٧٧) الاحمد، سامي سعيد، تاريخ العراق في القرن السابع قبل الميلاد، (بغداد: ٢٠٠٢)، ص ٥٥.
(٧٨)Wiseman D. J.: The Vassal treaties Esarhaddon, Iraq,vol.20,(Londaon:1957), P. 189.

(٧٩) الفتلاوي: اسرحدون ٦٨٠-٦٦٩ ق.م، ص٤٨.

(٨٠) فرحان، وليد محمد صالح، العلاقات السياسية للدولة الآشورية، رسالة ماجستير غير منشورة، (جامعة بغداد:١٩٧٦م)، ص١٥١ .

(٨١) بۆ دەقی پەیماننامەکە بڕوانە:
Wiseman D. J.: The Vassal treaties Esarhaddon,p.29 etc.

(٨٢) پيرنيا، حسن (مشير الدولـه): تـاريخ ايـران قبـل از اسـلام (ايـران قـديم)، (تهـران: ١٣٨٦)، ص٥٣.

(٨٣) Starr, I.: "Queries to the Sun go", (Hilsinki:1990),SAA, Vol. 4, p.49-53 , No.43-45.

(٨٤) علي: الدولة الميدية، ص٥٧.

(٨٥) احمد، جمال رشيد و فوزي رشيد: تاريخ الكرد القديم، (اربيل: ١٩٩٠)، ص ١١٣.

(٨٦) محمد: العلاقات السياسية والعسكرية بين الآشوريين والميديين، ص١١٥.

(٨٧) ئەلخەلیل: مەملەکەتی ماد، لا ٧٩.

(٨٨) علي: الدولة الميدية، ص ٥٨.

(٨٩) ئەلخەلیل: مەملەکەتی ماد، لا ٨١.

(٩٠) دیاکۆنۆف: میدیا، لا ٣٥٩-٣٦٠.

(٩١) علي: الدولة الميدية، ص ٥٨.

(٩٢) القر ه داغي: كوردستـان العـراق في التـاريخ القـديم في ضـوء المصـادر المسـمارية مـن الالـف الثالث ق.م حتى ٦١٢، ص١٦٦. هەروەها بڕوانە: ساكز: قوة آشور، ص١٧٢.
(٩٣)Luckenbill, D.D.: Ancient Records of Assyrian and Babylonia, Vol.2, p.419

(٩٤) محمد: العلاقات السياسية والعسكرية بين الآشوريين والميديين، ص١٢٣.
(٩٥)Lassoe, J.: People of Ancient Assyria, (London:1963), p.89

(٩٦) علي: الدولة الميدية، ص٥٩.

(٩٧) Biggs, R. & others: Chicago Assyrian Dicti0nary, (Chicago:2010),Vol. UW, p.102.

(٩٨) وشەی ئومان -ماندا Umman-manda بەر لە مادەکان بـۆ زۆر نەتـەوەی تـر بـەکارهاتووە کە لە تێکستە مێخییەکان ئاماژەی پێکراوە ئەمـەش وەك نازناوێـك بـۆ ئازایـەتی و ژمـارەی زۆری سوپایەك یان نەتەوەیەك یان گردبوونەوەیەك بەکار هاتووە، بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:

Adali, S.: Umman-manda and its Significance in the first Millennium B.C, pp.20 etc.

(٩٩) الوردي: الممالك في العراق القديم النشوء واسباب السقوط ٢١١٢-٦١٢ ق.م، ص ١٧٥.

(١٠٠) ساكز: عظمة بابل، ص١٧٠.

(١٠١) القرةداغي: كوردستان العراق في التاريخ القديم في ضوء المصادر المسمارية من الالف الثالث ق.م حتى ٦١٢، ص١٦٧.

هەروەها بڕوانە:

Luckenbill, D.D.: Ancient Records of Assyrian and Babylonia, Vol.2,p. 421.

(١٠٢) الأحمد: تأريخ الشرق الأدنى القديم ايران والأناضول،ص٩١.

(١٠٣) ناردۆ، دان: ئیمپراتۆریەتی ئێران، وەرگێڕانی: فەرهاد عەزیز خۆشناو، (هەولێر: -)، لا ٣١.

(١٠٤) احمد،جمال رشيد، فوزي رشيد: تاريخ الكرد القديم، (اربيل:١٩٩١)، ص ٣٢.

(١٠٥) محمد: العلاقات السياسية والعسكرية بين الآشوريين والميديين، ص ١٢٥-١٢٦.

(١٠٦) ئەلخەلیل: مەملەکەتی ماد، لا ٩٠.

(١٠٧) علي: الدولة الميدية، ص٦٠.

(١٠٨) ئەلخەلیل: مەملەکەتی ماد، لا ٩٧.

(١٠٩) هەمان سەرچاوە، لا٩٠.

(١١٠) زغلول، صالح صابر: كورش الأكبر (٥٩٩-٥٣٠ ق.م) مؤسس الدولة الفارسية و ابو ايران، (دمشق: ٢٠١١)، ص ٢٥-٣٢.

(١١١) ديورانت، ول: قصة الحضارة، الشرق الادنى، (القاهرة: ١٩٦٥) مجلد١، ج٢، ص٤٠١.

(١١٢) القرەداغي: كوردستان العراق في التاريخ القديم في ضوء المصادر المسمارية من الالف الثالث ق.م حتى ٦١٢، ص١٦٨.

(١١٣): تأريخ الشرق الأدنى القديم ايران والأناضول،ص٩٢.

(١١٤) زغلول: كورش الأكبر (٥٩٩-٥٣٠ ق.م)، ص ٢٦-٣٦.

(١١٥) علي: الدولة الميدية، ص٦٢.

(١١٦) ئەلخەلیل: مەملەکەتی ماد، لا٩٨-١١٠.

(١١٧) خودادادیان: ئارییەکان و مادەکان، لا ١٥٠-١٥١.

(١١٨) زغلول: كورش الأكبر (٥٩٩-٥٣٠ ق.م)، ص٦٦.

## ملخص البحث

### الامبراطورية الميدية في ضوء المصادر المسمارية

الميديون من الاقوام الآرية التي ظهرت في المناطق الشمالية والشمالية الغربية من سهول ايران في نهاية الالف الثاني وبداية الالف الاول قبل الميلاد. وكانوا في البداية يعيشون على شكل جماعات قبلية معتمدين على الماشية وتربية الخيول، ومن بعد ذلك تعلموا الزراعة واستغلوها في حياتهم الاقتصادية. ذكر الميديون بكثرة في كتابات الملوك الآشورية، وذكرت بلادهم بـ($^{kur}$Ma-da-a) بمعنى (بلاد الميديين)، بينما سموا في المصادر المسمارية ب (مادای داننوتي – Madai dannuti) بمعنى (الميديين الأقوياء). و كثيرا ما هاجم الآشوريين على المدن الميدية ونهبوها واحرقوا وقاموا بهجر سكانهم الى مناطق اخرى او اخذوهم كأسرى لبلاد آشور. وفي بعض المرات تركوا المدن مقابل اعتراف حاكمه الميدي بالسلطة الآشورية واعطائهم الجزية سنويا. وفي نهاية القرن السابع قبل الميلاد شكل الميديون قوة كبيرة وعرفوا في المصادر المسمارية (umman-manda) بمعنى (الجموع الغفيرة) حيث استطاعوا ان يهاجموا على بلاد آشور والقضاء عليه بشكل نهائي وذلك بالمشاركة مع الدولة البابلية.

# Abstract

## Median Empire in the cuneiform sources

Medes were from the Aryan tribes that have emerged in the northern and north-western areas of the Iranian plain, at the end of the second millennium and the beginning of the first millennium BC. They were initially living in the form of tribal groups depending on cattle and horse breeding, and then learned agriculture, and then used in the economic lives. The Medes are frequently mentioned in the writings of the Assyrian kings, and reported to their country ($^{kur}$Ma-da-a) means (Medes country), while named in the cuneiform sources (Madai dannuti) which means (powerful Medes).The Assyrians attacked the Median cities and looted and burned them several times, and they transferred their residents to other areas or took them as prisoners to Assyria. At some other times , left the city in exchange for the obeying the power of the Assyrian ruler Median recognition and give them the annual tribute. At the end of the seventh century BC, Median appeared as a great strength and known in cuneiform sources (umman-manda) which means(crowds), where they were able to attack on Assyria and eliminate once and for all and in partnership with the Babylonians.

# ئاستی هۆشیاری زانینی مامۆستایانی قوتابخانەکانی بنەڕەت لە ناوەندی قەزای زاخۆ لەبارەی بابەتەکانی رامیاریی هاوچەرخ

**د. نەسرەدین ئیبراهیم محەمەد**
بەشی دەروونناسیی گشتی /
فاکۆڵتیی پەروەردە/ زانینگەی زاخۆ

## بەشی یەکەم

### کێشەی لێکۆڵینەوە:

ڕووداوەکانی ڕامیاریی هاوچەرخ لە سەر ئاستی کوردستان و ناوچە و جیهانی و نەبوونی هۆشیاری و ئاگایی مامۆستایانی بابەتی مافی مرۆڤ لە قوتابخانەکانی بنەڕەت لە بارەیانەوە بۆ سوود وەرگرتنیان لە وانەگوتنەوەدا و بە تایبەت لە کات و ساتێکی ناسك و هەستیاری وەك ئەمڕۆ کە کوردستان پیایدا تێپەڕ دەبێ و هەنگاو بەرەو ئایندەیەکی گەشتر دەنێتەوە. چونکی وەك کەریمی (٢٠٠٧) ئاماژەی پێدەدا ئامادەکرنی مامۆستایان لە قوتابخانەکاندا یەکێکە لە ئاستەنگە هەرە مەزنەکانی سەدەی (٢١) چونکە بۆ پەروەردەکردن و پێگەهاندنی قوتابی و هاوڵاتییەکی لە ناو کۆمەڵگایەکی دیمۆکراسیدا پێویستە کە مامۆستایەکان ئامادەی چۆنیەتی فێرکردن بن و بتوانن قوتابیان بۆ فێربوونی ئاستێکی بەرزی مەعریفی پێبگەینن (کەریمي، ٢٠٠٧، ٢٢٥)، و توێژەر بەپێی ئەزموونی کاری پەروەردەیی و سیاسیی خۆی هەست بەم کەموکوڕییە دەکاتن لە لایەن مامۆستایانی قوتابخانەکان، بۆ ئەم مەبەستە چاوپێکەوتنی لەگەڵ کۆمەڵێك سەرپەرشتیاری پەروەردەیی و بەڕێوەبەر و مامۆستا ئەنجامدا و زۆریان ئاماژەیان بە ئەم کێشەیە کردووە.

## گرنگی لێکۆڵینەوە:

مامۆستا بەردی بناغەی پرۆسێسەکانی پەروەردە و فێرکردنە کە لە ڕێگەی قسە و ڕەفتار و سەروبەری و هەڵسوکەوتەکانی کاریگەری لەسەر قوتابی دەکات تا ببێ بە هاوڵاتییەکی لێهاتوو (البدری، ٢٠٠٨، ٥٦)، پسپۆران داکۆکی لەسەر پێگەیاندنی مامۆستا دەکەن بۆ ئەوەی ببێتە هاوڵاتییەکی چالاك و کارامە تا بتوانێ ڕۆڵی پێشەوایەتی لە بواری پەروەردەییدا ببینێ تا لە هەمان کاتدا قوتابی باش پەروەردە بکات، بگونجێ لەگەڵ بارودۆخی نوێ (الأمین، ٢٠٠٥، ٤٥؛ شحاتە، ٢٠٠٧، ٢٤٢).

قۆناغی خوێندنی قوتابیان لە قوتابخانەکانی بنەڕەت هاوکاتە لەگەڵ دەستپێکی یەکێك لەو قۆناغانەی کە هەرزەکاران دەستەویەخەن لەگەڵ قەیرانەکانی ناسنامەی خۆیان کە تیایدا مرۆڤ دەگاتە ئاستێك کە بتوانێت لە بارەی چەمکەکانی ئەبسترەکتی ڕەوشتی، سیاسی و مەزهەبی بکۆڵێتەوە و پرسیاریان لەبارەیەوە بکات، وەك چۆن ئێریکسۆن (١٩٦٣) بۆی دەچێت و بە یەکێك لەو گرفتانەی دەداتە زانین کە بەردەوام مێشکی مرۆڤی ئەم قۆناغەی ژیان بەخۆیەوە سەرقاڵ کردووە (أسدروو، ١٣٨٩، ١٦٦؛ نجاتی، ١٣٧٦، ٥٦). بۆیەش گرنگی پێگەیشتنی کۆمەڵایەتی (socialization)، وەك پرۆسێسەك کە مرۆڤ نموونەی ڕەفتار لە کەلتوور و کۆمەڵگای دەوروبەری وەردەگرێت (Gleitman, Fridlund and Reisberg, 2004, 518) بەگشتی و پێگەیشتنی ڕامیاری (Politicization یان التنشئة السیاسیة) لەلای قوتابی و مامۆستایەکانی کوردستان و پەیوەندی بە پرۆسێسەکانی پەروەردە و فێرکردن. چونکە لە لایەك، وەك تیۆرییە سەردەمییەکان ئاماژەی پێدەدەن ئاراستەکانی منداڵان بەرامبەر بە کەسان و نەتەوەکانی تر نەك تەنیا لە سایەی کاریگەری ژینگەی کۆمەڵایەتی ڕوودەدات بەڵکو فاکتەری شارەزاییەکانی زانینی (مەعریفی) کۆمەڵایەتیش لەم بارەیەوە ڕۆڵێکی بەرچاو دەگێڕن (سیزر و هادی و جیرفس، ٢٠١٠، ٦٠٢) و هەروەها ئەم بابەتە پەیوەندی بە ڕۆشنبیریی ڕامیارییەوە هەیە کە وەك ئەلمۆند و ڤێربا (Almond & Verba) بۆی دەچن بریتییە کۆمەڵێك بیروبۆچوونی ڕامیاریی پەتی کە بە ناوەڕۆك جەخت لەسەر پەیوەندییەکانی تاك لەگەڵ سیستەمی

دەسەڵاتی سیاسی دەکات (السالم، ١٩٨١، ٢٢)، و هەندێ لە فاکتەری گرنگ هەن کە کاریگەرییان بەسەر رەفتاری سیاسیی تاکەکان هەیە وەك ئەو هەڵوێستانەی کە پیاوانی سیاسی خۆیان تێیایدا دەبینن و لەوانەش ئەو ئاستەنگ و کۆسپانەی دەکەوێتە سەر رێگایان یان ئەو دەستکەوتانەی کە بەهۆی ئەم کارە دەستیان دەکەوێ، و هەروەها ئامادەبوون و فێربوونی هاوڵاتیان لە میانەی ئەزموون و کاریان، کە وەك سروشت و شێوازی فێربوونیان گرنگیی تایبەتی خۆی هەیە، چونکە کاریگەریی بەهێزی هەیە لەسەر ئارامی و بەردەوامی سەقامگیری کۆمەڵگا و بەرزی و نزمبوونی ئاستی بەشداریی سیاسی (هەمان سەرچاوە، ٢٣). تاوەکو هەندێ پسپۆری وەك (کریبندۆڤ) لەو بڕوایەدان کە بەردەوامیی سیستەمی سیاسی و بڕیاری سیاسی بە بەرژەوەندییەکانی نیشتمانییەوە دەبەستێت و پێیوایە کە بەرژەوەندیی دروستکردنی بڕیاری سیاسی واتە بەرژەوەندی نیشتمانی (سدیق، ٢٠٠٥، ٦٨)، لەم سۆنگەیەوە دەبینین کە ئەبستێمۆلۆژیای سیاسی واتە مەعریفەی سیاسی چەند گرنگیی خۆی هەیە و پەیوەندی هەیە بە مێنتالیتەی سیاسی کە خۆی لە خۆیدا رۆشنبیری سیاسی لە خۆی دەگرێ کە بریتییە لە هەموو ئەو ئایدیۆلۆژیا، نموونەبەرز، و بنەما و پرەنسیپ و بەهایەکان و چەمکەکانی کە رێباز و قوتابخانە سیاسییەکان، و سیستەمەکانی سیاسی و هێزی سیاسی کە رێنماییکەری سیاسەتوانانە لە هەڵوێستەکانیاندا، و هەروەهاش ئەزموونی کەڵەکەبووی ستراتیژییەکان و تەکتیکە سیاسییەکان و ئەو رێچکە کارگێڕییانە لە خۆی دەگرێت کە بۆ مەبەستی سەرەدەری و رووبەڕووبوونەوەی تەنگەژە و قەیرانە سیاسییەکان بەکار دەهێنرێن و سوودیان لێوەردەگیرێت لە کاتی دروستکردنی پەیوەندییەکانی سیاسی لە هەڵوێستەکانی ئاشتی یان جەنگدا، ئەوە گرنگیی خۆی هەیە بۆ نەتەوەی کوردستان، چونکی مێنتالیتە سیاسی کوردی و سیاسەتوانانی کورد هەندێ تایبەتمەندیی خۆی هەیە کە گرێدراوە بە ستراکچەری کەسایەتییەکەی و خۆی لە هەندێ خاڵدا دەبینێت وەك بێزاری لە دەسەڵاتی ناوەندی و تاکڕەویی رەها، و ڕاکێش ڕاکێش و ململانێی ناوخۆیی بەردەوام، و لاوازی پێگەیشتنی سیاسی و نەبوونی پرۆژەیەکی سیاسیی گشتگیر و یەکگرتوو، و دووربوونی سەرکردایەتی و بنکردایەتی و لەیەکتر تێنەگەیشتنیان، و

تێکـەڵکردنی سیاسـەت لەگـەڵ شـتە تایبەتییـەکانی کەسـایەتیی خـۆی (الخلیـل، ٢٠١٣، ١٥٧).

گۆمـانی تێـدا نییـە کـە دۆزینــەوە و زانینــی ئاسـتی هۆشـیاری مـەعریفیی مامۆسـتایان لـەبارەی رووداو و بابەتـەکانی رامیـاریی هاوچـەرخ و گرێـدراو بـە گۆڕانکارییەکانی زانستی، هـزری و لەشـگەری، بـۆ نموونـەش پێشـکەفتنی زانسـت بەگشتی و تەکنەلۆژیای پەیوەندیکردن و سەرهەڵدانی ئامێرەکانی وەك تۆڕەکـانی ئینتـەرنێت و مۆبایـل لـە بـواری ڕاگەیانـدن، و هـەروەها رووخـانی دیوارەکـانی شـیوعیەت و کۆمـۆنیزم وەك بـەردی بناغـەی دوو جەمسـەری بـوونی سیاسـەتی جیهانی، و باڵادەستیی رۆژئاڤا لە گۆڕەپانی سیاسـەتدا، و هـەروەها سـەرهەڵدانی سیستەمی تاکجەمسەری و سیستەمی نوێی جیهانی و دیاردەکانی بە جیهانیبوونی (Globalization)، هەم لەسیاسەت و هەم لەلایەنی ئابوورییەوە و رووداوی قەیران و کریزیسی ئابووری جیهانی و ئـەوروپی، و رووخـانی دیوارەکـانی دیکتاتۆرەکـانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ژووررووی ئەفریقا (وەك وڵاتەکانی تـونس، لیبیـا، میسـر)،و بەر لە هەموویان بەعسی گۆڕبەگۆڕ، و کێشەی پیتاندنی ئۆرانیۆمی وەڵاتی ئێران و پشتگیریکردنی لە لایەن چین و رووسیای فیـدراڵ، و کۆبوونـەوەکانی یـەك لـەدوای یەکی پەیوەنـدار بـەم بابەتـە و کێشـەی ئـاڵۆزی وەڵاتـی سـووریا و رژێمـی بەشـار ئەسەدی دەسەڵاتدار، و هەروەها سەرهەڵدانی تیرۆریزمی جیهانی و ناوچەیی و بـە تایبەت لەسەر کوردستان کە چەندەها کارەساتی گەورەی لێکەوتووە (لە رووداوی (١١) سپتەمبەری ئەمریکا – (کە هەندێ توێژینەوە دەسەلمێنن کـە چـەند رۆژ لـە دوای ئەم هێرشە تیرۆریستییانە ڕێژەی نیگەرانی و خەمۆکی و بەکارهێنانی مـادە هۆشـبەرەکان زیـادی کـردووە – (تاسـیگ و میکلـو و سـوبد، ١٣٨٦، ١٠٧ ) تـا کارەساتی یەکی شوبات لە کوردستان– هەولێری پایتەخت و... هتد) و هەڕەشەی ئەم دیاردەیە بۆ سەر ئاسایشـی جیهـانی بـە گشـتی و کوردسـتان بـە تایبـەتی، و هەروەها سەرهەڵدانی بیرۆکەی دانپێدانان بە دەوڵـەتبوونی بۆسـنیا و هێرزوگـۆڤین لـە ئـەوروپا و دەسـەڵاتی فەلەسـتینی لـە ڕۆژهـەڵاتی نـاوین، و هـەروەها گـۆڕینی هاوسەنگیی سیاسیی لە گۆڕەپانی سیاسی کوردستان و سەرهەڵدان و بەهێزبوونی هەندێ لایەن و ڕێکخراو و پارتی سیاسی و لاوازبوونی هەنـدێکی تـر، و کێشـەکانی

بەردەوامی حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی ناوەندی لە جێبەجێکردنی دەستوور و بابەتەکانی گرێدراو بە مادەی (١٤٠) و ناوچەکانی کێشە لەسەر و ناردنی پەترۆل بۆ دەرەوەی کوردستان و ئاستەنگ خستنە بەر پێدانی بودجەی هەرێم لە بودجەی حکوومەتی ناوەندی، و بابەتی هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی لە ئاستی کوردستان و حکومەتی ناوەندی، هەموویان ئەو بابەتە سیاسییە گرنگانەن کە پێویستە لای مامۆستاکانی بابەتی دیموکراسی و سیاسەت بە تایبەتی و مامۆستایەکانی تری ئێمە بەگشتی، روون و ئاشکرابن و بەتایبەت کە نەتەوەکەمان بەگشتی و بەتایبەت کوردستانی ئازاد بە قۆناغێکیٚ زۆر ناسك و هەستیاردا تێپەڕ دەبێت و بەرەو ئاسۆیەکی گەش هەنگاو دەنێت. هەموو ئەم رووداوانەی ئاماژە پێکراو لە سەرەوە هانمان دەدەن کە ئێمە بیر لەوەبکەین کەجێگە و پێگەی نەتەوەیی خۆمان لەسەر ئاستی کوردستان و ناوچەو جیهانی بزانین و بیر لەوە بکەین کە تا چەند هۆشیاریی ئێمە لەو بابەتە گرنگە، و لەم سۆنگەیەوە ئەم لێکۆڵینەوەیە بەگرنگ دەژمێردرێت بۆزانینی رۆڵی پەروەردە وفێرکردن لە پێگەیاندنی نەوەیەکی نویٚ وئامادە بۆ رووبەڕووبوون و بەرەنگاریی هەموو ئەم رووداوو پێشهات و گۆڕانکارییانە. چونکە وەك رۆبێرت داوزیٚ ( Robert Dowse, 1978) ئاماژەی پێدەدات ئەو زانیاری و ڕێسایە سیاسییانەی منداڵ وەریدەگریٚ هەمان ئەو هێزەیە کە لە سەردەمی پێگەیشتن و کاتێك کە گەورە دەبێت کاریگەری لەسەر رەفتارە سیاسییەکانی دەکات و ئەم چەمکە بە بۆچوونی سیاسییانە (Child is Parent of the adult) واتە منداڵ باوکی پێگەیشتووەکانە (السالم، ١٩٨١، ٥٠)، و لە ساڵی ١٩٩٤ ڕێکخراوی یۆنسکۆ بە ڕێکخستنی کۆنگرەیەکی جیهانی رۆڵی پەروەردە و فێرکردنی لە بواری بایەخدان بە بەهاکانی پەیوەندار بە پاراستنی ئاشتی و مافی مرۆڤ و دیمۆکراسیەت گەنگەشە کردووە و لە هەمان کاتدا کار دەکات بۆ گۆڕینی پەرتووکەکانی قوتابخانەیی تاوەك زیادتر بگونجێن لەگەڵ دۆخی ئێستای دیمۆکراسی و فێرکردنی بنەماکانیدا (سیزر و هادی و جیرفس، ٢٠١٠، ١٠٦٤). هەتاوەکو پسپۆرەکانی بواری ئابووری لە وڵاتانی پێشکەوتوو لەو بڕوایەدان کە پەروەردە و فێرکردن کاریگەری لەسەر ئاستی ئابووریی خێزان و کۆمەڵگا دەکات، بۆ نموونە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە

نێوان ساڵانی ١٩٧٠ تا ١٩٩٠ ئەو گەشەیە بە ئاشکرایی لە میانەی ئامارەکان هەست پێدەکرێت (Генкин ,2005, 103). بۆیە تێگەیشتنی مامۆستا لە فەلسەفەی پەروەردەیی دیمۆکراتیانە پێویست و گرنگە و لە گرنگترین بنەماکانی گرنگیدانە بە تاك و ڕێزگرتنی و بڕوا بە بنەمای جیاوازی لە پێداویستییەکان و توانایی و ئارەزووییەکانی و داکۆکیکردنە لە هێزی ئاوەدانکەر و هەستی بەرپرسیارەتی (سلامة، ٢٠٠٢، ٣٤).

دوابەدوای ئەو گرنگییەی کە لەسەرەوە ئاماژەی پێدراوە و هەروەهاش بۆ ئەم توێژینەوەیە پێویستە بگۆترێت کە ئاستی هۆشیاری و زانینی مامۆستایانی بابەتی (مافی مرۆڤ) زۆر گرنگە بۆ ئەوەی مامۆستایان بە باشترین شێوە وانەکە پێشکەش بە قوتابیان بکەن تا بتوانن سوود لە زانیارییە هەمە چەشنەکانی مامۆستاکانیان وەربگرن. هەروەهاش چونکە — ئەوەندەی توێژەر ئاگادار بێ — ئەم بابەتە لە کوردستان نەخراوەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە، هەنگاوێکە بۆ توێژەران لە ئایندەدا بوارە پەیوەندارەکانی هاوشێوە بخەنە بەر توێژینەوە. لە لایەکی تر توێژینەوەکان لە هەرێمی کوردستان ئاماژە بە گرنگیی قۆناغی بنەڕەت دەدەن وەك قۆناغی دەستپێك بۆ ئامادەکرنی قوتابیان وەك نەوەی داهاتوو و وەدەستهێنانی ئامانجەکانی ئەم قۆناغەی خوێندن لە ڕێگەی پێشخستنی پرۆگرامی خوێندن لەو قۆناغە بۆ ئەوەی قوتابیان لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانەی لە چوارچێوەی پرۆسێسی بەدیمۆکراتیزەکردن لە ناوچەکە لە ئارادایە بگونجێ (شکری، ٢٠١٤، ٨٩). هەربۆیە لە پێناو گەشەکردنی ئاراستەکانی دیمۆکراسیەت لە قۆناغی خوێندنی بنەڕەتدا دەبێ قوتابی فێری ڕێزلەخۆ و لە کەسانی بەرامبەر گرتن بکرێ، دواتر لەسەر بەهاکانی وەك بەشداریکردن و هاوکاری و دژایەتیکردنی هەر جۆرە رەفتارێکی خۆویستانە و توندوتیژی ڕابهێنرێت، تا بتوانێ فێری خۆ گونجاندن، و لێك تێگەیشتن و هەڵگرتنی ئەرکی بەرپرسیاری ببێ، و ئەوە کاریگەری دەکاتە سەری بۆ ئەوەی لە بەهاکانی سەربەخۆیی و پشت بە خۆ بەستن و ئەرینی بوون و هەڵسوکەوت و گفتوگۆی ئاوەدانکەر و خۆشەویستی و یەکسانی و دادپەروەری و رەخنەگرتن و لێبوردنی هزری تێبگات و ئەوانەن کە قوتابی بۆ پراکتیکردنی بنەماکانی دیمۆکراسیەت هۆشیار و ئامادە دەکات (عبدالحمید، ١٦٢،٢٠٠٤).

**ئارمانج و گریمانەکانی لێکۆڵینەوە:**

گریمانەکانی لێکۆڵینەوە ئەوانەی خوارەوە لە خۆ دەگرێت:

١- مامۆستاکانی بابەتی مافی مرۆڤ لە قوتابخانەکانی بنەڕەت لە ناوەندی شاری زاخۆ هۆشیاری مەعریفی باشیان نییە لەبارەی گۆڕانکارییەکانی گۆڕەپانی سیاسەت لەسەر ئاستەکانی خوارەوە: أ – لەسەر ئاستی کوردستانی.

ب- لەسەر ئاستی ناوچەیی. ج- لەسەر ئاستی جیهانی.

٢- هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان مامۆستاکانی بابەتی مافی مرۆڤ لە قوتابخانەکانی بنەڕەت لە ناوەندی شاری زاخۆ لە هۆشیاری مەعریفی لەبارەی گۆڕانکارییەکانی گۆڕەپانی سیاسەت بەپێی گۆڕاوی رەگەز (نێر و مێ).

٣- هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان مامۆستاکانی بابەتی مافی مرۆڤ لە قوتابخانەکانی بنەڕەت لە ناوەندی شاری زاخۆ لە هۆشیاری مەعریفی لەبارەی گۆڕانکارییەکانی گۆڕەپانی سیاسەت بەپێی سالانی خزمەت.

**سنووری لێکۆڵینەوە:**

لێکۆڵینەوە هەموو مامۆستایانی وانەبێژ بەخۆیەوە دەگرێ کە بابەتی (مافی مرۆڤ) لە قوتابخانەکانی بنەڕەت لە ناوەندی شاری زاخۆ دەڵێنەوە لە ساڵی خوێندنی (٢٠١٤ /٢٠١٥).

**دەستنیشانکردن و پێناسەی چەمك و زاراوە سەرەکییەکانی لێکۆڵینەوە :**

- سیاسەت وەك وشە واتای حکومەتکردن و بەڕێوەبردن و چارەکردن و هەروەهاش تەمبێکردن و سزادان دهێت، کە لە بنەڕەتدا لە وشەی (Politique) فرەنسی وەرگیراوە کە واتای دیپلۆماسی و هونەری حکومەتکردن دەداتن (طلوعی، ١٣٩٠، ٦٤١).

- زانستی ڕامیاری یان سیاسەت (Politic) لە لایەن فەرهەنگنامەی لیترە بە زانستی دەسەلاتداریی ولاتان و لە فەرهەنگنامەی رۆبیر (١٩٦٢ م.) بە هونەری بڕیار و دەسەلاتی کۆمەلگای مرۆڤایەتی دەناسرێت، و (نۆرتۆن فریش) سیاسەت بە هونەری توانستەکان پێناسە دەکاتن(الخلیل، ٢٠١٣، ١٥٥).

- رۆشنبیری وەك فەرهەنگنامەی ئۆکسفۆرد پێناسە دەکات بریتییە لە کۆمەلێك ئاراستە و بەهای ناو کۆمەلگا وەك زمان، چیرۆك، شێوازەکانی ژیان، کە

دام و دەزگاکانی پەروەردەیی و ئایینی و سیاسی دەریدەبڕن (پێندرۆیی، ٢٠١٠، ١٦).

أ – رۆشنبیری رامیاری : ئەلسالم (١٩٨١) بەم شێوەیە پێناسەی دەکات : سیستەمەکی گشتگیرە لە بیروباوەڕ و بۆچوون و بەهاکان، کە کاری سیاسی لەسەر ئەم بنەمایانە بەڕێوە دەچێت (السالم، ١٩٨١، ٢٢).

ب – ئەلعانی (١٩٨٨) رەوشنبیری سیاسی بە کۆمەڵێك بیرو بۆچوون و ئاراستەی ئەندامانی سیستەمێك لە بواری سیاسەتدا پێناسە دەکات (العانی، ١٩٨٨، ١٢٧).

– زانینی (مەعریفی) بریتییە لە کۆمەڵێك واتا و هزر و بیروباوەڕ و بڕیار و چەمك کە مرۆڤ لەمیانەی هەوڵەکانیدا بۆ تێگەیشتن لە دیاردەکانی نێو ژینگەکەیدا، دەخاتە سەر بنیاتی مێنتالی و ئەقڵی خۆی (سلامة، ٤٢،٢٠٠٢).

## بەشی دووهەم

### ئەدەبیات و وێژەی توێژینەوە و توێژینەوەکانی پێشتر:

لەو بەشە ئاماژەیەك دەدرێت بە هەندێ لایەنی گرێدراو بە بوارەکانی توێژینەوەکە لە نێو ئەدەبیات و وێژەی سەرچاوەکانی پەیوەندار بە بابەتی توێژینەوە، بە شێوەی خوارەوە:

**أ – ئەدەبیاتی توێژینەوە :**

زانستی رامیاری لە ڕوانگەی تۆماس هۆبز بریتییە لە هونەر و کێشە، هونەرە لەبەر ئەوەی کە ئەو واقعەی کە تیایداین لە لایەن مێشکی مرۆڤەوە دروستکراوە، و کێشەیە چونکی دەبێ بەر لە هەموو شتێك بەلایەنی فەلسەفییەوە چارەسەر بکرێت (عبدالمالك، ٢٠١٣، ١٧). هەتاوەکو هەندێ پسپۆری سیاسی لەو بڕوایەدان کە ڕێکخستنی سیاسی و ئابووری لە نێو دەوڵەت و نەتەوەیەك کاریگەری بە سەر لایەنی سایکۆلۆژیای مرۆڤ و جۆری کۆنترۆڵکردنی تێگەیشتنیان و هەستکردن بە بەختەوەرییان دەکات (معدل، ٢٠١٠، ٣٢٤)، بە واتایەکی تر لایەنی کۆمەلأیەتی ژیانی مرۆڤەکان و کۆمەڵگا پەیوەندی بە سیستەمی سیاسی و ئابووریی زاڵ بەسەر کۆمەڵگا و ولأتدا هەیە.

لـە هـەرێمی کوردسـتان ئـەدەبیاتی پێگەیانـدنی سیاسـی لـە قوتابخانـەکان شتێکی نوێیە و نموونەشـی پـەرتووکی خوێندنـە کـە بـەناوی (مـافێن مرۆڤـی) لـە قۆناغی بنەڕەتدا دەخوێندرێت. بـەلاّم لەگـەلّ ئەوەشـدا هەنـدێ بابـەتی گـرنگ لـە خۆی دەگرێ کە بۆ قوتابیان لەو قۆناغەدا بە پێویست دەزاندرێت.

**لە سەر ئاستی هەرێمی کوردستان :**

هەرێمی کوردستان لەگەلّ کۆمەلێك کێشەی گەورە لـە سـەر ئاسـتی هـەرێم و ناوچەیی دەستەویەخەیە، کە لێرەدا ئامـاژە بـە هەنـدێکیان دەدرێـت، بـۆ نموونـە تیرۆر، کە یەکێکە لـە مەترسـیدارترینی ئـەو دیاردانـەی کـە هەڕەشـە لـە ئێسـتا و ئایندەمان دەکات. تیرۆر کە لە وشەی (Terrer) لاتینی دێتن کە بـە واتـای هەسـت بـە ترسـکردن دێـت، و بریتییـە لـە وەرگرتنـی ڕێوشـوێن و شـێوازی تونـد لـە دژی رکابەرەکانـە (نـەورۆلی، ٢٠١٠، ١٦٨)، یـان ترسـاندن یـان خـراپ مامڵـەکردن یـان کوشتنی کەسانی بێتاوانە بۆ مەبەستی تۆقاندن و یان خسـتنی فشـارە (کلیفلانـد، ٢٠٠٠، ٢٠٣).هنـدەك لـە پسـپۆران لـەو بڕوایـەدان کـە بـەجیهانیبوون یەکێکـە لـە فاکتەرە بەهێزەکانی کە ئاسانکاری ڕوودانی توندوتیژی و دواتریش تـیرۆر دەکـات لە سەر ئاسـتی جیهـانی لـە ڕێگـەی ئـەو فشـار و کاریگەرییـەی کـە لەسـەر لایەنـە جیاجیاکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی و تاکەکانی دەکات (العزي، ٢٠١٠، ٩٢).

جگـە لـەوەی کـە لـە یاسـا و دەسـتووری عێراقـدا هەمیشـە بـە ترسـەوە هەڵسوکەوت لەگەلّ وشەی کورد کراوە، یاسادانەر و دەسـتهەلاّتدارانی بەغـداد زۆر بە شارەزایانە و پڕ لە قین و ڕەگەز پەرستانە و شۆڤینییانە تیایـدا سـەرەدەرییان لەگـەلّ کـورددا کـردووە (فنـدی، ٢٠١٤، ٢٧)، و هـەروەهاش گـەلی عێـراق بـەهۆی جۆراوجـۆریی نەتـەوەیی و ئـاینی هەمیشـە تووشـی کۆسـپ و تەگـەرە بـووە لـە بەڕێوەچـوونیەوە و خـەمی هەرەگـەورەی دەسـەلاّت لـە بـارەی یـەکگرتنی ئـەم پێکهاتانە هەمیشـە قـەیرانی گـەورەی بـەدواوە بـووە و نموونـەی هـەرە دیاریشـی جەنگە یـەك لـە دوای یەکـەکانی ئـەم ولاّتـە بـووە، بـەلاّم وەك خـاتوو فیبـی مـار، مامۆسـتای زانسـتی مێـژووی ڕۆژهـەلاّتی نـاوین لـە زانسـتگەی تێنێسـی ئامـاژەی پێدەداتن، ئەنجامەکەش هەمان دابەشبوونە بەسەر سێ لایەنی سەرەکیی شـیعە و سـوننە و کوردەکـان (مـار، ٢٠١٠، ٢٦)، و لەوانەیـە ئـەم دابەشـبوونە سـاڕێژی

یەکجارەکی برینە کۆنەکانی دانیشتوانی ئەم وڵاتە بە گشتی و کوردەکان بەتایبەت بکات و ئایندەیەکی پڕ ئاسوودەیان بۆ بە دیاری بهێنێت.

یەکێك لە بەڵگەکانی ئەوەی کە حکومەتی ناوەندی بەردەوام دژی بەرژەوەندییەکانی نەتەوەیی کوردی بووە بەشداریکردنی ئەم حکومەتە بووە لە نێو پەیماننامەکانی سیاسی وەك سەعدئاباد (١٩٣٧) و (حسن الجوار) لە (١٩٤٧) و (حلفی) بەغداد لە (١٩٥٥) و جەزایر (١٩٧٥) و ئەوانی تر کە هەموویان کاریگەرییان هەبووە لەسەر ئاسایشی سنوورەکانی کوردستان و لەگەڵیشیدا بزووتنەوەی کوردی (ارام، ٢٠٠٤، ١١٩)، و لە ئێستادا وەك سەرۆکی حکومەتی کوردستان ئاماژەی پێدەداتبە پێچەوانەی بیروباوەڕی ئێمە کە وامان دەزانی حکومەتی ناوەندی لە پاش (٢٠٠٣) و رووخانی رژێمی بەعس سەربۆرێکی هاوبەش بۆمان دەرەخسێنێ و کاری هاوبەش دەکەین کەچی جەنگێکی ئابووری لەگەڵماندا دەستپێکردووە کە خۆی لە بەکارهێنانی مووچە وەك کارتی فشار لەسەر حکومەتی هەرێمی کوردستاندا دەنوێنێ و ئەمە زەنگێکی مەترسیدارە بۆ ئێستا و ئایندەمان کە بیکەین بە وانە و سوودی لێی وەربگرین (بارزانی، ٢٠١٤).

**لە سەر ئاستی ناوچەیی :**

لایەنەکی دیکەی کاریگەر لە سەر دەڤەری کوردستان ئەو دۆخە گرنگە بووە کە لە چەند ساڵی دوایی سەری هەڵداوە و بەناوی بەهاری عەرەبی دەناسرێت، و بووە ئەگەری ئەوەی کە تەنگی بە فاشیستەکانی دیکتاتۆری ناوچەکە هەڵچنیت و لە توونس و لیبیا و میسرەوە دەستی پێکرد، و هەڵبەت وەك ڤیلهێلم رایش (١٩٧٥) ئاماژەی پێدەکات خودی دیاردەی فاشیزم بەرهەمی سەرکوتکراوەبوونی هەستە سێکسییەکانی قۆناغی منداڵییە کە لە هەڵوێستی دیاریکراودا و بەو شێوەیە سەرهەڵدەدات و جۆرەکە لە ڕەنگدانەوەی سیاسی سروشتی مرۆڤی مامناوەندییەکە بەو شێوازانە خۆی دەردەخات (ڤێنسێنت، ٢٠٠٧، ٥٨٦)، و بابەتەکانی وەك دیاردەکانی گەندەڵی، تیرۆر، دیکتاتۆریەت و رۆشنبیری لەو پارادیگمایانەن کە لە سەدەی بیستەم وەك بەشێك هەوڵەکانی زانستی ئەبستێمۆلۆژیا، کە بۆ مەبەستی دۆزینەوەی ڕاستییەکان لە چەوتی بەکار دێت، بووەتە جێگەی بایەخی توێژەرانی پسپۆرانی سۆسیۆلۆژی (گیلنەر، ٢٠٠٨، ٦٩).

**لە سەر ئاستی جیهانی :**

دیاردەی بەجیهانیبوون یەکێك لەو چەمکانەیە کە لە سەدەی بیستەم سەری هەڵداوە و پەرەی سەندووە، و قۆناغەکانی هاتنەکایەی ئیدیۆم و پرۆسێس و دیاردەی بەجیهانیبوون (العولمە یان Globalization) بە شێوەی خوارەوەن :

١- قۆناغی یەکەم دەسپێدەکات لە پرۆژەیەکی ئەمریکی بەناوی مارشال کە لە دوای جەنگی دووهەمی جیهانی هاتە ئاراوە بۆ مەبەستی یارمەتیدانی بانکی دراوی نێونەتەوەیی و لە پێناو سەقامگیری دارایی جیهانی، و هەروەها پەیماننامەی بازرگانیی گات ( GATT) یش ڕۆڵی هەبوو لەو کارەدا لە ساڵی (١٩٤٧).

٢- قۆناغی دووهەم بۆ سەرەتاکانی دەهەی پەنجای سەدەی رابردوو دەگەڕێتەوە کە هاوکات بوو لەگەڵ بەرزبوونی ئاستی جموجۆڵی بازرگانیی جیهانی و سەرهەڵدانی بازاڕی ئازاد و یەکێتییە گومرگییەکان.

٣- قۆناغی سێهەمینی بەجیهانیبوون بۆ هەرەسهاتنی بلۆکی شیوعیەت و سۆڤیەتی جاران و لە کاتی دەسەڵاتی گۆرباچۆف دەگەڕێتەوە کە بەهۆیەوە کۆمەڵێك لە ویلایەتەکانی ئەم وڵاتە سەربەخۆیی خۆیان وەرگرت و پەیوەندییان بە ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی کرد (حسین، ٢٠١١،١٤٣)، و هەندێ سەرچاوە لەو بڕوایەدان کە ئەم بزاڤە فاکتەرێکی رووخاندنی دیوارەکانی شیوعیەت بوو و بگرە قۆناغەکانی یەکەمی بۆ سەدەکانی پانزدەی زایینی و پێش قۆناغی ڕێنسانسیش دەگەڕێتەوە (تۆڤی، ٢٠١٤، ٤٣). جیهانگەرایی، بە پێچەوانە بیرو باوەڕی خەڵکی، تەنها بە دیاردەیەکی ئابووری ناژمێردرێت، بەڵکو هەموو لایەنەکانی کەلتووری و جڤاکی، و سیاسیش بە خۆیەوە دەگرێت، و وەك چۆن ئێلڤین تۆفلێر ئاماژەی پێدەدات لە سەردەمی ئەمڕۆکەدا، کە سەردەمی زانیارییە، نەك تەنها کەرەستە و کەل و پەلەکان و خزمەتگوزارییەکان لە نێوان نەتەوە جیاوازەکاندا دەگوازرێنەوە، بەڵکو بیروباوەڕ و زانیارییەکانیش دەگوازرێنەوە. و جیهانگەرایی پەروەردە و فێرکردن بریتییە لە بارودۆخێك کە تیایدا سنوورە جوگرافییەکان نامێنن (کەریمي، ٢٠٠٧، ٣١٣). بەجیهانیبوون لەگەڵ ئەوەی کە چەمکێکە لایەنەکانی سیاسی، کۆمەلایەتی و رۆشنبیری ژیانی مرۆڤایەتی بەخۆیەوە دەگرێت، بەلام لایەنە

ئابوورییەکەشی زۆر بەرچاوە، و بووەتە هۆکاری ئاسانکاری بۆ فراوانکردنی ڕۆڵی کۆمپانی و دەزگا ئابووری و داراییەکانی جیهان (میسری، ٢٠٠٠، ٢٦). هەر چەندە کە سەرهەڵدانی چەمکی دیموکراسیەت بۆ مێژوویەکی دوور و درێژی پێش زایین دەگەڕێت بەلأم لە سەردەمی ئێستادا بووەتە بەشێك لە فەلسەفەی ژیان لە ولأتانی ڕۆژئاوا (عەبدوڵلا و تەیب و ئەمین، ٢٠١١، ٣١)، و لە بابەتە هەرە گرنگەکانی پەیوەندار بە سەردەمی بەجیهانیبوون گرنگیدانە بە بەها کۆزمۆپۆلیتانیەکان یان بەهاکانی هاولأتی جیهانیبوونە کە لە ڕاست خۆیدا پەیوەستە بە ڕەهەندە سیاسییەکان و بە تایبەت پەیوەندیی نێوان ولأتان و ڕوانگەیان بەرامبەر بە یەکتری و لەسەر بنەماکانی سەروەریی یاسا و مافەکانی مرۆڤ و دەسەلأتی گشتی دابەشکردنی دەستهەلأت و بابەتی دیموکراسیەت کە هەموویان بە یەکەوە ئاماژەن بۆ دیموکراسیەتی لیبرالی (هوفە، ٢٠١٠، ٢١١)، چونکە دیموکراسیەت ڕۆڵێکی دیار دەگێڕێت لە گۆڕینی مافەکانی مرۆڤ و پیادەکرنی بە شێوازێکی پراکتیکی و کرداری لەو کۆمەڵگایەی کە تیایدا ڕەچاو دەکرێت.(عبدالله، ١٩٩٧، ١٠٧–١٢٧).دۆبرامایێر، یەکێك لە هزرڤانانی بەناوبانگی هاوچەرخ لە پەرتووکی خۆیدا (فێرکردن و پەروەردە بەرەو دیموکراسیەت) تەکەز لە سەر بابەتی فێرکردنی دیموکراسیەت لە قوتابخانەکان دەکات و ئەو چەندە بە بزاڤێکی نوێ دادەنێت لە بواری پەروەردەییدا، وەك ڕێگایەك بۆ پەروەردەکرنی هاولأتییەك کە بتوانێ فێری چۆنیەتی بیرکردنەوە ببێ (کەریمی، ٢٠٠٧، ٢٣٢). بەڵکو هەندێ پسپۆر لەو بڕوایەدان کەبەشداریکردن لە ژیانی سیاسی و بەتایبەت لە ولأتانی دیمۆکراتیکدا بە یەکێك لە فاکتەرەکانی بزواندنی کۆمەلأیەتی و هەروەها شۆڕشەکانی کۆمەلأیەتی دەژمێردرێت (سالم، ٢٠٠٣، ٩٨)، هەر چەندە کە هندەك لایەن و پسپۆر لەو بڕوایەدان کە کە بواری ڕۆشنبیری نەك تەنها کۆسپ و تەگەرە نییە بەڵکو کەتوار (واقعێکی) کۆمەلأیەتی و ئابووری کە دەکەوێتە نێوان تاك تا بیروبڕواکانی خۆی بە ئازادانە دەربڕێ و لەگەڵیشیدا ترس و دواکەوتوویی، و تێنەگەیشتن لە گرنگی دیموکراسیەت بەرهەمی هەژارییە و بە شێوەیەکی بەربلأو لە ئارادایە (عبدالحمید، ٢٠٠٤، ١٦٠). لە لایەکی ترەوە هەندێ لە پسپۆران لەو بڕوایەدان کە لە چوارچێوەی پەیوەندیی نێوان بەجیهانیبوون و پرۆگرامەکانی

خوێندن ئەو ئاراستەیە لەبەر چاو بگیرێت کە بۆ گەشەی کەسایەتی قوتابی بە هەموو لایەنەکانیەوە دەبێ هەوڵ بۆ ئەوە بدرێت کە بتوانێ لەلایەنی کەلتووری کراوە بێ و بتوانێ لەگەڵ ئەو دیاردەیە خۆی بگونجێنێ لە ڕێگەی تێگەیشتن و بەکارهێنان و سوودوەرگرتن لە لایەنە ئەرێنییەکانی و بەکارهێنانی لە پێناو بەرژەوەندییەکانی مرۆڤایەتی و کۆمەڵگا ( الخوالدە، ٢٠٠٧، ٢٨٧).

بابەتێکی تری گرنگ لە نێو گۆڕەپانی سیاسەتی هاوچەرخ ئازادییە، کە ئەم بنەمایە یەکێك لە رەهەندەکانی سەرەکیی بەهای یەکسانی نێوان مرۆڤەکانە، کە لەوە دێت کە سەرپێبوونی هەموو مرۆڤەکان بۆ یەك سەرچاوە دەگەڕێتەوە، کە ئەویش یەکسانییە، کە لە هەمان کاتدا ئەوە دەگەینێت کە هەموویان ئازاد لە دایك دەبن و ئازاد دەژین، بۆیە قۆرخکردنی ئەم ئازادییە لە لایەن مرۆڤەکانەوە بەرامبەر برا مرۆڤەکانی کارێکی پەسندنەکراوە (رشوان، ٢٠١٢، ٢٩٢)، و ئازادی پابەندییە بەو سیستەمەی کە یاسا بڕیاری لەسەر داوە و سیستەم لەم بەینەدا گرنگییەکی تەواوی هەیە چونکە ملکەچییەك بە ویستی خودی مرۆڤ بۆ یاسایە کە ئازادی لە بەرەڵایی جیاواز دەکات (عبدالله، ١٩٩٧، ١١٣).

**ب – خوێندنی قوتابخانەکانی بنەڕەت :** سیستەمی خوێندنی قوتابخانەکانی بنەڕەت لە کوردستان ئەزموونێکی نوێیە و بۆ کۆنگرەیەکی پەروەردەیی دەگەڕێتەوە کە لە ٢٢–٢٤ ئایاری ٢٠٠٧ لە هەولێری پایتەخت بەسترا و بە هۆی هەبوونی هەندێ لاوازی لە قۆناغی خوێندنی سەرەتایی بڕیاری لەسەر درا و وەك ئەزموونێك کە لە وڵاتانی ئەوروپی سەرکەوتنی وەدەست هێنابێ، و بۆ ئەوەی لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی سەردەم، و بەتایبەت لایەنەکانی تەکنەلۆژیایی و بەجیهانیبوون، بگونجێ، ئەم بیرۆکەیە هاتە جێبەجێکردن وەك هەنگاوێك بۆ چارەسەریی کەموکورییەکانی قۆناغی سەرەتایی (شکری، ٢٠١٤، ٢٠).

**ج – لێکۆڵینەوەکانی پێشووتر:**

ئەوەندەی توێژەر ئاگادار بێ هیچ توێژینەوەیەك کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەم لێکۆڵینەوەوە هەبێ نەبووە، و ئەمە خۆی لە خۆیدا خاڵێکی بەهێزی ئەم لێکۆڵینەوەیە، هەرچەندە سوود لە هەندێ توێژینەوەی هاوشێوە وەرگیراوە بۆ مەبەستی دانانی راپرسی و چارەسەریی ئاماری.

**بەشی سێیەم :**

**کردارەکانی پەیوەندار بە جێبەجێکاری لێکۆڵینەوە:**

ئەم بەشە خاڵەکانی خوارەوە بەخۆیەوە دەگرێت:

أ – کۆمەڵگای گشتی لێکۆڵینەوە و سەمپڵەکەی: ژمارەی قوتابخانەکانی بنەڕەت لە ناوەندی قەزای زاخۆ (١٠٠) قوتابخانەیە، و ژمارەی ئەو مامۆستایانەی کە وانەی (مافی مرۆڤ) دەڵێنەوە لەم قوتابخانانە (١٠٣) مامۆستایە، کە سەمپڵی لێکۆڵینەوە بە شێوەی چینایەتی هەڕەمەکی بووە و تیایدا (٤٢) مامۆستا بە شێوەی هەڕەمەکی هەڵبژێردراون کە دەکاتە (٤٠٪) ی کۆی کۆمەڵگای لێکۆڵینەوە.

ب – ئامادەکردنی ڕاپرسی و دروستی و نەگۆڕییەکەی: لە بواری سایکۆمێتریدا،ڕاپرسی، وەك کۆمەڵێك پرسیار شێوازێکی گونجاوە بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە مرۆڤایەتییەکان بە تایبەت پێدانی زانیاری لە بارەی ئاراستەکانیان و بەها و ئارەزوو و کەسایەتییان (Colman,2009 ,630). بۆ مەبەستی دروستکردنی ئەم کەرەستەیە لێکۆڵەر بەپێی ئەزموونی خۆی و چەند توێژینەوە و سەرچاوە ڕاپرسییەکی ئامادە کرد لە (٤٣) پرسیار کە سێ ئاستی (کوردستانی، ناوچەیی و جیهانی) بەخۆیەوە گرتبوو، و دوای ئەوە ئەم ڕاپرسییە لە سەر چەند پسپۆڕێکی بوارەکانی پەروەردەیی، سایکۆلۆژی، مێژوویی و سیاسی لە زانستگەکانی زاخۆ و دهۆك و سەلاحەدین–هەولێر دابەشکران بۆ مەبەستی وەرگرتنی بیروڕایان و ڕێژەی ڕەزامەندی (٨٠٪) بوو (پاشکۆی ژمارە ١)، و دوای لادانی و گۆڕانکاری (٣٤) پرسیار مایەوە وەك نموونەی دوایی،دواتر بۆ زانینی کەموکوڕییەکانی بەسەر چەند مامۆستایەکی بابەتی توێژینەوە دابەشکرا و دواتر گۆڕانکاریی پێویستی تیایدا کرا. هەرچەندە پسپۆڕانی بواری ئەزموونەکانی سۆسیۆمێتریك لەو بڕوایەدان کە نەگۆڕی ئەزموون یان ڕاپرسییەك زۆر گرنگ نییە و بەدەستهێنانی کێشە دروست ناکات، چونکە بەپێی گریمانەی ئەوان ئەزموون ڕەنگدانەوەی ئەو گۆڕانکارییانەیە کە لە بنیاتی کۆمەڵگا یان تواناییەکانی تاکەکان لە ماوەیەکی تایبەتدا ڕوودەدات، بۆیە ئەگەر ئەزموون هەمان ئەنجامەکانی وەك جاران و وەك خۆی پیشان دا ئەوە گومان لەسەر ئەو ئەزموونە و ڕاپرسییە دروست دەکات نەك

بەڵگەیە بۆ نەگۆڕی ئەو ئەزموونە (النجار، ٢٠١٣، ١٠٣)، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بۆ مەبەستی دۆزینەوەی نەگۆڕی ڕاپرسییەکە، ڕاپرسی دوو جار بەسەر (١٠) مامۆستا دابەشکران و ڕێژەی (٠,٥٦) بوو.

ج – جێبەجێکاری لێکۆڵینەوە: پاش وەدەستهاتنی تایبەتمەندییەکانی سایکۆمێتریک ڕاپرسییەکە بەسەر (٥٠) مامۆستای پەیوەندار دابەشکرا، و بەهۆی سروشتی تایبەتی ڕاپرسییەکە وەك ڕێنمایی داوا لە مامۆستایان کرا کە بۆ وەڵامدانەوەیان سوود لە هیچ سەرچاوە و مامۆستایەکی تر وەرنەگرن تاکو ئەنجامەکە زانستییانە بێ و هەموو مامۆستایەکان ئەو چەندەیان لەبەر چاو وەرگرتبوو و ئەوە لە وەڵامدانەوەیان دیار بوو، و پاش کۆکردنیان و لادانی ئەو ڕاپرسییانەی کەموکوڕییان تێدا بوو، ئەوانەی تر کە ژمارەیان (٤٢) ڕاپرسی بوون چارەسەری ئاماریان بۆ کرا بە دانی نمرەیەك بۆ هەر وەڵامێك بۆ هەر بەشێك لە پرسیارەکان.

د – سوود لە فۆرمولەکانی ئاماری خوارەوە وەرگیراوە: **هاوکێشەی** پەیوەندیی پیرسۆن (کاظم، الطائي و الشکري، ٢٠١٣، ٢٧٣؛ Duann, 2001,207)، کێش و ڕێژەی سەدی (٪) و سیستەمی پرۆگرامی شرۆڤەکاری SPSS.

## بەشی چارەم:

**ئەنجام و گفتوگۆکردنی لێکۆڵینەوە**: لەم بەشەدا ئەنجام و گفتوگۆیی ئەنجامەکان بەپێی ئارمانج و گریمانەکان خراونەتە ڕوو:

١–سەبارەت بە ئامانجی یەکەم و پاش سوودوەرگرتن لە سیستەمی SPSS و **هاوکێشەی** (T-Test) بۆ تەنها نموونەیەك بە شێوەی خوارەوە:

**خشتەی (١)**

(T-Test) **ی وەدەستهاتوو و خشتەیی بۆ نموونەی توێژینەوە بە گشتی**

| ژمارەی سەمپل | تێکڕای نمرەکان | لادانی پێوەری | بەهای t | | نمرەی ئازاد | سەلماندنی ئامارەیی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | وەدەستهاتوو | خشتەیی | | |
| ٤٢ | ٤٨.٠٠ | ٢٠,٠٨٦ | ١,٢٩١ | ٢,٠٠٠ | ٤١ | ٠.٠٥ |

وەك لە خشتەی سەرەوە دیارە بەهای (T -Test) دەستکەوتوو کە بریتییە لە (١,٢٩١) کەمترە لە بەهای خشتەیی (T -Test) (٢,٠٠٠)، و ئەوەش لە ئاستی (٠,٠٥) و بە نمرەی ئازادی (٤١). و ئەوە واتە ئێمە گریمانەی صفری پەسند دەکەین واتە ئاستی هۆشیاری نموونەکەمان، کە مامۆستایانی بابەتی مافی مرۆڤە لە قوتابخانەکانی بنەڕەت لە بازێری زاخۆ، لە بارەی بابەتەکانی سیاسی لەسەر ئاستەکانی کوردستانی و ناوچەیی و جیهانی لاوازە و باش نییە. و توێژەر ئەو چەندە بۆ ئەوە دەگەڕێنێتەوە کە مامۆستایانی ناوبراو کەمتر بایەخ بە خۆدەولەمەندکردن و خۆ رۆشنبیرکردن دەدەن و هەربۆیەش نەیانتوانیوە وەك پێویست وەلأمی پرسیارەکانی راپرسییەکەی توێژینەوە بدەن. و لەوانەیە هەر ئەم مامۆستایانە لە میانەی وانە وتنەوەشدا تووشی پرسیاری هاوشێوە بېن و نەتوانن وەك پێویست وەلأمی قوتابییەکانیان بدەنەوە.

٢ – سەبارەت بە ئارمانجی دووەم کە پەیوەستە بە کاریگەری رەگەز لەسەر ئاستی هەبوونی هۆشیاریی سیاسی لە بارەی بابەتەکانی سیاسیی هاوچەرخ لە سەر ئاستەکانی کوردستانی و ناوچەیی و جیهانی و پاش سوودوەرگرتن لە پرۆگرامی SPSSخشتەی خوارەوە دەرکەوت:

**خشتەی (٢)**

**(T -Test) ی وەدەستهاتوو و خشتەیی بۆ دوو نموونەی توێژینەوە بەپێی رەگەز**

| ژمارەی سەمپل | تێکڕای نمرەکان | لادانی پێوەری | بەهای t | | نمرەی ئازاد | سەلماندنی ئامارەیی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | وەدەستهاتوو | خشتەیی | | |
| ٢٠ نێر | ٥٣,٣٠ | ١٩,٣٠٤ | ٠,٦١٣ | ٠,٠٢٥ | ٤٠ | ٠,٠٥ |
| ٢٢ مێ | ٤٣,١٨ | ١٩,٩٨٧ | | | ٣٩,٨٤٢ | |

خشتەی سەرەوە پیشان ددەات کە چونکە بەهای (t-test) وەدەستهاتوو (٠,٦٣١) لە هەمان بەهای خشتەیی (٠,٠٢٥) گەورەترە، بۆیە گریمانەی صفری پەسند دەکرێ، ئەوە بەپێی سەرچاوەکانی زانستی کە ئاماژە دەدەن بە ئەوەی کە ئەگەر ئاستی دەستهاتوو (sig) گەورەتر بێ لە ئاستی پشتبەستراو (کە لێرە

٠,٠٢٥) ئێمە گریمانـەی صـفری پەسـند و قـەبول دەکـەین (جـودە، ٢٠٠٨، ١٧٥)، واتە هیچ جیاوازییەك لە نێوان مامۆستایانی پیـاو و مامۆسـتایانی ئـافرەت نییـە و هـەموویان وەك یـەکن لـە لاوازی لـە بابـەت و رۆشـنبیری لـە بـواری بابەتـەکانی سیاسیی هاوچەرخ لە سەر ئاستی کوردستانی و ناوچـەیی و جیهـانی، و وەك یـەك ئاسـتی خـۆ رۆشـنبیرکردن لـە لایـان لاواز و کەمـە، و ئـەوەش کاریگـەری هـەبووە لەسەر چۆنیەتی وەڵامدانەوەیان بۆ پرسیارەکانی ڕاپرسـییەکە و ئاسـتێکی لاوازی نیشان داوە.

٣- سـەبارەت بـە گریمانـەی سـێیەم و هـەبوونی جیـاوازی لـە نێـوان مامۆستایانی بابەتی مافی مرۆڤ لە قوتابخانەکانی بنەڕەت لـە شـاری زاخـۆ بـەپێی ساڵانی خزمەت:

**خشتەی (٣)**

**(ANOVA) ی وەدەستهاتوو و خشتەیی بۆ نموونەی توێژینەوە بەپێی ساڵانی خزمەت**

| ساڵانی خزمەت | ژمارەی سەمپل | تێکڕای نمرەکان | لادانی پێوەری | نمرەی ئازاد | سەلماندنی ئامارەیی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١-٥ساڵ | ١٤ | ٤٩,٠٧ | ١٨,٢٦٩ | ٣ | ٠.٠٥ |
| ٦-١٠ ساڵ | ١٣ | ٥١,٣١ | ٢٤,٧٤٠ | ٣٨ | |
| ١١-١٥ ساڵ | ٧ | ٣٥,٨٦ | ١٦,٢٦٣ | | |
| ١٦ و سەرتر | ٨ | ٥١,٣٨ | ١٦,٨٦٠ | ٤١ | |
| گشتی | ٤٢ | ٤٨,٠٠ | ٢٠,٠٨٦ | | |

**خشتەی (٤)**

**(ANOVA) ی وەدەستهاتوو و خشتەیی بۆ نموونەی توێژینەوە بەپێی ساڵانی خزمەت**

| | کۆی چوارگۆشەکان | نمرەی ئازاد | ناوەندی چوارگۆشە | ئاستی بە ڕامان (sig) | بەهای دەستهاتوو |
|---|---|---|---|---|---|
| لە نێوان گرووپەکان | ١٢٨١,٥٧٠ | ٣ | ٤٢٧,١٩٠ | ٠,٣٧٦ | ٠,٠٥ |
| لە ناو گرووپەکان | ١٥٢٦٠,٤٣٠ | ٣٨ | ٤٠١,٥٩٠ | | |
| گشتی | ١٦٥٤٢,٠٠٠ | ٤١ | | | |

وەك لە خشتەی سەرەوە دیار دەبێ (F) دەستهاتوو (٠,٣٧٦) گەورەترە لە بەهای خشتەیی (٠,٠٥)، و ئەوە وەك لە سەرچاوەکانی زانستی ئاماژەی پێدراوە، ئەگەر ئاستی بە ڕامانی ( sig) کە بریتییە لە (٠,٣٧٦) گەورەترە لە ئاستی بەڵگەیی پشتبەستراو کە (٠,٠٥)، کەواتە گریمانەی صفری پەسند و قبول دەکرێ (جودە، ٢٠٠٨، ٢٤٢). واتە لێرەدا ساڵانی خزمەت هیچ کاریگەری لەسەر ئاستی رۆشنبیریی مامۆستایان نەبووە و هەموویان وەك یەك لە رووی ئاستی رۆشنبیریی سیاسی لە بابەتەکانی سیاسیی هاوچەرخ لاوازن، و ئەوە بە واتای ئەوەیە کە مامۆستایان لە هەموو ئاستەکانی تەمەن هیچ هەوڵی خۆ رۆشنبیرکردن نادەن.

## بەشی پێنجەم:

### دەرەنجام و ڕاسپاردە و پێشنیازەکان:

**أ – دەرەنجامەکان**بریتین لە بوونی ئاستێکی لاواز لە هۆشیاری و هەبوونی رۆشنبیریی سیاسی لای مامۆستایانی قوتابخانەکانی بنەڕەت لە ناوەندی شاری زاخۆ بە شێوەیەکی گشتی و بەپێی جیاوازیی رەگەزی و بێ جیاوازی لە ساڵانی خزمەت، لە ئاستە جیاوازەکانی ڕاپرسی کوردستان و ناوچە و جیهانی.

**ب – ڕاسپاردەکان:** بریتین لە دامەزراندن و سوودوەرگرتن لە دەرچووانی بەشەکانی ڕامیاریی زانستگەکانی کوردستان بۆ گۆتنەوەی وانە لە بابەتی (مافی مرۆڤ) لە قوتابخانەکانی بنەڕەت لە کوردستان بەگشتی و دەڤەری زاخۆ

بەتایبەتی، کردنەوەی بەشێکی تایبەت بە بابەتی مافی مرۆڤ بە هەمان ناو و نیشان لە کۆلیژەکانی مامۆستایانی بنەڕەت و یان کۆلێژی پەروەردەی زاخۆدا و دامەزراندنیان لەسەر میلاکی وەزارەتی پەروەردە، و یانکردنەوەی خولی زیاتری تایبەت بۆ بەرزکردنی ئاستی زانستیی ئەم مامۆستایانە.بایەخدانی مامۆستایان بە بابەتی خۆ رۆشنبیرکردن و سوود وەرگرتن لە سەرچاوەکانی جۆراجۆری وەك تەلەفزیۆن و رادیۆ و رۆژنامە و گۆڤارەکان کە ئێستا زۆر بە ئاسانی دەستدەکەون.

ج — **پێشنیازەکان بۆ توێژینەوەکانی داهاتوو بریتین** لە ئەمانەی خوارەوە:
ئەنجامدانی توێژینەوە بۆ زانینی ئاستی رەزامەندی مامۆستایانی بابەتی (مافی مرۆڤ) لە کاری وانەگۆتنەوە، و هەڵسەنگاندنی خودی خۆیان لە کاری مامۆستایەتیدا، و جێبەجێکردنی توێژینەوەیەك لەسەر کاری مامۆستایانی بابەتی مافی مرۆڤ بۆ زانینی ئەو ئاستەنگ و گرفتانەی رووبەڕوویان بووە لە ماوەی گۆتنەوەی ئەم بابەتە لەو قۆناغەدا، و توێژینەوەیەکی بەراوردکارانە لە نێوان مامۆستایانی بابەتی مافی مرۆڤ لە قۆناغەکانی بنەڕەت و ئامادەییەکان.

**ژێدەرەکان :**

**بە زمانی کوردی :**

١.بارزانی، نێچیرڤان (٢٠١٤). وتاری تایبەت بە هەڵبژاردنەکانی (٢٠١٤) لە شاری زاخۆ بۆ **مەبەستی بانگەشە بۆ کاندیدەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە (٢٦/٤/ ٢٠١٤)**، تەلەفزیۆنی زاخۆ .Zaxo tv، دەمژمێر (١٥ : ١٥) ئێڤاری.

٢.پێندرۆیی، (جەگەر سۆز)، محەمەد سالح (٢٠١٠). رۆشنبیر کییە؟،چاپی یەکەم، چاپخانەی هیڤی، کوردستان، (١٤٤) ل.

٣. تۆڤی، أنور (٢٠١٤). **جیهانگەری**، گۆڤارا هیزل ژ. (٢٧)، ل. ل. (٤٢ — ٥٠).

٤.فندی، هەکار (٢٠١٤). **کورد د دەستوورێن عێراقێدا (١٨٧٦-٢٠٠٥)**. گۆڤارا هیزل، ژ. (٢٧). ل. (٢٦-٣٤).

٥.سدیق، فۆئاد (٢٠٠٥). **دیموکراسی و ئیسلامی سیاسی**، چاپ ١، وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٧٥ ل.

٦. ڤێنسێنت، ئەندرۆ (٢٠٠٧). **ئایدیۆلۆژیا مۆدێرنە سیاسیەکان**، وەرگێڕان: عومەر مولودی، چ. یەکەم، خانی، (٥٨٦) ل.

٧. عەبدوللّا، فرست أحمد و تەیب، موئەید و ئەمین، تێلی (٢٠١١). **دیمۆکراسی و سیاسەت**، چاپی یەکەم، چاپخانا المستقبل، لوبنان، ٨١ ل.

٨. گیلنەر، ئەرنێست (٢٠٠٨). **پۆست مۆدێرنیزم و ئەقل و ئایین**، وەرگێڕان: بەهزاد حەوێزی، چاپی یەکەم، چاپخانەی خانی، دهۆك، کوردستان، (١٦١) ل.

٩.ماڕ، فیبی (٢٠١١). **مێژووی نوێی عێراق**، وەرگێڕان : حەمە شەریف حەمە غەریب و شێرکۆ احمد حەوێز، چ. ١، چاپخانەی ئاوێزە و رۆژهەلأت، هەولێر، (٥٦٠) ل.

١٠.میسری، فۆئاد مەجید (٢٠٠٠). **جیهانگیری سەرەتایەك بۆ تێگەیشتن لە بە جیهانیبوون، سەرمایە و پرۆسەی بەرهەمهێنان**، چ. ١، کوردستان، (٣٠١) ل.

١١.نەورۆلی، فارس (٢٠١٠). **مانا و چەمکەکانی چەند زاراوەیەك**، چاپی یەکەم، چاپخانەی گەنج، (١٩٢) ل.

**بە زمانی عەرەبی :**

١٢. الأمين، شاكر (٢٠٠٥). **الشامل في تدريس المواد الاجتماعية**، دار أسامة، عمان: الأردن، (٢٣٢)ص.

١٣. آرام، صباح (٢٠٠٤). **الملامح السياسية لتاريخ الكرد الحديث والمعاصر، ئاسۆی پەروەردەیی**، ص. (١٧٥).

١٤.جـودة، محفـوظ (٢٠٠٨). **التحليـل الإحصـائي الأساسـي باسـتخدام SPSS**، ط. ١، داروائل، (٣٤٦) ص.

١٥. حسين، برفان حمدى (٢٠١١). **دور العولمة في تغير القيم الأجتماعية لدى الشباب الجامعي – دراسة ميدانية في جامعة صلاح الدين**، رسالة ماجستير غير المنشورة، جامعة صلاح الدين، (١٤٧) ص.

١٦. الخليل، أحمد محمود (٢٠١٣). **الشخصية الكوردية، دراسة سوسيولوجية**، ط. ١، موكرياني، أربيل، كوردستان، ٣٠٤ ص.

١٧. الخوالدة، محمد محمود (٢٠٠٧). **أسس بناء المناهج التربوية و تصميم الكتاب التعليمي**، ط. ٢، دار المسيرة، عمان: الأردن، (٣٣٧)ص.

١٨. رشوان، حسين عبدالحميد أحمد (٢٠١٢). **حقوق الأنسان دراسات في علم الاجتماع القانوني**، مؤسسة شباب الجامعة الاسكندرية، (٣٢٩) ص.

١٩. سعيد، سعاد جبر (٢٠٠٨). **القيم العالمية و اثرها في السلوك الانساني**، ط١، عالم الكتب الحديث وجدارالكتاب العالمي،عمان،٣١٥ ص.

٢٠.سالم، صلاح (٢٠٠٣). **تكنولوجيا المعلومات و الإتصالات والأمن القومي للمجتمع**، ط. ١، عين للدراسات، (١٧٦)ص.

٢١. السالم، فيصل (١٩٨١). **أساسيات التنشئة السياسية الاجتماعية مع دراسات ميدانية في بعض دول الخليج**، جامعة الكويت، (١٩١) ص.

٢٢. سلامة، عادل أبو العز (٢٠٠٨). **تخطيط المناهج المعاصرة**، ط. ١، دارالثقافة، عمان: الأردن، (٤٠٠) ص.

٢٣. سلامة، عبدالحافظ (٢٠٠٢). **تخطيط وتطوير المنهج لطفل ماقبل سن المدرسة**، داراليازوري، عمان: الأردن، (٢٩١)ص.

٢٤. سيزر، داڤيد أو. و هادى، ليوني و جيرفس، روبرت (٢٠١٠). **المرجع في علم النفس السياسي**، ترجمة: ربيع وهبة و مشيرة الجزيري و محمد الرخاوي، الجزء الأول، المركز القومي للترجمة، ٦٠٢ ص.

٢٥. شحاتة، حسن (٢٠٠٧). **تصميم المناهج وقيم التقدم في العالم العربي**، الدار المصرية، ط. ١، (٣٥٩)ص.

٢٦. شكرى، بيوار تەها (٢٠١٤). **تقويم مدارس الأساس في محافظة دهوك في ضوء متطلبات التخطيط الاستراتيجي**، رسالة ماجستير غير المنشورة، جامعة زاخو.

٢٧. العاني، حسان محمد شفيق (١٩٨٨).**المبادىء النظرية لتحليل النظم السياسية في الجزائر و ايطاليا و فرنسا**، جامعة بغداد، مطبعة التعليم العالي، ١٨٢ ص.

٢٨. عبدالحميد، الهـام (٢٠٠٤). **التنشـئة السياسـية فـى العمليـة التربويـة،** ط ١، مركـز المحروسة، القاهرة.١٦٧ ص.

٢٩. عبدالله، عبـدالرحمن رحـيم. (١٩٩٧). **الترابـط العضـوي مـابين حقـوق الأنسـان و الديمقراطية،** گۆڤاری كاروانی ئەكاديمی. ژمارە ٢، بـەرگی يەكەم،هـەولێر، ل.(١٠٧- ١٢٧)

٣٠.عبدالمالك، البكاي ولد (٢٠١٣). **العقل والحرية في فلسفة هوبز السياسية،** تقديم: صالح مصباح، ط. الأول، لبنان، (٣٧٨) ص.

٣١. العـزي، سـويم (٢٠١٠). **علـم الـنفس السياسـي،** ط. ١، دار اثـراء، عمـان، الاردن، (٢٣٢) ص.

٣٢. كاظم، أموري، و خالد ضاري الطائي و عبدالمنعم كاظم الشكري (٢٠١٣). **الإحصاء التطبيقي أسلوب تحليلي باستخدام SPSS**، ط. ١، دار الذاكرة، ٤٠٠ ص.

٣٣. كريمي، عبدالعظيم ( ٢٠٠٧). **مرتكزات التربية و الديمقراطيـة (العقلانيـة، والمدنيـة والمعنوية)**، تعريب: عبدالرحمن العلوي، ط. ١، دارالهادي، بيروت، لبنان، (٣٣٤) ص.

٣٤. كليفلاند، هارلان (٢٠٠٠). **مـيلاد عـالم جديـد،** ترجمـة: جمـال علـي زهـران، ط. ١. المكتبة الأكاديمية، القاهرة، مصر، (٣٥٨) ص.

٣٥. معدل، منصـور (٢٠١٠). **مسـح القـيم العـالمي، القـيم كمـا تـدركها جمـاهير العـالم الاسلامي و الشرق الأوسط،** ترجمة: عبدالحميد عبداللطيف، المركز القومي للترجمـة، ٥٧٣ ص.

٣٦. النجار، صباح أحمد محمد (٢٠١٣). **العلاقات السوسيومترية في الجماعات الصغيرة،** ط. ١، دار حامد، عمان: الأردن، (١٩٦) ص.

٣٧. هوفة، أوتفريد (٢٠١٠). **مواطن الأقتصاد، مواطن الدولة، المواطن العالمي (الأخلاق السياسية في عصر العولمة).** ترجمة: عبدالحميد مرزوق، المركز القومي للترجمة، ٤٢٢ ص.

**بە زمانی فارسی:**

٣٨. اسدورو، لستر ام. (١٣٨٩). **روانشناسی،** ترجمه: جهانبخش صادقی، چ. ٣، مركز تحقيق وتوسعه علوم انسانی، تهران،(٦١٨) ص.

٣٩.تاسيگ، مارك و ميكلو، جانت و سوبد، سری (١٣٨٦). **جامعـه شناسـی بيماريهـای روانـی**، سـازمان مطـالعـه و تـدوين كتابهـای علـوم انسـانی دانشـگاهها، ترجمـه : د. عبدا... أحمدی، چاپ (١). تهران، ٤٠٧ ص.

٤٠.طلوعی، محمود (١٣٩٠). **فرهنگ جامع سیاسی**، چاپ چهارم، نشر علم، تهران،(١١٠٣) ص.

٤١.نجاتی، حسین (١٣٧٦). **روان شناسی نوجوانی، چگونگی رفتار با نوجوانان**، چاپ سوم، بیکران، (٢٣٩) ص.

**به زمانی روسی:**

42. Генкин Б. М.(2005). **Экономика и социология труда**: учебник для вузов.-5-е изд., -М. :НОРМА,-416с.

**به زمانی ئینگلیزی:**

43. Colman، M. Andrew (2009). **Oxford Dictionary of Psychology**، 3th. Ed. Oxford university press، USA، 882pp.
44. Dunn, Dana S. (2001). **Statistics and data analysis for the behavioral sciences**, 1st ed., McGraw-Hill, NY. 582 pp.
45. Gleitman, Henry, Fridlund, Alan J., Reisberg, Daniel. (2004). **Psychology**. 6th. Ed. Norton &company, NY. London. 705pp.

## پاشکۆ (١)

**ناوونیشانی ئەو پسپۆر و شارەزایانەی کە بۆ دەرخستنی راستی راپرسی سوودیان لێوەرگیراوە:**

| ژ | ناوی پسپۆر یان شارەزا | شوێنی کارکردن | پسپۆری |
|---|---|---|---|
| ١ | پ. د. سابر عەبدوڵڵا سەعید | زانینگەی دهۆك/ سکولی پەروەردەی بنیات | پێوانە و هەڵسەنگاندن |
| ٢ | پ. د. مەولوود حەمەد نەبی خەلیفانی | زانینگەی دهۆك/ سکولی پەروەردەی بنیات | شێوازی وانەگۆتن/ زمانی کوردی |
| ٣ | پ. د. خالد سەعید تەوفیق | زانینگەی سەلاحەددین/ کۆلیژی یاسا و رامیاری | سیاسەت |
| ٤ | پ. هـ. د. ئەحمەد قاسم محەمەد | زانینگەی زاخۆ/ سکولی پەروەردە / بەشی پەروەردەی وەرزشی | شێوازی وانەگۆتنی وەرزشی |
| ٥ | پ. هـ. د. ئازاد ئۆسمان سالح | زانینگەی سەلاحەددین/ کۆلیژی یاسا و رامیاری | سیاسەت |
| ٦ | پ. هـ. د. محەمەد سدیق حەسەن | زانینگەی زاخۆ/ سکولی ئاداب / بەشی مێژوو | مێژوو |
| ٧ | پ. هـ. د. هۆگر تاهر تەوفیق | زانینگەی زاخۆ/ سکولی ئاداب / بەشی مێژوو | مێژوو |
| ٨ | پ. هـ. د. دیار عەبدولکەریم سەعید | زانینگەی زاخۆ/ سکولی ئاداب / بەشی زمانی کوردی | شێوازی وانەگۆتن/ زمانی کوردی |
| ٩ | م. د. سەتار جەبار حاجی | زانینگەی زاخۆ/ سکولی پەروەردە / بەشی دەروونناسی | شێوازی وانەگۆتن/ مێژوو |

## ملخص البحث

### الوعي المعرفي بالقضايا السياسية المعاصرة لدى معلمي المدارس الأساسية في مركز قضاء زاخو

تهدف الدراسة الحالية الى إثبات الفرضيات الأحصائية حول فروق ذات دلالة احصائية بين مستوى الوعي المعرفي بالقضايا السياسية المعاصرة لدى معلمي مادة حقوق الإنسان للمدارس الأساسية في مركز قضاء زاخو حسب متغيرات الجنس وسنوات الخدمة للسنة الدراسية (٢٠١٤/٢٠١٥). شملت مجتمع البحث وعينته (١٠٣) و (٤٢) معلم ومعلمة. استخدم الباحث المقابلة واستبيان مكون من (٣٤) فقرة. من أهم نتائج التي وصلت اليها الدراسة هي: ضعف معلمين ومعلمات مادة حقوق الانسان في مدارس الأساس في مركز قضاء زاخو في الوعي المعرفي حول القضايا السياسية المعاصرة بصورة عامة ولايوجد فروق ذات دلالة احصائية حسب الجنس وسنوات الخدمة لديهم، كما وقدم الدراسة عدد من التوصيات والمقترحات في ضوء النتائج.

# Abstract

**Cognitive awareness in contemporary political subjects among teachers of (human rights) subject in the Basic schools in the city of Zakho**

The aim of study is to testify the statistical hypotheses concerning the significant differences among teachers of (human rights) subject point of view according to the variables of gender and years of service in the Basic schools in the city of Zakho in the academic year (2014/2015) in cognitive consciousness in contemporary political subjects. The population and the sample of the research consist of (103) and (42) teachers. The researcher has used the interview and questionnaire which includes (34) items. The results of the research reveal that there is weakness in cognitive consciousness in contemporary political subjects among teachers of (Human Rights) subject in the city of Zakho, also there is non-statistical significant differences among them according to the variables of gender and years of service. The study presented some suggestions and recommendations in the light of results.

# لاوان و پرسی راگەیاندنی دەوڵەت

## ( توێژینەوەیەکی مەیدانییە لە هەرێمی کوردستان- عێراق )

**م. ی. هەردی زیاد ساڵح**
کۆمەڵناسی / فاکەڵتی پەروەردە/
زانکۆی کۆیە

**پێشەکی:**

وادادەنرێت دەوڵەت دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی سیاسییە، لە کۆنەوە بوونی هەبووە. هزری مرۆیی زۆر بە دەوڵەتەوە خەریك بووە، بابەت و جێگای گرنگپێدانی فەیلەسووف، زاناکان، بیرمەندان، سیاسییەکان، ئابووریناسان و کۆمەڵناسان...تاد بووە (عبدالرحمن، ٢٠٠١، ص٣٠٢). هەروەها دەوڵەت بە گەورەترین بنیاد، رێکخراو و گرنگترین بناغەی سیستەمی سیاسی هەر کۆمەڵگەیەك دەژمێردرێت، بایەخی دەوڵەت بە رادەیەکە کە هەندێك لە توێژەران، زانستی سیاسەت و کۆمەڵناسییان بە زانستی لێکۆڵینەوە لەسەر دەوڵەت و بابەتەکانی پەیوەندیدار بەوەوە زانیوە (زادە، ٢٠٠٧، ل١٩٧). دەوڵەت لە فۆرمە مۆدێرنەکەیدا تا سەدەی پانزەش پەیدا نەبووبوو (هێیوود، ٢٠٠٧، ل١٢٧). چەمکی نوێی دەوڵەت، کە لە سەدەی شازدەهەم بەهۆی هەوڵەکانی (ماکیاڤیللی و ژان بۆدان)ەوە لە ئەوروپا سەری هەڵدا و لە سەدەکانی (١٧و ١٨) و لەگەڵ شۆڕشی فەرەنسادا جێگیر بوو (وەڵەد بەگی، ٢٠٠٥، ل١٩١).

پرسی دەوڵەتی کوردیش خەونێکی لەمێژینەی میللەتی کوردە، بە درێژایی مێژوو کورد چەندین قوربانی و هەوڵ و تێکۆشانی لە پێناو ئازادی و بەدەستهێنانی قەوارەیەکی سەربەخۆ داوە، لاوانیش لە هەر کۆمەڵگەیەکدا توێژێکی چالاك و گرنگن، دەشێ ئەو گۆڕانکارییە کولتووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییانەی لە هەر کۆمەڵگەیەك دێتە کایەوە لاوان تیایدا پێشەنگ بن.

بە گشتی ئـەم توێژینەوەیـە لـەبارەی (**لاوان و پرسـی راگەیانـدنی دەوڵـەت، توێژینەوەیەکی مەیدانییە لە هـەرێمی کوردسـتان– عێـراق**)، یەکێکـە لـەو هەوڵـە زانسـتییانەی لــە پرســی راگەیانــدنی دەوڵــەتی کــوردی لــە روانگــەی لاوانــەوە دەتوێژێتەوە و لە (چوار بەش) پێکهاتووە. لە بەشی یەکەمدا چوارچێوەی تیـۆری لـە دوو باسـدا خراوەتـەڕوو، لـە باسـی یەکەمـدا کێشـە و گرنگـی و ئامانجـەکانی توێژینەوەکـە خـراونەتـەڕوو. لـە باسـی دووەمیشـدا چـەمکەکانی (لاو و دەوڵـەت) پێناسە و شرۆڤەیان بۆ کراوە. هەروەها بەشی دووەمیش تایبـەتکراوە بـە تـوخم، جۆرەکـان و گەشەسـەندنی دەوڵـەت، بەسـەر دوو بـاس دابەشـکراوە، لـە باسـی یەکەمدا باسی توخمە پێکهێنەر و جۆرەکانی دەوڵـەت کـراوە. لـە باسـی دووەمـدا تیۆرەکانی شیکردنەوەی دروستبوونی دەوڵەت خراونەتەڕوو.

بەشـی سـێیەمی ئـەم توێژینەوەیـە تایبـەتکراوە بـە چوارچـێوەی مەیـدانیی توێژینەوەکە، ئەویش لە پێنج خاڵدا خراوەتەڕوو، لە خاڵی یەکەمـدا دەستنیشـانی میتۆدە بەکارهاتووەکانی توێژینەوەکـە کـراوە. لـە خـاڵی دووەمیشـدا کۆمەڵگـە و نموونـەی توێژینـەوە دەستنیشـان کـراوە. ئینجـا لـە خـاڵی سـێیەمدا بوارەکـانی توێژینەوە دیاریکراوە. لە خاڵی چوارەمیشـدا ئـامرازی کۆکردنـەوەی زانیارییـەکان (پرسـیارنامە) خراوەتـەڕوو، لـە خـاڵی پێنجـەم و کۆتاییـدا ئـامرازە ئامارییـە بەکارهاتووەکان لەم توێژینەوەیـەدا خراوەتـەڕوو. هـەروەها لـە بەشـی چـوارەم و کۆتاییدا لە دوو باسدا لەژێر ناونیشانی شیکردنەوەی زانیارییەکان و ئەنجامـەکانی توێژینـەوە خراوەتـەڕوو، لـە باسـی یەکەمـدا تایبـەتکراوە بـە خسـتنەڕوو و شـیکردنەوەی زانیارییـەکانی توێژینـەوە، هـەروەها لـە باسـی دووەمـدا ئـەنجام و راسپاردەکانی توێژینەوە خراوەتەڕوو.

## ١- چوارچێوەی گشتی توێژینەوە:

### ١-١: کێشە، گرنگی و ئامانجەکانی توێژینەوە:

#### ١-١-١: کێشەی توێژینەوە:

یەکێك لەو بابەت و باسانەی لەو دوو ساڵەی رابردوودا لە هەرێمی کوردستان جێگەی بایەخ و گرنگیپێدانە لەلایەن حکومەت، حزبە سیاسییەکان، رۆشنبیران، دەزگاکانی راگەیاندن و تەنانەت خەڵکە ئاساییەکەی ناو کۆمەڵگەش، پرسی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردییە، بەجۆرێك لەلایەن حکومەتی هەرێمەوە هانی وەبەرهێنان و دروستکردنی پرۆژە جیاوازەکان، رازیکردنی وڵاتان بە کردنەوەی باڵیۆزخانە و دڵنیایی پێدانیان بە ئارامیی ناوچەکە، ئەمەش بەمەبەستی بەدەستهێنانی پشتگیری نێودەوڵەتی و بووژانەوەی کەرتی ئابووری و بەدەستهێنانی ئابووریی سەربەخۆ دێت. هەروەها لەسەر ئاستی زۆربەی حزبە سیاسییەکانی هەرێمی کوردستان بابەتی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی بووە بەشێك لە کارنامە و پرۆژە و راسپاردەکانی کۆنگرەکانی ئەو حزبانە. هەروەها لەپاڵ ئەمانەشدا زۆربەی دەزگاکانی راگەیاندنیش وەکو گۆڤار، رۆژنامە، رادیۆ، سەتەلایت و تەلەفزیۆنەکان شرۆڤە و قسەوباسیان لەبارەی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردییەوە بوو، بەتایبەت لە بۆنە و یادە جیاوازەکاندا.

لاوانیش وەکو توێژێکی گرنگ لە هەر کۆمەڵگەیەکدا هەوڵی بەدیهێنانی گۆڕانکاری و نوێگەری لەناو کۆمەڵگەدا دەدات، هەروەها داهاتووی هەر کۆمەڵگەیەك بەندە بە ئاستی متمانە و هۆشیاریی لاوەکانی لەناو کۆمەڵگەدا هەربۆیەش دەبینرێت زیاتر لاوان لە سەنگەرەکانی پێشەوەی بەرگری لە خاك و داینەمۆی گشت شۆڕش و سەرکەوتنەکانن.

لەم روانگەوە بابەتی (لاوان و پرسی راگەیاندنی دەوڵەت) یەکێکە لەو توێژینەوانەی هەوڵدەدات پرس و راوبۆچوونی لاوان لەبارەی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردییەوە بزانێت، بۆیە بەگشتی کێشەی ئەم توێژینەوەیە بە دوای وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە سەرەکییەیە، ئەویش ئایا لاوان لە ئێستادا لەگەڵ راگەیاندنی دەوڵەتی کوردیدان؟

**١-١-٢: گرنگی توێژینەوە:**

گرنگی ئەم توێژینەوەیە لەم چەند خاڵەی لای خوارەوەدا دەخەینەڕوو:

– لەبەر ئەو بایەخەی کە دەوڵەت هەیەتی لای هەر تاکێکی کوردی بابەتێکی هەنووکەییە، ئەوا بایەخی ئەم توێژینەوەیە لەوەدایە، کە دەیەوێت بەشێوەیەکی زانستی و ئەکادیمی بابەتی پرسی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی لە روانگەی لاوانەوە شرۆڤە و شیکردنەوەی بۆ بکات.

– ئەو گۆڕانانەی لەم چەند ساڵەی دوایی بەسەر هەرێمی کوردستاندا هاتووە، کاریگەری لەسەر هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگە دروست کردووە، دەشێ توێژی لاوان لە هەموو توێژەکانی دیکەی ناو کۆمەڵگە زیاتر بکەونە ژێر کاریگەریی گۆڕانە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان، ئەمە وای لێکردووە کە توێژینەوە لەسەر ئەم توێژە (لاوان) و (دەوڵەتی کوردی) سەنگ و قورسایی و بایەخی خۆی هەبێت.

**١-١-٣: ئامانجەکانی توێژینەوە:**

ئەم توێژینەوەیە هەوڵدەدات بۆ گەیشتن بە چەند ئامانجێک، کە لە خوارەوەدا خراونەتەڕوو:

– ئایا لاوان لە ئێستادا لەگەڵ راگەیاندنی دەوڵەتی کوردیدان؟، هەروەها ئایا لاوان دەوڵەتی کوردییان دەوێت و ئامادەن لەپێناویدا قوربانی بدەن و بەرگەی قەیرانە ناوخۆیی و دەرەکییەکان بگرن؟، لە دواییدا تێڕوانینی لاوان چییە بەرامبەر بە ئایندەی دەوڵەتی کوردی؟

– بەراوردکردن و جیاوازیی نێوان لاوان بەرامبەر پرسی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی بەپێی گۆڕاوەکانی توێژینەوە. واتە وەڵامدانەوەی ئەو گریمانەیەی کە دەڵێت: (جیاوازی لە نێوان تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بەپێی گۆڕاوەکان هەیە، سەبارەت بە پرسی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی).

## ١-٢: ناساندن و روونکردنەوەی چەمکەکان:

### ١-٢-١: لاو (Youth):

چەمکی لاو لەو چەمکانەیە کە پێناسەی جۆراوجۆر لەخۆ دەگرێت، لەڕووی کردارییەوە پێناسەی لاوان جیاوازە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە، کە پشت بە فاکتەرەکانی رۆشنبیری، سیاسی و کۆمەڵایەتی هەر وڵاتێك دەبەستێت (الأنصاري، ٢٠٠٨، ص٦٨)، **هەروەها** جیاوازی لە نێوان توێژەر و پسپۆرەکان هەیە سەبارەت بە دیاریکردنی ئەم چەمکە، هەندێکیان وای دادەنێن ماوەیەکی تەمەنییە، هەندێکیشیان وەکو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی سەیری دەکەن، هەندێکی دیکەشیان وای دادەنێن کە دیاردەیەکی دەروونیی جەستەیییە (رشوان، ٢٠٠٦، ص٣)، لە ئەنجامی ئەو جیاوازییانەش لەبارەی دیاریکردنی چەمکی لاو، چەند ئاراستەیەك سەریان هەڵدا، لەوانە:

– **ئاراستەی کۆمەڵایەتی:** زانایانی کۆمەڵناسی پێیانوایە قۆناغی لاوێتی کاتێك دەستپێدەکات کە کۆمەڵگە هەوڵدەدات تاك ئامادە بکات بۆ ئەوەی پێگەیەکی کۆمەڵایەتی داگیر بکات و، رۆڵێك یان کۆمەڵە رۆڵێك لە بونیادنانی کۆمەڵگەدا بگێڕێت، قۆناغی لاوێتی کۆتایی دێت کاتێك لاو توانی پێگەیەکی کۆمەڵایەتی داگیر بکات و دەست بکات بە جێبەجێکردنی یان گێڕانی رۆڵەکانی لەناو کۆمەڵگەدا (الزيود،٢٠١١، ص٤٦) (موسى، ٢٠٠٩، ص١٧).

**هەرچی ئاراستەی کاتی (الزمني) یان تەمەنییە:** وای دادەنێت لاو قۆناغێکی زەمەنییە، دەکەوێتە نێوان تەمەنی (١٨- بۆ ٢٥ یان ٣٠)ساڵی (حجازي، ٢٠٠٨، ص١٩)، یان تەمەنی (١٨- ٣٠) ساڵی (بوعناقة، ٢٠٠٧، ص٤٠)، کە لەو قۆناغەدا گەشەی جەستەیی و ئەقڵی تەواو دەبێت، تاك دەتوانێت وەزیفە جیاوازەکان جێبەجێ بکات (الزيود،٢٠١١، ص٤٦). یان لاو بریتییە لەو دەستە تەمەنییەی دەکەوێتە نێوان (١٥ بۆ ٣٥) ساڵی (خاطر، ٢٠١٤، ص١٥). هەروەها لە بەیاننامەی بەرشەلۆنەی نێودەوڵەتی کە لە ساڵی ١٩٩٨ بەسترا، تیایدا تەمەنی لاو بە (١٨- ٣٥) ساڵی دەستنیشان کردووە (الذيفاني، ٢٠٠١، ص٢٤). لە پێناسەیەکی دیکەدا (ئەریك ئەریکسۆن- Eric Aricson) پێیوایە قۆناغی لاوێتی بە قۆناغی نەوجەوانی (المراهقة) دەستپێدەکات و بە تەمەنی (٤٠) ساڵی کۆتایی دێت (غباري، ١٩٩٩، ص١٠).

بەڵام لایەنگرانی **ئاراستەی دەروونی:** پێیانوایە لاوێتی قۆناغێکی تەمەنی نییە، کە تایبەت بێت بە تەمەنێکی دیاریکراو، بەڵکو حاڵەتێکی دەروونییە و پەیوەندیی بە تەمەنی زەمەنی نییە، مرۆڤ لاوە بە ئەندازەی هەستکردن بە چالاکی و گڕ و تین تیایدا، چالاکی و خواستەکان و، بەهیوابوون بە ژیان...تاد (الزیود، ٢٠١١، ص٤٦).

لە کۆتاییدا لایەنگرانی **ئاراستەی بایۆلۆژی:** لاوێتی بە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیان دادەنێن، داکۆکی لەسەر گەشە و کامڵبوون وەکو واقعییەتێکی بایلۆژی دەکەن (ذکائي، ٢٠٠٨، ص٢٣)، زانایان پێیانوایە کۆتایی ئەم قۆناغە (لاوێتی) بە تەواوبوونی گەشەسەندنی بنەما جەستەیی و فیزیکییەکان دێت لەڕووی گەشەسەندن و تەواوبوونی هەموو ئەندامەکانی جەستە، کە کۆمەڵە وەزیفەیەکی دیاریکراویان لە بونیادنانی جەستەدا هەیە، ئینجا ئەندامی ناوەوە بێت یان دەرەوە (موسی، ٢٠٠٩، ص١٧). یان بریتییە لەو قۆناغەی دەکەوێتە نێوان قۆناغی منداڵی و قۆناغی پێگەیشتندا (الرشد)، لە ئەنجامیدا دەبێتە هۆی پێگەیشتنی لایەنی جەستەیی، ئەقڵی، هەڵچوون و سۆزدارییەکانی(خاطر، ٢٠١٤، ص١٥).

**پێناسەی توێژەر بۆ چەمکی لاو،** (لاو بریتییە لەو تاکانەی دانیشتووی شاری "هەولێر، سلێمانی و دهۆك"ن، کە تەمەنیان لە نێوان "١٨- ٣٥" ساڵیدایە، ئینجا چ پیاو بن یان ئافرەت، نەخوێندەوار بن یان هەڵگری بڕوانامەی خوێندنی باڵا بن).

**١-٢-٢: دەوڵەت (State):**

چەمکی دەوڵەت یەکێکە لەو چەمکانەی کە گەلێك پێناسەی جیاوازی بۆ کراوە. (دەوڵەت) کە هاوواتا ئینگلیزییەکەی (State) و لاتینییەکەی (Status)ە، لە چەمکی (Stare) بە واتای "ڕاوەستاو" وەرگیراوە (محەممەدی و زادە، ٢٠٠٦، ل٢١٧) (شبیب، ٢٠١١، ص٣٥٢- ٣٥٣). زانایان بەپێی پسپۆڕییە جیاوازەکانیان پێناسەی دەوڵەتیان کردووە، بۆیە هەندێکیان لە ڕوانگەی یاسایی، یان سیاسی و کۆمەڵناسی باسیان لەم چەمکە کردووە و پێناسەیان کردووە.

یەکەم کەسێك لە زانستە سیاسییەکان وشەی دەوڵەتی بەکارهێنابێت (ماکیاڤیللی) بوو کە دەڵێ: هەر هێزێك بتوانێ دەسەڵاتی خۆی بەسەر تاکەکاندا جێبەجێ بکات ئەوا بە دەوڵەت ئەژمار دەکرێت، ئینجا پاشایەتی یان کۆماری بێت

(الأسود، ٢٠٠١، ص٧٧). (جارنەر—Garner) لە رووی سیاسییەوە پێناسەی دەکات و پێیوایە دەوڵەت لە کۆمەڵە خەڵکێك پێکدێت ئینجا ژمارەیان زۆر یان کەم بێت، بەشێوەیەکی هەمیشەیی لەسەر پارچە زەوییەکی دیاریکراو دەژین، بەشێوەیەکی تەواو یان نیمچە تەواو لـە دەسـەڵاتی (السـیطرة) دەرەکـی سـەربەخۆن، هـەروەها حکومەت رێکخراوی تایبەت بەخۆی هەیـە، وا لـە هاوڵاتیـان دەکـات کـە بەتـەواوی گوێڕایـەڵی بـبن (الطبیـب، ٢٠٠٧، ص١١٣) (عبـدالرحمن ٢٠٠١، ص٢٩٤). یـان دەوڵـەت قەوارەیەکی سیاسی و یاسایی رێکخراوە، نوێنەرایەتی کۆمەڵە تاکێکی دانیشـتووی سـنوورێکی دیـاریکراو دەکـات و، کاروبارەکانیـان بـۆ رێـك دەخـات(سـلطان، ٢٠٠٨، ص٦٦).

یاساناسـانیش لـە نموونـەی (هولانـد— Holland) و (لابانـد— LA band) پێناسـەی دەوڵـەتیان کـردووە، ئـەوەی یەکـەمیان (هولانـد) پێناسـەی کـردووە بەوەی، کە کۆمەڵە تاکێکن لە هەرێمێکی دیاریکراودا دەژیـن، ملکەچـی دەسـەڵاتی زۆرینە یان دەسـەڵاتی توێـژێك لـە خۆیـان دەبـن (اسماعیـل، ٢٠٠٨، ص١٩)، هەرچـی (لابانـد)ە، پێناسـەی کـردووە بـەوەی کۆمـەڵێکن پیـادەی مافـەکانی سـەروەری (سـیادة) دەکـەن، بەرامبـەر تاکـەکان یـان ئەندامـەکانی خۆیـان(عبـدالرحمن ٢٠٠١، ص٢٩٤). لە پێناسەیەکی دیکەدا وتراوە، دەوڵەت دامەزراوەیەکی سیاسی یاساییە دروسـت دەبێـت کاتێـك کۆمـەڵێك خـەڵك بەشـێوەیەکی هەمیشـەیی لـە هـەرێمێکی دیـاریکراودا دەژیـن و، ملکەچـی دەسـەڵاتێکی بـاڵا دەبـن، ئـەم دەسـەڵاتەش سـەروەریی خـۆی هەیـە و لەسـەر تاکـەکان جێبـەجێی دەکـات)(الشـریفی، ٢٠١٠، ص١١٨).

هـــەروەها زانایـــانی کۆمەڵناســـی پێناســـەی دەوڵـــەتیان کـــردووە، لەوانـــە (جینیزبێرگ—Ginsberg) وا دادەنێت دەوڵـەت وەکـو رێکخسـتنێکی کۆمەڵایـەتی لـەناو هـەموو کۆمەڵگەکانـدا بـوونی هەیـە، بـۆ پاسـەوانی ئەندامـەکانی و جێبـەجێکردنی کۆمـــەڵێك ئـــەرکی تایبـــەت بـــە یاســـا و رێســـا گشـــتییەکان بـــۆ بـــەرێوەبردنی سســـتەمەکە(عبـدالرحمن ٢٠٠١، ص٢٩٤). (روبـرت ماکیڤـەر—R. Maciver)یـش پێیوایـە دەوڵەت رێکخستنێکی گشـتگیرترە لـە حکوومـەت کـە دەسـتوور و یاسـاو رێسـای خۆی هەیە و حکوومەت جێبەجێیان دەکات (عبدالرحمن ٢٠٠١، ص٢٩٤)(الطبیب، ٢٠٠٧، ص١١٣).

هەروەها (کارل مارکس–Karl Marx– ١٨١٨ -١٨٨٣ن) دەوڵەت بە ئامرازێك دەزانێ بەدەست سەرمایەدارەکانەوە و، بە ئەنجامی ململانێی چینایەتی دادەنێت، کە بەهۆیەوە چینە ستەمدیدەکان لە کۆت و بەندی دیلێتیدا دەمێننەوە(وەڵەد بەگی، ٢٠٠٥، ل١٨٩– ١٩١). هەروەها پێیوایە دەوڵەتی نوێ جگە لە لیژنەیەك بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری سەرمایەداران شتێکی دیکە نییە(سکوت، ٢٠٠٩، ص٢٠٠). کەچی (ماکس ڤیبەر–M. Weber– ١٨٦٤ -١٩٢٠ ن) وادادەنێت دەوڵەت ڕێکخستنێکی ئەقڵانییە (Rational Organization)، سەرکردەیەکی هۆشیار و کامڵیان هەیە، هەوڵدەدات بە بەکارهێنانی خۆزاڵکردن (قهر) ئامانجەکانی جێبەجێ بکات (القادري، ٢٠٠٩، ص٢٥٥) (عبدالرحمن ٢٠٠١، ص٢٩٤). یان پێناسەکراوە بەوەی ڕێگایەکە لە ڕێگاکانی ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵی (جماعی) لە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا (لاسکي، ٢٠١٢، ص١٩). یان دەوڵەت ئەو دەسەڵاتەیە، کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان ڕێك دەخات، یاساکان دادەنێت و جێبەجێیان دەکات، بە جۆرێك لە ڕێککەوتن یان کۆڕایی یان بە پەیوەندییەکی دیاریکراو لە نێوان دەسەڵاتدار و دەسەڵات بەسەرکراودا سەر هەڵدەدات (عبدالکافي، ٢٠٠٥، ص٢٠٥).

**پێناسەی توێژەر بۆ چەمکی دەوڵەت**، "دەوڵەت دامەزراوەیەکی سیاسی یاسایی ڕێکخراوە، وەکو ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی لەناو زۆربەی کۆمەڵگەکاندا بوونی هەیە، خاوەنی سەروەرییە و دەستوور و یاساو ڕێسای تایبەت بەخۆی هەیە. کاتێك دروست دەبێت کە کۆمەڵە خەڵکێکی دیاریکراو جا ژمارەیان زۆر یان کەم بێت، بەشێوەیەکی هەمیشەیی لە هەرێمێکی دیاریکراودا بژین و ملکەچی دەسەڵاتێکی باڵا بن".

## ٢- توخم، جۆرەکان و گەشەسەندنی دەوڵەت:

### ٢-١: توخمە پێکهێنەر و جۆرەکانی دەوڵەت:

#### ٢-١-١: توخمە پێکهێنەرەکانی دەوڵەت:

لە ئەنجامی پێناسەکردن و ناساندنی چەمکی دەوڵەت، دەتوانین بڵێین توخمە پێکهێنەرەکانی یان بنەماکانی دەوڵەت بریتین لە:

**٢-١-١-١: دانیشتوان (Population) :**

وا دادەنرێت دانیشتوان یان میللەت و گەل لە پێکهێنەرە سەرەکییەکانی دروستکردنی دەوڵەت بێت، ئینجا کۆبوونەوەی کۆمەڵە تاکێك بەشێوەی هەمیشەیی ژمارەیان کەم یان زۆر بێت بە بنچینەی دروستبوونی دەوڵەت دادەنرێت (سلطان، ٢٠٠٨، ص٦٧). ئەو دانیشتوانەی ملکەچی یاساکانی دەوڵەتێك دەبن، بۆ دوو جۆر دابەش دەبن، ئەوانیش هاوڵاتیانی رەسەن و بیانییەکانن (برو، ١٩٩٨، ص١١١)، هەروەها کۆمەڵە رایەڵێك پێکەوەیان دەبەستێتەوە وەکو زمان، ئایین، گونجان، هەرێمێکی دیاریکراو و ئارەزووی ژیان تیایدا، ئینجا مێژووی هاوبەش و بەرژەوەندی هاوبەشیان پێکەوە هەبێت (الأسود، ٢٠٠١، ص٨٠). ئەم فاکتەرانەش جۆراوجۆر و کەمو زیاد دەبن لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی دیکە (اسماعیل، ٢٠٠٨، ص٢٤) (الطبیب، ٢٠٠٧، ص١١٤).

**٢-١-١-٢: هەرێم (Territory):**

هەرێم بریتییە لە رووبەرێکی جوگرافی جا گەورە بێت یان بچووك (سلطان، ٢٠٠٨، ص٦٧) یان ئەو هەرێمە چ رووبەرێکی ئاوی، دورگەیەك یان پارچە زەوییەکی دیاریکراو بێت، تاکەکان تیایدا جێگیر دەبن و یارمەتیدەر دەبێت بۆ دروستکردنی کۆویژدان و سەقامگیری کۆمەڵگە و بەردەوامبوونی بە شێوەیەکی رێکخراو (اسماعیل، ٢٠٠٨، ص٢٩)، هەروەها لە ئەنجامی بەکۆمەڵایەتیبوون و گواستنەوەی بەردەوامی کەلەپووری کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە، پێوەی وابەستە دەبن و تاکەکانی ئینتیمایان بۆی دەبێت(برو، ١٩٩٨، ص١٠٦- ١٠٧) (الأسود، ٢٠٠١، ص٨٠).

**٢-١-١-٣: حکوومەت یان دەسەڵاتی سیاسی (Government of Political Power):**

بریتییە لە بەڕێوەبردن یان سستەمی سیاسی بۆ دەوڵەت، یاخود بریتییە لە دەسەڵاتی سیاسی (ڕێکخستن و دامودەزگاکان و سستەمە سیاسی و کارگێڕییەکان دەگرێتەوە)(عبدالرحمن، ٢٠٠١، ص٣٠٠)، کە تاکەکانی کۆمەڵگە ملکەچی یاساکانی دەبن(الأسود، ٢٠٠١، ص٨٠). هەندێك پێیانوایە رازیبوونی هاوڵاتیان بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت لەلایەن دەسەڵاتداران کارێکی زۆر پێویستە، بۆئەوەی ئارامی و بەردەوامی لەناو کۆمەڵگەدا بێتە کایەوە(اسماعیل، ٢٠٠٨، ص٣٣).

**٢-١-١-٤: سەروەری (Sovereignty):**

سەروەری تایبەتمەندی سەرەکی دەوڵەتە، لەبنەڕەتدا چەمکێکی یاساییە و ئاماژە دەکات بە هێزی باڵا بۆ دەوڵەت(المشاقبة، ٢٠١١، ص١٧)، هەموو دەوڵەتێك دەستەیەك یان دەزگایەکی خاوەن سەروەری هەیە و خاوەن هێزی باڵایە کە مافی گۆڕینی ویستی دەوڵەتی هەیە بۆ چەند دەقێکی یاسایی (الحسن، ١٩٩٩، ص٣٤٤)، بەو واتایەی دەوڵەت دەبێت دەسەڵاتی بەسەر زەوی و تاکەکانی هەبێت، بەبێ ئەوەی هیچ لایەنێکی دەرەکی و ناوخۆیی بەشداری تێدا بکەن. هەر بۆیە (ژان بۆدان- Jean Bodin- ١٥٣٠- ١٥٩٦ز) کە یەکەم کەس بوو ئەم چەمکەی بەکارهێنا دەڵێت: دەوڵەتێکی خاوەن سەروەری فەرمانەکان دەردەکات بەبێ ئەوەی فەرمان لە هیچ کەسێك وەربگرێت (الأسود، ٢٠٠١، ص٨١). یان بەشێوەیەکی دیکە واتە، توانای دەوڵەتە بۆ بنیادنانی سیاسەتی دەرەکی و ناوخۆیی بەبێ هیچ ملکەچییەك بۆ ویستێکی دەرەکی، ئەمەش بە سروشتی خۆی لە کاتی دەرکردنی بڕیارەکانی ئازادی بۆ دەوڵەت دەهێنێتە کایەوە (الطیب، ٢٠٠٤، ص١٣٠).

**٢-١-١-٥: دانپێدانانی نێودەوڵەتی (International Recognition):**

کرداری دانپێدانانی نێودەوڵەتی، بە یەکێك لە پێکهێنەرە سەرەکییەکانی دروستبوونی دەوڵەت دادەنرێت، کە دەوڵەتە نوێیەکان ڕەچاوی دەکەن(عبدالرحمن، ٢٠٠١، ص٣٠٢).

**٢-١-٢: جۆرەکانی دەوڵەت:**

بەشێوەیەکی گشتی دەوڵەت بۆ دوو جۆری سەرەکی هەیە؛ ئەوانیش:

**٢-١-٢-١: دەوڵەتی سادە یان یەکگرتوو (الدولة البسيطة أو الموحدة):**

پێناسە کراوە بەوەی کە دەسەڵاتەکەی تیایدا بەش بەش نەکراوە، یەك دەستووریان هەیە، هەروەها یەك حکومەتیان هەیە و کاروبارە ناوخۆیی و دەرەکییەکان بەبێ بەشداری هیچ حکوومەتێك یان دەستەیەك بەڕێوە دەبات (عبدالرحمن، ٢٠٠١، ص٣١١-٣١٢). دەوڵەتی سادە دوو جۆری سستەمی (ناوەندی و ناناوەندی) هەیە:

**٢-١-٢-١-١: سستەمی ناوەندی (المركزية):** سستەمی ناوەندی واتە یەکبوونی دەسەڵات، ئەوەش ئەوە ناگەیەنێ کە تاکڕەوی لە دەسەڵاتدا هەبێ، یان چەند جەمسەرێك نەبێ بۆ بەڕێوەبردنی دەسەڵات، یان چەند دەسەڵاتێك نەبێت و جیاوازی لە نێوان ئەو دەسەڵاتانەدا نەبێت لە دەوڵەتدا، دەسەڵاتی یاسادانان، ڕاپەڕاندن و دادوەری، واتە چەند دەسەڵاتێکی جیاواز هەیە، بەڵام یەکبوونی دەسەڵات، یەکبوونی گوزارشتکردن لەو دەسەڵاتە دەگەیەنێت (محەمەد، ٢٠٠١، ل٧٣-٧٤)(الطبيب، ٢٠٠٧، ص١٤١).

**٢-١-٢-١-١-١: لە ناوەندەوە (عن المركزية):** هەندێك لە دەوڵەتەکان ڕووبەرێکی فراوانیان هەیە و، پێکهاتەی کۆمەڵایەتی تیایدا مامناوەندییە، نە بەهێزە و نە لاوازە. لێرەدا بەڕێوەبردنی کاروباری دەسەڵات لەلایەن ناوەندەوە بە شێوەیەکی گونجاو هەم لە توانای دەسەڵات بەدەرە، هەم بۆ خەڵکی ناوچە جیاجیاکانی دەوڵەتیش نەگونجاوە، جا لەبەرئەم هۆکارە دەسەڵاتی ناوەندی نوێنەری تایبەتی خۆی لە ناوچە جیاجیاکان دادەنێت، کە نوێنەرایەتی دەسەڵاتی ناوەندی دەکەن و لەژێر ئیرادەی دەسەڵاتی ناوەندیدا بن (محەمەد، ٢٠٠١، ل٧٤-٧٥).

**٢-١-٢-١-٢: سستەمی ناناوەندی (اللامركزية):** لەبەر فراوانبوونی ڕووبەری دەوڵەت و هەبوونی هەرێمە جیاجیاکانی، کە هەریەك لەو هەرێمانە تایبەتمەندی خۆی هەیە و خەڵکی هەر هەرێمێك لەو هەرێمانە بەرژەوەندیی هاوبەشی خۆیان هەیە، ئەم جۆرە سستەمە جێبەجێ دەکرێت. بەڵام دەبێت:

- یاساکانی دەوڵەت کاروباری هەردوو دەسەڵاتی ناوەندی و دەسەڵاتی هەرێمەکان دیاری بکەن و ڕێکیان بخەن.

- هەرێمە ناناوەندییەکان سەربەخۆیی داراییبیان هەبێت(محەمەد، ٢٠٠١، ل٧٥-٧٦).

**٢-١-٢-٢: دەوڵەتی تێکەڵاو (فیدرالی) (الدولة المركبة أو الإتحادية):**

دەوڵەتی تێکەڵاو لە یەکگرتنی دوو دەوڵەت یان زیاتر پێکدێت(الطبيب، ٢٠٠٧، ص١٤٢)، پێناسەکراوە بەوەی رێکخستنێکی سیاسی و دەستووری ناوخۆیی و لێکدراوە، کە بەو پێیە دەوڵەتانی ئەندام یان هەرێمەکان ملکەچی دەوڵەتی فیدرالی دەبن، کە لە سەرووی ئەواندایە و ئەم رێکخستنەش دوو رەهەند لەخۆ دەگرێت؛ **رەهەندی دەرەکی** کە دەوڵەتی فیدرالی وەك یەك دەوڵەت لەبواری سەروەریی دەرەکیدا بە دیاردەکەوێ، هەرچی **رەهەندی ناوخۆیی** کە بریتییە لە چەند کیانێکی دەستووری و حکوومەتی فیدرالی لە پراکتیزەکردنی سەروەریی ناوخۆییدا بەشداری دەکات(وەڵەد بەگی، ٢٠٠٥، ل٢٩٧). بەم جۆرە دەردەکەوێ کە سستەمی فیدرالی رێکخستنیکی رامیاری و یاساییە نەك گرێبەست و رێکخستنێکی دەستووری ناوخۆییە نەك رێکەوتننامەیەکی نێودەوڵەتی(وەڵەد بەگی، ٢٠٠٥، ل٢٩٨-٢٩٩). هەروەها بە دوو شێواز دروست دەبێت:

**٢-١-٢-٢-١: فیدرالیی پێکەوەلکان:** لەم شێوازەدا چەند دەوڵەتێکی سەربەخۆ یەکدەگرن یا پێکەوە دەلکێن و یەك دەوڵەت لە سەرووی دەوڵەتانی ئەندامەوە دروست دەکەن، کە ئەمەیان شێوازێکی ئاسایی و باوە، وەك وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، سویسرا، کەنەدا، ئوستralیا، ئەفریقای باشوور لەسەر ئەم شێوازە دروست کراون (بركات والاخرون، ١٩٩٠، ص١٦٨). لەم جۆرە فیدرالییەدا مافی دەوڵەتی ئەندام زیاترە، چونکە ئەو دەوڵەتە سەربەخۆیانە کە حکوومەتی فیدرالی دروست دەکەن، واز لە رێژەیەکی کەمی دەسەڵاتەکانی خۆیان دەهێنن، تا ئەو ئاستەی کە بۆ پاراستنی فیدرالی پێویست بێت و زۆربەی دەسەڵاتەکان بۆ خۆیان دەپارێزن (الطبيب، ٢٠٠٧، ص١٤٧).

**٢-١-٢-٢- ٢: فیدرالی بە دابەشبوون:** لەم شێوازەدا دەوڵەتی سادە یا یەکبوو بەسەر چەند دەوڵەت یا هەرێمێکدا دابەش دەکرێت و دەبێتە دەوڵەتێکی لێکدراو. هەریەك لە وڵاتانی یەکێتی سۆڤیەتی (جاران)، بەرازیل، ئەرژەنتین،

مەکسیك، ڤەنزویلا، کۆلۆمبیا، هیندستان، مالیزیا، نێجیریا لەسەر ئەم شێوازە پێکهاتوون. لەم جۆرە سستەمەدا حکوومەتی فیدرالی دەسەڵاتێکی زیاتر بۆ خۆی دەپارێزێ لەچاو شێوازی یەکەمدا و وڵاتەکە دابەش دەبێت بەسەر چەند هەرێم یا بەشی کارگێڕیی یا کیانی دەستووری هەر بۆیە حکوومەتی فیدرال واز لە رێژەیەکی کەمی دەسەڵاتەکانی خۆی دەهێنێ(الطبیب، ٢٠٠٧، ص١٤٧).

## ٢-٢: تیۆرەکانی شیکردنەوەی دروستبوونی دەوڵەت:

بەشێوەیەکی کورت و پوخت، هەندێك دروستکردنی دەوڵەت و دەسەڵات بۆ خودا دەگەڕێننەوە، ئینجا بەشێوەی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ. هەندێکی دیکە بۆ سروشتی دەگەڕێننەوە، بەڵام بۆچوونێکی دیکە بەرپەرچی ئەو بیرۆکەیە دەداتەوە و سەرهەڵدانی دەوڵەت بۆ خودی مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە، لایەنگرانی ئەم بیرۆکەیە پێیانوایە ویستی مرۆڤ هۆکاری سەرهەڵدانی دەوڵەتە نەوەکو سروشت. هەندێکی دیکە بۆ لایەنی ئابووری و ویستی دابینکردنی پێداویستییەکان لای مرۆڤ دەگەڕێننەوە. هەندێکی دیکە پێیانوایە دەوڵەت لە ئەنجامی پەیمانی کۆمەڵایەتی سیاسی ئازاد دروستبووە، کۆمەڵێکی دیکە پێیانوایە دەوڵەت بەرهەمی هەموو دیاردە مێژووییەکانە، کە کارلێکیان لەگەڵ یەکدیدا کردووە و بەرهەمەکەی دروستبوونی دەوڵەت بووە(الطیب، ٢٠٠٤، ص١٥٠). لە خوارەوە بەشێك لەو تیۆرانە دەخەینەڕوو کە باس لە دروستبوون و شیکردنەوەی دەوڵەت دەکەن:

### ٢-٢-١: تیۆری فەلسەفەی ئەخلاقی (النظرية الفلسفية الاخلاقية):

وا دادەنرێت بۆچوونەکانی هەریەکە لە سوقرات، ئەفلاتوون و ئەرستۆ چوارچێوەی سەرەکی بن بۆ تیۆرەکانی دەوڵەت کە رەهەندێکی فەلسەفی و ئەخلاقییان هەیە. بیرۆکەی سەرەکی دروستبوونی دەوڵەت دەگەڕێننەوە بۆ هێنانەدیی (تحقیق) خێر و بەختەوەری و کامەرانی بۆ مرۆڤایەتی(عبدالرحمن، ٢٠٠١، ص٣٠٣).

### ٢-٢-٢: تیۆری ئایینی (النظرية الدينية- الثيوقراطية):

شیکردنەوەی بنچینەی دەوڵەت لەم تیۆرەدا بۆ هێزی پیرۆز دەگەڕێتەوە، وای دادەنێن دەوڵەت سستەمێکی خوایی (ئیلاهی)یە (اسماعیل، ٢٠٠٨، ص٥١)، خوا

بەمەبەستی جێبەجێکردنی ئامانجی کۆبوونەوەی مرۆڤەکان بۆ مرۆڤی ناردووە. کرۆکی ئەم بیرۆکەیە ئەوەیە خوای گەورە هەموو شتێکی لەم ژیانەدا دروستکردووە، دەوڵەتیش یەکێکە لەو دروستکراوانە. خاوەنی ئەم بۆچوونەش بۆ دوو دەستە دابەش بوون: خاوەنی تیۆری حەقی ئیلاهی راستەوخۆ، ئەوان پێیانوایە دەوڵەت راستەوخۆ لەلایەن خوداوە دامەزراوە، هەر خۆشی هەندێك لە سەرۆك (ملوك)ەکان بەشێوەیەکی راستەوخۆ دیاری دەکات، بۆ ئەوەی بەپێی شەریعەت و فەرمانەکانی، حوکمی گەل و میللەتەکانیان بکەن(اسماعیل، ٢٠٠٨، ص٥٤– ٥٥). بەڵام گرووپی دووەم لایەنگری تیۆری حەقی ئیلاهی ناراستەوخۆن، خوای گەورە سستەمی سیاسی (دەوڵەت) دروست کردووە، بەڵام بەشێوەیەکی راستەوخۆ دەستنیشانی فەرمانڕەوا ناکات (الطبیب، ٢٠٠٧، ص١٢٢) (الطیب، ٢٠٠٤، ص١٥٠–١٥١).

**٢–٢–٣: تیۆری پەیمانی کۆمەڵایەتی (نظرية العقد الاجتماعي):**

بەگشتی ئەم تیۆرە لەسەر دوو گریمانەی سەرەکی دامەزراوە، ئەوانیش یەکەم: پێیانوایە مرۆڤایەتی خاڵی بووە لە یاسای مەدەنی و کۆمەڵگە مرۆییەکان نەیانناسیوە، کرداری رێکخستنی رەفتار و پەیوەندییەکان و جۆری کارلێکردنیان لە رێگەی یاسای سروشتییەوە بووە. هەروەها زانایان و فەیلەسوفانی تیۆری پەیمانی کۆمەڵایەتی (Social Contract Theory) لە بۆچوونەکانیاندا جیاوازییان هەیە، هەندێکیان ئەم حاڵەتە بە قۆناغی وەحشیگەری (بەربەری)، هەندێکی دیکەیان بە نەبوونی جێگیربوون و ئۆقرەگرتنی (ئیستقرار) دادەنێن (اسماعیل، ٢٠٠٨، ص٦٨) (عبدالرحمن، ٢٠٠١، ص٣٠٤).

بەڵام گریمانەی دووەم، پەیمانی کۆمەڵایەتی (پەیمان، وادادەنێن بنچینەی دروستبوونی دەوڵەتە) ئەوا ئەم زانایانە هەوڵدەدەن بەپێی شیکردنەوە سیاسییەکان راڤەی بکەن، هەندێکیان بە حەقیقەتێکی مێژوویی دەزانن و راڤەی گەشەسەندنی کۆمەڵگە و پێشکەوتنی دەگەیەنێت. هەندێکی دیکە بە پەیمانێك (پەیمانێکی حکومی–رسمی–) لە نێوان دەسەڵاتدار و دەسەڵات بەسەرکراو (خەڵك) دەیبینن (اسماعیل، ٢٠٠٨، ص٦٨) (عبدالرحمن، ٢٠٠١، ص٣٠٥).

هەروەها سەدەی (١٧) و (١٨) بە سەردەمی زێڕینی ئەم تیۆرە دادەنرێت، لە گرنگترین ئەو زانایانەی باسیان دەکرد و بەرگرییان لێدەکرد، هەریەکە لە (تۆماس هۆبز– Thomas Hobbes– ١٥٨٨ -١٦٧٩ن)، (جۆن لۆك–John Locke– ١٦٣٢ -١٧٠٤ن) و (جان جاك رۆسۆ –Jean-jacQue Rousseau– ١٧١٢ -١٧٧٨ن) بوون.

### ٢–٢–٤: تیۆری هێز و زاڵبوون (نظرية القوة):

لایەنگرانی ئەم تیۆرە پێیانوایە سەرهەڵدانی دەوڵەت لە ئەنجامی ملکەچیی بێهێزەکان بۆ بەهێزەکان بووە(الطبيب، ٢٠٠٧، ص١٢٧)، واتە هەوڵدان لەپێناو هێز و حەزی جەختکردنەوە لەسەر خود (تأكيد الذات) دوو غەریزەی سەرەکین لەلای مرۆڤ بۆ فەرمانڕەواییکردن بەسەر تاکەکانی دیکە(عبدالرحمن، ٢٠٠١، ص٣٠٧). هەربۆیەش بنچینەی دروستبوونی دەوڵەت دەگەڕێننەوە بۆ هێزی کەسێك یان – کۆمەڵە کەسێك– کە بەسەر تاکەکانی دیکە زاڵ دەبێت و ملکەچیان دەکات (اسماعيل، ٢٠٠٨، ص٦١).

### ٢–٢–٥: تیۆری پەرەسەندنی مێژوویی (نظرية التطور التاريخي):

زۆربەی زانایانی سیاسی، مێژوویی، کۆمەڵناسی و ئەنترۆپۆلۆجییەکان ئەم تیۆرەیان بە تیۆری پەرەسەندن (التطورية) بۆ دروستبوونی دەوڵەتیان راڤە کردووە. بیرۆکەی ئەم تیۆرە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی دەوڵەت وەکو سستەمێکی سیاسی پەرەی سەندووە، بەشێوەی مێژوویی و پلە بەپلەیە (تدرج) (محەمەد، ٢٠٠١، ل٥٤). هەروەها پێیانوایە دروستبوونی دەوڵەت بۆ تاکە فاکتەرێك ناگەڕێتەوە بەڵکو بۆ کۆمەڵە فاکتەر و هۆکارێك دەگەڕێتەوە، گرنگیی ئەو فاکتەرانەش لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی دیکە جیاوازە، ئەم فاکتەرانەی رۆڵیان تیایدا بینیوە بریتین لە: (أ– پەیوەندیی خزمایەتی (خوێن)، پەیوەندیی ئایینداری (ئایین)، ج– چالاکی و سستەمی ئابووری (بەرژەوەندیی ماددی)، د– هێز و، هـ– هۆشیاری سیاسی) (اسماعيل، ٢٠٠٨، ص٧٩– ٨١).

## ٣- چوارچێوەی میتۆدی توێژینەوە:

### ٣-١: میتۆدی توێژینەوە:

میتۆد (Method) ڕێباز: بریتییە لەو ڕێگەیەی کە توێژەر دەیگرێتەبەر لەکاتی دراسەکردنی کێشەیەك بۆ دۆزینەوەی راستییەکان و، وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی بابەتی توێژینەوەکەی(شفیق، ٢٠٠٨، ص٨٥). هەروەها دەکرێت لە توێژینەوەیەکدا زیاتر لە میتۆدێك بەکاربهێندرێت، ئەو میتۆدانەی لەم توێژینەوەیەدا بەکارهاتوون بریتین لە:

**٣-١-١: میتۆدی ڕووپێوی کۆمەڵایەتی (Social Survey Method) بەڵام بەڕێگەی نموونە (Sample)**، لە رووی پراکتیکییەوە لە توانادا نییە، ئەو ژمارە زۆرەی لاوان لە هەرێمی کوردستان ڕووپێو بکرێن، بۆیە میتۆدی ڕووپێوی کۆمەڵایەتی لەرێگەی نموونەوە بەکارهێنراوە. میتۆدی ڕووپێوی کۆمەڵایەتی بەکاردەهێندرێت بەمەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری لەبارەی رەفتاری تاکەکان یان کۆمەڵەکان یان زانینی بیر و بۆچوون و هەڵوێستەکانیان بەرامبەر بە بابەتێکی دیاریکراو(شـیّا، ٢٠٠٨، ص١٨). بەڵام پێویستە ئەو یەکانەی وەك نموونەی توێژینەوە وەردەگیرێن سیفات و خەسڵەتەکانیان لە سیفات و خەسڵەتەکانی کۆمەڵگەی توێژینەوە نزیك بێت، بۆئەوەی بتوانێت ئەنجامەکانی تاکەکانی نموونەکە بەسەر کۆمەڵگەی توێژینەوە بگشتێنرێت(عقیل، ٢٠١٠، ص٣٢٩).

**٣-١-٢: میتۆدی بەراوردکاری ( Comparative Method )**، لە رێگەی ئەو میتۆدەوە دەتوانین بزانین دیاردەکان چۆن و بۆچی روودەدەن، کاتێك هەندێکیان لەڕووە لێکچوو و جیاوازەکان لەگەڵ یەکتردا بەراوردیان دەکەین، ئینجا بەمەبەستی زانینی هۆکارەکانی روودانی دیاردەیەك و ئەو بارودۆخانەش کە تیایدا روو دەدات، دەتوانرێت ئەم میتۆدە بەکاربهێنرێت (علیان و غنیم، ٢٠٠٠، ص٥٦). هەروەها بەمەبەستی زانین و بەراوردکردنی شوێن (شوێنی نیشتەجێبوون)، کۆمەڵ یان دابونەریت و بیروبۆچوونە جیاوازەکان ئەم میتۆدە بەکاردەهێنرێت (رایت، ١٩٩٦، ص٥٤). لەم توێژینەوەیەدا میتۆدی بەراوردکاری

لەلایـەنی مەیـدانی، بـۆ بـەراوردکردنی نێـوان بۆچـوونی تاکـەکانی نموونـەی توێژینەوە بەپێی (رەگـەز، بـاری کۆمەڵایـەتی، تەمـەن، داهـاتی مانگانـە، پیشـە، شوێنی نیشتەجێبوون و ئاستی خوێندەواری) بەکارهاتووە.

**٣-٢: کۆمەڵگە و نموونەی توێژینەوە:**

**٣-٢-١: دیاریکردنی کۆمەڵگەی توێژینەوە:**

کۆمەڵگەی توێژینەوە گشت ئەو تاکانە یان حاڵەتانە دەگرێتەوە، کە توێـژەر دەیەوێت ئەنجامەکانی توێژینەوەکـەی بەسـەریاندا بگشـتێنێت. ئـەم توێژینەوەیـە لـەبارەی (لاوان و پرسـی راگەیانـدنی دەوڵـەت- توێژینەوەیـەکی مەیدانییـە لـە هەرێمی کوردستان- عێراق) کۆمەڵگەی توێژینەوەکـەی بـریتی دەبێـت لـە هـەموو لاوەکانی دانیشتووی سەنتەری شارەکانی "هەولێر، سلێمانی و دهۆك".

**٣-٢-٢: دیاریکردنی نموونەی توێژینەوە:**

لـەم توێژینەوەیـەدا نموونەیـەکی هەرەمـەکی (Random Sample) لـە جـۆری (هێشوویی - العنقودية- Cluster) یان پێشی دەگوترێت نموونـەی چـەند قۆنـاغی (Multi-Stage Sample)وەرگـیراوە. لـەم جـۆرەی نموونـە وەرگرتنـدا گرووپـەکان هەڵدەبـژێردرێن نـەك تاکـەکان و پێویسـت بـە هـەبوونی لیسـتی نـاوی تاکـەکانی کۆمەڵگای توێژینەوە ناکات(عبيدات و مبيضين، ١٩٩٩، ص٩٣- ٩٤).

قـەبارەی نموونـەی (الصيرفي، ٢٠٠٨، ص٢٠٨) ئـەم توێژینەوەیـە لـە (٣٧٥) لاو پێکهـاتووە، کـە بەشـێوەی نموونـەی هەرەمـەکی هێشـوویی لـە کۆمەڵگـەی توێژینەوەکە وەرگیراوە، لەسەر بنچینەی شوێنی نیشتەجێبوونی تاکەکان (گەڕەك "هەژار، ناوەند و دەوڵەمەند") بەپێی رێژەی دانیشـتووانی هـەر شـارێك (دەسـتەی ئاماری هەرێمی کوردستان). لەو سێ شارەی بە نموونە وەرگـیراون، واتـە لـە قۆنـاغی یەکەمدا هـەرێمی کوردسـتان بەسـەر سـێ شـار دابەشـکراوە، هەریەکـەیان بـەپێی رێـژەی ژمـارەی دانیشـتووانی سـەنتەری شـارەکە پرسـیارنامەکەیان بەسـەردا دابەشـکراوە، ئینجـا لـە قۆنـاغی دووەمـدا هەریەکـە لـەو شـارانە چـەند فـۆرمی بەرکەوتووە بە رێژەی یەکسان فۆرمەکان بەسەر گەڕەکەکاندا دابەشکراون، دواتـر

لە هەر گەڕەکە و ماڵ بەماڵ هەوڵدراوە ڕێژەیەکی یەکسان لە "پیاو و ئافرەت لە تەمەنی (١٨- ٣٥) ساڵی وەربگیرێن، بڕوانە خشتەی (٣-١):

**خشتەی (٣-١) چۆنیەتی وەرگرتنی نموونە بەپێی شوێنی نیشتەجێبوون ڕووندەکاتەوە**

| شار | ژمارەی دانیشتوان | ڕێژەی سەدی | قەبارەی نموونە | ژمارەی فۆرمی بڵاوکراوە | ژمارەی فۆرمی دروست |
|---|---|---|---|---|---|
| هەولێر | ٧٢٥٦٢٠ | ٪٤٥,١٥ | ١٧٣ | ١٨٥ | ١٧٣ |
| سلێمانی | ٥٨٥٨٥٥ | ٪٣٦,٤٥ | ١٤٠ | ١٥٠ | ١٢٤ |
| دهۆك | ٢٩٥٧٣٨ | ٪١٨,٤٠ | ٧١ | ٨٠ | ٧٨ |
| کۆی گشتی | ١٦٠٧٢١٣ | ٪١٠٠ | ٣٨٤ | ٤١٥ | ٣٧٥ |

**٣-٣: بوارەکانی توێژینەوە:**

**٣-٣-١: بواری مرۆیی:** ئەو لاوانە دەگرێتەوە کە تەمەنیان لە نێوان (١٨- ٣٥)ساڵیدایە ئینجا چ پیاو بن یان ئافرەت.

**٣-٣-٢: بواری شوێن:** سنووری جوگرافی توێژینەوەکە بریتییە لە سەنتەری شارەکانی (هەولێر، سلێمانی و دهۆك).

**٣-٣-٣: بواری کاتی:** مەبەست لێی ئەو کاتەیە، کە بۆ لایەنی مەیدانی توێژینەوەکە تەرخان کرابوو، لەم توێژینەوەیەدا بواری کاتی ماوەی نێوان (٢/ ١/ ٢٠١٥ تاکو ٢٠/ ٣/ ٢٠١٥) بۆ کۆکردنەوە و شیکردنەوەی زانیارییەکان خایاندووە.

**٣-٤: ئامرازی کۆکردنەوەی زانیارییەکان:**

لەم توێژینەوەیەدا پرسیارنامە (Questionnaire) بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان بەکارهێنراوە، دوای ئەوەی پرسیارنامەکە لە سەرەتادا لە شێوەی چەند برگەیەك بەشێوەی پێوەری لیگەرت (Likert scale)ی چوارینە ئامادەکرا، ئینجا بۆ ئەوەی مەرجە سایکۆمەترییەکانی لێبێتە دی (ابراهيم، ٢٠٠٠، ٤٢- ٤٣)،

هــەردوو ئــامرازی "راســتێتی- Validity" و، "جــێگیری Reliability" (القصــاص، ٢٠٠٧، ص٣٣٠- ٣٣٣) (كراجة، ١٩٩٧، ص٢٩٨- ٣٠٧) لەسەر جێبەجێ كرا.

پرسیارنامەكەی ئەم توێژینەوەیە بەمەبەستی هەڵسەنگاندن بۆ لای (٨) لـە پســپۆران بــردران، دوای گەڕانــەوەی پرســیارنامەكە دەركــەوت پلــەی راســتێتی ئامرازی پێوانەكردن بریتییە لە (٩٢,٣٣٪) (سەیری پاشكۆی "٢" بكـە)، ئەمـەش بـە ئاماژەیـەكی زۆر بـاش دادەنرێـت بـۆ رازیبـوونی پسـپۆران لـە پرسـیارنامەكە. هەروەها بۆ دەرهێنانی جێگیری ئـامراز، توێـژەر (١٢) فـۆرمی بەسـەر كۆمەڵگـەی توێژینەوەكـەی دابەشـكرد، لـە رێگـەی بـەكارهێنانی هاوكۆڵكـەی ئـەلفا كرونبـاخ (Alpha Cronbach)ی دەركەوت جێگیری ئامراز (٠,٨٤٥) (سـەیری پاشـكۆی "٣" بكە) هەروەها ئەمەش ئاماژەیەكی باشە بۆ جێگیری پرسیارنامەكە.

لە كۆتاییدا ژمارەی برگەكانی ئـەم پرسـیارنامەی ئـەم توێژینەوەیـە بـوو بـە (٤٢) پرسیار، لەوانەش (٧) پرسیاریان گشتین بۆ وەسفكردنی تایبەتمەندییـەكانی ئەندامانی نموونەكە دانراون و ، (٣٥) یان پرسیاری تایبەتین، كە لـە (٦) تـەوەردا خراونەتەڕوو(سەیری پاشكۆی "١" بكە).

### ٣-٥: ئامرازە ئامارییەكانی بەكارهاتوو لەم توێژینەوەیەدا:

- ئەمڕۆ كۆمپیوتەر لە پرۆسەی توێژینەوەدا رۆڵێكی بـاڵا دەگێڕێـت، یـەكێك لەو بەرنامە كۆمپیوتەریانەی كە لەم توێژینەوەیەدا بەكارهاتووە بەرنامـەی (Spss) (امـین، ٢٠١٢، ص١٢٩- ١٥٩)، ئـەویش بـۆ پـۆلێنكردن و دروسـتكردنی خشـتەكان و شـیكردنەوەی زانیارییـەكان سـوودی لێـوەرگیراوە. هـەروەها دەرهێنـانی رێـژەی سەدی (النسبة المئويـة)، ناوەنـدی ژمـارەیی (الوسـط الحسـابي Mean)، ناوەنـدی ژمێرەیـی سـەنگكراوی برگـە (الوسـط الحسـابي المـرجح للفقـرة)، ئـەلفا كرونبـاخ (Alpha Cronbach) بۆ جێگیری پرسیارنامە، لادانی پێـوەری (الانحـراف المعيـاري - Std. Deviation)، تاقیكردنـەوەی (ت)ی (الاختبـار التـائي- T-Test) و ئـەنۆڤا (تحليل التباين- Anova) سوودی لێوەرگیراوە(طبيه، ٢٠٠٨، ص٥٢- ٥٣)(عـلاّم، ٢٠٠٠، ص١٦٥- ١٩٠).

**– هاوکێشەی رێژەی رازیبوون (نسبة الاتفاق)**

ناوەندی ژمێرەیی
رێژەی رازیبوون = ———————— X ۱۰۰
ژمارەی وەڵامەکان

**– هاوکێشەی هاوکۆڵکەی جیاوازی (معامل الاختلاف)**

لادانی پێوەری
هاوکۆڵکەی جیاوازی = ———————— X ۱۰۰
ناوەندی ژمێرەیی

**– هاوکێشەی ناوەندی گریمانەکراو (الوسط الفرضي– المتوسط المقياسي)**

کۆی بەهای بڕگەکان
ناوەندی گریمانەکراو = ————————
ژمارەی وەڵامەکان

## ٤- شیکردنەوەی زانیارییەکان و ئەنجامەکانی توێژینەوە:

### ٤-١: خستنەڕوو و شیکردنەوەی زانیارییەکانی توێژینەوە:

### ٤-١-١: خەسڵەتە گشتییەکانی تاکەکاتی نموونەی توێژینەوە:

**خشتەی (٤-١-١) خەسڵەتە گشتییەکانی تاکەکانی نموونەی توێژینەوە**

| ر | گۆڕاوەکان | وەڵامەکان | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ڕەگەز | نێر | ١٨٧ | ٪٤٩,٩ |
| | | مێ | ١٨٨ | ٪٥٠,١ |
| ٢ | باری کۆمەڵایەتی | سەڵت | ٢٢٥ | ٪٦٠ |
| | | خێزاندار | ١٥٠ | ٪٤٠ |
| ٣ | تەمەن | ١٨- ٢٣ساڵ | ١٤٧ | ٪٣٩,٢ |
| | | ٢٤- ٢٩ساڵ | ١٤٢ | ٪٣٧,٩ |
| | | ٣٠- ٣٥ساڵ | ٨٦ | ٪٢٢,٩ |
| ٤ | داهات | بێ داهات | ١٨٩ | ٪٥٠,٤ |
| | | کەمتر لە ٥٠٠ هەزار دینار | ٣٢ | ٪٨,٥ |
| | | ٥٠٠- ٩٩٩ هەزار دینار | ١١٢ | ٪٢٩,٩ |
| | | یەك ملیۆن و بەسەرەوە | ٤٢ | ٪١١,٢ |
| ٥ | پیشە | کاسب | ٧٢ | ٪١٩,٢ |
| | | مووچە وەرگر | ١١٤ | ٪٣٠,٤ |
| | | قوتابی | ١٢٦ | ٪٣٣,٦ |
| | | ژنی ماڵ | ٤١ | ٪١٠,٩ |
| | | بێکار | ٢٢ | ٪٥,٩ |
| ٦ | شوێنی نیشتەجێبوون | هەولێر | ١٧٣ | ٪٤٦,١ |
| | | سلێمانی | ١٢٤ | ٪٣٣,١ |
| | | دهۆك | ٧٨ | ٪٢٠,٨ |
| ٧ | ئاستی خوێندەواری | نەخوێندەوار | ١٢ | ٪٣,٢ |
| | | خوێندن و نووسین | ٢٣ | ٪٦,١ |
| | | سەرەتایی | ٣٢ | ٪٨,٥ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | ناوەندی | ٣١ | ٨,٣٪ |
| | | ئامادەیی | ٨٥ | ٢٢,٧٪ |
| | | پەیمانگا | ٦٢ | ١٦,٥٪ |
| | | زانکۆ | ١٢١ | ٣٢,٣٪ |
| | | خوێندنی باڵا | ٩ | ٢,٤٪ |

لە خشتەی (٤-١-١) کە تیایدا خەسڵەتەکانی نموونەی توێژینەوەکە خراوەتەڕوو، بۆمان دەردەکەوێت:

**٤-١-١-١:** رەگەز: تاکەکانی نموونەی توێژینەوەکە بە رێژەی نزیك لە یەکسان دابەشبوون بەسەر رەگەزی نێر (٤٩,٩٪) و رەگەزی مێ (٥٠,١٪).

**٤-١-١-٢: باری کۆمەڵایەتی**: سەبارەت بە باری کۆمەڵایەتی ئەوا رێژەی (٦٠٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوەکە سەڵتن بەرامبەر بە رێژەی (٤٠٪)یان خێزاندارن.

**٤-١-١-٣: تەمەن**: دەستەی تەمەنی تاکەکانی توێژینەوە بۆ سێ دەستەی تەمەنی دابەشکراون، ئەوانیش دەستەی تەمەنی (١٨- ٢٣ساڵ) رێژەی (٣٩,٢٪) نموونەکە پێکدەهێنن، ئینجا دەستەی تەمەنی (٢٤- ٢٩ ساڵ) رێژەی (٣٧,٩٪) و دەستەی تەمەنی (٣٠- ٣٥ ساڵ) رێژەی (٢٢,٩٪) نموونەکە پێکدەهێنن.

**٤-١-١-٤: داهاتی مانگانە**: سەبارەت بە داهاتی مانگانە رێژەی (٥٠,٤٪) تاکەکانی نموونەکە بێ داهاتن، رێژەی (٢٩,٩٪) ئەوانەن کە داهاتی مانگانەیان لە نێوان (٥٠٠- ٩٩٩ هەزار دینار)ە، لە دواییدا ئەوانەی داهاتی مانگانەیان لە نێوان (یەك ملیۆن و بەسەرەوەیە) رێژەی (١١,٢٪) نموونەکە پێکدەهێنن و رێژەی (٨,٥٪) ئەو لاوانەن کە داهاتی مانگانەیان (کەمتر لە ٥٠٠ هەزار دینار)ە.

**٤-١-١-٥: پیشە**: رێژەی (٣٣,٦٪) تاکەکانی نموونەی توێژینەوە ئەوانەن کە قوتابین، ئینجا رێژەی (٣٠,٤٪) مووچە وەرگرن، هەروەها رێژەی (١٩,٢٪) کاسبکارن، ئەو لاوانەی ژنی ماڵن رێژەی (١٠,٩٪) تاکەکانی نموونەکە پێکدەهێنن و رێژەی ئەو لاوانەی بێکارن دەگاتە (٥,٩٪).

**٤-١-١-٦: شـوێنی نیشـتەجێبوون:** ڕێـژەی (٤٦,١٪) تاکـەکانی نموونـەی توێژینەوەکـە لاوانـی دانیشـتووی شـاری هــەولێرن، ڕێــژەی (٣٣,١٪) لاوانـی دانیشتووی شاری سلێمانی و ڕێژەی (٢٠,٨٪) دانیشتووی شاری دهۆکن.

**٤-١-١-٧: ئاستی خوێندەواری:** لە بەرزترین ڕێژەوە بۆ نزمترین ڕێژە، ئەوا ڕێژەی (٣٢,٣٪) ئەوانەن لە ئاسـتی خوێنـدەواری زانکـۆدان، ئینجـا ئامـادەیی بـە ڕێـژەی (٢٢,٧٪)، پـەیمانگا بەڕێـژەی (١٦,٥٪)، سـەرەتایی بـە ڕێـژەی (٨,٥٪)، ناوەندی بە ڕێژەی (٨,٣٪)، خوێندن و نووسین بە ڕێژەی (٦,١٪) و نەخوێندەوار بە ڕێژەی (٣,٢٪) تاکەکانی نموونەکە پێکدەهێنن.

**٤-١-٢: شیکردنەوە و خستنەڕووی زانیارییە تایبەتییەکانی توێژینەوە:**

ئامانجی ئەم باسە وەسفکردنی پرسیار و بڕگەکانی توێژینەوەکەیە لە ڕێگەی شـیکردنەوەی را و بۆچـوونی تاکـەکانی نموونـەی توێژینەوەکـە، ئەمـەش بـە بەکارهێنانی ئـامرازە ئامارییـەکانی وەکـو ناوەنـدی ژمێرەیـی سـەنگکراوی بڕگـە، ناوەندی گریمانەکراو، لادانی پێوەری، هاوکۆڵکەی جیاوازی و ڕێژەی رازیبوون.

سەبارەت بە ناوەندی ژمێرەیی سـەنگکراوی بڕگـە، ئەگـەر گـەورەتر بـوو لـە ناوەنـدی گریمانـەکراو (٢,٥) ئـەوا ئاماژەیـە بـۆ ئـەوەی کـە تاکـەکانی نموونـەی توێژینەوە رازین لەسەر ناوەڕۆکی بڕگەکە، هەروەها ئەگەر ڕێژەی رازیبـوونی هـەر بڕگەیەك گـەورەتر بـوو لـە (٦٢,٥٪) (ڕێـژەی ناوەنـدی رازیبـوون) ئـەوا بەهـەمان شێوە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە تاکەکانی نموونەی توێژینەوە رازین لەسەر ناوەڕۆکی بڕگەکە. ئەمەش لەسەر هەموو بڕگەکانی پرسیارنامەکە جێبەجێ دەبێت.

**٤-١-٢-١: کاتی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی:**

ریزبەندی بڕگەکانی تەوەری یەکەم (**کاتی راگەیاندنی دەوڵـەتی کـوردی**) لـە بڕگە (١- ٦) بەشێوەی گەورە بۆ بچووك لەسەر بنەمای ڕێژەی رازیبـوون ریزبەنـد کراوە. هەروەکو لە خشتەی (٤-١-٢) بۆمان دەردەکەوێت، کە بڕگەی (٤) ڕێژەی رازیبوونی (٨١٪) و گەورەترە لـە ڕێـژەی (٦٢,٥٪)، ریزبەنـدی (١) سـەبارەت بـە ڕێـژەی رازیبـوون لای تاکـەکانی نموونـەی توێژینـەوە بەدەسـتهێناوە، هـەروەها ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراوی بڕگە (٣,٢٤) و گەورەترە لە ناوەنـدی گریمانـەکراو

(٢,٥)، بە لادانی پێوەری (٠,٩٣) و هاوکۆڵکەی جیاوازی (٢٨,٧٠٪)، ئەمەش ئاماژەیە بۆ (بەهێز)ی ناوەڕۆکی ئەو بڕگەی کە دەڵێت (**پێموایە دەمێکە کاتی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی هاتووە**).

هەروەها بڕگەی (٢) ڕێژەی ڕازیبوونی (٥٧٪) و بچووکترە لە ڕێژەی (٦٢,٥٪)، ڕیزبەندی (٦) سەبارەت بە ڕێژەی ڕازیبوون لای تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بەدەستهێناوە، هەروەها ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراوی بڕگە (٢,٢٨) و بچووکترە لە ناوەندی گریمانەکراو (٢,٥)، بە لادانی پێوەری (٠,٧٦) و هاوکۆڵکەی جیاوازی (٣٣,٣٣٪)، ئەمەش ئاماژەیە بۆ (مامناوەند)ی ناوەڕۆکی ئەو بڕگەی کە دەڵێت (**پێموایە ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی بەم نزیکانە دەنگۆ (دعاية) نییە**).

هەروەها بڕگەکانی (١، ٦، ٣، ٥) ڕیزبەندی (٢، ٣، ٤، ٥)یان سەبارەت بە ڕێژەی ڕازیبوون لای تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بەدەستهێناوە، هەروەها هەموویان ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراویان گەورەترە لە (٢,٥)، ئەمەش ئاماژەیە بۆ (بەهێز)ی ناوەڕۆکی ئەو بڕگانە.

**خشتەی (٤–١–٢) کاتی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی**

**لای نموونەی توێژینەوەکە ڕووندەکاتەوە**

| تەوەری یەکەم | پ | زۆر لەگەڵیدام ٤ | | لەگەڵیدام ٣ | | لەگەڵیدا نیم ٢ | | هیچ لەگەڵیدا نیم ١ | | ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراو بۆ برگە | لادانی پێوەری | هاوکۆلکەی جیاوازی | ڕێژەی ڕازیبوون | ڕیزبەندی ڕازیبوون |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | | | | | |
| کاتی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی | ١ | ١٧٤ | ٤٦,٤٪ | ١٠٩ | ٢٩,١٪ | ٦٠ | ١٦٪ | ٣٢ | ٨,٥٪ | ٣,١٣ | ٠,٩٧ | ٣٠,٩٩٪ | ٧٨,٢٥٪ | ٢ |
| | ٢ | ١ | ٠,٣٪ | ١٧٥ | ٤٦,٧٪ | ١٢٩ | ٣٤,٤٪ | ٧٠ | ١٨,٧٪ | ٢,٢٨ | ٠,٧٦ | ٣٣,٣٣٪ | ٥٧٪ | ٦ |
| | ٣ | ١٢٧ | ٣٣,٩٪ | ١٤٩ | ٣٩,٧٪ | ٧٢ | ١٩,٢٪ | ٢٧ | ٧,٢٪ | ٣ | ٠,٩٠ | ٣٠٪ | ٧٥٪ | ٤ |
| | ٤ | ١٩٧ | ٥٢,٥٪ | ٩٤ | ٢٥,١٪ | ٦٢ | ١٦,٥٪ | ٢٢ | ٥,٩٪ | ٣,٢٤ | ٠,٩٣ | ٢٨,٧٠٪ | ٨١٪ | ١ |
| | ٥ | ١١٧ | ٣١,٢٪ | ١١٧ | ٣١,٢٪ | ٦٧ | ١٧,٩٪ | ٧٤ | ١٩,٧٪ | ٢,٧٣ | ١,١٠ | ٤٠,٢٩٪ | ٦٨,٢٥٪ | ٥ |
| | ٦ | ١٣٦ | ٣٦,٣٪ | ١٤٧ | ٣٩,٢٪ | ٧٢ | ١٩,٢٪ | ٢٠ | ٥,٣٪ | ٣,٠٦ | ٠,٨٧ | ٢٨,٤٣٪ | ٧٦,٥٪ | ٣ |
| کۆی گشتی | | ١٢٥,٣٣ | ٣٣,٤٣٪ | ١٣١,٨١ | ٣٥,١٦٪ | ٧٧ | ٢٠,٥٣٪ | ٤٠,٨٣ | ١٠,٨٨٪ | ٢,٩٠ | ٠,٩٢ | ٣١,٩٥٪ | ٧٢,٦٦٪ | |

### ٤-١-٢-٢: بەرگەگرتنی قەیران و ئامادەیی قوربانیدان لەپێناو راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی:

ریزبەنـدی برگـەکانی تـەوەری دووەم (**بەرگـەگرتنی قـەیران و ئامـادەیی قوربانیدان لەپێناو راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی**) لـە برگـەی (٧- ١٣) بەشـێوەی گەورە بۆ بچووك لەسـەر بنـەمای رێـژەی رازیبـوون ریزبەنـد کـراوە، هـەروەکو لـە خشتەی (٤-١-٣) ئاماژەی پێدراوە:

**خشتەی (٤-١-٣) بەرگەگرتنی قەیران و ئامادەیی قوربانیدان لەپێناو راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی لای نموونەی توێژینەوەکە روونکراوە**

| تەوەری دووەم | پ | زۆر لەگەڵیدام ٤ | | لەگەڵیدام ٣ | | لەگەڵیدا نیم ٢ | | هیچ لەگەڵیدا نیم ١ | | ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراو | لادانی پێوەری | هاوکۆلکەی جیاوازی | ڕێژەی رازیبوون | ریزبەندی رازیبوون |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | | | | | |
| بەرگەگرتنی قەیران و ئامادەیی قوربانیدان لەپێناو راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی | ٧ | ١٢٨ | ٣٤,١٪ | ١٠٩ | ٢٩,١٪ | ٨٤ | ٢٢,٤٪ | ٥٤ | ١٤,٤٪ | ٢,٨٢ | ١,٠٥ | ٣٧,٢٣٪ | ٧٠,٥٪ | ٢ |
| | ٨ | ١٧٣ | ٤٦,١٪ | ١١٣ | ٣٠,١٪ | ٦٥ | ١٧,٣٪ | ٢٤ | ٦,٤٪ | ٣,١٦ | ٠,٩٣ | ٢٩,٤٣٪ | ٧٩٪ | ١ |
| | ٩ | ١٠٥ | ٢٨٪ | ١١٦ | ٣٠,٩٪ | ٨٣ | ٢٢,١٪ | ٧١ | ١٨,٩٪ | ٢,٦٨ | ١,٠٧ | ٣٩,٩٢٪ | ٦٧٪ | ٥ |
| | ١٠ | ١٠١ | ٢٦,٩٪ | ١١٥ | ٣٠,٧٪ | ٨١ | ٢١,٦٪ | ٧٨ | ٢٠,٨٪ | ٢,٦٣ | ١,٠٩ | ٤١,٤٤٪ | ٦٥,٧٥٪ | ٦ |
| | ١١ | ١٠٢ | ٢٧,٢٪ | ١٣٣ | ٣٥,٥٪ | ٩٧ | ٢٥,٩٪ | ٤٣ | ١١,٥٪ | ٢,٧٨ | ٠,٩٧ | ٣٤,٨٩٪ | ٦٩,٥٪ | ٣ |
| | ١٢ | ١٠٠ | ٢٦,٧٪ | ١٢٠ | ٣٢٪ | ١١٦ | ٣٠,٩٪ | ٣٩ | ١٠,٤٪ | ٢,٧٤ | ٠,٩٦ | ٣٥,٠٣٪ | ٦٨,٥٪ | ٤ |
| | ١٣ | ١٠٠ | ٢٦,٧٪ | ٨٧ | ٢٣,٢٪ | ١٢٣ | ٣٢,٨٪ | ٦٥ | ١٧,٣٪ | ٢,٥٩ | ١,٠٦ | ٤٠,٩٢٪ | ٦٤,٧٥٪ | ٧ |
| کۆی گشتی | | ١١٥,٥٧ | ٣٠,٨١٪ | ١١٣,٢٨ | ٣٠,٢١٪ | ٩٢,٧١ | ٢٤,٧١٪ | ٥٣,٤٢ | ١٤,٢٤٪ | ٢,٧٧ | ١,٠١ | ٣٦,٩٨٪ | ٦٩,٢٨٪ | |

لە خشتەی (٤-١-٣) بۆمان دەردەکەوێت، کە برگەی (٨) رێژەی رازیبـوونی (٧٩٪) و گـەورەترە لـە رێـژەی (٦٢,٥٪)، ریزبەنـدی (١) سـەبارەت بـە رێـژەی رازیبـوون لای تاکـەکانی نموونـەی توێژینـەوە بەدەسـتهێناوە، هـەروەها ناوەنـدی ژمێرەیی سەنگکراوی برگە (٣,١٦) و گەورەترە لە ناوەندی گریمانەکراو (٢,٥)، بە لادانی پێوەری (٠,٩٣) و هاوکۆلکـەی جیـاوازی (٢٩,٤٣٪)، ئەمـەش ئاماژەیـە بـۆ

(بەهێز)ی ناوەڕۆکی ئەو بڕگەی کە دەڵێت (**ئامادەم ببمە سەرباز تەنیا لەپێناو دەوڵەتی سەربەخۆدا**).

**هەروەها** بڕگەکانی (٧، ١١، ١٢، ٩، ١٠، ١٣) ریزبەندی (٢، ٣، ٤، ٥، ٦، ٧) یان سەبارەت بە رێژەی رازیبوون لای تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بەدەستهێناوە، هەروەها هەموویان ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراویان گەورەترە لە ناوەندی گریمانەکراو (٢,٥)، ئەمەش ئاماژەیە بۆ (بەهێز)ی ناوەڕۆکی ئەو بڕگانە.

**٤-١-٢-٣: ویستنی دەوڵەتی کوردی:**

ریزبەندی بڕگەکانی تەوەری سێیەم (**هەڵوێست بەرامبەر راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی**) لە بڕگەی (١٤- ١٨) بەشێوەی گەورە بۆ بچووک لەسەر بنەمای رێژەی رازیبوون ریزبەند کراوە، هەروەکو لە خشتەی (٤-١-٤) ئاماژەی پێدراوە:

**خشتەی (٤-١-٤) ویستنی دەوڵەتی کوردی لای نموونەی توێژینەوەکە رووندەکاتەوە**

| تەوەری سێیەم | پ | زۆر لەگەڵیدام ٤ | | لەگەڵیدام ٣ | | لەگەڵیدا نیم ٢ | | هیچ لەگەڵیدا نیم ١ | | ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراو بۆ برگە | لادانی پێوەری | هاوکۆلکەی جیاوازی | رێژەی رازیبوون | ریزبەندی رازیبوون |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ژمارە | رێژەی سەدی | ژمارە | رێژەی سەدی | ژمارە | رێژەی سەدی | ژمارە | رێژەی سەدی | | | | | |
| ویستنی دەوڵەتی کوردی | ١٤ | ١٨٥ | ٤٩,٣٪ | ١١٩ | ٣١,٧٪ | ٤٣ | ١١,٥٪ | ٢٨ | ٧,٥٪ | ٣,٢٢ | ٠,٩٢ | ٢٨,٥٧٪ | ٨٠,٥٪ | ١ |
| | ١٥ | ١٦٤ | ٤٣,٧٪ | ٩٩ | ٢٦,٤٪ | ٧١ | ١٨,٩٪ | ٤١ | ١٠,٩٪ | ٣,٠٢ | ١,٠٣ | ٣٤,١٠٪ | ٧٥,٥٪ | ٢ |
| | ١٦ | ١١٤ | ٣٠,٤٪ | ١٠٧ | ٢٨,٥٪ | ٧٩ | ٢١,١٪ | ٧٥ | ٢٠٪ | ٢,٦٩ | ١,١٠ | ٤٠,٨٩٪ | ٦٧,٢٥٪ | ٤ |
| | ١٧ | ٢٩ | ٧,٧٪ | ٣٨ | ١٠,١٪ | ١٠٠ | ٢٦,٧٪ | ٢٠٨ | ٥٥,٥٪ | ١,٧٠ | ٠,٩٣ | ٥٤,٧٠٪ | ٤٢,٥٪ | ٥ |
| | ١٨ | ١٣١ | ٣٤,٩٪ | ٩٥ | ٢٥,٣٪ | ٩٢ | ٢٤,٥٪ | ٥٧ | ١٥,٢٪ | ٢,٨٠ | ١,٠٧ | ٣٨,٢١٪ | ٧٠٪ | ٣ |
| كۆی گشتی | | ١٢٤,٦ | ٣٣,٢٪ | ٩١,٦ | ٢٤,٤٪ | ٧٧ | ٢٠,٥٤٪ | ٨١,٨ | ٢١,٨٢٪ | ٢,٦٨ | ١,٠١ | ٣٩,٢٩٪ | ٦٧,١٥٪ | |

لە خشتەی (٤-١-٤) بۆمان دەردەکەوێت، کە بڕگەی (١٤) رێژەی رازیبوونی (٨٠,٥٪) و گەورەترە لە رێژەی (٦٢,٥٪)، ریزبەندی (١) سەبارەت بە رێژەی رازیبوون لای تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بەدەستهێناوە، هەروەها ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراوی بڕگە (٣,٢٢) و گەورەترە لە ناوەندی گریمانەکراو (٢,٥)، بە

لادانی پێوەری (٠,٩٢) و هاوکۆڵکەی جیاوازی (٢٨,٥٧٪)، ئەمەش ئاماژەیە بۆ (بەهێز)ی ناوەڕۆکی ئەو بڕگەی کە دەڵێت (**دەوڵەتی کوردیم دەوێت، ئەگەر دەسەڵاتی سیاسیش نەیەوێت**).

هەروەها بڕگەی (١٧) ڕێژەی ڕازیبوونی (٤٢,٥٪) و بچووکترە لە ڕێژەی (٦٢,٥٪)، ڕیزبەندی (٥) سەبارەت بە ڕێژەی ڕازیبوون لای تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بەدەستهێناوە، هەروەها ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراوی بڕگە (١,٧٠) و بچووکترە لە ناوەندی گریمانەکراو (٢,٥)، بە لادانی پێوەری (٠,٩٣) و هاوکۆڵکەی جیاوازی (٥٤,٧٠٪)، ئەمەش ئاماژەیە بۆ (لاواز)ی ناوەڕۆکی ئەو بڕگەی کە دەڵێت (**دەوڵەتی کوردیم دەوێت، ئەگەر سەرۆکەکەشی دیکتاتۆر بێت**).

هەروەها بڕگەکانی (١٥، ١٨، ١٦) ڕیزبەندی (٢، ٣، ٤) یان سەبارەت بە ڕێژەی ڕازیبوون لای تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بەدەستهێناوە، هەروەها هەموویان ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراویان گەورەترە لە (٢,٥)، ئەمەش ئاماژەیە بۆ (بەهێز)ی ناوەڕۆکی ئەو بڕگانە.

**٤-١-٢-٤: سنوور و پێکهاتەی دەوڵەتی کوردی:**

ڕیزبەندی بڕگەکانی تەوەری چوارەم (**سنوور و پێکهاتەی دەوڵەتی کوردی**) لە بڕگەی (١٩- ٢٢) بەشێوەی گەورە بۆ بچووك لەسەر بنەمای ڕێژەی ڕازیبوون ڕیزبەند کراوە، هەروەکو لە خشتەی (٤-١-٥) ئاماژەی پێدراوە:

**خشتەی (٤–١–٥) سنوور و پێکهاتەی دەوڵەتی کوردی**
**لای نموونەی توێژینەوەکە ڕوندەکاتەوە**

| تەوەری چوارەم | پ | زۆر لەگەڵیدام | | لەگەڵیدام | | لەگەڵیدا نیم | | هیچ لەگەڵیدا نیم | | ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراو بۆ برگە | لادانی پێوەری | هاوکۆلکەی جیاوازی | ڕێژەی ڕازیبوون | ڕیزبەندی ڕازیبوون |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ٤ | | ٣ | | ٢ | | ١ | | | | | | |
| | | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | | | | | |
| سنوور و پێکهاتەی دەوڵەتی کوردی | ١٩ | ١٥٦ | ٤١,٦٪ | ١٢٢ | ٣٢,٥٪ | ٦٠ | ١٦٪ | ٣٧ | ٩,٩٪ | ٣,٠٥ | ٠,٩٨ | ٣٢,١٣٪ | ٧٦,٢٥٪ | ٣ |
| | ٢٠ | ٢٢٠ | ٥٨,٧٪ | ١٠٨ | ٢٨,٨٪ | ٣٢ | ٨,٥٪ | ١٥ | ٤٪ | ٣,٤٢ | ٠,٨١ | ٢٣,٦٨٪ | ٨٥,٥٪ | ٢ |
| | ٢١ | ٢٣٤ | ٦٢,٤٪ | ٩٥ | ٢٥,٣٪ | ٢٥ | ٦,٧٪ | ٢١ | ٥,٦٪ | ٣,٤٤ | ٠,٨٤ | ٢٤,٤١٪ | ٨٦٪ | ١ |
| | ٢٢ | ١٣١ | ٣٤,٩٪ | ١١٠ | ٢٩,٣٪ | ٨٦ | ٢٢,٩٪ | ٤٨ | ١٢,٨٪ | ٢,٨٦ | ١,٠٣ | ٣٦,٠١٪ | ٧١,٥٪ | ٤ |
| کۆی گشتی | | ١٨٥,٢٥ | ٤٩,٤٪ | ١٠٨,٧٥ | ٢٨,٩٧٪ | ٥٠,٧٥ | ١٣,٥٢٪ | ٣٠,٢٥ | ٨,٠٧٪ | ٣,١٩ | ٠,٩١ | ٢٩,٠٥٪ | ٧٩,٨١٪ | |

لە خشتەی (٤–١–٥) بۆمان دەردەکەوێت، کە برگەی (٢١) ڕێژەی ڕازیبوونی (٨٦٪) و گەورەترە لە ڕێژەی (٦٢,٥٪)، ڕیزبەندی (١) سەبارەت بە ڕێژەی ڕازیبوون لای تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بەدەستهێناوە، هەروەها ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراوی برگە (٣,٤٤) و گەورەترە لە ناوەندی گریمانەکراو (٢,٥)، بە لادانی پێوەری (٠,٨٤) و هاوکۆلکەی جیاوازی (٢٤,٤١٪)، ئەمەش ئاماژەیە بۆ (زۆر بەهێز)ی ناوەرۆکی ئەو برگەی کە دەڵێت (**دەوڵەتی کوردیم دەوێت پێکهاتبێت لە هەر چوار پارچەی کوردستانی گەورە**). هەروەها برگەی (٢٠) ڕێژەی ڕازیبوونی گەیشتۆتە (٨٥,٥٪) و گەورەترە لە ڕێژەی (٦٢,٥٪)، ڕیزبەندی (٢) سەبارەت بە ڕێژەی ڕازیبوون لای تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بەدەستهێناوە، هەروەها ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراوی برگە (٣,٤٢) و گەورەترە لە ناوەندی گریمانەکراو (٢,٥)، بە لادانی پێوەری (٠,٨١) و هاوکۆلکەی جیاوازی (٢٣,٦٨٪)، ئەمەش ئاماژەیە بۆ (زۆر بەهێز)ی ناوەرۆکی ئەو برگەی کە دەڵێت (**لام ئاسایی نییە، دەوڵەتی کوردیم هەبێت بەبێ ئەوەی شاری کەرکوکی لەگەڵدا بێت**).

هەروەها بڕگەکانی (١٩، ٢٢) ریزبەندی (٣، ٤)یان سەبارەت بە ڕێژەی رازیبوون لای تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بەدەستهێناوە، هەروەها هەردووکیان ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراویان گەورەترە لە (٢,٥)، ئەمەش ئاماژەیە بۆ (بەهێز)ی ناوەڕۆکی ئەو بڕگانە.

**٤-١-٢-٥: بەدەستهێنانی پێگە و ناسنامە بەهۆی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی:**

ریزبەندی بڕگەکانی تەوەری پێنجەم (**بەدەستهێنانی پێگە و ناسنامە بەهۆی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی**) لە بڕگەی (٢٣- ٢٧) بەشێوەی گەورە بۆ بچووك لەسەر بنەمای ڕێژەی رازیبوون ریزبەند کراوە، هەروەکو لە خشتەی (٤-١-٦) بۆمان دەردەکەوێت، کە بڕگەکانی (٢٣، ٢٤ و ٢٥) ڕێژەی رازیبوونی (٨٦,٢٥٪، ٨٥٪ و ٨٢,٧٥٪) و گەورەترن لە ڕێژەی (٦٢,٥٪)، ریزبەندی (١، ٢ و ٣) یان سەبارەت بە ڕێژەی رازیبوون لای تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بەدەستهێناوە، هەروەها ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراوی بڕگەکان (٣,٤٥، ٣,٤٠ و ٣,٣١) و گەورەترە لە ناوەندی گریمانەکراو (٢,٥)، بە لادانی پێوەری (٠,٦٥، ٠,٨٠ و ٠,٨١) و هاوکۆلکەی جیاوازی (١٨,٨٤٪، ٢٣,٥٢٪ و ٢٤,٤٧٪)، ئەمەش ئاماژەیە بۆ (زۆر بەهێز)ی ناوەڕۆکی ئەو بڕگانە کە دەڵێن (**بوونی دەوڵەت واتە پێگەیەکی نێودەڵەتیم هەیە، بوونی دەوڵەت واتە رزگاربوون لە دەوڵەتێکی فاشی، کە عێراقە، بوونی دەوڵەت واتە بەدیهێنانی خواستەکانم**).

هەروەها بڕگەی (٢٧ و ٢٦) ڕێژەی رازیبوونیان (٧٩,٥٪ و ٧٨,٢٥٪) گەورەترن لە ڕێژەی (٦٢,٥٪)، ریزبەندی (٤ و ٥) یان سەبارەت بە ڕێژەی رازیبوون لای تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بەدەستهێناوە، هەروەها ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراوی هەردوو بڕگەکە (٣,١٨ و ٣,١٣) و گەورەترە لە ناوەندی گریمانەکراو (٢,٥)، بە لادانی پێوەری (٠,٨٧ و ٠,٨٩) و هاوکۆلکەی جیاوازی (٢٧,٣٥٪ و ٢٨,٤٣٪)، ئەمەش ئاماژەیە بۆ (بەهێزی)ی ناوەڕۆکی هەردوو بڕگەکە.

**خشتەی (٤-١-٦) بەدەستهێنانی پێگە و ناسنامە بەهۆی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی لای نموونەی توێژینەوەکە ڕووندەکاتەوە**

| تەوەری پێنجەم | پ | زۆر لەگەڵیدام ٤ ژمارە | زۆر لەگەڵیدام ٤ ڕێژەی سەدی | لەگەڵیدام ٣ ژمارە | لەگەڵیدام ٣ ڕێژەی سەدی | لەگەڵیدا نیم ٢ ژمارە | لەگەڵیدا نیم ٢ ڕێژەی سەدی | هیچ لەگەڵیدا نیم ١ ژمارە | هیچ لەگەڵیدا نیم ١ ڕێژەی سەدی | ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراو بۆ بڕگە | لادانی پێوەری | هاوکۆلکەی جیاوازی | ڕێژەی ڕازیبوون | ڕیزبەندی ڕازیبوون |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بەدەستهێنانی پێگە و ناسنامە بەهۆی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی | ٢٣ | ١٩٨ | ٪٥٢,٨ | ١٥٧ | ٪٤١,٩ | ١٣ | ٪٣,٥ | ٧ | ٪١,٩ | ٣,٤٥ | ٠,٦٥ | ٪١٨,٨٤ | ٪٨٦,٢٥ | ١ |
| | ٢٤ | ٢١٣ | ٪٥٦,٨ | ١١٧ | ٪٣١,٢ | ٣٠ | ٪ ٨ | ١٥ | ٪٤ | ٣,٤٠ | ٠,٨٠ | ٪٢٣,٥٢ | ٪٨٥ | ٢ |
| | ٢٥ | ١٨٩ | ٪٥٠,٤ | ١٣٠ | ٪٣٤,٧ | ٤٢ | ٪١١,٢ | ١٤ | ٪٣,٧ | ٣,٣١ | ٠,٨١ | ٪٢٤,٤٧ | ٪٨٢,٧٥ | ٣ |
| | ٢٦ | ١٥٦ | ٪٤١,٦ | ١٣٦ | ٪٣٦,٣ | ٦١ | ٪١٦,٣ | ٢٢ | ٪٥,٩ | ٣,١٣ | ٠,٨٩ | ٪٢٨,٤٣ | ٪٧٨,٢٥ | ٥ |
| | ٢٧ | ١٦٦ | ٪٤٤,٣ | ١٣١ | ٪٣٤,٩ | ٥٩ | ٪١٥,٧ | ١٩ | ٪٥,١ | ٣,١٨ | ٠,٨٧ | ٪٢٧,٣٥ | ٪٧٩,٢٥ | ٤ |
| کۆی گشتی | | ١٨٤,٤ | ٪٤٩,١٨ | ١٣٤,٢ | ٪٣٥,٨ | ٤١ | ٪١٠,٩٤ | ١٥,٤ | ٪٤,١٢ | ٣,٢٩ | ٠,٨٠ | ٪٢٤,٥٢ | ٪٨٢,٣٥ | |

**٤-١-٢-٦: تێڕوانینی لاوان بۆ ئایندەی دەوڵەتی کوردی لە داهاتوودا:**

ریزبەندی بڕگەکانی تەوەری شەشەم (**تێڕوانینی لاوان بۆ ئایندەی دەوڵـەتی کوردی لە داهاتوودا**) لە بڕگەی (٢٨- ٣٥) بەشـێوەی گـەورە بـۆ بچـووک لەسـەر بنەمای ڕێژەی رازیبوون ریزبەند کراوە، هەروەکو لە خشتەی (٤-١-٧) ئامـاژەی پێدراوە:

**خشتەی (٤–١–٧) تێڕوانینی لاوان بۆ ئایندەی دەوڵەتی کوردی**
**لە داهاتوودا لای نموونەی توێژینەوەکە ڕووندەکاتەوە**

| تەوەری شەشەم | پ | زۆر لەگەڵیدام ٤ | | لەگەڵیدام ٣ | | لەگەڵیدا نیم ٢ | | هیچ لەگەڵیدا نیم ١ | | ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراو بۆ برگە | لادانی پێوەری | هاوکۆلکەی جیاوازی | ڕێژەی ڕازیبوون | ڕیزبەندی ڕازیبوون |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | | | | | |
| تێڕوانینی لاوان بۆ ئایندەی دەوڵەتی کوردی لە داهاتوودا | ٢٨ | ٢٠٧ | ٪٥٥,٢ | ١٢٠ | ٪٣٢ | ٣٣ | ٪٨,٨ | ١٥ | ٪ ٤ | ٣,٣٨ | ٠,٨٠ | ٪٢٣,٦٦ | ٪٨٤,٥ | ١ |
| | ٢٩ | ١٧٩ | ٪٤٧,٧ | ١٢٧ | ٪٣٣,٩ | ٤٥ | ٪١٢ | ٢٤ | ٪ ٦,٤ | ٣,٢٢ | ٠,٨٩ | ٪٢٧,٦٣ | ٪٨٠,٥ | ٢ |
| | ٣٠ | ٨٤ | ٪ ٢٢,٤ | ١٦١ | ٪٤٢,٩ | ٨٧ | ٪٢٣,٢ | ٤٣ | ٪١١,٥ | ٢,٧٦ | ٠,٩٢ | ٪٣٣,٣٣ | ٪٦٩ | ٨ |
| | ٣١ | ١٥٥ | ٪ ٤١,٣ | ١٤٦ | ٪٣٨,٩ | ٤٦ | ٪١٢,٣ | ٢٨ | ٪٧,٥ | ٣,١٤ | ٠,٩٠ | ٪٢٨,٦٦ | ٪٧٨,٥ | ٥ |
| | ٣٢ | ١٤٣ | ٪٣٨,١ | ١٥٠ | ٪٤٠ | ٥٨ | ٪١٥,٥ | ٢٤ | ٪ ٦,٤ | ٣,٠٩ | ٠,٨٨ | ٪٢٨,٤٧ | ٪٧٧,٢٥ | ٦ |
| | ٣٣ | ١٢٤ | ٪٣٣,١ | ١٩٥ | ٪٥٢ | ٤٥ | ٪١٢ | ١١ | ٪ ٢,٩ | ٣,١٥ | ٠,٧٣ | ٪٢٣,١٧ | ٪٧٨,٧٦ | ٣ |
| | ٣٤ | ١٣٣ | ٪٣٥,٥ | ١٧٧ | ٪٤٧,٢ | ٥٤ | ٪١٤,٤ | ١١ | ٪ ٢,٩ | ٣,١٥ | ٠,٧٧ | ٪٢٤,٤٤ | ٪٧٨,٧٥ | ٤ |
| | ٣٥ | ١٠٩ | ٪٢٩,١ | ١٥٧ | ٪٤١,٩ | ٧٥ | ٪٢٠ | ٣٤ | ٪ ٩,١ | ٢,٩٠ | ٠,٩٢ | ٪٣١,٧٢ | ٪٧٢,٥ | ٧ |
| کۆی گشتی | | ١٤١,٧٥ | ٪٣٧,٨ | ١٥٤,١٢ | ٪٤١,١ | ٥٥,٣٧ | ٪١٤,٧٧ | ٢٣,٧٥ | ٪٦,٣٣ | ٣,٠٩ | ٠,٨٥ | ٪٢٧,٦٣ | ٪٧٧,٤٦ | |

لە خشتەی (٤–١–٧) بۆمان دەردەکەوێت، کە بڕگەی (٢٨) ڕێژەی ڕازیبوونی (٪٨٤,٥) و گەورەترە لە ڕێژەی (٪٦٢,٥)، ڕیزبەندی (١) سەبارەت بە ڕێژەی ڕازیبوون لای تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بەدەستهێناوە، هەروەها ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراوی برگە (٣,٣٨) و گەورەترە لە ناوەندی گریمانەکراو (٢,٥)، بە لادانی پێوەری (٠,٨٠) و هاوکۆڵکەی جیاوازی (٪٢٣,٦٦)، ئەمەش ئاماژەیە بۆ (زۆر بەهێز)ی ناوەڕۆکی ئەو بڕگەی کە دەڵێت (**لەکاتی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی، حکومەت (هێزەکانی پێشمەرگە و ئاسایش) دەتوانێت پارێزگاری لەو دەوڵەتە بکات**).

هــەروەها بڕگــەکانی (٢٩، ٣٣، ٣٤، ٣١، ٣٢، ٣٥، ٣٠) ریزبەنـدی (٢، ٣، ٤، ٥، ٦، ٧، ٨)یان سەبارەت بە رێژەی رازیبوون لای تاکەکانی نموونـەی توێژینـەوە بەدەستهێناوە، هەروەها هەموویان ناوەندی ژمێرەیی سەنگکراویان گـەورەترە لـە (٢,٥)، ئەمەش ئاماژە بۆ (بەهێز)ی ناوەڕۆکی ئەو بڕگانە دەکات.

**٤-١-٣: پێوانەکردنی ئاستی هەستکردنی لاوان بە پرسی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی و تەوەرەکانی:**

**خشتەی (٤-١-٨) ئەنجامی تاقیکردنەوەی (ت)ی بۆ یەك نموونە بۆ پێوانەکردنی جیاوازی نێوان ناوەندی بەدەستهاتوو و ناوەندی گریمانەکراو بۆ پرسی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی و تەوەرەکانی**

| تەوەر | ناوەندی بەدەستهاتوو | لادانی پێوەری | ناوەندی گریمانەکراو | بەهای (ت)ی | | ئاستی ئاماژەداری ئاماری لە ٠,٠٥ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | بەدەستهێنراو | خشتەیی | |
| کاتی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی | ١٧,٤٦٦ | ٤,٠١٧ | ١٥ | ٢,٥٧١ | ١,٩٨٤ | ئاماژەدارە |
| بەرگەگرتنی قەیران و ئامادەیی قوربانیدان لەپێناو راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی | ١٩,٤٣٢ | ٥,٤٧٣ | ١٧,٥ | ٥,٥٤٧ | ١,٩٨٤ | ئاماژەدارە |
| ویستنی دەوڵەتی کوردی | ١٦,٨٣٧ | ٣,٧١٤ | ١٢,٥ | ٩,٥٧٨ | ١,٩٨٤ | ئاماژەدارە |
| سنوور و پێکهاتەی دەوڵەتی کوردی | ١٢,٧٨٩ | ٢,٢٩٨ | ١٠ | ٦,٦٤٩ | ١,٩٨٤ | ئاماژەدارە |
| بەدەستهێنانی پێگە و ناسنامە بەهۆی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی | ١٦,٥٠١ | ٢,٩٣٩ | ١٢,٥ | ٩,٨٩٠ | ١,٩٨٤ | ئاماژەدارە |
| تێڕوانینی لاوان بۆ ئایندەی دەوڵەتی کوردی لە داهاتوودا | ٢٤,٨٢٩ | ٤,١٤١ | ٢٠ | ٣,٨٧٨ | ١,٩٨٤ | ئاماژەدارە |
| هەموو تەوەرەکان بەیەکەوە | ١٠٠,١٣٠ | ١٥,٣٢٦ | ٨٧,٥ | ٦,١٥٢ | ١,٩٨٤ | ئاماژەدارە |
| کۆی نموونە= ٣٧٥ | | | نمرەی ئازادی= ٣٧٤ | | | |

لە خشتەی (٤-١-٨) بۆمان دەردەکەوێت سەرجەم تەوەرەکانی توێژینەوە ئاماژەدارن، لەبەرئەوەی ناوەندی بەدەستهاتووی سەرجەم تەوەرەکان لە ناوەندی گریمانەکراو گەورەترن، هەروەها بە هاى تاقیکردنەوەی (ت) بۆ یەك نموونە (إختبار (ت) لعينة واحدة- One Sample T.test) ی سەرجەم تەوەرەکان گەورەترە لە بەهای (ت)ی خشتەیی (١,٩٨٤)، لە ئاستی ئاماژەداری ئاماری (٠,٠٥) و نمرەی ئازادی (٣٧٤). ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ((**لە ئاستێکی بەرزدا، لاوان لە ئێستادا لەگەڵ راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی دان**)).

**٤-١-٤: جیاوازی نێوان تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بەپێی گۆڕاوەکان:**

ئامانجی ئەم باسە بۆ وەسفکردن و شیکردنەوەی جیاوازی نێوان تاکەکانی نموونەیە بەپێی گۆڕاوەکانی توێژینەوە، وەکو (رەگەز، باری کۆمەڵایەتی، تەمەن، داهاتی مانگانە، پیشە، شوێنی نیشتەجێبوون و ئاستی خوێندەواری)، لە رێگەی بەکارهێنانی ئامرازە ئامارییەکانی وەکو تاقیکردنەوەی (ت) بۆ دوو نموونەی سەربەخۆ (إختبار (ت) لعينتين مستقلتين- Independent Simple T.test) و تاقیکردنەوەی ئەنۆڤا (ف) (إختبار التباين الأحادي- One way ANOVA)، لە ئاستی ئاماژەداری (٠,٠٥٠). ئەمەش بۆ وەڵامدانەوەی ئەو گریمانەیەی کە دەڵێت ((**جیاوازی لە نێوان تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بەپێی گۆڕاوەکان هەیە، سەبارەت بە پرسی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی**)).

**خشتەی (٤-١-٩) جیاوازی نێوان تاکەکانی نموونە بەپێی گۆڕاوەکانی توێژینەوە سەبارەت بە پرسی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی**

| ر | گۆڕاوەکان | وەڵامەکان | ژمارە | ناوەندی ژمێرەیی | لادانی پێوەری | بەهای (ت) و (ف) | | ماناداری | ئاستی ئاماژەدار لە ٠,٠٥٠ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | | دەرهێنراو | خشتەیی | | |
| ١ | رەگەز | نێر | ١٨٧ | ٩٩,٩١٩ | ١٦,٩٢١ | t = ٠,٢٦٥ | ١,٩٦٦ | ٠,٧٩١ | ئاماژەدار نییە |
| | | مێ | ١٨٨ | ١٠٠,٣٤٠ | ١٣,٥٩٨ | | | | |
| ٢ | باری کۆمەڵایەتی | سەڵت | ٢٢٥ | ٩٩,٤٠٨ | ١٥,٣١٣ | t = ١,١١٧ | ١,٩٦٦ | ٠,٢٦٥ | ئاماژەدار نییە |
| | | خێزاندار | ١٥٠ | ١٠١,٢١٣ | ١٥,٣٣٢ | | | | |
| ٣ | تەمەن | ١٨- ٢٣ ساڵ | ١٤٧ | ٩٨,٥٨٥ | ١٤,٣٩٢ | F = ٣,٤٣٠ | ٣,٠٢٠ | ٠,٠٣٣ | ئاماژەدارە |

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ٢٤– ٢٩ ساڵ | ١٤٢ | ١٠٢,٧٦٧ | ١٤,٩١٨ | | | | |
| | | ٣٠– ٣٥ ساڵ | ٨٦ | ٩٨,٤١٨ | ١٧,٠٢٤ | | | | |
| ٤ | داهاتی مانگانە | بێ داهات | ١٨٩ | ١٠٠,٨٦٢ | ١٣,٨٣٤ | F = ١,٣٨٢ | ٢,٦٢٩ | ٠,٢٤٨ | ئاماژەدار نییە |
| | | کەمتر لە ٥٠٠ هەزار دینار | ٣٢ | ١٠٣,٥٣١ | ١٢,١٩٤ | | | | |
| | | ٥٠٠– ٩٩٩ هەزار دینار | ١١٢ | ٩٩,٠٢٦ | ١٦,٧٤٥ | | | | |
| | | یەك ملیۆن و بەسەرەوە | ٤٢ | ٩٧,١٩٠ | ١٩,٢٣١ | | | | |
| ٥ | پیشە | کاسب | ٧٢ | ١٠٢,١٦٦ | ١٧,٣٩٥ | F = ٣,٢١٠ | ٢,٣٩٦ | ٠,٠١٣ | ئاماژەدارە |
| | | مووچە وەرگر | ١١٤ | ٩٧,٦٣١ | ١٦,٠٩٥ | | | | |
| | | قوتابی | ١٢٦ | ٩٩,٢٦١ | ١٢,٨٦٣ | | | | |
| | | ژنی ماڵ | ٤١ | ١٠٦,٧٨٠ | ١٢,٠٢٦ | | | | |
| | | بێکار | ٢٢ | ٩٩ | ١٩,١٢٣ | | | | |
| ٦ | شوێنی نیشتەجێبوون | هەولێر | ١٧٣ | ١٠٣,١٠٩ | ١٣,٨٦٤ | ٣٩,٠٩٩ F = | ٣,٠٢٠ | ٠,٠٠٠ | ئاماژەدارە |
| | | سلێمانی | ١٢٤ | ٩١,٣٦٢ | ١٤,٩٥٧ | | | | |
| | | دهۆك | ٧٨ | ١٠٧,٤٦١ | ١٢,٤٩٠ | | | | |
| ٧ | ئاستی خوێندەواری | نزم | ٦٧ | ١٠٣,٠٧٤ | ١٤,٣٦٥ | ١٦,٥٠٥ F = | ٣,٠٢٠ | ٠,٠٠٠ | ئاماژەدارە |
| | | ناوەند | ١١٦ | ١٠٥,٣٧٩ | ١٣,٣٠٦ | | | | |
| | | بەرز | ١٩٢ | ٩٥,٩٣٢ | ١٥,٦٣٧ | | | | |

**ئەنجامەکانی خشتەی (٤–١–٩) پیشانی دەدات، کە:**

**٤–١–٤–١: رەگەز:** جیاوازی لە نێوان تاکەکانی نموونەی توێژینەوەکە بەپێی گۆڕاوی رەگەز (نێر و مێ) نییە، چونکە بەهای (ت)ی دەرهێنراو (٠,٢٦٥)

بچووکترە لە بەهای (ت)ی خشتەیی (١,٩٦٦) بە نمرەی ئازی (٣٧٣) و ئاستی ئامـاژەداری (٠,٠٥٠)، سـەرەڕای بـوونی جیـاوازی بـەپێی گـۆڕاوی ڕەگـەز، بـەڵام نەگەیشـتوونەتە ئاسـتی ئامـاژەداری ئامـاری، بەمـەش گریمانـەی توێژینـەوە ڕەتدەکرێتەوە و گریمانەی سفری وەردەگیرێت، کە دەڵێت ((هـیچ جیاوازییـەك لـە نێوان ڕەگەزی نێر و مێ نییە، سەبارەت بە پرسی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی)).

**٤-١-٤-٢: بـاری کۆمەڵایـەتی:** جیـاوازی لـە نێـوان تاکـەکانی نموونـەی توێژینەوەکە بەپێی گۆڕاوی باری کۆمەڵایـەتی (سـەڵت و خێزانـدار) نییـە، چـونکە بەهای (ت)ی دەرهێنراو (١,١١٧) بچووکترە لـە بـەهای (ت)ی خشـتەیی (١,٩٦٦) بە نمرەی ئازی (٣٧٣) و ئاستی ئامـاژەداری (٠,٠٥٠)، سـەرەڕای بـوونی جیـاوازی بەپێی گۆڕاوی باری کۆمەڵایەتی بەڵام نەگەیشتوونەتە ئاستی ئاماژەداری ئامـاری، بەمەش گریمانەی توێژینەوە ڕەتدەکرێتەوە و گریمانەی سـفری وەردەگیرێـت، کـە دەڵێت ((هـیچ جیاوازییـەك لـە نێـوان بـاری کۆمەڵایـەتی سـەڵت و خێزانـدار نییـە، سەبارەت بە پرسی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی)).

**٤-١-٤-٣: تەمەن:** جیاوازی لە نێوان تاکەکانی نموونـەی توێژینەوەکـە بـەپێی گۆڕاوی تەمەن (١٨- ٢٣ ساڵ، ٢٤- ٢٩ ساڵ و ٣٠- ٣٥سـاڵ) هەیـە، چـونکە بـەهای (ف)ی دەرهێنراو (٣,٤٣٠) گەورەترە لـە بـەهای (ف)ی خشـتەیی (٣,٠٢٠) لـە ئاسـتی ئامـاژەداری (٠,٠٥٠)، جیاوازییەکـەش بـۆ دەسـتەی تەمـەنی (٢٤- ٢٩سـاڵ)ی دەگەڕێتەوە چونکە ناوەنـدی ژمێرەیـی ئـەو دەسـتەیە لـە دوو دەسـتە تەمەنییەکـەی دیکـە گـەورەترە، بەمـەش گریمانـەی سـفری ڕەتدەکرێتـەوە و گریمانـەی توێژینـەوە وەردەگیرێت، کە دەڵێت ((جیاوازی لە نێوان تاکەکانی نموونـەی توێژینەوەکـە بـەپێی گۆڕاوی تەمەن هەیە، سەبارەت بە پرسی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی)).

**٤-١-٤-٤: داهـاتی مانگانـە:** جیـاوازی لـە نێـوان تاکـەکانی نموونـەی توێژینەوەکە بەپێی گۆڕاوی داهـاتی مانگانـە (بـێ داهـات، کـەمترە لـە ٥٠٠ هـەزار دینار، ٥٠٠- ٩٩٩ هـەزار دینـار و یـەك ملیـۆن دینـار و بەسـەرەوە) نییـە، چـونکە بەهای (ف)ی دەرهێنراو (١,٣٨٢) بچووکترە لە بـەهای (ف)ی خشـتەیی (٢,٦٢٩) لـە ئاسـتی ئامـاژەداری (٠,٠٥٠)، بەمـەش گریمانـەی توێژینـەوە ڕەتدەکرێتـەوە و گریمانەی سفری وەردەگیرێت، کە دەڵێت ((جیاوازی لە نێوان تاکـەکانی نموونـەی

توێژینەوەکە بەپێی گۆڕاوی داهاتی مانگانە نییە، سەبارەت بە پرسی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی))

**٤-١-٤-٥: پیشە:** جیاوازی لە نێوان تاکەکانی نموونەی توێژینەوەکە بەپێی گۆڕاوی پیشە (قوتابی، کاسب، مووچەوەرگر، ژنی ماڵ و بێکار) هەیە، چونکە بەهای (ف)ی دەرهێنراو (٣,٢١٠) گەورەترە لە بەهای (ف)ی خشتەیی (٢,٣٩٦) لە ئاستی ئامادەداری (٠,٠٥٠)، جیاوازییەکەش بۆ ئەو لاوانە دەگەڕێتەوە کە ژنی ماڵن چونکە ناوەندی ژمێرەیی ئەو دەستەیە لە چوار دەستەکەی دیکە گەورەترە، بەمەش گریمانەی سفری رەتدەکرێتەوە و گریمانەی توێژینەوە وەردەگیرێت، کە دەڵێت ((جیاوازی لە نێوان تاکەکانی نموونەی توێژینەوەکە بەپێی گۆڕاوی پیشە هەیە، سەبارەت بە پرسی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی)).

**٤-١-٤-٦: شوێنە نیشتەجێبوون:** جیاوازییەکی ئامادەداری ئاماری گەورە لە نێوان تاکەکانی نموونەی توێژینەوەکە بەپێی گۆڕاوی شوێنە نیشتەجێبوون (هەولێر، سلێمانی و دهۆك) هەیە، چونکە بەهای (ف)ی دەرهێنراو (٣٩,٠٩٩) گەورەترە لە بەهای (ف)ی خشتەیی (٣,٠٢٠) لە ئاستی ئامادەداری (٠,٠٥٠)، جیاوازییەکەش بۆ ئەو لاوانە دەگەڕێتەوە کە دانیشتووی شاری دهۆکن، چونکە ناوەندی ژمێرەیی لاوانی دانیشتووی شاری دهۆك گەورەترە لە ناوەندە ژمێرەیی لاوانی دانیشتووی هەولێر و سلێمانی، بەمەش گریمانەی سفری رەتدەکرێتەوە و گریمانەی توێژینەوە وەردەگیرێت، کە دەڵێت ((جیاوازی لە نێوان تاکەکانی نموونەی توێژینەوەکە بەپێی گۆڕاوی شوێنە نیشتەجێبوون هەیە، سەبارەت بە پرسی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی)).

**٤-١-٤-٧: ئاستی خوێندەواری:** جیاوازی لە نێوان تاکەکانی نموونەی توێژینەوەکە بەپێی گۆڕاوی ئاستی خوێندەواری (ئاستی خوێندەواری نزم "نەخوێندەوار، خوێندن و نووسین و سەرەتایی"، ئاستی خوێندەواری ناوەند "ناوەندی و ئامادەیی"و ئاستی خوێندەواری بەرز "پەیمانگا، زانکۆ و خوێندنی باڵا") هەیە، چونکە بەهای (ف)ی دەرهێنراو (١٦,٥٠٥) گەورەترە لە بەهای (ف)ی خشتەیی (٣,٠٢٠) لە ئاستی ئامادەداری (٠,٠٥٠)، جیاوازییەکەش بۆ ئەو لاوانە دەگەڕێتەوە کە لە ئاستێکی ناوەندی خوێندەواریدان، چونکە ناوەندی

ژمێرەیی ئەو ئاستە لە دوو ئاستەکەی دیکە گەورەترە، بەمەش گریمانەی سفری رەتدەکرێتەوە و گریمانەی توێژینەوە وەردەگیرێت، کە دەڵێت ((جیاوازی لە نێوان تاکەکانی نموونەی توێژینەوەکە بەپێی گۆڕاوی ئاستی خوێندەواری هەیە، سەبارەت بە پرسی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی)).

**٤-٢: ئەنجام و راسپاردەکانی توێژینەوە:**

لەم باسەدا ئەنجام و راسپاردەکانی توێژینەوە دەخەینەڕوو:

**٤-٢-١: ئەنجامەکانی توێژینەوە:**

**٤-٢-١-١: ئەنجامەکانی تایبەت بە ئامانجی یەکەم:**

لەم ئامانجەدا هەوڵدراوە وەڵامی ئەو پرسیارانە بدرێتەوە، کە دەڵێت (**ئایا لاوان لەگەڵ راگەیاندنی دەوڵەتی کوردیدان؟، هەروەها ئایا لاوان دەوڵەتی کوردییان دەوێت و ئامادەن لەپێناویدا قوربانی بدەن و بەرگەی قەیرانە ناوخۆیی و دەرەکییەکان بگرن؟، لە دواییدا تێڕوانینی لاوان چییە بەرامبەر بە ئایندەی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی؟**).

**بەگشتی لە بارودۆخی ئێستادا لاوان لەگەڵ راگەیاندنی دەوڵەتی کوردیدان،** ئەنجامەکانیش بەم شێوەیەی لای خوارەوەن:

١- سەبارەت بە لاوان و کاتی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی، ئەوا زۆربەی تاکەکانی نموونە بەڕێژەی رازیبوونی (٨١٪) پێیانوایە دەمێکە کاتی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی هاتووە و لە بارودۆخی ئێستاشدا لەگەڵ راگەیاندنی دەوڵەتی کوردیدان.

٢- سەبارەت بە لاوان و بەرگەگرتنی قەیران و ئامادەیی قوربانیدان لەپێناو راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی، ئەوا رێژەی رازیبوونی تاکەکانی نموونەکە گەیشتۆتە (٧٩٪) و ئامادەن لەپێناو راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی ببنە سەرباز و بە کەمترین مووچە و داهات رازی بن و بەرگەی هەموو جۆرە قەیرانێك بگرن، تەنها لەپێناو راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی.

٣- سەبارەت بە لاوان و ویستنی دەوڵەتی کوردی، ئەوا بەڕێژەی رازیبوونی (٨٠,٥٪) تاکەکانی نموونەکە دەوڵەتی کوردییان دەوێت تەنانەت ئەگەر دەسەڵاتی سیاسیش لەئێستادا نەیانەوێت.

٤- سەبارەت بە لاوان و پێکهاتەی دەوڵەتی کوردی، ئەوا زۆربەی تاکەکانی نموونە بەڕێژەی ڕازیبوونی (٨٦٪) و (٨٥,٥٪) دەوڵەتی کوردییان دەوێت پێکهاتبێت لە هەرچوار پارچەی کوردستانی گەورە، هەروەها لای ئاسایی نییە دەوڵەتی کوردی هەبێت ئەگەر شاری کەرکووکی لەگەڵدا نەبێت.

٥- سەبارەت بە لاوان و بەدەستهێنانی پێگە و ناسنامەی بەهۆی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی، ئەوا زۆربەی تاکەکانی نموونە بەڕێژەی ڕازیبوونی نزیکەی (٨٦٪) پێیانوایە بەهۆی دەوڵەتی کوردی پێگەیەکی نێودەوڵەتییان دەبێت و ڕزگار دەبن لە دەوڵەتێکی فاشی کە عێراقە و خواستەکانیان بەدی دێت.

٦- سەبارەت بە تێڕوانینی لاوان بۆ ئایندەی دەوڵەتی کوردی، ئەوا زۆربەی تاکەکانی نموونە بەڕێژەی ڕازیبوونی (٨٤,٥٪) پێیانوایە حکومەت (هێزەکانی پێشمەرگە و ئاسایش) دەتوانێت پارێزگاری لە دەوڵەتی کوردی بکەن، هەروەها لە ئاییندەدا کەمتر دەوڵەتی کوردی بە واتای زۆری داهاتی هاولاتیان و جێبەجێکردنی سستەمی دیموکراسی و کەمکردنەوەی ناعەدالەتی دەگەیەنێت.

**٤-٢-١-٢: ئەنجامەکانی تایبەت بە ئامانجی دووەم:**

لە ئامانجی دووەمدا هەوڵدراوە وەڵامی ئەو پرسیارە بدرێتەوە کە دەڵێت (**ئایا جیاوازی لە نێوان تاکەکانی نموونەی توێژینەوە بەپێی گۆڕاوەکان هەیە؟، سەبارەت بە پرسی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی**). ئەوا دەرکەوتووە:

١- هیچ جیاوازییەکی ئامارەداری ئاماری لە نێوان تاکەکانی نموونە بەپێی گۆڕاوەکانی (ڕەگەز، باری کۆمەڵایەتی و، داهاتی مانگانە) سەبارەت بە پرسی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی نییە.

٢- بەڵام جیاوازی ئامارەداری ئاماری لە نێوان تاکەکانی نموونە بەپێی گۆڕاوەکانی (تەمەن، پیشە، شوێنی نیشتەجێبوون و ئاستی خوێندەواری) سەبارەت بە پرسی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی هەیە، ئەویش بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

- گۆڕاوی تەمەن، جیاوازییەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو لاوانەی تەمەنیان لە نێوان (٢٤- ٢٩) ساڵیدایە. واتە ئەوان زیاتر لە ئێستادا لەگەڵ ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردیدان.

– گۆڕاوی پیشە، جیاوازییەکە بۆ ئەو لاوانەی (ژنی ماڵ)ن دەگەڕێتەوە، واتە ئەوان زیاتر لە ئێستادا لەگەڵ راگەیاندنی دەوڵەتی کوردیدان.

– گۆڕاوی شوێنی نیشتەجێبوون، جیاوازییەکە بۆ ئەو لاوانەی دانیشتووی شاری (دهۆک)ن دەگەڕێتەوە، واتە ئەوان زیاتر لە ئێستادا لەگەڵ راگەیاندنی دەوڵەتی کوردیدان. بەرامبەر ئەو لاوانەی دانیشتووی شاری (سلێمانی)ن، کە کەمتر لە ئێستادا لەگەڵ راگەیاندنی دەوڵەتی کوردیدان.

– گۆڕاوی ئاستی خوێندەواری، جیاوازییەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو لاوانەی ئاستی خوێندەوارییان لە ئاستێکی (ناوەند)دایە، واتە ئەوان زیاتر لە ئێستادا لەگەڵ راگەیاندنی دەوڵەتی کوردیدان. بەرامبەر ئەو لاوانەی ئاستی خوێندەوارییان لە ئاستێکی (بەرز) دایە، کە کەمتر لە ئێستادا لەگەڵ راگەیاندنی دەوڵەتی کوردیدان.

**٤-٢-٢: راسپاردە و پێشنیازەکانی توێژینەوە:**

**٤–٢–٢–١: راسپاردەکانی توێژینەوە:**

لەبەر رۆشنایی ئەو ئەنجامانەی کە توێژینەوەکە پێی گەیشتووە، ئەوا چەند راسپاردەیەك ئاراستەی ئەم لایەنانەی خوارەوە دەکەین:

١– سەرۆکایەتی پەرلەمانی کوردستان، پێویستە پەرلەمانی کوردستان بە شێوەیەکی رێکوپێکتر بیر لە پرسی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی بکاتەوە و تەنانەت هەوڵبدات ئەو بابەتە بخاتە بەر باس و بڕیارێکی گونجاو لەبارەیەوە بدات، هەوڵبدات کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی هەرێمی کوردستان راسپێرێت بۆ راپرسی لەبارەی ئەو پرسەوە.

٢– سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران، دوای ئەوەی لاوان متمانەیان بە حکوومەت (پێشمەرگە و ئاسایش) هەیە سەبارەت بە پاراستنی دەوڵەتی کوردی، ئەوا دەبێت زیاتر هێزەکانی ناوخۆ و پێشمەرگە تۆکمەتر بکرێت. هەروەها هەوڵبدات کێشە ناوخۆییەکان و قەیرانە دارایی و سیاسییەکان کەمتر بکاتەوە و کار بۆ بنبڕکردنیان بکات. لەدواییدا ئامادەکاری بکرێت بۆ راپرسی لەبارەی پرسی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی.

٣– سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان زیاتر کار بکەن بۆ ئەوەی زەمینەی دەرەکی ساز بکەن، چونکە بەپێی ئەنجامەکانی ئەو توێژینەوەیە بێت ئەوا زەمینەی ناوخۆیی لەبارە بۆ پرسی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی.

٤– حزب و لایەنە سیاسییەکان لە هەرێمی کوردستان، پێویستە زیاتر هەوڵی یەکریزی بدەن و ئاراستەی ئەندام و لایەنگرانیان بکەن بۆ ئەوەی گیانی لەیەکبوردنیان هەبێت.

٥– رۆشنبیر و کەناڵەکانی راگەیاندن، پێویستە بەیەکەوە کار بکەن بۆ زیاتر ورووژاندنی ئەم پرسە و زیاتر تاکەکانی کۆمەڵگە هوشیاربکەنەوە لە بایەخ و گرنگی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی.

**٤–٢–٢–٢: پێشنیازەکانی توێژینەوە:**

لێرەدا چەند پێشنیازێك دەخەینەڕوو:

١– لەبەرئەوەی ئەم توێژینەوەیە تەنها لاوان (١٨– ٣٥) ساڵی وەرگرتووە، کە توێژێکی گرنگی ناو کۆمەڵگەن، ئەوا توێژینەوەی هاوشێوەی بکرێت، بەڵام با کۆمەڵگەی توێژینەوەکەیان جیاواز بێت و توێژی پێگەیشتووان و پیران بگرێتەوە.

٢– توێژینەوەی دیکە لەسەر لاوانی دانیشتووی سلێمانی بکرێت، چونکە بە بەراورد لەگەڵ لاوانی دانیشتووی هەولێر و دهۆك کەمتر لەگەڵ راگەیاندنی دەوڵەتی کوردیدا بوون، بۆ ئەوەی ئەو هۆکار و فاکتەرانە بخرێنەڕوو سەبارەت بە ئەم پرسە لای لاوانی دانیشتووی شاری سلێمانی.

## ليستى سەرچاوەكان:


١. ابراهيم، د. مروان عبدالمجيد، ٢٠٠٠، أسس البحث العلمي لإعداد الرسائل الجامعية، عمان: مؤسسة الوراق.

٢. اسماعيل، د. فضل الله محمد، ٢٠٠٨، فلسفة السياسة، الاسكندرية: دار الجامعة الجديدة.

٣. الأسود، د. شعبان الطاهر، ٢٠٠١، علم الاجتماع السياسي، ط٢، القاهرة: الدار المصرية اللبنانية.

٤. امين، اسامة ربيع، ٢٠١٢، التحليل الاحصائي بإستخدام برنامج spss، ج٢، ط٢، القاهرة: مكتبة الانجلو المصرية.

٥. الأنصاري، د. عيسي بن حسن، ٢٠٠٨، من التعليم إلي العمل تدريب وتوظيف الشباب، بيروت: المؤسسة العربية للدراسات والنشر.

٦. بركات والاخرون، د.نظام، د. عثمان الروّاف و د. محمد الحلوة، ١٩٩٠، مبادئ علم السياسة، ط٢، عمان: دار الكرمل للنشر والتوزيع.

٧. برو، فيليب، ١٩٩٨، علم الاجتماع السياسي، ترجمة: د.محمد عرب صاصيلا، بيروت: المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع.

٨. بوعناقة، د. علي، ٢٠٠٧، الشباب مشكلاته الاجتماعية في المدن الحضرية، بيروت: مركز دراسات الوحدة العربية.

٩. حجازي، د. مصطفى، ٢٠٠٨، الشباب الخليجي والمستقبل، بيروت: المركز الثقافي العربي.

١٠. الحسن، د. احسان محمد، ١٩٩٩، موسوعة علم الاجتماع، بيروت: دار العربية للموسوعات.

١١. خاطر، محمد إبراهيم، ٢٠١٤، الشباب ودورهم في التغيير والإصلاح، الإسكندرية: دار الوفاء لدنيا الطباعة والنشر.

١٢. الذيفاني، د. عبدالله أحمد، ٢٠٠١، الشباب العربي والمعاصرة من منظور فكري وتربوي، بغداد: بيت الحكمة.

١٣. رايت، ف. ج.، ١٩٩٦، مبادئ علم الاجتماع، ترجمة: د. محمد شيّا، القاهرة: دار الحداثة للطباعة والنشر والتوزيع.

١٤. رشوان، د. عبدالمنصف حسن، ٢٠٠٦، ممارسة الخدمة الاجتماعية في رعاية الشباب وقضاياهم، بغداد: المكتب الجامعي الحديث.

١٥. الزيود، د. ماجد، ٢٠١١، الشباب والقيم في عالم متغير، ط٢، عمان: دار الشروق للنشر والتوزيع.

١٦. سكوت، جون، ٢٠٠٩، علم الاجتماع المفاهيم الاساسية، ترجمة: محمد عثمان، بيروت: الشبكة العربية للأبحاث والنشر.

١٧. سلطان، د. جاسم محمد، ٢٠٠٨، قواعد في الممارسة السياسية، مصر: مؤسسة أم القرى للترجمة والتوزيع.

١٨. شبيب، كاظم، ٢٠١١، المسألة الطائفية –تعدد الهويات في الدولة الواحدة–، بيروت: دار التنوير للطباعة والنشر والتوزيع.

١٩. الشريفي، د. نداء صادق، ٢٠١٠، أصول علم الاجتماع السياسي، عمان: جهينة للنشر والتوزيع.

٢٠. شفيق، د. محمد، ٢٠٠٨، البحث العلمي "الأسس– الإعداد"، المكتب الجامعي الحديث، الإسكندرية.

٢١. شيّا، د. محمد، ٢٠٠٨، مناهج التفكير وقواعد البحث في العلوم الانسانية والاجتماعية، ط٢، بيروت: مجد المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع.

٢٢. الصيرفي، د. محمد عبدالفتاح، ٢٠٠٨، البحث العلمي –دليل تطبيقي للباحثين–، عمان: دار وائل للنشر والتوزيع.

٢٣. الطبيب، د. مولود زايد، ٢٠٠٧، علم الاجتماع السياسي، بنغازي: منشورات جامعة السابع من ابريل.

٢٤. طبيه، د. أحمد عبدالسميع، ٢٠٠٨، مبادىء الاحصاء، عمان: دار البداية ناشرون وموزعون.

٢٥. الطيب، د. عمر يوسف، ٢٠٠٤، علم الاجتماع السياسي "الاصول والتحليل التكاملي"، الخرطوم: دار عزة للنشر والتوزيع.

٢٦. عبدالرحمن، د. عبدالله محمد، ٢٠٠١، علم الاجتماع السياسي، بيروت: دار النهضة العربية.

٢٧. عبدالكافي، د. اسماعيل عبدالفتاح، ٢٠٠٥، الموسوعة الميسرة للمصطلحات السياسية. القاهرة: دار الكتب العربية.

٢٨. عبيدات و مبيضين، د. محمد، د.محمد أبو نصار و د.عقلة، ١٩٩٩، منهجية البحث العلمي "القواعد والمراحل والتطبيقات"، ط٢، عمان: دار وائل للطباعة والنشر.

٢٩. عقيل، أ. د. عقيل حسين،٢٠١٠، قواعد المنهج وطرق البحث العلمي، دمشق: دار ابن كثير للطباعة والنشر والتوزيع.

٣٠. علاّم، د. صلاح الدين محمود، ٢٠٠٠، القياس والتقويم التربوي والنفسي، القاهرة: دار الفكر العربي.

٣١. عليان و غنيم، د. ربحي مصطفى و د.عثمان محمد، ٢٠٠٠، مناهج وأساليب البحث العلمي"النظرية والتطبيق"، عمان: دار الصفاء للنشر والتوزيع.

٣٢. غباري، محمد سلامة، ١٩٩٩، الخدمة الاجتماعية ورعاية الشباب في المجتمعات الاسلامية، ط٢، الإسكندرية: مكتبة الجامعي الحديث.

٣٣. القادري، د.محمد صالح، ٢٠٠٩، الدولة والمجتمع المدني، تونس: سلسلة كتب ثقافية شهرية تصدرها جريدة "الحرية".

٣٤. القصاص، د. مهدى محمد، ٢٠٠٧، الاحصاء والقياس الاجتماعي، القاهرة: دار الفكر العربي.

٣٥. كراجة، د. عبدالقادر، ١٩٩٧، القياس والتقويم في علم النفس، عمان: دار اليازوري العلمية للنشر والتوزيع.

٣٦. لاسكي، هارولد ج.، ٢٠١٢، الدولة نظرياً وعملياً، ترجمة: سعيد شحاته، ط٢، الاسكندرية: شركة الأمل للطباعة والنشر.

٣٧. المشاقبة، بسام عبدالرحمن، ٢٠١١، الإعلام البرلماني والسياسي، عمان: دار أسامة للنشر والتوزيع.

٣٨. موسى، د. أحمد محمد، ٢٠٠٩، الشباب بين التهميش والتشخيص "رؤية إنسانية"، المنصورة: المكتبة العصرية للنشر والتوزيع.

٣٩. ذكائي، محمد سعيد، ١٣٨٧ (٢٠٠٨)، جامعه شناسي جوانان ايران، چاپ دوم، تهران: مؤسسة انتشارات آگاه.

٤٠. زادە، د. ئەحمەد نەقیب، ٢٠٠٧، پێشەکییەك لەسەر کۆمەڵناسی سیاسی، و: مەسعوود رەواندووست، هەولێر: دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی.

٤١. محەمەد، بەهادین ئەحمەد، ٢٠٠١، تیۆری دەوڵەت و سیستەمە رامیارییەکان، سلێمانی: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

٤٢. محەممەدی و زادە، زاهیر و یاسین حاجی، ٢٠٠٦، فەرهەنگی سیاسی، هەولێر: چاپخانەی رۆژهەڵات.

٤٣. هێیوود، ئاندرو، ٢٠٠٧، تیۆری سیاسی، و: گۆران سەباح، هەولێر: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس.

٤٤. وەڵەد بەگی، ئازاد، ٢٠٠٥، فەرهەنگی رامیاری نیگا، هەولێر: وەزارەتی رۆشنبیری– بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەر.

٤٥. دەستەی ئاماری هەرێمی کوردستان لە مانگی ٢٠١٥/١

http://www.krso.net/files/articles/230714125439.pdf

## پاشكۆی (١): پرسیارنامە

وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی
زانكۆی كۆیە
فاكەڵتی زانستە مرۆڤایەتی و كۆمەڵایەتییەكان
**سكوڵی زانستە كۆمەڵایەتییەكان– بەشی كۆمەڵناسی**

KOYA UNIVERSITY

ژمارەی فۆرم ..........
شوێن ..........
ڕێكەوت ........

**لاوی بەڕێز..................**

ئەم فۆرمەی لەبەردەستی بەڕێزتاندایە ئامادەكراوە بەمەبەستی ئەنجامدانی توێژینەوەیەك لەبارەی **(لاوان و پرسی راگەیاندنی دەوڵەت، توێژینەوەیەكی مەیدانییە لە هەرێمی كوردستان– عێراق)**، لەم بارەیەوە رای بەڕێزتان بایەخی تایبەتی خۆی هەیە.

هاوكاریتان شیاوی ڕێز و پێزانینە

**ئامادەكردنی: م. ی. هەردی زیاد صالح**

.......................................................................................................

**یەكەم: زانیارییە گشتییەكان:**

**١– رەگەز:** نێر ( ) مێ ( )،
**٢– باری كۆمەڵایەتی:** سەڵت ( ) خێزاندار ( )،
**٣– تەمەن:** ..........ساڵ
**٤– داهاتی مانگانە:** .......... هەزار دینار،
**٥– پیشە:** ................ ،
**٦– شوێنی نیشتەجێبوون:** .......... ساڵ
**٧– ئاستی خوێندەواری:** ......................

## دووەم: زانیارییە تایبەتییەکان:

| ر | پرسیارەکان | زۆر لەگەڵیدام | لەگەڵیدام | لەگەڵیدا نیم | هیچ لەگەڵیدا نیم |
|---|---|---|---|---|---|
| | **تەوەرەی یەکەم: کاتی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی** | | | | |
| ١ | لە بارودۆخی ئێستادا لەگەڵ ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردیدام | | | | |
| ٢ | پێموایە ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی بەم نزیکانە دەنگۆ (دعایە) نییە | | | | |
| ٣ | پێموایە لە بارودۆخی ئێستادا ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی پشتگیری و دانپێدانانی نێودەوڵەتی بەدەست دەهێنێت | | | | |
| ٤ | پێموایە دەمێکە کاتی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی هاتووە | | | | |
| ٥ | متمانەم بە سەرکردە سیاسییەکانی هەرێم هەیە سەبارەت بە ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی | | | | |
| ٦ | پێموایە کۆمەککردنی وڵاتان بۆ هەرێمی کوردستان لە ڕووی سەربازی و مرۆیییەوە، ڕێگاخۆشکەرە بۆ ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی لە ئاییندەیەکی نزیکدا | | | | |
| | **تەوەرەی دووەم: بەرگەگرتنی قەیرانەکان و ئامادەیی قوربانیدان لەپێناو ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی** | | | | |
| ٧ | ئامادەم بە کەمترین مووچە و داهات کار بکەم، بە مەرجی دروستبوونی دەوڵەتی سەربەخۆ | | | | |
| ٨ | ئامادەم ببمە سەرباز تەنیا لەپێناو دەوڵەتی سەربەخۆدا | | | | |
| ٩ | لەپێناو ڕاگەیاندنی دەوڵەت بە کەمترین خزمەتگوزاریش ڕازی دەبم | | | | |
| ١٠ | لەپێناو ڕاگەیاندنی دەوڵەت بەرگەی قەیرانی سووتەمەنی دەگرم | | | | |
| ١١ | ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی ئەوە دەهێنێت بەرگەی هەموو جۆرە قەیرانێك بگرم | | | | |
| ١٢ | ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی هێندە گرنگە ئەگەر شەڕیش لەگەڵ دەوڵەتی عێراق هەڵگیرسێت | | | | |
| ١٣ | ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردی هێندە گرنگە ئەگەر شەڕیش لەگەڵ دەوڵەتانی (ئێران و تورکیا) هەڵگیرسێت | | | | |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| **تەوەرەی سێیەم: ویستنی دەوڵەتی کوردی** | | | | | | |
| ١٤ | دەوڵەتی کوردیم دەوێت، ئەگەر دەسەڵاتی سیاسیش نەیەوێت | | | | | |
| ١٥ | دەوڵەتی کوردیم دەوێت، ئەگەر بکەوینە حاڵەتی شەڕیش لەگەڵ هەر وڵاتێك | | | | | |
| ١٦ | دەوڵەتی کوردیم دەوێت، بەبێ گوێدانە ئەوەی سستەمێکی عەلمانی یان ئیسلامی بێت | | | | | |
| ١٧ | دەوڵەتی کوردیم دەوێت، ئەگەر سەرۆکەکەشی دیکتاتۆر بێت | | | | | |
| ١٨ | لەگەڵ ئەوەدام دەوڵەتی کوردی رابگەیەنرێت ئەگەر ئەمریکا و رۆژئاواش لە ئێستادا دژی بن و نەیانەوێت | | | | | |
| **تەوەرەی چوارەم: سنوور و پێکهاتەی دەوڵەتی کوردی** | | | | | | |
| ١٩ | لام ئاسایی نییە، دەوڵەتی کوردیم هەبێت بەبێ ناوچە کوردستانییەکانی دەرەوەی هەرێم (مادەی ١٤٠) | | | | | |
| ٢٠ | لام ئاسایی نییە، دەوڵەتی کوردیم هەبێت بەبێ ئەوەی شاری کەرکوکی لەگەڵدا بێت | | | | | |
| ٢١ | دەوڵەتی کوردیم دەوێت پێکهاتبێت لە هەر چوار پارچەی کوردستانی گەورە | | | | | |
| ٢٢ | دەوڵەتی کوردیم دەوێت پێکهاتبێت لە باشوور و رۆژئاوای کوردستانی گەورە | | | | | |
| **تەوەرەی پێنجەم: بەدەستهێنانی پێگە و ناسنامە بەهۆی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی** | | | | | | |
| ٢٣ | بوونی دەوڵەت واتە پێگەیەکی نێودەوڵەتیم هەیە | | | | | |
| ٢٤ | بوونی دەوڵەت واتە رزگاربوون لە دەوڵەتێکی فاشی، کە عێراقە | | | | | |
| ٢٥ | بوونی دەوڵەت واتە بەدیهێنانی خواستەکانم | | | | | |
| ٢٦ | بوونی دەوڵەت واتە کەمبوونەوەی کاریگەری حزبەکان لەسەر ژیانی خەڵك | | | | | |
| ٢٧ | بوونی دەوڵەت واتە رزگاربوون لە دڵەڕاوکێ و نالەباری بارودۆخی ناوخۆ | | | | | |
| **تەوەرەی شەشەم: تێروانینی لاوان بۆ ئایندەی دەوڵەتی کوردی لە داهاتوودا** | | | | | | |
| ٢٨ | لەکاتی راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی، حکومەت (هێزەکانی پێشمەرگە و ئاسایش) دەتوانێت پارێزگاری لەو دەوڵەتە بکات | | | | | |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢٩ | دەوڵەتی کوردی دەسەڵاتی بەسەر هەموو ناوچەکانی کوردستان دەبێت (پاراستنی یەکپارچەیی خاك) | | | | |
| ٣٠ | راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی، واتە بەهێزی سستەمی ئابووری و زۆری داهاتی هاوڵاتیان دەگەیەنێت | | | | |
| ٣١ | راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی، واتە دروستکردنی دیکتاتۆری دیکە ناگەیەنێت | | | | |
| ٣٢ | راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی، واتە حکومەت بە یەکسانی دەسەڵاتی بەسەر هەموو هاوڵاتییانی دەبێت | | | | |
| ٣٣ | راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی، واتە پابەندبوونی هاوڵاتیان بەو یاسا و رێنماییانەی لەلایەن حکومەتەوە دەردەچێت | | | | |
| ٣٤ | راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی، واتە جێبەجێکردنی سستەمی دیموکراسی لە حکومڕانیدا | | | | |
| ٣٥ | راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی، واتە کەمکردنەوەی ناعەدالەتی و تاکرەوی دەگەیەنێت | | | | |

## پاشکۆی (٢): بۆچوونی پسپۆران سەبارەت:

### بە راستێتی ئامرازی پێوانەکردن بۆ برگەکانی فۆرمی راپرسییەکە روونەکاتەوە

| ژ. | ناوی مامۆستاکان | ژمارەی برگە دروستەکان | ژمارەی برگە نادروستەکان | ناوی برگە نادروستەکان |
|---|---|---|---|---|
| ١ | پ.د. صباح احمد نجار–کۆمەڵناسی/ زانکۆی سەلاحەددین | ٢٩ | ٢ | ٢١، ٢٢ |
| ٢ | پ.د. طاهر حسۆ میر زێباری–کۆمەڵناسی/ زانکۆی سەلاحەددین | ٣٠ | ١ | ٢٢ |
| ٣ | پ. د. رەشاد صبری میران –کۆمەڵناسی/ زانکۆی سەلاحەددین | ٣١ | ٠ | – |
| ٤ | پ.ی.د.عبدالحمید علی سعید برزنجی–کۆمەڵناسی/زانکۆی سەلاحەددین | ٢٩ | ٢ | ٢٥، ٣٠ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٥ | پ.ی.د. ئازاد عەلی اسماعیل– سایکۆلۆژی/ زانکۆی کۆیە | ٣١ | ٠ | – |
| ٦ | پ.ی.د. عبدالمجید غفور ابراهیم– کۆمەڵناسی/زانکۆی سەلاحەددین | ٢٤ | ٧ | ٤، ٦، ٧، ٩، ١٠، ١٩، ٢٥ |
| ٧ | پ.ی.د. عبدالله خورشید عبدالله– کۆمەڵناسی/زانکۆی سەلاحەددین | ٣١ | ٠ | – |
| ٨ | د. کاوە علی– سایکۆلۆژی/ زانکۆی کۆیە | ٢٤ | ٧ | ٦، ١٧، ١٨، ٢١، ٢٥، ٣٠، ٣١ |
| کۆی گشتی | | ٢٢٩ | ١٩ | |

کۆی گشتی بڕگەکانی هەر فۆرمێك = (٣١) بڕگە، ژمارەی پسپۆران (٨) پسپۆر
کۆی گشتی بڕگەکان = ژمارەی بڕگەکانی فۆرمەکە × ژمارەی پسپۆرەکان
= ٣١ × ٨ = ٢٤٨ بڕگە
ژمارەی بڕگە دروستەکان = ٢٢٩ بڕگە ، ژمارەی بڕگە نادروستەکان= ١٩ بڕگە
ڕاستێتی گشتی فۆرم = کۆی گشتی بڕگە دروستەکان ÷ ژمارەی بڕگەکانی ئامراز × ١٠٠
= ٢٢٩ ÷ ٢٤٨ × ١٠٠ = ٩٢.٣٣٪ ڕاستێتی ئامرازی پێوانەکردن

**پاشکۆی (٣): تاقیکردنەوەی جێگیریی پێوەری بەڕێگەی ئەلفا کرونباخ: بۆ هەر (٦) شەش تەوەرەی توێژینەوە**

| Cronbach's Alpha | N of Items |
|---|---|
| ٠.٨٤٥ | ٦ |

## ملخص البحث

## الشباب ومسألة اعلان الدولة

## (دراسة ميدانية في اقليم كوردستان– العراق)

الشباب شريحة مهمة في اي مجتمع تحاول تحقيق التغير والتحديث في المجتمع، وان مستقبل اي مجتمع مرتبط بمستوى الثقة والوعي الاجتماعي لشبابها لذلك يلاحظ ان شريحة الشباب دائما يتواجدون في المقدمة للدفاع عن الوطن وقيادة الثورات والحركات الاجتماعية.

ان اهداف الدراسة عبارة عن الاجابة عن هذه التساؤلات:

ـ هل الشباب مع اعلان الدولة الكوردية؟. هل الشباب يريدون الدولة الكوردية و من اجل ذلك يتحملون الازمات الداخلية والخارجية؟. ماهي تصورات الشباب ازاء مستقبل اعلان الدولة الكوردية؟.

– مقارنة بين الشباب امام مسألة اعلان الدولة بحسب متغيرات الدراسة (الجنس، الحالة الاجتماعية، السن، الدخل، العمل، السكن، ومستوى التعليم).

المناهج المستخدمة في هذه الدراسة (المسح الاجتماعي والمقارن). وعينة الدراسة (عشوائية العنقودية). ومن وسائل جمع البيانات (الاستبانة). وصلت هذه الدراسة الى ان الشباب بشكل عام مع اعلان الدولة الكوردية، ويؤكدون على الدفاع عنها ومن اجلها يتحملون الازمات الداخلية والخارجية. اما بالنسبة لمسألة اعلان الدولة الكوردية ومتغيرات الدراسة، اتضح انه لا يوجد دلالة احصائية بين وحدات العينة حسب متغيرات (الجنس، الحالة الاجتماعية، الدخل). لكن يوجد فرق في الدلالة الاحصائية بين وحدات العينة حسب متغيرات (السن" يرجع الفرق للفئة العمرية (٢٤–٢٩)")، (العمل" يرجع الفرق للشباب (ربة البيت)")، (السكن" يرجع الفرق للشباب الذين يعيشون في مدينة (دهوك)") و (مستوى التعليم" يرجع الفرق للشباب الذين في مستوى (المتوسط)").

